# هەولێر

## لە سەردەمی ئەتابەگیاندا

لێکۆڵینەوەی بارودۆخی سیاسیی و ئابوریی و لەشکریی و ئیداریی و کلتووریی هەولێری ئەو سەردەمەیە

٥٢٢ - ٦٣٠ھ/ ١١٢٨ - ١٢٣٣ز

پ. د. موحسین موحەممەد حوسێن

چاپی دووەم

بە کوردی

عثمان علی قادر کردوویە بە کوردی



ناوی کتێب: هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیاندا
ناوی نووسەر: پ. د. موحسین موحەممەد حوسێن
ناوی وەرگێڕ: عثمان علی قادر
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تیپ چنین: عبدالحمید عزیز ـ ظاهر عمر
دیزاین : نووسینگەی هیوا
خــەت : نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٣٤ك — ٢٠١٣ز
تـــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٧٧٨) ساڵی ٢٠١٣ ی دراوەتێ





دەبێ بەیفێکی ڕێز و سوپاسنامە، پێش هەموو شتێك، بۆ ئەو زاتانە تۆمار بکەم کە لە نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، باری گرانیان لەسەر شانم سووك کردو، یارییان دام، بەر لە هەمووشیان، مامۆستای پایە بەرز (پرۆفیسۆر دکتۆر جعفر حسین خصباك)ە، کە لە ماوەی نووسینی ئەم کتێبە دا تێبینی و ڕێنماییگەلێکی ورد و بەسوودی پێم بەخشی و، فێری ورە و سەبر و بەدواداچوونی کردم. سوپاسی (پرۆفیسۆر دکتۆر (صالح أحمد العلی)یش دەکەم کە ئەویش، چ پێش گفتوگۆکان و چ لە دەم و کاتی گفتوگۆکاندا، بەگیانێکی زانستانە و دڵسۆزانە، ڕێنماییگەلێکی ڕاست و ڕەوان وبەنرخی خستە پێشم و دەرگای کتێبخانەکەی خۆی بۆم خستە سەر پشت و، سوودم لێ وەرگرت.

سوپاسی (پرۆفیسۆر دکتۆر فیصل السامر) سەرۆکی پێشووی بەشی مێژووی، جاران، لە کۆلێجی ئاداب زانکۆی بەغدا، دەکەم بۆ ئەو ڕێنماییە بەنرخانەی کە لە سەرەتای بڕیاردانی دانانی ئەم کتێبەدا پێی دام و، هەر ئەویش بە گەنکردنی (اختیار) ئەم بابەتەی لەلام شیرینتر کرد.

هەروەها، سوپاسی بەڕێز مامۆستا (عثمان عەلی قادر)یش دەکەم کە بە ئەمانەتی زانستییەوە کتێبەکەی کرد بە کوردی.

دانەر

# ئاسۆی ئەم لێکۆڵینەوەیە و نمایشی سەرچاوە بنەڕەتەکانی

## ئاسۆی ئەم لێکۆڵینەوەیە

ئەم لێکۆڵینەوەیە، باسی ماوەی زێتر لە سەد ساڵ دەگرێتەوە کە لە ساڵی (٥٢٢ك/ ١١٢٨ز) تا ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز) درێژەی هەیە. پاش ئەوەی بنەماڵەی (بەگتگین) لە موسڵ جیا بوونەوە، ئیدی بە درێژایی ئەو ماوەیە میرایەتیی هەولێریان گرتە دەست و، ئەمارەتێکی سەربەخۆیان تێدا پێکەوە نا، ناونرا ئەمارەتی ئەتابەگیان.

ئەگەر ئەو ماوەیە، چ لەڕووی مێژووی ئەمارەتی هەولێرەوە - کە پێشتر ژیانێکی خەملێوی هاوشێوەی ژیانی ئەو ماوەیەی بەخۆیەوە نەدیبوو - چ لەڕووی مێژووی ناوچەکەوە و، چ لەڕووی گشت مێژووی ئیسلامیشەوە، لە سەرلەبەری قۆناغەکانی مێژووی ئیسلام گرنگتر و پڕ بایەخریش نەبووبێت، بەڵام زێدەڕۆیی ناکەین گەر بڵێین ئەو ماوەیە بەقۆناغێکی زۆر گرنگی مێژووی ئیسلام لە قەڵەم دەدرێت. ئەم ناوچەیە، لەو ماوەیەدا، بە ڕووداو گەلی گەورە گەورە شەپۆلی دەدا و، لە گۆڕانکارییەکی نائاسایی خێرداری پڕ بایەخی سیاسی و ئابووری و لەشکرسازی و ئیداری و داراییدا دەژیا.

لەو ماوەیەدا، هێز و توانستی خەلافەتیش، کەموزۆر بووژایەوە، خەلیفە (الناصرلدين الله)، کە ماوەیەکی زۆر، لەساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) تا ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) حوکمی دەکرد، توانیی بە بزاڤ و چالاکیی سەربازیی خۆی، بەرگی سام و مەترسی بە باڵای دەزگای خەلافەتدا بیڕێتەوە. ئەوەبوو خواریزمەکانی بۆ کۆمەکی خۆی هوروژاندو، پاشانیش لە ساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٣ز)دا بەسەر سەلجووقییەکانی عێراقدا

دەستبالآی کردن. هەروەها، سەرەتای سیستەمی ئەتابەگایەتی، لەو ماوەیەدا سەری هەڵدا و، ئیمپراتۆرییەتی سەلجووقیانی دابڕ دابڕ کرد و، حوکمی بڕێ لە بنەماڵەکانی تورکی بەسەر وێرانەکانیانەوە دامەزراند کە خۆیشیان هەر بریتی بوون لە گەورە بەرپرسانی تەلاری سەلجووقیان، ڕاستیشت دەوێ، ئەم ئەتابەگانەش لەرووی شێوازی حوکم و پێڕۆی کارەوە، بریتی بوون تەنیا لە درێژە پێدانی حوکمی سەلجووقی و، لەو نەختە گۆڕینە بەولاوە، کە بۆ هەلومەرجی ئەم قۆناغە نوێیەی ژیانیان پێویست بوو، دەنا هیچی دیکەیان لێ نەگۆڕی، سەرباری ئەوەش، ئەم ماوەیە، لەگەڵ چەرخ و زەمانی سەرەتای قۆناغی ڕابوونی ئیسلامیی دژی خاچدروشمان یەکیگرتەوە، ئەو قۆناغە بوو کە ئەتابەگ (عماد الدين زنگی)ی کوڕی (آق سنقر قسيم الدولة) دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی موسڵ (٥٢١ - ٥٤١ك/ ١١٢٧ - ١١٤٦ز) گەڵاڵەی کرد و، لە حوکمی (نورالدين محمود کوڕی عماد الدين زنگی) دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی حەڵەبدا (٥٤١ - ٥٦٩ك/ ١١٤٦ - ١١٧٣ز) هاتەدی و پێگەیشت و، لەسەر دەستی (الملك الناصر صلاح الدين الأيوبي) دامەزرێنەری دەوڵەتی شاهانەی ئەیووبیان لە میسر و شام (٥٦٧ - ٥٨٩ك/ ١١٧١ - ١١٩٣ز) گەیشتە ترۆپك و لقە پۆپەی. ئنجا لەسەر دەستی (الملك العادل أبی بكر)ی برای سەلاحەددین (٥٩٦ - ٦١٥ك/ ١١٩٧ - ١٢١٨ز) و کوڕەکانی ئەم دوو مەلیکەدا دەوامی کێشا.

ئەو ماوەیە - وەکو لێمان ڕوونە - لەگەڵ سەرەتای لێشاوی مەگۆلانیشدا یەکی گرتەوە، ئەوەبوو شارەکانی بەری خۆرەڵاتی جیهانی ئیسلام، شار لەدوای شار، لەژێر کوتەکی پشتشکێنی مەگۆلاندا، بەچۆکا دەهاتن. ئەو نەهامەتییەش، ڕۆژانێکی دوورودرێژی خایان، هەموو ئەو ڕووداوانە و، ڕووداوی دیکەش، کەشو هەواو زەمینەیەکی مێژووکردی بۆ پێکهانین و دامەزران و پەرەسەندن و، پاشانیش بۆ کۆتایی هاتنی ئەمارەتی ئەتابەگایەتیی هەولێر سازدا، ئەو ئەمارەتەی کە هەلومەرجێکی وەهای بۆ رەخسا، ببێتە هێزێکی سەربازی و سیاسیی بە شان و شەوکەت و، ڕۆڵی تایبەتی خۆی، لەو قۆناغەی مێژووی ئیسلامدا بگێڕێت.

لە ناوەرۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، بزاڤ و چالاکیی جۆربەجۆری خەڵکی ئەم ئەمارەتە دەخوێننەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە، پاش ئەوەی خەسڵەتەکانی ئەو دەمە دەخاتە پێش چاو، ئنجا کارەساتی ئەو قۆناغەش کە ئەم ئەمارەتەی بەر لە پەیدابوونی حوکمی بنەماڵەی بگتگین پێدا ڕۆیشتووە، بەکورتی دەگێڕێتەوە، واتا، ئەو قۆناغەی کە هێشتا ئەمارەتەکە، بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی سەلجووقیان، یان میرە کوردەکانی هەزەبانیان حوکمیان دەکرد، پاشان، هەولێر، بوو بە بەشێك لە ئەتابەگییەکەی موسڵ، چونکە (عمادالدین زنگی) داگیری کرد و، دەستبەجێ ڕادەستی فەرمانداری لەشکرەکەی خۆی میر (زین الدین علی کچك) کوڕی بگتگین دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی هەولێر کرد. ئەم میرە خۆی، یەکەو ڕاست کاروباری شارەکەی هەڵنەدەسووڕاند، بەڵکو، نوێنەرێکی خۆی، بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە دەستنیشان دەکرد، ئەوەبوو، میر (أبا منصور سرفتگین الزینی)ی دامەزراند، ئەمیش حوکمی هەولێری کرد، تا لە ساڵی (٥٥٩ك/ ١١٦٢ز)دا مرد. پاش ئەم، ئنجا (مجاهد الدین قایماز)ی دامەزراند، ئەمیش لەسەر حوکمی ئەمارەتەکە مایەوە، بگرە، هەتا پاش مردنی (زین الدین علی کچك)ی سەرداری هەولێریش، هەر حوکمی دەکرد.

لێکۆڵینەوەکە، ئنجا بادەداتەوە سەر مەسەلەی ئەو ململانێیەی لە نێوان موزەففەرەددین گۆگبوریی کوڕە گەورەی (زین الدین علی کچك) و دوا نوێنەردا هەڵایسا، ئەو ململانێیەی کە لەتەختلادان و لە هەولێر دەرکردنی موزەففەرەددین گۆگبوریی، بووە هۆی ئەوەش کە (زین الدین یوسف ینالتگین)ی برای، کە ئەکاتە کوڕە گچکەی (زین الدین علی کچك) جێگاکەی بگرێتەوە.

ئەم میرە نوێیەش، پاشان، جیاکردنەوەی ئەمارەتەکەی لە ئەتابەگایەتیی موسڵ ڕاگەیاند و، چووە ریزی دەستدایانی (تبعیە) سەلاحەددینی ئەییوبییەوە.

بە ڕاگەیاندنی ئەم گۆڕانکارییەش، ئیدی (زین الدین یوسف ینالتگین) جەنگێکی سەختی لە دژی موسڵ دەست پێکرد و، لەدوا دوای تەمەنیشیدا، گەیشتە بەرەی جەنگی دژ بە خاچدروشمان و، لەوێ، کۆتایی ژیانی هات و مرد. ئنجا

موزەففەرەددین گۆگبوری کە تازە گەڕابووەوە بۆ هەولێر، جێگاکەی گرتەوە و حوکمی هەولێری گرتە دەست، تا لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٢٣ز)دا، واتا پاش چل و چوار ساڵ حوکمکردنی لە هەولێردا، گیانی سپارد. لەماوەی ئەو چل و چوار ساڵەدا، هەولێر لە هەموو روویەکەوە گەیشتە ئەوپەڕی پەرەسەندن و پێشکەوتن.

لێکۆڵینەوەکە، هەروەها هەندێ لایەنی ژیانی ئەم ماوەیەی ئەم میرە کە لە دەرەوەی هەولێر بووە روون دەکاتەوە، لەو ماوەیەدا سەرگەورەی (حران) بووە و، دەستدای ئەتابەگی موسڵ بووە، پاشان لە موسڵ جیابووەتەوە و، خۆی گەیاندووەتە خزمەتی سەلاحەددینی ئەیوبی، ئەویش شاری (الرها) و شارگەلێکی دیکەشی خستە ژێر دەستی، ئەم لێکۆڵینەوەیە باسی ڕۆڵی کارای ئەم میرە دەکات کە لە جەنگەکانی خاچدروشماندا گێڕاویەتی، نەخاسمە لە شەڕە چارەنووسسازەکەی (حطين)دا.

هەروەها باسی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەم ئەمارەتە دەکات و، لە پێوەندیی نێوان ئەمارەتەکە و ئەمارەتی موسڵەوە دەست پێدەکات، چونکە موسڵ ببووە جەمسەری پێوەندییە دەرەکییەکانی نێوان ئەم ئەمارەتە و هێزەکانی دی. ئنجا، دێینە سەر باسوخواسی پێوەندیی نێوان ئەم ئەمارەتە لەگەڵ ئەیوبیان و، لەگەڵ خەلافەتی عەبباسیان و، پاشانیش لەگەڵ سوڵتانی خواریزم (جلال الدين منكبرتی)و، لەگەڵ هێزەکانی تری ناوچەکەشدا.

بەڵام لە بەشی پێوەندییەکانی دەرەوە، لەبەر پچڕ پچڕی و دابڕانی باسوخواسی چەندین ساڵ، کەمێ لێڵی و ناتەواوییان پێوە دیارە، چونکە ئەو دابڕانە چەندین ساڵ درێژەی دەکێشا. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە سەرچاوەیەکی چڕ و ئاودامان، کە مێژووی ئەم ئەمارەتە لەخۆ بگرێ، لەبەر دەستدا نییە و، کتێبەکەی (أبن المستوفی)یش، کە بە ئومێد بووین هەندێ حەقیقەت و ڕووداوی ڕاستەقینەمان بۆ روون بکاتەوە، ئەویش بزرە و، نییە.

بەشی دووەم شرۆڤەی پلانەکانی ئەو ماوەیەی شاری هەولێرە. لەم بەشەدا بایەخێکی تایبەتمان بەباسی قەڵا و منارەکە داوە، کە قەڵاکەی مۆڵگە و مەرکەزی ئەمارەتەکە و، جێگە و بنکەی دایەرەکان و قەڵەمڕەوی سەردار بووە - دیاریشە، شارەکە لەو سەردەمەدا، زۆرتر داویە لە فراوانی و بووژانەوە و، دامودەزگای ئاینی و زانستی و خێرخوازیی زۆر گرنگ و بەرخورداریشی تێدا پەیدا بووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەزیفە جۆربەجۆرەکانی ڕێکخراو و دایەرەکانیش دەگرێتەوە، چ ئەوانەی بەر لە سەردەمی ئەتابەگی هەبووبن پاشان لەم سەردەمەدا باشتر خەملێبن - وەك وەزارەت و باجگری و دادوەری و سەرکاری - چ ئەوانەی لە سەردەمی ئەتابەگایەتیدا پەیدا بووبن.

ڕاستت دەوێ، لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوەکان لە مێژوودا کارێکی ئەستەم و ئاڵۆزە، نەخاسمە ڕێکخراوەکانی ئەمارەتێکی وەك هەولێر، کە لە زانینی ڕەوشتی کاربەدەستانی ئەو وەزیفانە بەولاوە، هیچ شتێك لە ڕێکخراوە تایبەتییەکانی نازانین و، ناچار بووین لە سروشتی ڕێکخراوە هاوشێوەکانیان کە لە دەرەوەی هەولێردا هەبوون بکۆڵینەوە، ئنجا بێینەوە سەرباسی کاربەدەستانی ڕێکخراوەکانی هەولێر - ئەمەش - بە بۆچوونی خۆم - لەوەدەچێ کە لێکۆڵینەوەکە، کەموزۆر، کەموکورتییەکی پێوە دیاربێت، چونکە بەدووری نازانم هەندێ لە ڕێکخراوەکانی ئەمارەتی هەولێر، لەهەندێ ڕووەوە لەوانەی دەرەوەی هەولێر جیاوازبن. بەهەر حاڵ ناچار بووین لەو ڕێگایە زێتر، هیچ ڕێگایەکی دیکەمان شك نەبرد.

ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەشەوە، باسی هەندێ لەو ڕێکخراوانەشمان نەدۆزییەوە کە لە ئەمارەت و دەوڵەتانی دیکەی هاوچەرخی ئەتابەگایەتیی هەولێردا هەبووبن، یان بووبن و پێویستییان پێی نەمابێ، یان بە ناوو نیشانی جیاواز هەبووبن، یان خرابێتنە پاڵ ڕێکخراوگەلی تر، یانیش مێژوونووسان هەر ناویشیان نەهێناوە، کەچی هەندێ ڕێکخراوی وەهای تێدا بووە، لە ئەمارەتە هاوچەرخەکانی دیکەیدا پەیدا نەبووە، بەتایبەتیش ئەمارەتی موسڵ، بە نموونە،

وەك (دیوانی سەرکاری و، دیوانی خار و بار) و دیوانی دیکەی زۆر گرنگ. بەشێکی گرنگمان لە باسی ڕێکخراوەکان بۆ ڕێکخراوەی سەربازی و، هەروەهاش بۆ لێکۆڵینەوەی دراو و، جۆر و، شێوە و، کێشی دراو تەرخان کردووە. پاشانیش دراومان وەك سەرچاوەیەك داناوە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی سیاسی و پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەم ئەمارەتە، چونکە دراو سەرچاوەیەکە، جێگای گومان نییە و، هەروا بەئاسانی پشتگوێ ناخرێت.

دەبێ ئەوەش بڵێین زانیاریی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیی ناو ئەم ئەمارەتەمان بۆ فەراهەم نەبووە و دەستمان نەکەوت، بەتایبەتیش دەربارەی ئاستی گوزەران و پێگەی ئافرەت و، دابونەریتی باو و بڵاوی ئەو سەردەمە. وەڵێ بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە دەستمان کەوتن، باسی ژیانی ئابووریی ئەمارەتەکەمان کردووە و، دام و دەزگا خێر بەخشەکانی موزەففەرەددین گۆگبوریمان نیشان داوە کە ئەم میرە دایمەزراندوون و، شاهێدی ئەوەن کە خەمخۆری ژیانی چینی هەژار و داماو و بێوەژن و هەتیوبار و پەککەوتە و کەسانی دیکەی وەك ئەوانە بووە. هەروەها باسی ئەو ئاهەنگە گەورەیەشمان کردووە کە سەرداری هەولێر کردبووی بە باو، هەموو ساڵێك بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە (د. خ) دەیگێڕا کە دواتر باوی سەند و، لەم شارەدا بووە چاولێکەری و، هەر لەم شارەشەوە بە باقیمەنی وڵاتانی دیکەی ئیسلامدا بڵاو بووەوە.

لەو بەشەشدا کە بۆ باسی ڕۆشنبیریی ناو ئەمارەتەکە تەرخان کراوە، باسی مەڵبەندەکانی فێرکاری، بەنموونە، وەك باسی قوتابخانە و فێرگەی حەدیس و حوجرە و خانەقا و، دامودەزگاکانی دیکەی فێرکردنمان کردووە. هەروەها باسی بنەماڵە ڕووناکبیرە ناودارەکانی بەنموونە، وەك بنەماڵەی (ابن خلکان و، ابن المستوفی و، ابن منعە)مان کردووە و، ڕەوشی ژیانی کەسایەتییە ڕۆشنبیرەکانی هەولێر و، بواری بزاقی هزرییانمان بەسەر کردووەتەوە. ئنجا هاتووین نەختێ بەکورتی باسی رەوشی ئەو گەورە هزرمەندانەشمان کردووە کە سەریان لە هەولێر

داوە و، ماوەیەك تێیدا ماونەتەوە و، لە دەزگا زانستییەكانیدا وانە و دەرسیان گوتووەتەوە، یان هەر بەیەكجارەكی لە هەولێر ماونەتەوە.

## نمایشی سەرچاوە بنەڕەتەكانی

لە نمایشی سەرچاوەكاندا پێویستمان بەوە نییە بچینەوە سەر هەموو ئەو كتێبانەی كە لەم لێكۆڵینەوەیەدا پشتمان پێیان بەستووە، چونكە ئەو كتێبانە لیستێكی دوور و درێژە، كتێبگەلی زۆری عەرەبی و بیانیی كۆن و تازە و، دەستنووس و چاپكراوی تێدایە، بەڵكو تەنیا سەرچاوە سەرەكییەكانیان دەخەینە پێش چاو. نەخاسمە ناوی هەموو ئەو سەرچاوانەشمان هێناوە كە سوودمان لێیان وەرگرتووە و، لەكۆتایی ئەم كتێبەشدا بە لیستێكی دوور و درێژ بەرچاو خراون. جا بەر لەوەی ناوی سەرچاوەكان بنووسین، دەڵێین، بەپێچەوانەی زۆربەی ئەمارەتەكانی دی، كتێبێك نییە مێژووی ئەو ماوەیەی هەولێری تێدا بێت. تەنها كتێبێكیش كە لەبارەی مێژووی ئەم شارەوە دانرابێت - كە دەكرا، بیكەینە سەرچاوەی بنەڕەتی مێژووی ئەم شارە، ئەویش بزر بووە و نەماوە[1]. لەبەر ئەوە ناچار بووم زانیارییەكان لە ناوەرۆكی كتێبگەلێكەوە كۆبكەمەوە كە هەموو جۆرە بابەتێكیان تێدایە، ئنجا بێنم پشكنین و بەراورد و ساغكردنەوەیان تێدا بكەم و، ئەگەر دەستیشم پەرژا تەتەڵەیان بكەم، كامیان لە ڕاستی و حەقیقەتەوە نزیكتر بوو، ئەویان تۆمار بكەم. ئەو كارەش یەكێك بوو لەو كێشە زەحمەت و گرانانەی كە لە نووسینی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا هاتە پێشم.

---

(١) مەبەست، كتێبی (نباهة البلد الخامل بمن ورده من الأماثل في تأريخ أربل)ی (ابن المستوفي)یە، كاتێ نامەی ماستەرم دەنووسی، تا ساڵی (١٩٨٠ - ١٩٨١ز) ئنجا یەك جزمی ئەو كتێبە دۆزرایەوە و چاپ كرا.

پێدەچێ (ابن الاثیر - ت ٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز) پێشەنگی ئەو مێژوونووسانە بووبێت كە پشتمان پێی بەستبێت: چ كتێبە ناودامانەكەی (الكامل في التأريخ) كە بریتییە لە مێژووی گشتی و باسی ڕووداوەكانی تا ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣١ز)ی تێدایە، چ ئەو كتێبەی كە لەسەر مێژووی بنەماڵەی ئەتابەگی زەنگیی موسڵ بەناوی (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية) داینـاوە، دیاریشە (ابن الأثیر) خۆی و براكانی و باوكیشی لەژێر سایەی ئەتابەگـەكانی موسـڵ و (بدرالـدین لؤلـؤ)دا دەژیـان و، بـەناودارترین مێژوونووسـی ئـەو سـەردەمە لەقەڵـەم دەدرا و، زۆریـش بـەوردی باسوخواسـی ناوچەكەی تۆمـار كـردووە، باسـی هەولێریشی تێدایـە، كـە خـۆی هـەر لـەو ماوەیـەدا ژیـاوە و، لەهـەمان سـاڵی كۆچـی دوایـی موزەففـەرەددین گۆكبـوری و كۆتـایی ئەتابەگایـەتیی هـەولێردا مـردووە. هـەولێریش كـە تـا سـاڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٢ز) بەشـێك بووە لە ئەتابەگایەتیی موسڵ، بایەخێكی گەورەتر بەم مێژوونووسە ناودارە دەدات.

دەبێ لەوەش ئاگادار بین كە (ابن الاثیر) بە ئاشكرا بـەلای ئەتابەگـەكانی موسـڵدا دایتاشیوە و، زۆربـەی ئـەو باسوخواسـانەش كـە دەربـارەی ڕووداوەكـان دەیگێڕێتـەوە، بـریتین لـە بیر و بۆچوونی ئەتابەگەكانی موسڵ و، لەشـانی ئەوانـەوە دەڕوانێـت و بەخراپەی موزەففەرەددین گۆكبوریی دەگەڕێنەوە. بە نموونە، دەبیـنین باسـی ڕۆڵـی كـارای موزەففـەرەددین گۆكبـوریی نـەكردووە كـە لـە ڕیـزی لەشـكری سـەلاحەددینی ئەییوبیـدا گێڕاویـەتی بەتایبـەتیش لـە شـەڕەكەی (حطـین)دا. هـەروەها هیچیـشی لەبارەی سەردانەكەی بەغـدای ئـەم مـیرە كـە لـە بـەرایی سـاڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)دا، بـۆ بەغدا چووە، نەنووسیوە، هەرچەندیشە ئەم مێژوونووسە لەو دەمەدا، نـەك هـەر تـا كۆتایی ئـەو ساڵە بـەڵكو تـا بەسەرچوونی مـانگی سـەفەری سـاڵی (٦٢٩ك[1]/ كۆتـایی ساڵی ١٢٣١ز)یش، بەردەوام هەر خەریكی نووسینی مێژوو بووە.

---

(١) الكامل ١٢/ ٥٠٤.

سەرەڕای ئەوەش (ابن الأثیر) - بەبێ چەند و چۆنی - گرنگترین سەرچاوەی پشتپێبەستراوی ئەم لێكۆڵینەوەیە. (ابن الاثیر) لە كتێبەكەی خۆیدا (التأریخ الباهر) باسی سەروسەختی (العلاقات) نێوان (زین الدین علی كچك) دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی هەولێر و (عماد الدین زنگی)ی دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی موسڵی كردووە و، دەڵێت كە (زین الدین) خولامێكی باوكی ئەو ئەتابەگە بووە واتا خولامی (آقسنقر قسیم الدولة) بووە كە لە ساڵی (٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز)دا كوژراوە. كاتێكیش ئەو ئەتابەگە لە ساڵی (٥٢١ك/ ١١٢٧ز) دا ئەتابەگییەكەی موسڵی دامەزراند (زین الدین علی كچك) هاوكاریی كرد، ئەتابەگیش لە پاداشتی ئەوەدا هەندێ ناوچەی بۆ دابڕی، هەولێریش ناوچەیەك بوو لەو ناوچانە. سەروسەختی (زین الدین علی كچك) لەگەڵ كوڕانی (عمادالدین زنگی) چ لە ئەتابەگییەكەی موسڵ و چ لە ئەتابەگییەكەی حەڵەب كە بە كوڕانی ئەتابەگی دامەزرێنەر لەساڵی (٥٤١ك/ ١١٤٦ز)دا لە موسڵ جیابووەوە، سەرومڕ بەردەوام بوو. لەسەردەمی (قطب الدین مودود)ی ئەتابەگی موسڵ (٥٤٤ - ٥٦٥ك/ ١١٤٩ - ١١٧٠ز)دا، ئەم پێوەندی و سەروسەختەی گەیشتە ئەوپەڕی دۆستایەتی و، زیاتر لە جارێكیش، لەشەڕدا فەرماندەیی لەشكری ئەم ئەتابەگییەی گرتووەتە دەست و پاش حەفتا و پێنج ساڵیش خزمەت، ئنجا بنەماڵەی زەنگیی موسڵی بەجێهێشتووە، لە هەولێر جێگیر بووە، تا لەساڵی (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز)دا هەر لەم شارەدا كۆچی دوایی كردووە و بەخاك سپێردراوە.

وەلێ دەربارەی حوكم و چالاكیی هەردوو كوڕەكەی دامەزرێنەی ئەتابەگایەتیی هەولێر، ئەوەی (ابن الاثیر) لە (التأریخ الباهر)دا باسیان لێوە دەكات كەمترە لەوەی كە لە كتێبە ئاودامانەكەی (الكامل في التأریخ)دا باسی كردووە. ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە كتێبی یەكەمیانی بۆ شاباش و پێداهەڵدانی حوكمی بنەماڵەی زەنگی تەرخان كردووە. بەلام لەساڵی (٦٠٧ك/ ١٢١٠ز)دا كە (الملك القاهر عزالدین سعود - عزالدین الثاني) لەسەر تەختی موسڵ دانیشت، كە لە ئەسڵا كتێبەكەی بۆ خەڵاتی ئەم

دانابوو، ئیدی نووسینەکەی وەستاند. کەموکورتیی ئەم کتێبەش ئەوەیە کە مێژووی هەندێ لە ڕووداوەکانی، لەگەڵ کتێبەکەی پێشتری (الکامل) دا جیاوازە.

گەلێك لە مێژوونووسانی هاوزەمەنی (ابن الأثیر) و، ئەوانەی پاشتریش لە (ابن الأثیر)ەوە دەگێڕنەوە، بەتایبەتیش لە (الکامل) وەریانگرتووە، لەوانەش (أبو شامة - ت ٦٦٥ك/ ١٢٦٦ز) لە کتێبی (الروضتین في أخبار الدولتین) و کتێبی (تراجم رجال القرنین السادس والسابع) کە بە (الذیل علی الروضتین) ناودارە، هەروەها (ابن واصل - ت ٦٩٧ك/ ١٢٩٧ز) لە کتێبی (مفرج الکروب في اخبار بني أیوب)[1] و، (ابن العبری - ت ٦٨٥ك/ ١٢٨٦ز) لە کتێبی (تأریخ مختصر الدول) و (تأریخ الدول السریاني)دا، دەشبینین، هەندێ باسوخواس هەیە، تەنیا ئەو مێژوو نووسەی دوایین دەیانگێڕێتەوە. پێش ئەمیش کەسانی دیکەی، بە نموونە، وەك (محمد علي الحموي - ت ٦٤٤ك/ ١٢٤٦ز) لە کتێبی (التأریخ المنصوري)دا کە خۆیشی هەر لەو ماوەیەدا ژیاوە هەروەها (سبط ابن الجوزي) (ت ٦٥٤ك/ ١٢٥٦ز) لە کتێبی (مرآة الزمان)دا کە (الیونیني - ت ٧٢٦ك/ ١٣٢٥ز) کتێبی (ذیل مرآة الزمان)ی وەك پاشکۆ بۆ داناوە - بە بۆچوونی ئێمە، لەوانەی پێش خۆی، باشتر مێژووی نووسیوە.

هەندێ مێژوونووسی - کەم و زۆر - پاش ئەوانیش، باسی ئەمارەتەکە و، باسی ئەو ماوەیەشیان کردووە کە مێژوونووسانی ئەو سەردەمە ناویان نەهێناوە، پێدەچێ لە مێژوونووسانێکەوە، کە کتێبەکانیان بزرە، وەریانگرتبێ، بە نموونە، وەك (الذهبي

---

(١) ئەم کتێبە، تا ئێستا چوار بەرگی لێ چاپ کراوە، دوا بەرگیشی لە ساڵی ١٩٧٢ چاپکراوە، کە باسوخواسی ساڵانی نێوان (٦١٥ ـ ٦٢٨ك)ی تێدایە. لەم بەرگەدا زێتر لە بەرگەکانی تر دەبینین کە (ابن واصل) زۆربەی باسوخواسەکانی لە (ابن الأثیر) وەرگرتووە. ئەمەش ساغکەرەوەی کتێبەکەی ناچار کرد کە (محمد حسنین ربیع)ە، لە باسوخواسی ساڵی (٦٢٨ك)دا بووەستێ، چونکە لەو ساڵەدا (ابن الأثیر) لە پێشەکیی بەرگی چوارەم دەبێتەوە - سەیری لاپەڕەی (٦) بکە. ساغکەرەوەی کتێبەکە دەڵێت: کە پشتی بە کتێبی (الکامل) بەستووە، هەر هەمان ئەو کتێبەیە کە (ابن واصل) سوودی لێ وەرگرتووە.

- ت ٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز) لە کتێبگەلێکی زۆردا، لەوانەش (تأريخ الاسلام) و کتێبی (العبر)، هەروەها (ابن كثير - ت ٧٧٤ك/ ١٣٧٢ز) لە کتێبی (البداية والنهاية)دا کەسانی زۆری دیکەش لەوانیان وەرگرتووە، بەنموونە، وەك (الغساني - ت ٨٠٣ك/ ١٤٠٠ز) لە کتێبی (العسجد المسبوك)دا، هەروەها (ابن الفرات - ت ٨٠٧ك/ ١٤٠٥ز) لە کتێبی (تأريخ الدول والملوك)دا کە بە (تأريخ ابن الفرات) ناسراوە. هەروەها (المقريزي - ت ٨٤٥ك/ ١٤٤١ز) لە کتێبی (السلوك لمعرفة دول الملوك)، (ابن تغري بردي - ت ٨٧٤ك/ ١٤٦٩ز) لە کتێبی (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة)دا، (ابن خلدون - ت ٨٠٨ك/ ١٤٠٦ز) هەروەکو ئەوانی کردووە، بەڵام ئەوەی کتێبە گەورەکەی لەکەدار کردووە ئەوەیە کە بەرواری هەندێ لە ڕووداوە گرنگەکانی نەنووسیوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ماندوو کردنی لێکۆڵەر. ئەو لە نووسینی باسوخواسەکاندا سیستەمی یەکپارچەیی بابەتەگەی پێڕۆ کردووە بەبێ ئەوەی بەرواریان لەسەر دابنێ، واتا بە پێچەوانەی مێژوونووسەکانی دی کە سیستەمی ساڵبەساڵیان پێڕۆ کردووە. زیاد لەوەش، ئەم مێژوونووسە، ڕووداوەکان پتر لە جارێك دوبارە دەکاتەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێین (أبو الفداء - ت ٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) هەموو ئەو شتانەی کورت کردووەتەوە کە (ابن الأثير) لە (الكامل)دا نووسیونی، پاشان باسی ڕووداوی ساڵانی دوای (٦٢٨ك)یشی بۆ زیاد کردووە، چونکە (ابن الأثير) ئیدی لەو ساڵەدا لە نووسین وەستا و، کتێبەکەشی ناونا (المختصر في اخبار البشر). (ابن الوردي - ت ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز) کتێبێکی بەناوی (ذيل المختصر) یان (تأريخ ابن الوردي) وەك پاشکۆ لەسەر کتێبەکەی (أبو الفداء) دانا.

هەرچی ئەو مێژوو نووسانەشن کە باسی چالاکییەکانی دامەزرێنەری ئەمارەتی هەولێر (زين الدين علي كچك) یان، لە موسڵدا کردووە، ناوی (ابن القلانسي - ت ٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) دێنن کە لە کتێبی (ذيل تأريخ دمشق)دا ئەو باسەی کردووە و (ابن الجوزي - ت ٥٩٧ك/ ١٢٠٠ز) لە کتێبی (المنتظم في اخبار الملوك والامم)دا دیسان، ئەو باسەی کردووە. دەربارەی ڕۆڵگێڕانی (زين الدين يوسف ينالتگين) و موزەففەرەددین

گۆگبوریش لەشەڕی موسڵ و شەڕەکانی خاچدروشماندا، پشتمان بە (العماد الكاتب الاصفهاني - ت ٥٩٧ك/ ١٢٠٠ز) بەستووە کە لە کتێبی (الفتح القسی)دا ئەو باسەی کردووە. هەروەها (ابن شداد - ت ٦٣٢ك/ ١١٣٤ز) لە کتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية)دا کە ناونراوە (سيرة صلاح الدين) ئەو باسانەی کردووە. هەربەو جۆرەش (علي البنداري - ت ٦٤٢ك/ ١٢٤٤ز) کورت کردنەوەی کتێبەکانی (العماد الكاتب)ی کردبوو بە پیشە، بەنموونە، کتێبی (البرق الشامي)ی کورتکردەوە و، ناوی نا (سنا البرق الشامی). (ابن العديم)یش (ت ٦٦٠ك/ ١٢٦٢ز)، تەنیا، کەسە، کە هەندێ باسوخواسی چالاکییەکانی موزەففەرەددین گۆگبوریی، لە شامدا، کردبێ.

وەك لە کتێبەکەیدا (زبدة الحلب في تأريخ حلب) دەردەکەوێت. هەرچی کتێبی (الحواث الجامعة)یە کە بە هەڵە دراوەتە پاڵ (ابن الفوطي)، ئەوە، تەنیا کتێبە بەدوور و درێژی باسی بۆ بەغدا سەردانە بەناوبانگەکەی ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣١ز)ی موزەففەرەددین گۆگبوری کردبێ و، هەر بەو جۆرەش باسی داگیرکردنی هەولێر و گرێدانی هەولێری بە مەملەکەتی خەلیفەوە (لەساڵی ٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز)دا کردبێ.

کاتێکیش باسی ناودارانی خودی هەولێر، یان باسی ئەو زاتانە دەکەین کە سەردانی هەولێریان کردووە و، ماوەیەك بۆ خوێندن یان بۆ وانە گوتنەوە لەم شارەدا ماونەتەوە، ئەوە، پێویستە ناوی کتێبگەلی ڕەوشتنامە و کتێبگەلی چینەکانیش بکەین کە بۆ ئەم بابەتە گرنگ و پڕ بایەخن. لەم ڕووەوە، ڕەنگە، (ابن خلكان - ت ٦٨١ك/ ١٢٨٢ز) پێشەنگی ئەو مێژوونووسانە بێت، نەك لەبەر ئەوەی کە بەناوبانگترین نووسەر و مێژوونووسی ڕەوشتنامەکان بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە خۆی خەڵکی هەولێر بووە و، ماوەیەکی تاقی لاوێتیشی لەم شارەدا بەسەر بردووە. (ابن خلكان) لە هەولێر، لە ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆی دەزانی و تێیاندەگەیشت و، هەمووی لەبیر مابوون و لە کتێبەکەی خۆی (وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان)دا تۆماری کردن، لەم کتێبەدا باسی پێوەندیی بنەماڵەکەی خۆی لەگەڵ سەرداری هەولێر موزەففەرەددین گۆگبوریدا کردووە و، باسێکی دوور و درێژ و زۆر

گرنگیشی لەسەر ڕەوشتی سەرداری هەولێر و لەسەر ڕەوشتی ناودارانی زانستیی پەیوەست بە مێژووی سیاسیی و ئیداری و ڕۆشنبیریی شارەکەوە کردووە. نووسەرگەلێکی زۆری ڕەوشتنامە و چینەکان لە (ابن خلكان)ەوە باس و خواسیان گێڕاوەتەوە. بە نموونە (الذهبي)، ئنجا (الامام الفارسي المكي - ت ٨٣٢ك/ ١٤٢٨ز) لە کتێبی (العقد الثمين في تأريخ البلد الأمين)دا زۆری وەرگرتووە. هەروەها (ابن أبي عذيبة - ت ٨٥٦ك/ ١٤٥٣ز) لە کتێبە دەستنووسەکەی خۆیدا (انسان العيون في مشاهير سادس القرون) زۆری لە (ابن خلكان) وەرگرتووە و، بگرە، مێژوونووس نییە لەوی وەرنەگرتبێ - نەخاسمە نووسەرانی ڕەوشتنامە و چینەکان.

(الصفدي)یش (ت ٧٦٤ك/ ١٣٦٢ز) خاوەنی کتێبی (الوافي بالوفيات) یەکێکە لە ڕەوشتنامەنووسەکان، ئنجا، (الكتبى - ت ٧٦٤ك/ ١٣٦٢ز)، ئنجا (اليونيني - ت ٧٢٦ك/ ١٣٢٦ز) نیمچە درێژمیەکی بەباسی ڕەوشتنامەی کەسانێکی زۆری هەولێری داوە. هەروەها (ابن الفوطي - ت ٧٢٣ك/ ١٣٢٣ز) خاوەنی کتێبی (تلخيص مجمع الآداب في معجم الألقاب)، ئنجا (السبكى - ت ٧٧١ك/ ١٣٧٠ز) خاوەنی کتێبی (طبقات الشافعية)، ئنجا (الأسنوي - ت ٧٧٢ك/ ١٣٧١ز)، (ابن قاضي شهبة - ٨٥١ك/ ١٤٤٧ز) کە هەریەکە و، کتێبێکیان بەو ناوەوە داناوە. لەو نووسەرانەش کە بەر لە (ابن خلكان) ڕەوشتنامەیان نووسیوە و، سوودمان لە کتێبەکانیان وەرگرتووە، ئەمانەن (ابن عساكر - ت ٥٦٣ك/ ١١٦٨ز) خاوەنی کتێبی (تهذيب تأريخ ابن عساكر)ە، (ياقوت الحموي - ت ٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) دانەری کتێبی (معجم الأدباء)ە و، (أرشاد الأريب الى معرفة الأديب)یشی پێدەڵێن. هەروەها (ابن الدبيني - ت ٦٣٧ك/ ١٢٤٠ز) خاوەنی کتێبی دەستنووسی (التأريخ المذيل به على تأريخ ابن السمعاني)، ئنجا (المنذري - ت ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) خاوەنی کتێبی (التكملة لوفيات النقلة)، ئنجا (الصابوني - ت ٦٨٠ك/ ١٢٨١ز) دانەری کتێبی (تكملة إكمال الاكمال) و نووسەرانی چینەکان و ڕەوشتنامەگەلی دیکەش.

کتێبە دەستنووسەکەی (ابن الشعار - ت ٦٥٤ك/ ١٢٥٦ز) بەناوی (عقود الجمان في شعراء هذا الزمان) بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە بایەخێکی تایبەتی هەیە، چونکە ئەم نووسەرە قوتابییەکی (ابن المستوفي) بووە و، لەهەولێردا ماوەیەکی دوور و درێژ ژیاوە و، سەروسەختی لەگەڵ گەلێ لە ناودارانی شارەکەدا هەبووە و، باسوخواسیانی نووسیوە و، کتێبەکەی خۆی و کتێبەکەی (ابن المستوفي)یش گرنگترین سەرچاوەی (ابن خلكان) بوون و، زیاد لەوەش، ئەم کتێبەی، بۆ ناسینی ئەوانەی کە وەزیفەی گەورەیان لە دەوڵەتی موزەففەرەددین گۆگبوریدا وەدەست هێنابوو، بەتەنیا سەرچاوەی گرنگ دادەنرێت. بێجگە لە (ابن الشعار و، ابن خلكان) کەسانی دیکەش هەن، وەك ئەوان، زۆریان لە (ابن مستوفي) وەرگرتووە.

لەوانەش کە بۆ بابەتی رێکخراوەکان، سوودمان لە کتێبەکانیان بینیوە، ئاماژە بەمانە دەکەین: (قدامة بن جعفر - ت ٣٢٠ك/ ٩٣٢ز) دانەری (كتاب الخراج وصنعة الكتابة)، هەروەها (الماوردي - ت ٤٥٠ك/ ١٠٥٨ز) دانەری کتێبی (الاحكام السلطانية)، (ابن مماتي - ت ٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز) خاوەنی کتێبی (قوانين الدواوين)، (النويري - ت ٧٣٣ك/ ١٣٣٢ز) خاوەنی کتێبی (نهاية الأرب في فنون الأدب)، (القلقشندي - ت٨٢١ك/ ١٤١٨ز) خاوەنی کتێبی (صبح الأعشى في صناعة الأنشا).. لەنووسەرانی وێژە و ئەدەبیش (أبا الفتح نصرالله محمد بن أبي الكرم الشيباني) ناسراو بە (ابن الأثير المنشئ - ت ٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) خاوەنی کتێبی (رسائل ابن الأثير). هەروەها (ابن سعيد الأندلسي - ت ٦٨٥ك/ ١٢٨٦ز) خاوەنی کتێبی (الغصون اليانعة في محاسن شعراء المائة السابعة).

هەروەهاش دیوانەکەی (الحاجري). زیاد لەمانەش، کتێبەکەی (ياقوت الحموي) و کتێبەکەی (ابن الشعار)یش. کە باسمان کردن.

لەوڵاتناسانیش (البلدانيين) کە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە، سوودمان لە کتێبەکانیان بینیوە، ئەمانەن: (ياقوت الحموي) کە لە کتێبی (معجم البلدان) دا باسی شاری

هەولێری کردووە و، دوو جار سەری لەم شارە داوە. لەم کتێبەیدا، باسی بازاڕ و قەیسەرییە بەناوبانگەکە و ئاوی سازگاری بیرەکانی دەکات و، باسی دانیشتوانی کوردی ئەم شارە دەکات، کە بە قسەی ئەو گوایا بوونەتە عەرەب. هەروەها (زکریا بن محمد بن محمود القزويني - ت ٦٨٢ك/ ١٢٨٣ز) دانەری کتێبی (آثار البلاد واخبار العباد) کە تێیدا باسی مزگەوتی (الکف) دەکات. (أبو الفداء - ت ٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) دانەری کتێبی (تقويم البلدان)، (صفي الدين عبدالمؤمن بن عبدالحق - ت ٧٣٩ك/ ١٣٣٨ز) دانەری کتێبی (مراصد الاطلاع).

سوودم لە هەندێ کتێبی فارسیش بینیوە، بەتایبەتیش بۆ نووسینی بابەتی پێوەندییەکانی نێوان موزەففەرەددین گۆکبوری و دوا سوڵتانی خواریزمیان (جلال الدين منكبرتی) و هێرشەکەی مەگۆل، بە نموونە، وەك کتێبی (جيهانگشای) کە (الجوينی - ت ٦٨٣ك/ ١٢٨٦ز) دایناوە، هەروەها کتێبی (جامع التواريخ)ی (رشيد الدين فضل الله الهمداني - ت ٧١٨ك/ ١٣١٨ز). لەکتێبە فارسییەکانی دیکەش، کتێبی (نزهة القلوب)ی (حمدالله المستوفی القزوينی - ت ٧٥٠ك/ ١٣٤٩ز) و، کتێبەکەی تریشی بەناوی (تأريخ گزيدة)و، هەندێ کتێبی دیکەی فارسی و تورکی و ئینگلیزی. پشتم بە کتێبی (سيرة السلطان جلال الدين منكبرتی) لە نووسینی (علی محمد احمد النسوی)یش (ت ٦٣٩ك/ ١٢٤١ز) بەستووە.

لەکۆتاییدا پێویستە ئەوەش بڵێین، لە منارەکە و، هەندێ گۆڕ و نزرگە بەولاوە، لەو ماوەیەدا، هیچ ناسەوارێکی مێژوویینی هەولێرمان بەدی نەکرد، ئەمەش بێگومان ئەستەنگی لە سازدانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دروست کرد و، گەلێکیشی ماندوو کردین، بەتایبەتیش بابەتی پلانەکانی شارەکە و، نەبوونی بەڵگەنامە، کە ئەگەر فەراهەم بوونایە زۆربەی مەسەلە مێژووییەکانی بەتەواوەتی ساغ دەکردەوە.

# دەروازەی یەکەم
# (مێژووی سیاسی)

## بەشی یەکەم
## ئەمارەتی ( میرنشینی ) هەولێری سەردەمی ئەتابەگی –
## لە دامەزراندنییەوە
## تا کۆچی دوایی – زین الدین یوسف ( ینالتگین )
## لە ساڵی ( ٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)

### فەسلی یەکەم

**یەك** : لاوازبوونی دەوڵەتی سەلجووقی و پەیدابوونی ئەمارەتە ئەتابەگییەکان. مانای ئەتابەگ. ئەسڵ و رەسەنی ئەتابەگەکان.

**دوو** : پیرەشاری هەولێر و، سەرلەنوێ سەرهەڵدانەوەی، لەسەدەی پێنجەمی کۆچی (سەدەی یازدەمینی زایین)دا.

**سێ**: لە سەردەمی ئەتابەگیدا داگیرکردنی هەولێر و بەستنی بە ئەمارەتی موسڵەوە.

**چوار**: ئەتابەگ - زین الدین علی کچك - دامەزرێنەری ئەمارەتی ئەتابەگایەتیی هەولێر.

# فەسلی یەکەم

## یەك: أ- لاوازبوونی دەوڵەتی سەلجووقی و، پەیدابوونی ئەمارەتە ئەتابەگییەکان:

خەلافەتی عەبباسیان، بەچەند سەدەیەك بەر لەوەی بە دەستی مەگۆلەکان بڕووخێت، هەر لە سەدەی دووەمیەوە، بەرە بەرە لاوازی سەری تێ کردبوو، بەهەموو جومگەکانیدا تەشەنەی دەکرد. سەردارانی ناوچەکانیش بەسەر ئەم هەلەوە نەچوون و، دەستیان بەسەر ناوچەگەلێکی بەرفراوانی خاکی خەلافەتدا گرت، ئەنجام، هەڵوەشانی یەکێتیی جیهانی ئیسلامی لێ کەوتەوە و، حوکمی بنەماڵەکان سەری هەڵدا، ئەوەبوو، هەر هەرێمە و، بگرە هەندێ لە شارەکانیش، هەریەکە و کەوتە ژێر حوکمی بنەماڵەیەك و، نیمچە پێوەندییەکی شڕۆڵیان لەگەڵ مەرکەز (بەغدا)دا مایەوە.

لەسەدەی شەشەمینی کۆچیدا (واتا لە سەدەی دوازدەمینی زاییندا) ـ کە ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیگرێتەوە ـ دەسەڵاتی ڕاستەقینە کەوتە دەست سەلجووقیان و، ئەوانیش لەماوەی هەرەتی هێزیاندا دیاردەی ئەو هەڵوەشاوەیی و پچڕپچڕەیان نەهێشت و، کۆنترۆڵیان کرد و، تا ڕادەیەکی زۆریش لە یەکخستنەوەی هەرێمە بەرینەکانی وڵاتانی ئیسلامدا سەرکەوتن[1]. هەرچەندیشە سیستەمی لا مەرکەزییان

---

(١) البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ص ٦٥.

ابن الاثير، الكامل في التأريخ، ١٠/ ٢١١.

عبدالنعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق، ص ٦٧ و ٨١.

د. احمد ابراهيم الشريف، العالم الاسلامي في العصر العباسي، ق (٢) ص ٥٧٠.

لەم هەرێمانەدا پێڕۆ کرد، کە بریتی بوو لە ڕەنگدانەوەی سیستەمی دابڕینی زەویوزا[١] کە سەلجووقیان سەرگەرمی سەپاندنی بوون.

دەشتوانین ئەم بەرەولامەرکەزیچوونە، لە هەرەتی بەهێزیی سەلجووقیاندا، بەنیشانەی بەهێزبوونی حوکمیان لە قەڵەم بدەین[٢]، نەخاسمە ئەم سیستەمە مۆرکی سەربازی و ئیداریی پێوە دیاربوو[٣]. وەلێ هەر هەندەی چەند سوڵتانێکی بێدەسەلات هاتنە سەر تەخت کە نەیانتوانی ڕەوشی دەوڵەت بەرەوپێش ببەن (ئەم سیستەمەشیان) لێ بوو بە تەوق و چووە ملیانەوە. هەندێ کەسیش، گەندەڵی و لاوازی و هەرەسهێنانی حوکمی سەلجووقی دەخەنە ئۆباڵی ئەو سیستەمە[٤].

---

(١) پێویستە زاراوەی (دابڕینی زەوی) کە لە مێژووی ئیسلامدا، سیستەمی دەرەبەگایەتیی پێدەڵێن، (نەخاسمە ئەم سیستەمە سەلجووقییەش) نەختێ بە وردی و بەدووربینییەوە لێکبدەینەوە، چونکە پاساوی پەیدابوونی ئەم سیستەمە لە جیهانی ئیسلامدا جیاوازە لەوەی کە لە سەدەکانی ناوین، لە ئەوروپادا پەیدابووە، هەروەها پێوەندییە ئاڵۆزەکانی ئەو دەرەبەگایەتییەی لە ئەوروپادا، بەتایبەتیش لە (ئەوروپای ڕۆژئاوا)دا پەیدابووە و، هاوشێوەی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامنشیندا نییە. مەبەست لە دەرەبەگایەتیی سەلجووقی ئەو سیستەمەیە کە سوڵتان (ملکشاه) لەسەر خواستی (نظام الملك)ی وەزیری دایناو (بەپێی ئەو سیستەمە زەویی بەسەر میرەکاندا دابەش کرد بەو حسابەی کە ئەمە دەسهات و داهاتە. سوبرنهیم. (دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣ المترجمة، مادة (اقطاع)، ٢/ ٤٧٨. والدكتور ابراهيم علي طرخان في (النظم الاقطاعية في الشرق الاوسط في العصور الوسطى) ص ٢١ ـ ٣٢. سەیری ئەمەش بکە کە (کلود کاهین) لەم کتێبەیدا نووسیویەتی:-

The Encyel. Of Islam (New Edition ١٩٧١) V. ١١١, p. ١٠٨٨ (art Ikta).

(٢) عبدالنعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق: ١٥٧. علي بيومي، قيام الدولة الايوبية في مصر، ص ٢٨.

(٣) د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية والوظائف، ٣/ ١١٣٨.

(٤) حسن خليفة، الدولة العباسية، قيامها و سقوطها، ص ٢٣٠.

Lane – poole, Saladin, p. ٢١.

علي بيومي، قيام الدولة الايوبية، ٢٩.

عبدالنعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق: ١٥٧.

سەرەنجامیش، بووە هۆی پەیدابوونی حكومەتگەلی ناوچەكان و، بە ئەتابەگییەكان دەناسران[1]، كە زۆربەی زەویەكانیان لە موڵكی دەوڵەت دامالی، تەنیا بەشەكەی ڕۆمی نەبێت لە ئاسیای بچووك كە تا درەنگانێك بەدەست سەلجووقیەكانەوە مایەوە و ناویان لێنرا (سەلجووقییە ڕۆمەكان) [2].

لێكدانەوەی هۆی ئەم لاوازبوونەش ئەوەیە، ئەم جۆرە سیستەمە سەردەكەوت ئەگەر هاتبا و پیاوێكی بەهێزی وەك سوڵتان (ملكشاه/ ت ٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز) سەرۆكایەتیی دەوڵەتەكەی كردبا، كە ترسی لە دڵی خەڵكەكەدا چاندبوو و، جڵەوی كاروباری دەوڵەتەكەشی توند لە دەستی خۆ گرتبوو، هەر خۆیشی سەرپەرشتیی سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی دەوڵەتەكەی دەكرد و، وەزیرێكی زیت و زیرەكی وەك (نظام الملك) [3]یش یارمەتیی دەدا.

ئەم وەزیرە. هەر خۆی، سیستەمی دەرەبەگایەتیی لە دەوڵەتی سەلجووقیدا داهێنا. ئەوەتا، (عماد الكاتب) دەڵێت بەر لەوە دەرەبەگایەتی لە ئارادا نەبووە. كاتێكیش (نظام الملك) بۆی دەركەوت كە زۆر زەحمەتە پارەی پێویست و دەغلودان بۆ دەوڵەت خڕبكاتەوە. هەستا زەویی بەسەر دۆست و دەستداكانیدا (الاجناد) دابڕ دابڕ (اقطاعات ـ دەرەبەگی) كرد بۆ ئەوەی ئاوەدانی بكەنەوە و تۆوی بكەن و بیچێنن و لەجیاتی مووچەی میری بەروبووم و داهاتی بۆ خۆیان بێت[4].

---

(١) پاش كەمێكی دی، مانای زاراوەی (ئەتابەگ)یش شرۆڤە دەكەین.

(٢) احمد مختار العبادي، قيام دولة المماليك الاولى في مصر والشام، ص: ٧٧.

(٣) (نظام الملك) (حسن كوڕی علی كوڕی إسحق كوڕی العباس الطوسي)یەو، وەزیری بەناوبانگی سەلجووقییە و، سەرداری (مدرسە نیزامییەكانی) بەغدا و جێگایانی تریشە. بەدەستی فیدایییەكانی تایەفەی ئیسماعیلییە كوژرا (٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز) الراوندي، راحة الصدور، ص ٢٠٩.
الكامل ١٠/ ٢٠٤.
البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ص: ٥٩.
ابن خلكان ١/ ٣٩٥ ـ ٣٩٨. ط/ القاهرة.

(٤) البنداري: تأريخ دولة آل سلجوق، ص: ٥٥.

دەشتوانین پەیدابوونی ئەم ئەمارەتە ناوچەییانە[١] "ئەتابەگییانە" بە درێژەی ئەو دۆخە پچڕ پچڕە سیاسییە لە قەڵەم بدەین کە بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامنشیندا تێپەڕی و، سەلجووقییەکان توانییان تا ماوەیەك کۆنترۆڵی بکەن ـ بەڵام هەندەی نەبرد، هەر زوو پچڕ پچڕییەکە بەهۆی سیستەمە (ئابووری و سەربازی و ئیداری)یەکەیانەوە کە نەیتوانی یەکێتییە زیندووکراوەکەیان بپارێزێت، سەری هەڵدایەوە.

## ب- مانای ئەتابەگ :

ئەتابەگ لەبزێکی (وشەیەکی) تورکییە، لەدوو وشە پێکهاتووە: "ئەتا"، یان "ئەطا" بەمانای باوك دێت و، "بەگ" مانای (میر)ە[٢] یان خانەدانە یان گەورەیە یان شێخە (سەرۆکە). پێدەچێت وشەی "بەگ" لە "بیوگ"ی تورکییەوە سووابێت کە ئەکا (گەورە) یان (باپیرە).

گوتراویشە، وشەی "ئەتابەگ" مانای (بابە میرە)یە، مەبەستیش (باوکی میرەکانە) [٣]. بەڵام وشەکە، بەمانا و مەبەستی ئەوان (پەروەرشتکاری میر) [٤]ی

---

(١) ئەم ئەتابەگییانەش ئەمانەن:

١. ئەتابەگایەتیی موسڵ.
٢. ئەتابەگایەتیی حەڵەب.
٣. ئەتابەگایەتیی هەولێر.
٤. ئەتابەگایەتیی سنجار.
٥. ئەتابەگایەتیی دیمەشق.
٦. ئەتابەگایەتیی جزیرە.
٧. ئەتابەگایەتیی دیاربەکر
٨. ئەتابەگایەتیی ئازەربێجان.
٩. ئەتابەگایەتیی لۆرستان.
١٠. ئەتابەگایەتیی کرمان.
١١. ئەتابەگایەتیی ئەرمینیا.
١٢. ئەتابەگایەتیی فارس.

(٢) المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ق١، ص ١٤٦، الهامش.

(٣) القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشاء، ص: ٤/ ١٨. ابن الأثير، الكامل ١٠/ ٨٠.

(٤) د. حسن الباشا، الالقاب الاسلامية: ١٢٣. احمد عطية الله، القاموس الاسلامي ١/ ١٨.

سەلجووقییە، یان (لەلەیە - لالایە) كە منداڵەكانی مەلیك دەلاوێنێ[1]. كەسانێكیش، دەڵێن "ئەتابەگ" نازناوێكە لەلای فارسەكان هەبووە نەك لەلای توركان، فارسەكان ئەم نازناوەیان بە سەرداره فارسەكانی خۆیان لە ئاسیای بچووك، دەبەخشی، كە پاشان لەلای توركان واتای (الصدر الاعظم) [2]ی دەگەیاند.

سوڵتان گەلی سەلجووقی ئەم نازناوەیان بەو میرانە دەبەخشی كە پەروەرشتی كوڕگەلی نابالغی سوڵتانەكانیان پێ دەسپێردرا، جا، لەپاداشتی ئەم ئەركە و، ئەو ئەركەی كاتی جەنگیش، كە دەگەیشتنە بەرەكانی شەڕ و ڕیزی لەشكر[3]، دەرەبەگایەتیشیان پێدەدان.

دیارە، مانای (ئەتابەگ) هەندێ گۆڕینی بەسەردا هاتووە، تا، بوو بە نازناوێك لە كەسێك دەنرا خزمەتی گەورەی خۆی كردبێ. كاتێكیش (نظام الملك) توانیی بەسەر هەڵپەی میری سەلجووقی قاورت (قاورد)دا كە تەماعی لە مەملەكەتی (ملكشاە)ی برازای كردبوو سەربكەوێ و بیگرێ و بیكوژێ (ساڵی ٤٦٥ك/ ١٠٧٢ز)، (ملكشاه) نازناوی (ئەتابەگ)ی پێبەخشی كە، بۆ ئەو دەمە بەرزترین نازناو بوو[4].

زیاتریش، پێدەچێ كە ئەو نازناوە لە نەریتە كۆنەكانی توركەوە مابێتەوە، بەڵام بەكارهێنان و دەساو دەسكردنی وەك نازناوێكی شانازی، ئەوە، وەك ـ حسن الباشا دەڵێت ـ دواتر هاتە گۆڕێ، دوای ئەوەی كە توركەكان لەجیهانی ئیسلامدا، بوون

(١)ابن خلكان، وفيات الاعيان، طبعة بيروت ١/ ٣٦٥.

(٢)رشيد عطية، معجم عطية، ص: ١٩٣.

(٣). حسن الباشا، الفنون الاسلامية والوظائف على الآثار العربية، ج١، ص: ٤٠.

Lane – Poole, the Muhamad, p. ١٥٩.

احمد مختار العبادي، قيام دولة المماليك، ص: ٧٧.

(٤) الكامل ١٠/ ٨٠.

القلقشندي، صبح الاعشى، ٤/ ١٨.

بەهێزێکی سیاسی[١]. لەبەر ئەوە، دەبینین ئەم نازناوە، پێش سەردەمی سەلجووقی دەماودەم نەگوازراوەتەوە و بەکارنەهاتووە[٢].

## ج- ئەسڵ و ڕەسەنی ئەتابەگەکان:

ئەمانە میرانی تەلاری سەلجووقییەکانن، لەژێر سایەی سوڵتانەکاندا ژیاون و پێگەیشتوون، بەڕەسەنیش لەو تورکانەن کە لە ناوەندی ئاسیا و وڵاتی قەبجاقەوە هێنرابوون[٣]. هەرزوو، بەخێرایی بەناوچەیەکی بەرینی خاکی موسوڵماناندا تەشەنەیان کرد و بڵاو بوونەوە بەتایبەتیش لەماوەی هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا. ئەو میرانە لە تەلاری سوڵتانەکانی[٤]سەلجووقیدا پلە و پایەی بەرز بەرزیان کەوتە دەست و، خزمەتی چاکی گەورە و سەروەری خۆیان کرد و، خۆیان لە پێناویاندا بەخت دەکرد، لەبەر ئەوەش کە جێگای باوەڕ و متمانەی

---

(١) د. حسن الباشا، الالقاب الاسلامية، ص ١٢٢.

د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية، ١/ ٥.

(٢) كلود كاهين، مادة أتابك، دائرة المعارف الاسلامية، (المترجمة)، ط ١٩٦٩ مجلد ٢، ص ٤٥.

Lane -- Poole, Saladin, p. ١٥.

Lane – Poole, the Muham Dyna, p. ١٥٩

(٣) قەبجاق ڕەگەزێکە لە تورك، لە بیابانەکانی (دەشتەکانی) باکووردا دەژین، ئەمانە بە جەشنی بەدوی سارانشین کۆچەر و کۆڵ بەکۆڵ بوون، القلقشندی، صبح الاعشى، ٤/ ٤٥٦.. (شمس الدین سامی) دەڵێ: قەبجاق تیرەیەکە لە تورك، لەناوچەی چیاکانی ئۆراڵ، لەدەوروبەری ڕووباری. فوڵگا دەژیان، (قاموس الاعلام)، ج٥، ص ٣٥٩٩، وەڵێ (فازیلی بارتوڵد) دەڵێت: قەبجاق نەتەوەیەکی سارانشینن (البدو)، ئاگاییان لە ئیسلام نییە و نەیانزانیوە ئیسلام ئایینە، وێڕای ئەوەش دوژمنی شارستانێتی ئیسلام نەبوون.. بنۆڕە، کتێبەکەی (تاریخ الترك في آسيا الصغرى)، ص ١١٢. لە لاپەڕەی (١١٥)یشدا دەڵێت: قەبجاق یەکێتی سیاسییان نەبوود و. دەوڵەتیان بۆ خۆیان دانەمەزراند و، لەوەش نەبوونە کە بە هەموویان یەك سەردارییان هەبێت، پاشان (بارتولد) دێتە سەر باسی جموجووڵی سەربازیی ماوەی سەدەی شەشەمی کۆچی (سەدەی دوازدەمی زایین). کە ئەم تیرەیە نواندوویانە

Lane - Poole, Saladin, p. ١٥

(٤) حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام السياسي، ٤/ ٦٠.

سـولّتانەکان بـوون، ئـەرکی لەلـەیی و پـەروەردە کردنـی کـوڕانی سـولّتانەکانیان پێسپێردرا، هەر لەبەر ئەوەشە کە نازناوی ئەتابەگ (باوە گەورە)یان پێبەخشراوە.

ئەسپاردنی ئـەو جۆرە ئەرکە بـەم کۆیلـە (ممالیـك) ئەتابەگانـە، بـوو بـە دابـو دەستووری تەلاری سەلجووقی، پاشان وەهای لێهات ئەتابەگ لـە مـیر (کوڕی سولّتان) جیا نەدەبووەوە و لە هەڵسوکەوت و هاتوچوونیدا هەمیشە لەگەڵیدا بوو. ئەگەریش سولّتان کـوڕێکی خـۆی بکردایـە بـە سـەرداری شـارێ لـە شـارەکان، ئـەوا ئەتابـەگ لەخزمەتیدا دەچوو بەسیفەتی ئەوەی کە هەم پەروەرشتکارە، هەم باوکە و هـەم ڕابەرێتی - بۆ ئەوەی لە هەڵسووڕاندنی حوکمدا یاریدەی بدات، بەو سیفەتەی کە خـاوەن ئـاوەز و ئەزموونـە و، بـۆ ئـەوەش کـە ئامۆژگـاریی بکـات، بەتایبـەتیش ئامۆژگاریکردنی نابالّغەکانیان[1].

بـەڵام، بـارودۆخ، بـەوەوە نەوەسـتاو بـەو شـێوەیە نەچووە سـەر، ئەتابـەگ هـەر هەنـدەی زانیبـا کـە سـولّتانەکان توانـستی حوکمکردنیـان نـەماوە، ئیـدی خـۆی دەسەپاند و ڕۆڵی سەرەکیی حوکمی دەوڵەتەکەی دەگرتە دەست و بە ئارەزووی خۆی گەمـەی بـە چارەنووسیان دەکرد. نـەك هـەر ئـەوە، بگرە ئەتابـەگی وەهایـان تێدا دەرکـەوت، تاکـە تاکـەی نـاو بنەماڵـە سـەلجووقییەکانی لـە یـەکتر گـاڵ دەدا و دووبەرەکیی دەخستە ناویان و دڵیانی لێك پیس دەکرد[2]و، - کـاریش وەهـا بـڕوات - ئەنجام، ئەتابەگەکان جێگای سەروەرەکانی خۆیان گرتەوە[3].

---

(١) کلۆد کاهین، مادة أتابك، دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٦٩، ٢/ ٤٦.
د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية والوظائف، ١/ ٤ ـ ٥.
Lane-Poole, Saladin, P. ١٥.
حسن ابراهيم حسن، تأريخ الاسلام السياسي ٤/ ٦١.
(٢) د. حسن الباشا، م، ن، ١٠/ ٦.
عبدالنعيم حسنين، سلاجقة ايران والعراق، ١٣٦.
(٣) کلود کاهين: م. ن، ص: ٤٧
علي بيومي: قيام الدولة الايوبية. ص: ٣٠.
احمد مختار العبادي، قيام دولة المماليك، ص: ٧٧.

سەرهەڵدانی ئەو ئەتابەگانە، لەسەر شانۆی ڕووداوەکان، لەسەرەتاوە ڕوون و ئاشکرا نەبوو، بەڵام بە مردنی سوڵتان (مسعود) لە ساڵی (٥٤٧ك/ ١١٥٢ز)دا کە ئیدی ئەستێرەی سەلجووقییەکان بەرەو ئاوابوون دەچوو، ئەوجا ئەتابەگەکان دەستیانکرد بەگێڕانی ڕۆڵی گەورە و ترسناك و، بەمردنی سوڵتان (مسعود)یش بەختیاری لە بنەماڵەی سەلجووقییاندا نەما، ئیدی بڕاو بڕ ئالایەکی ئەوتۆیان نەشەکایەوە[1]. ئەوجا، خۆیان ئاشکرا کرد و، بوون بەخاوەنی فەرمان و سوڵتان، بەڵکو پلەو پایەکانی خۆشیان بەمیرات بۆ کوڕەکانیان بە جێدەهێشت[2]. بەوەشەوە نەوەستان، بگرە، وەك ڕێوڕەسمی سەردارانی سەلجووقی و سەردارانی دیکەش نازناو گەلیشیان[3]بۆخۆیان دائەتاشی.

ئنجا، دەبێ ئاماژە بەوەش بدەین، ئەو میرانەی حوکمی ئەتابەگییەکانیان دەکرد، مەرج نییە هەموویان ئەتابەگ (واتا پەروەرشتکاری کوڕانی) سوڵتانەکانی سەلجووقی بووبن، بەڵکو ئەم جۆرە ئەتابەگانەش لە هەمان ئەو ماوەیەدا سەریان هەڵدا کە ئەتابەگە ڕاستەقینەکان حوکمی ئەمارەت و دەرەبەگایەتییەکانی سەلجووقییان دەکرد، لەبەر ئەوە، ئەوانیش ئەم نازناوەیان بەرکەوت، واتا

---

Lane - Poole, The Muham, Dynasty, P. ١٥٩.

(١) ابن الأثير، الكامل، ١١/ ١٦٠.

ابو الفداء، المختصر في اخبار البشر، ٤/ ٢٩.

ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٥/ ٣٠٣.

(٢) لمقريزي، الخطط، طبع مطبعة بولاق بمصر ١٢٩٤، ٢/ ٢١٦.

م. سوبر نهيم M. Ssubernheim "مقال الاقطاع" في دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، ٢/ ٤٧٨.

علي بيومي، قيام الدولة الايوبية، ص ٣٠ ـ ٣١.

حسن ابراهيم حسن، تأريخ الاسلام السياسي، ٤/ ٦١.

نظير حسن سعداوي، التأريخ الحربي المصري في عهد صلاح الدين، ص ٤.

كلود كاهين، مادة "اتابك" دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٦٩، مجلد ٢/ ٤٧.

(٣) ابو يعلى حمزة ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٨٤.

ناولێنانیان بە ئەتابەگ و، ناونانی ئەمارەتەکانیشیان بە ئەتابەگایەتی، تەنیا و تەنیا، بۆ راییکردن بوو و، هیچی تر.

## دوو: پێرەشاری هەولێر و، سەرلەنوێ سەرهەڵدانەوەی، لە سەدەی پێنجەمی کۆچی / (سەدەی یازدەمی زاییندا).

هەولێر[1]، وەك گرنگترین شارێك لە ناوچەی نێوان زێی گەورە و زێی بچووك، لە هەرێمی باکووری بەغدا و، لەنێوان هەرێمی شینایی (السواد) و هەرێمی چیاکاندا، لەدوا چاخی حوکمی عەبباسییەکاندا، واتا لە سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا سەری هەڵدایەوە و، شاری موسڵ نەبێ، ولاتی جزیرە کەوتە ژێر ئالایەوە و، وەهای لێهات، بوو بە مەرکەزی ولاتی شارەزوور[2]- ئەم شارە، کە رابوردوویەکی زۆر کۆنی هەیە، لەماوەی تەشەنە کردن و هاتنی ئیسلامدا، تا چەند سەدەیەکیش، ببووە شارۆچکەیەکی بچووك و بێ ناو و کەم بایەخ، بەڵکو بشبوو بە (طسوجێك لە طسوجەکان)[3] واتا ناحیەیەك لە ناحیەکان، کە بە درێژایی چەندین سەدەیش، زەینی شارانگەڕان و مێژوونووسە ئیسلامەکانی بەلای خۆیدا رانەکێشابوو و، بەتەواویش پشتگوێ خرابوو، بەڵام ناوە کۆنەکەی ئەربیل، هەر

(١) بەڵام شارانگەڕانی ئیسلام ناویان نابوو: (أربل).

(٢) أبو الفداء، تقويم البلدان، ص: ٤١٣.

القلقشندي، صبح الاعشى، ٤/ ٣٦٦.

شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، ٢/ ٨٢١.

(٣) طسوج = ناحية، انظر ابن خرداذبة، المسالك والممالك، ص: ٦.

وابن رستة، الاعلاق النفيسة، ص: ١٠٧.

مایەوە[1] هەرچەندیشە بە کاریگەریی زۆرینەی نەتەوەکانی کە لەناو شارەکە و لەدەوروبەری شارەکەشدا دەژین، ناوە کۆنەکەی کەمێ گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە.

---

(١) وشەی ئەربیل، هەر هەمان ئەو (أربائیلۆ)، یان (اربیلۆ)یەیە کە لە نەخش و نیگارە دێرینەکانی بابلی و ئاشووریدا بەخەتی مسماری نووسراوە.

کەسانێکی پێوەندیداریش دەڵێن: مانای شاری (اربعة آلهة)یە چونکە لەو سەردەمەدا جێگای پەرستشی (أربعة آلهة) واتا (چوار خواوەندەکە) بووە. نەخش و نیگارە فارسییە دێرینەکانیش، کە، ئەویش، هەر بە خەتی مسماری نووسراوە، بە (ئەربیرا) ناوی دەبات... بنۆڕە (M. Streck)/ دائرة المعارف الاسلامية ط/ ١٩٣٣، مادة أربيل ١/ ٥٧٠.. عبدالرزاق الحسني في مجلة (لغة العرب) في مقال "لواء اربيل"، جـ ٨، ص ٦٠٩، ونفس المؤلف في (العراق قديماً وحديثاً) ص ٢٣٦.. عبدالرزاق الهلالي، معجم العراق ١/ ٦٧.

بەڵام دانیشتوانی شارەکە (هۆلێر ـ هەولێر)ی پێدەڵێن، نەك (هاولێر)ی وەك ئەوەی (عبدالرزاق الهلالي) کە لە (معجم العراق)دا نووسیویەتی. ئەوەش گوتراوە: کە ئەم ناوە لە (اربائیلو) داتاشراوە دوای ئەوەی بەم قۆناغانەی خوارەوەدا تێپەڕ بووە: (أربائیلو ـ اربیلا ـ اربیل ـ اروێل ـ هۆروێل ـ هەولێر).

بنۆڕە: (عبدالرزاق الحسنی)، العراق قدیماً وحدیثا، ٢٣٦.

جێمس بکنگهام، رحلتي الى العراق، ١/ ١١٩.

بشیر فرنسیس و گۆرگیس عواد في مقال (اصول اسماء الامکنة العراقیة)، مجلة سومر، مجلد ٨ لسنة ١٩٥٢، ص: ٢٥٠.

طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الى موطن الآثار، الرحلة الخامسة، ص ٦.

وەڵێ (فؤاد جمیل) دەڵێ: کەسانێك وەهای بۆ دەچن کە (هولیر) دەچێتەوە سەر وشەی (خۆر)، چونکە (هیلیو ـ Helio) ئەکا (ڕەنگی ئاری)، ئەمەش لەسەر زمانی ئاسایی خەڵکەکەی، بەرە بەرە گۆڕاوە و بووە بە (هولێر) و (خورلێر) و، ئنجا بووەتە (هەولێر) بەو پێوەندگەش، ئەم ناوە، ئەکا (شاری خۆر و پەرستشی خۆر)..

بنۆڕە گوتارەکەی (حدیاب.. اربیلا.. عشتار.. اربیلا) گۆڤاری (سومر) بەرگی ٢٥، ساڵی ١٩٦٩، پەراوێزی لاپەڕەی ٢٢٠. ئەوە، ڕای پرۆفیسۆری ئەڵمانی (خدنك)ە، حسین حزنی موکریانی پشتی پێ بەستووە. بنۆڕە کتێبی (اربیل في اربعة أعوام)، تألیف جماعة من شباب اربیل، طبع المؤسسة العامة للصحافة والطباعة، دار الجمهوریة، بغداد، ص: ٨.←

گرنگی (أربیل) لە چاخە دێرینەکاندا ئەو کاتە ئاشکرابوو، کە، بوو بە بارەگای (آلهە)ی (عەشتار)ی ئاشووری. (أربیلو) لەم پێگەیەوە وەك "دلفس Delphes" شارە پیرۆزەکەی یۆنان[1]وایە، بگرە، لەبەر چاکی و نایابیی جێگەکەی، لە دلفسیش بەناوبانگتر بووە، چونکە کەوتبووە سەر جەمسەرە ڕێگاکانی کاروانەکان، لەبەر ئەوە ـ بەپێچەوانەی شارە ناودارەکانی دیکەی ئاشوور ـ چ شارەکە و چ ناوەکەی، بەدرێژایی سەدەکان بە نەمری مایەوە. ناوی شارەکانی ئاشوور، بەرە بەرە، نەمان[2]و لەبیر چوونەوە، بەڵام ناوی (أربیل) کەوتە سەر زمانی بازرگانان و کاروانچییان و بڵاو بووەوە. ئەم شارە، بەدرێژایی زیاتر لە (٣) سێ هەزارساڵ[3]خۆی ڕاگرت و، ئەوەش، کە ناوی ئەربیلی لەو چاخە کۆنانەدا زەق و زۆپ هێشتەوە، شەڕە گەورە و

---

←سەیرەکەش لەوەدایە، کەسانێك هەوڵیان داوە و ویستوویانە ناوی شارەکە بکەن بە (ناوێکی کۆنی تورکی)، لەم بارەیەوە (شاکر عمر) نووسیویەتی کە ئەم ناوە لەدوو وشەی تورکی پێکهاتووە: (ار) واتا: (سەرباز، پیاو، گەورە، مێرد، ئەفەندی).... (بیل) واتا: (بزانە)... ئەم نووسینەی (شاکر عمر) تەنانەت کوێرە بەڵگەیەکی لاوازیشی لەپشتەوە نییە: بنۆڕە ڕۆژنامەی (الأهالي)، ژمارە/ ٧٧، ساڵی ١٩٥٩... بەڵام "دکتۆر کمال مظهر احمد" لەهەمان ڕۆژنامەدا، لە ژمارەکانی (٧٩، ٨٠، ٨١، ٨٢، ٨٣، ٨٥، ٨٨)دا بەرپەرچی ئەو گوتارەی داوەتەوە، هەر بەو چەشنەش (جمیل بندی رۆژبەیانی) لە ژمارەی (٨٦)ی هەمان ڕۆژنامەدا ڕەددی داوەتەوە. ئەوەش کە لە هەولێردا بەتورکمانی قسان دەکات، دەڵێن (ئێربل) یان (ئێرول). هیچ کەسێکیش لە خەڵکی شاری هەولێر، لەقسە و نووسینی عەرەبیدا نەبێ، لەبزی (اربیل)یان لێ نابیەیت.

(١) دلفی (دلفس): جێگەیەکە لە وڵاتی یۆنان، لەوەوە ناوبانگی پەیدا کردووە کە (کاهینەکانی) لەوێدا ڕێ و ڕەسمی خۆیان سازدەدا و، پەرستشگایەکی گەورەیان لێ دروست کردبوو. بنۆڕە: (الموسوعة العربیة المیسرة)، ص ٨٠٠.

(٢) کي لسترانج، بلدان الخلافة الشرقیة، ص ١٢٠. هەروەها: عبدالرزاق الحسني، العراق قدیماً وحدیثاً، ص ٢٣٦، وانظر له ایضاً في مجلة (لغة العرب)، جـ٨، ص ٦٠٩ مقالة تحت عنوان لواء اربیل، (٦٠٢ ـ ٦٠٩).

(٣) (دوروثي مکي) لەکتێبی (مدن العراق القدیمة)ی خۆیدا دەڵێت: ئەربیل تەنیا شاری ئاشوورییە کە هەتا ئێستا بە ئاوەدانی ماوەتەوە و، هەر بەو ناوە کۆنەشەوە ناسراوە: بنۆڕە: مجلة "لغة العرب" مجلد ٩ لسنة ١٩٣١، ص ٦٦٤... هەروەها: مجلة سومر، مجلد ٢٥ لسنة ١٩٦٩ بعنوان "حدیاب... أربیلا ـ وعشتار أربیلا" لفؤاد جمیل، ص ٢٢٠.

یەکلاکەرەوەکەی نێوان (ئەسکەندەری گەورە و دارای شای فارس) بوو کە ساڵی (٣٣١ پ. ز) لەنزیك ئەو شارەوە قەوما، ئەو شەڕە لە مێژووی دێریندا، بە (شەڕی ئەربیلا) [١]بەناوبانگە و، ئەو شەڕە بوو کە (ئەسکەندەر) شاری بابل پایتەختی یەکەم ئیمپراتۆرییەتی ناوچەکەی تێدا داگیر کرد[٢]، کە ئەربیل لەو ڕۆژانەشدا هێشتا شارێکی بەناوبانگی ناوچەکە بوو. هەرچی هەرێمی دەوروبەری شارەکەیە، ئەوە، جار جارە پێی دەگوترا "ئەربیلیتس ـ Arbelitis" و، جاروباریش پێی دەگوترا "الزابین" واتا نێوان هەردوو زێ، چونکە دەکەوێتە بەینی هەردوو زێ[٣]، هەروەها ناوی "ادیابین ـ Adiabene"[٤] یش لێ نرابوو، واتا (حدیاب) چونکە خەڵکی پێشتری وڵاتی شام پێیان دەگوت (حدیاب) لەبەر ئەوەی (ئەربیل) مەرکەزی (پایتەختی) مەملەکەتی (حدیاب)ی ئارامییەکان بووە و، تا، ماوەیەکیش دەسەڵاتی

---

(١) د. طلیمات) بەهەڵەداچووە کە دەڵێت ئەم شارە، لەو ڕۆژەوە ئەم ناوەی لێنراوە کە شەڕەکەی (أربیلای ساڵی ٣٣١ پ. ز) قەوما، بنۆڕە کتێبەکەی (مظفر الدین کوکبوری امیر أربل) ص ١٨٩، کە بە تێنەگەیشتنەوە پشتی بە (دائرة المعارف الاسلامیة)، مادە أربیل، ط ١٩٣٣ و، بەم ئینسۆکلۆپیدایەش بەستووە:

Encycl. Of Britannica (Irbil), v. ١٢, p. ٥٣٨.

(٢) بۆ زانینی چەند و چۆنیی ئەم شەڕە، بنۆڕە:

- الجنرال برسي سایکس، تأریخ ایران، ج١، ص ٢٤٢- ٢٥٣.

- مقال فؤاد جمیل، (اریان – Arrian) یدون ایام الاسکندر الکبیر في العراق في مجلة سومر، مجلد ٢١ لسنة ١٩٦٥، ص ٢٦٩ وما بعدها حیث یتکلم عن هذه المعرکة، بنۆڕە: گوتاری هەمان نووسەر: حدیاب.. أربیلا.. وعشتار – أربیلا، سومر، مجلد ٢٥ لسنة ١٩٦٩.

Encycl. Brit. ١٢, ٥٣٨.

بنۆڕە: حنا خبار، المعارك الفاصلة في التأریخ، ص ٢٩ – ٣٦.

(٣) کي لسترانج، بلدان الخلافة الشرقیة، ص ١٣٠.

(٤) بنۆڕە: (م. سترك، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة أربیل، ط ١٩٣٣. ١/ ٥٧١.

لەڕۆژاواوە گەیشتبووە فورات و، بەرەو باکووریش، گەیشتبووە (نصیبین) [١].

لەدوا نیوەی سەدەی دووەمی پێش لەدایکبوونی مەسیح، لە هەرێمەکەدا مەمڵەکەتێکی بچووك دامەزرا توانیی تا ماوەیەکی درێژ، سەربەخۆیی خۆی بەرامبەر بە هەڵپە و تەماعی لایەنەکان، نەخاسمە دژ بە مرخی (تەماعی) دەوڵەتی فارسی ساسانی بپارێزێت. یەکێك لە مەلیکەکانی بەناوی "قردح" ناوبانگی پەیدا کرد و، قەڵایەکی قایمکاری لەنزیك ئەربیل کرد بە بارەگای خۆی و، لەو قەڵایەدا، خۆی لەشای ساسان (سابووری دووەم/ ل ٣٧٩ز) کە مەسیحییەکانی دەکوشت، یاخی کرد، چونکە (قردغ) مەسیحی بوو.. پاشان مەلیکی ساسانی توانیی مەملەکەتی ئەربیل سەروبن بکات[٢]و، ئەربیلیش بکات بە بەشێك لە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی.

بەڵام لە مێژووی ئیسلامدا، لەهەرسێ سەدەکەی بەرەومیدا، هیچ بایەخێکی ئەم شارە بەرچاو نەکەوت و، مێژوو نووسانی ئیسلامیش لەباسی داگیرکردنی شارەکانی وڵاتی جزیرە و شارەکانی ناو چیاکاندا، ناویان نەهێناوە - (البلاذري) کە زۆربەی قسەکانی (الواقدی) دەجاوێتەوە و، باسی داگیرکردنی شاری شارەزوور و شارەکانی نزیك بەشارەزوور دەکات و، دەڵێت فەرماندار (عتبة بن فرقد السلمي) ئەو شارانەی

---

(١) حدیاب، یان (حدیب) ناوێکی ئارامییە، بەڵام لە سەرچاوە کلاسیکییەکاندا بە "ادیابین" هاتووە، ڕەنگە "زابین" کۆکردنەوەی ئەم ناوە بێت، چونکە ئارامییەکان (زاب) بەشێوەی (ذب) ئەدرکێنن، جا بەو پێودانگە، مەبەست لە (حدیاب) یان (ادیابین) هەرێمی دوو زێیەکەیە (الزابین). هەرێمی (حدیاب) لە رووی جوغرافیاوە، کەمێکی ماوە کە بەشێکی زۆر گەورەی وڵاتی ئاشووری کۆن بگرێتەوە، تا، وای لێهات، جاروبار، لەجیاتی (ئاشوور) دەگوترا (ئاشوریا) واتا وڵاتی ئاشوور- (طه باقر وفؤاد سفر)، المرشد الى مواطن الآثار والحضارة، الرحلة الخامسة، ط/ بغداد ١٩٦٦، ص ٤.

دەشبینین کاتێك (المقدسی البشاری) باسی هەرێمی جزیرە دەکات، بە هەرێمی (ئاقور) ناوی دەبات- بنوارە کتێبەکەی بەناوی "احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم"، ص ١٣٦.

(٢) م. سترك: دائرة المعارف الاسلامیة، مادة اربیل ١/ ٥٧٧.

داگیر کردووە، چونکە فەرماندار (عزرە بن قیس) [١] نەیتوانی ئەو ئەرکە بەجێ بهێنێت، کەچی لەو هەموو باسوخواسەدا، ناوی ئەربیلی نەهێناوە.. - ئەم مێژوونووسە - هەروەها دەڵێت: موسڵیش هەرهەمان فەرماندار داگیری کرد. پێدەچێ ناونەهێنانی داگیرکردنی ئەربیل لەبەر ئەوە بووبێ کە ببو و بە شارێکی کەسنەناس و کەم بایەخ.

بەڵام ناوی شاری ئەربیل، لەدوا دوای سەدەی سێیەمی کۆچی و بەرایی سەدەی چوارەمدا (نۆیەم و دەیەمی لەدایکبوون) کەوتەوە سەر زمانان. (ابن خرداذبة) لەباسی دابەشکردنی (بەشەکانی) عێراقدا بە (طسوجیك = ناحیەیەك) لە طسوجەکانی هەرێمی (السواد = شینایی) (دل ایرانشهر = واتا دڵی عیراق)، ناوی دەبات. (قدامة ابن جعفر)یش [٢] هەر بە (طسوج)ی دادەنێت. ئەمەش، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەربیل، لەو دەمەدا شارێکی بچووك بووە. دەشبینین، هەندێ لە جوغرافی زانان وێڕای ئەوەش کە هاوزەمەنی (ابن خرداذبة) و (قدامة ابن جعفر) بوون و، ئەوانەش کە پاش ئەوان هاتنە ئاراوە، ناوی ئەربیلیان نەهێناوە... (الاصطخري [٣]) و، (ابن حوقل النصيبي [٤]) و، (البكري [٥]) و، (المقدسي [٦]) هەموویان

---

(١) ابو القاسم بن عبدالله الخراساني في المسالك والممالك، ص ٦.

(٢) ابو الفرج قدامة بن جعفر الكاتب البغدادي في الخراج وصنعة الكتابة، ص ٢٣٥.

(٣)ابو اسحاق ابراهيم محمد الفارسي الكرخي الاصطخري في (مسالك الممالك).

(٤) ابو القاسم محمد بن حوقل النصيبي، ابن حوقل (ت ٣٦٧هـ) في (صورة الارض).

(ئەم شارانگەڕە باسی (أرض حزة) دەکات و بە (رستاق)ێك لە (ڕستاقەکانی) موسڵی دادەنێت. هەروەها باسی (كفرعزي)یشی کردووە کە سەر بە ئەربیل بووە، بەڵام ناوی خودی ئەربیلی نەهێناوە - لاپەڕەی ١٩٦ - (رساتق = کۆی ڕستاق)، یان (رزداق) مەبەست لە شینایی و گوندەکانە، بنۆڕە:

(ادي شير)، معجم الالفاظ الفارسية المعربة، ص: ٧١.

(٥) في كتابه (معجم ما استعجم من اسماء البلاد والمواضع).

(٦) المقدسي في (احسن التقاسيم في معرفة الأقاليم)، ص ١٣٦.

پشتگوێیان خستووە، لە کاتێکدا (المقدسي) کە دەکەوێتە باسی (آقور)، ناوی شارە نزیکەکانی ئەربیل دێنێت، هەروەهاش (ابن رستة) ناوی شارەکانی هەرێمی (ایرانشهر)ی هێناوە، تەنیا ئەربیل نەبێت[١]. هەرچەندیشە ئەم شارە کەوتووەتە ناوەندی ئەم هەرێمە. هەروەها (الیعقوبي)یش ناوی نەهێناوە[٢]. ئەم پشتگوێخستنە، تووشی ناودارترین مێژوونووسانی سەدەی سێیەم و بەرایی سەدەی چوارەمی کۆچی بووە، بەنموونە، وەك (الیعقوبي[٣]) و (الطبري[٤]و (المسعودي[٥]) کە بابەتی مێژوویی گشتیان نووسیوە.

پاشان ئەربیل، بەرە بەرە کەوتە بەرچاو، تا، بوو بە مەرکەزی ئەمارەتی (الهذبانیة = هەزەبانییەکان)، حوکمی ئەم ئەمارەتەش، هەتا، دوای ساڵی (٥٢٠ك/ ١١٢٦ز) درێژەی کێشا و، دوا میری ئەم ئەمارەتە (أبو الهیجاء) لە ململانێی نێوان خەلیفە (المسترشد بالله) و سوڵتانی سەلجووقی (محمود بن محمد بن ملکشاه) دا، ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا، ئەوە بوو لە ساڵی (٥٢٠ ـ ٥٢١ك/ ١١٢٦ز)دا[٦]، بەخۆی و سەربازەکانیەوە چووە ڕیزی هێزەکانی ئەم سوڵتانە، هەروەها هەڵکەوتنی چەند زانایەکی خەڵکی هەولێر، وەك (أبو أحمد القاسم محمد بن المظفر علي الشهرزوري الشیباني الاربلي)[٧] کە لەساڵی (٤٨٩ك/ ١٠٩٦ز)[٨] دا لە موسڵ کۆچی دوایی کردووە و، باپیرەی شارەزوورییەکانی پێشتر بووە کە لە موسڵ و جزیرە و شام قەزاوەتیان کردووە و لە بابەتی فەرموودەکان و فیقهدا کۆششیان کردووە، ئەمانە هەمووی لەو

(١) الاعلاق النفیسە، ص ١٠٥ ـ ١٠٦.

(٢) في (کتاب البلدان).

(٣) في (تأریخ الیعقوبي).

(٤) في کتابه: (تأریخ الامم والملوك).

(٥) المسعودي في کتابیه (مروج الذهب) و (التنبیه والاشراف).

(٦) الکامل، ١٠/ ٦٣٨.

(٧) السمعاني، الانساب، ١/ ١٥٢.

(٨) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ط القاهرة ٣/ ٢٣٢.

ماوەیەدا ناوی هەولێریان وەبەرچاو خستووە. كوڕەزای ئەو (القاسم)ەش؛ (كمال الدین محمد) و، كوڕی كمال الدینیش (محي الدین بن كمال الدین)[1] كە هەر لەو بنەماڵەیەن، ئەوانیش هەڵكەوتن و ناوبانگیان بۆ هەولێر پەیدا كرد. (أبو أحمد) ماوەیەك قەزاوەتی لە هەولێر گرتە دەست، پاشان چوو بۆ سنجار[2]. لەو ماوەیەدا كە لە هەولێر بوو، لە ساڵی (٤٥٣ك/ ١٠٦٠ز) [3]، (أبو بكر)ی كوڕی لەدایك بوو. (أبو بكر محمد) ناسراو بە (قاضي الخافقین) [4]لە ساڵی (٥٣٨ك/ ١١٤٣ز) لە بەغدا كۆچی دوایی كرد[5].

هەروەها، كوڕەكەی تریشی (أبو منصور المظفر) هەر لەم شارە، لەساڵی (٤٥٧ك/ ١٠٦٥ز) [6]دا لە دایك بووە و، لەساڵی (٥٣٦ك/ ١١٤١ز) [7]دا مردووە. بێجگە لەوانە كەسانی دیكەش هەبوون كە بە خەڵكی ئەربیل دانراون، لە ماوەی پێش دامەزراندنی ئەتابەگایەتی سەربەخۆی هەولێردا هەڵكەوتبوون و ناویان دەركردبوو. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە ئەو شارە داویە لە فراوانی و بەر لە سەردەمی ئەتابەگایەتیش پێگە و جێگەی خۆی لەڕیزی شارەكانی ناوچەكەدا كردووەتەوە.

---

(١) م. ن. ص.

(٢) م. ن. ص.

(٣) ن. م. ٣/ ٢٣٣.

(٤) بەنازناوی (قاضي الخافقين) ناسراوە، چونكە لە وڵاتگەلێكی زۆردا قەزاوەتی كردووە... (ابن خلكان)؛ ن. ص.

الأسنوي، طبقات الشافعية، ٢/ ٩٩.

(٥) ابن الجوزي، المنتظم، ١٠/ ١١٢.

ابن الصلاح الشهرزوري، مخطوط (طبقات الشافعية) في مكتبة الدراسات العليا ـ كلية الآداب ـ جامعة بغداد، تحت رقم (١٢٨٩) ورقة (٣١أ)، الصفدي، الوافي بالوفيات، ط٢ لسنة ١٣٨١هـ/ ١٩٦١م باعتناء هلمون ريتر ٤/ ٣٣٩.

السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، طبعة الحسينية، ٤/ ٩٥ ـ ٩٦.

(٦) وفيات الأعيان ٣/ ٢٣٣.

(٧) السبكي، طبقات الشافعية، ط (الطناحي والحلو) ٧/ ٣٠١.

## سێ: لە سەردەمی ئەتابەگیدا داگیرکردنی هەولێر و بەستنی بە ئەمارەتی موسلەوە (٥٢٢ك - ١١٢٨ز) یان (٥٢٦ك - ١١٣١ز)

لە ماوەیەکدا، بەر لەوەی هەولێر بخرێتە سەر ئەمارەتە ئەتابەگیەکەی موسڵ، ئێڵی هەزەبانی[1] حوکمی هەولێریان دەکرد. سەرۆکەکانی ئەم ئێڵە کوردەش - نەخاسمە هەردوو کوڕەکەی (موسی الهذباني): عیسی و سالار[2]- لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا (سەدەی یازدەمینی زایینیدا) لەسەر سەروەرایەتیی ئەم شارە، لە ململانێدا بوون، بەڵام باسوخواسی حوکمڕانیی ئەم بنەماڵەیە بە ئاڵۆزی و پچڕ پچڕ گەیشتووەتە دەستمان[3]. باسوخواسی میر (أبو الهیجاء بن موسك)ی کوردی هەزەبانی سەرداری هەولێر[4]، لەساڵی (٥٠٠ك/ ١١٠٦ز)ەوە دەست پێدەکات، کە

---

(١) الهذبانیة: ئێڵێکی گەورەی کوردە: ابن خلکان، وفیات الاعیان، ط القاهرة، ٦/ ١٣٩. ئەم ئێڵە سەردەمێك حوکمی هەولێریان کردووە، ئەییوبییەکان لەم ئێڵەن و، هۆزی (بني أیوب الروادیة)ش، بەرەبابێك بووە لەم ئێڵە.

بنواڕە: ابن واصل، مفرج الکروب ١/ ٣.

المقریزي: السلوك، جـ ١ ق١، ص ٤٢.

(الخطط)، ٢/ ٢٣٣.

(٢) بنۆڕە: الکامل ٩/ ٥٣٩ (حوادث سنة ٤٣٧هـ)، دەبینین ئەم مێژوونووسە، ناوی ئەو دوو میرە (هذباني)یەی وەها: (أبا الحسن، وابا علي، ابنا موسك) نووسیوە واتا: کوڕانی (موسك) نەك (موسی).. بنۆڕە: الکامل ٩/ ٥٤٩، (حوادث سنة ٤٤٠هـ)... کوڕی دووەم، واتا: (أبو علي) تا، دوای ساڵی (٤٥٠)ی کۆچییش حوکمی هەولێری کردووە. بەڵام (ابن خلدون) دەڵێت: (ابنا موشك) واتا هەردوو کوڕەکەی (موشك).. ابن خلدون، کتاب العبر، ق١، مجلد ٤/ ٥٦٣.

(٣) بنۆڕە: الکامل: کە (ابن الأثیر) لەم کتێبەدا ڕووداوەکانی ساڵانی ٤٣٧، ٤٤٠، ٥٠٠، ٥٠٢، ٥١٢... تا، ساڵی (٥٢٠ك) کە پێوەندییان بە ڕووداوە سەربازییەکانی ئەم ئەمارەتەوە هەیە، هەمووی باس کردووە.

(٤) م. ن: ١٠/ ٤٢٣.

پێدەچێ دوا فەرمانڕانی هەزەبانی هەولێر بووبێت، بەر لەوەی (عماد الدین زنگی) داگیری بکات و بیخاتە سەر ئەتابەگییەکەی موسڵ.

وادیارە ئەم ئەمارەتە نەکاراوە (نەیتوانیوە) پشت بە تەنیا هێزی خۆی ببەستێ لەماوەی ململانێی سەختی ناوچەکە، نەخاسمە ململانێی نێوان خەلیفەکانی عەبباسی و سوڵتانەکانی سەلجووقی. میری (الهذباني)ی هەولێر ناچار بوو، دەبوو بچێتە پاڵ یەك لەو دوو هێزە و سەری سەلامەت بێت. لەبەر ئەوە دەبینین، لەشەڕە گەورەکەی نێوان خەلیفە (المسترشد بالله) (٥١٢ - ٥٢٩ك/ ١١١٨ - ١١٣٤ز) ونێوان سوڵتان مەحمودی سەلجووقی (٥١١ _ ٥٢٥ك/ ١١١٧ _ ١١٣٠ز) کە لە ساڵی (٥٢٠ك/ ١١٢٦ز)دا لە بەغدا ڕووی دا، سەرداری هەولێر (أبو الهيجاء الكوردي) کەوتەڕێ و، خۆی وەها پێشان دا کە گوایا شان بە شانی خەلیفە شەڕ دەکات. بەڵام خۆی و سەربازەکانی چوونە پاڵ سوڵتانی سەلجووقی و دژ بە خەلیفە وەستان[١]. بەوەش ئەمارەتی هەولێری هەزەبانی بوو بە دەسدا (تابع)ی سەلجووقیەکان. (ابن خلكان)یش ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە، بە وەرگرتن لە (ابن المستوفي مێژوونووسی هەولێر کە گوتوویەتی: الطغرائي السيد فخر الكتاب ابا اسماعيل الحسين بن علي بن محمد ابن عبدالصمد الملقب بمؤيدالدين الاصفهاني المنشئ السلجوقي الشهير) بۆ ماوەیەك لە هەولێر وەزارەتی وەرگرتووە[٢]. بەڵام ئەمە، مانای وایە، کە هەولێر بەر لە بەرواری ناوبراوی (٥٢٠ك/ ١١٢٦ز) چووەتە ژێر ئاڵای سەلجووقییەکانەوە، چونکە (الطغرائي)ی ناوبراو لە دەوروبەری ساڵی (٥١٥ك/ ١١٢١ز) دا کوژرا[٣]. ئەمە لە لایەك،

---

(١) ابن الأثير، الكامل، ١٠/ ٦٣٨. الباهر، ص ٣٠.

(٢) ابن خلكان، ١/ ٤٤١، ط ١٩٤٨، وكراس (ترجمان المتقدمين من الشعراء)، ص ٤٤. E. A. Strandman, ١٨٦٦ ئەم نامیلکەیە دراوەتە پاڵ (ابن خلكان) بنۆڕە لاپەڕەی (١٠) لەو نامیلکەیە. کەچی دەبینین باسی کەسانێکی تێدایە کە دوای (ابن خلكان) مردوون. بنۆڕە: لاپەڕەی (٤١، ٤٢)ی نامیلکەکە.

(٣) باسی ساڵی کوژرانەکەی لە جێگایەکی تر دەکەین.

لە لایەکی ترەوە، (ابن واصل) [١]دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە ساڵی (٥٢٦ك/ ١١٣١ز)دا، ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی) هەولێری داگیر کرد، بەڵام ئێمە نازانین لەو کاتەدا، کێ، لە بریکاری سوڵتانی سەلجووقی (مسعود) حوکمی هەولێری دەکرد؟ پێدەچێ مەبەست لەو بریکارە (أبو الهیجاء) بووبێت، یان ئەم میرە، بەر لەو داگیرکردنە، مردووە، کە ئێمە بەرواری مردنەکەی نازانین، سا، بە هەرحاڵ، هەولێر، کاتی ئەو داگیرکردنەی بە دەستی سەلجووقییەکانەوە بووە.

وا دیارە، ئێلێکی دیکەی کورد، بۆ وەرگرتنی حوکمی هەولێر[٢]، لەگەڵ (الهذبانیة)کاندا کەوتبنە کێبڕکێ، ئەوەش ئێلی (الحکمیة)یە، دووریش نییە هۆزێك بێت لە هۆزەکانی هەزەبانی[٣].

ئەوەش کە مێژوو نووسان دەربارەی کات و ساتی داگیرکردنی ئەم شارە دەیڵێن، کە (عیماد الدین زەنگی) داگیری کردبێ و خستبێتیە سەر ئەتابەگایەتیی موسڵ، دیسان وەکو یەك باسی مێژووی ئەو داگیرکردنە ناکەن؛ (أبو شامة) دەڵێ: لە ساڵی ٥٢٢ك/ ١١٢٨ز داگیری کردووە[٤]، (الدواداری) [٥]یش دەڵێ: بەڵێ لەو ساڵدا داگیری کردووە کە ڕەنگە لە (أبو شامة)وە وەری گرتبێ. (ابن قاضي شهبة) [٦]یش هەروەها

---

(١) مفرج الکروب ١/ ٩٧.

(٢) (م. سترك) لە (دائرة المعارف الاسلامیة) ط ١٩٢٣، مادة أربیل (١/ ٥٧٤)دا دەڵێت: زۆرجاران سەرۆکانی ئەم دوو ئێڵە – هەزەبانی و حکمیة – لەسەر ئەم شارە لە دوژمنایەتی و ململانێدا بوون)

(٣) سەرۆکانی ئەم دوو ئێڵەی سەردارانی ئەربیل، بە (ابو الهیجاء) ناوەبران.

(٤) کتاب الروضتین ١/ ٣٠

(٥) کنز الدرر، ص ٥٠٢.

(٦) الکواکب الدریة، ص ٩٣.

دەڵێت، کەچی (ابن العبري) دەڵێت هەولێر لەساڵی (١١٢٦ز) [١] ڕێکەوتی (٥٢٠ك) داگیر کراوە.

وا دیارە لەم کتێبەیدا بە هەڵە داچووە، چونکە، وەها زانراوە کە (عماد الدين زەنگی) لە ساڵی (٥٢١ك/ ١١٢٧ز)دا ئەمارەتەکەی خۆی لە موسڵ دامەزراند هەروەك خودی (ابن العبري) لە کتێبەکەی تریدا، دەیڵێت[٢]. زەنگی، تا، ئەتابەگایەتی موسڵی دانەمەزراند، هەولێری نەگرت، هەموو سەرچاوەکانیش لەسەر ئەمە، کۆکن: بەخودی کتێبە ناوبراوەکەی (ابن العبري)یشەوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەولێر یەکەم شار بووە، زەنگی داگیری کردبێ و خستبیە سەر ئەمارەتە تازەکەی خۆی، دەشبینین کە (أبو شامة) و (ابن العبري) و (الدواداري) و (ابن قاضي شهبة) ئەمانە، بەرواری گرتنی ئەم شارە دەخەنە پێش ئەو بەروارەی کە (أبو شامة) و هاوڕاکانی دیاریان کردووە. رەنگە، (سبط ابن الجوزي) لەوانە هەڵاوێرین، هەرچەندیشە بەرواری گرتنی شارەکە دیار ناکات، وەلێ دەیخاتە پێش ساڵی ٥٢٤ك/ ١١٢٩ز، ئەوەش لە قسەکانییەوە دیارەکە دەڵێت (عماد الدين زەنگی) لە ساڵی (٥٤١ك/ ١١٤٦ز)دا کوژراوە و، دەڵێت: "بەر لەساڵی ٥٢٤ك وڵاتێکی زۆری لە هەولێر و (جزيرة ابن عمر) و (سنجار) و (الرحبة) و جێگایانی تردا گرتووە"[٣]. هەرچی (ابن واصل)ە کە بە دوور و درێژی باسی گرتنی هەولێر دەکات، ئەو، دەڵێت: هەولێر لەساڵی (٥٢٦ك/ ١١٣١ز)دا داگیر کراوە[٤].

---

(١)تأريخ الدول السرياني، ترجمة الأب اسحق السرياني الى العربية، ونشره في مجلة (المشرق الكاثوليكية، طبعة المطبعة الكاثوليكية، بيروت، مجلد (٤٦) لسنة ١٩٥٢، ص ٣٠٩.
Bar Hebraeus, The Chronography of Gregory, v. I. p. ٢٥٣.

(٢) تأريخ مختصر الدول، ط ١٩٥٨.

(٣)مرآة الزمان، ٨/ ١٨٩.

(٤)مفرج الكروب، ١/ ٩٧.

پێدەچێ ئەم سەرلێشێوانە دەربارەی دیاریکردنی ساڵی گرتنی ئەم شارە لەوەوە پەیدا بووبێ کە ئەو مێژوو نووسانە هاودەمی ڕووداوەکە نەبوونە، هەرچەندیشە (ابو شامة) نەك هەر ساڵی داگیرکردنەکە، بگرە مانگەکەشی دیار کردووە، ئەوەتا، دەڵێت: (زەنگی لە ڕەمەزانی ساڵی پێنج سەد و بیست و دوودا هەولێری داگیر کرد)[1]. ئەو مێژوو نووسە هاودەمی ئەو گرتنەی ئەربیل نەبووە و، ناشزانین ئەو قسانەی لەکێ وەرگرتووە. پێدەچێ، ئەو مێژوو نوسانەش کە سەردەمی داگیرکردنی هەولێریان دیتووە، بەڵام ژیانی ماوەی بە ئەمارەتبوونی هەولێریان بە قسمەت نەبووە، باسی ساڵی داگیرکردنەکەیان پشتگوێ خستبێ و، بەهەواڵێکی گرنگیان دانەنابێ و، پێشبینی ئەوەشیان نەکردبێ کە ئەم شارە، بۆ ئایندەی، دەبێتە مەرکەز (پایتەختی) ئەمارەت، بەڵام باسی چالاکییەکانی سەرداری شارەکە (زین الدین علی کچکیان کردووە). وادیارە، ئەم پشتگوێ خستنە، زۆرتر، دەکەوێتە ئەستۆی (ابن القلانسی/ ت ٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) و (ابن الجوزی/ ت ٥٩٧ك/ ١٢٠١ز)، ئەوەتا، یەکەمیان واتا (ابن القلانسی) باسی چالاکییەکانی موسڵی (زین الدین علی کچك) [2]دەکات و، دووەمیان بە دووروردرێژی باسی بەشداربوونی (زین الدین علی کچك) لە ڕووداوەکانی بەغدای نێوان خەلیفە و (سوڵتان محمدی سەلجووقی) دەکات کە لە ساڵی (٥٥١ - ٥٥٥ك/ ١١٥٦ - ١١٦٠ز) [3]دا قەوما، کەچی نەیانویستووە باسی چالاکییەکانی (زین الدین علی کچك لەگەڵ عیماد الدین زەنگی) دەربارەی گرتنی ئەربیل بکەن.

ئەوەی جێگای ڕامانە، ئەوەیە (ابن الأثیر) کە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو ڕووداوانە بووە و، هاودەمی حوکمی هەردوو میر، کوڕانی (زین الدین علی کچك) بووە و، زۆر بە دوور و درێژی ڕووداو و کارەساتی ئەو زەمەنەی تۆمار کردووە، کەچی ئەویش

---

(١)کتاب الروضتين، ١/ ٣٠.

(٢)ذیل تأریخ دمشق، ص ٢٨١، ٣٠٧، ٣٣٧، ٣٥٨.

(٣)المنتظم، ج١، ص ١٦٤ ـ ١٦٥، ١٦٨ ـ ١٧١، ١٧٣ ـ ١٧٦.

کەمتەرخەمیی لە ڕووداوی گرتنی هەولێردا کردووە، هەرچەندیشە باسی هەموو شەڕەکانی (عماد الدین زەنگی)ی کردووە کە شارەکانی ناوچەکەی داگیر کردووە و، ساڵی گرتنی یەکبەیەکیشیانی نووسیوە، بە نموونە، باسی گرتنی قەڵاگەلی کوردانی (الحمیدیە)، وەك عەقرە (العقر) و، شوش[1] دەکات (ساڵی ٥٢٨ك/ ١١٣٣ز)، هەروەها گرتنی داقوق (کە ناوی ـ داقوقا ـ بووە) لەساڵی (٥٣١ك/ ١١٣٦ز)، گرتنی شارەزوور[2] و قەڵاکانی ساڵی (٥٣٤ك/ ١١٣٩ز) [3]. ئەم مێژوو نووسە، چجای ئەوەش کە باسی گرتنی هەولێری نەکردووە، بەڵام باسی داگیرکردنی قەڵاو قایمکارو شارگەلی ناوچەکەی کردووە و، بۆ بابەتی ئەم نووسینەمان بێ سوود نییە، چونکە لەو باسانەوە دەگەینە ئەوەی کە ئەم شارە لە ماوەیەکی بەر لە ساڵی (٥٣١ك/ ١١٣٦ز) دا گیراوە و، ناکرێ و ئەستەنگە بۆ (زەنگی) داقوقی بەر لە هەولێر داگیر کردبێ، چونکە هەولێر گرنگییەکی نائاسایی بۆ سەردارانی موسڵ هەیە و دەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان موسڵ و داقوق.

هەرچی (ابن خلکان)ە - کە باسی سەرداران و گەورە پیاوانی هەولێر دەکات-، ئەویش بە چەشنی (ابن الأثیر) هیچی لەبارەی داگیرکردنی ئەم شارەوە نەنووسیوە، کە، خۆی لەم شارەدا لەدایك بووە.

وێڕای ڕاڕایی و ناکۆکی لەنێوان مێژوونووساندا لەسەر مەسەلەی ساڵی داگیرکردنی شارەکە، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن (عماد الدین زەنگی) داگیری کرد، چونکە مەسەلەی (داگیر کردنی) ئەم شارە، ببوو بە مەسەلەیەکی ژیاری و پڕ بایەخ بۆ ئەمارەتەکەی خۆی. ئاساییشە هەموو سەردارێك پێویستە سەلامەتیی سنوورەکانی وڵاتەکەی خۆی لە هەموو مەترسییەکی ناگەهانی دەرەکی زامن بکات.

---

(١)بۆ زانینی ئەم قەڵایانە: بنۆڕە لاپەڕەکانی دوای لاپەڕەی (٥٥)، پەراوێزی (١)، تا دەبیدۆزیتەوە.

(٢)شەهرزور، شاری گەورە و بەرفراوانە، لە شاخەکانی نێوان هەولێر و هەمەداندا، خەڵکەکەی هەموویان کوردن،.. یاقوت، معجم البلدان، ٣/ ٣٧٥.

(٣)ئەو ڕووداوانە لە (الکامل، ج١١، الباهر)دا باس کراون.

دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی موسڵیش ئەم ئەرکەی بەجێ هێنا، چونکە بەڕاستی نەزانی واز لە هەولێر بهێنێ و گرنگیی ئەم شارە وەلاوە بنێ، هەولێر ببووە دەروازەیەك ئەمارەتی موسڵی لەناوچەی چیاکانی ڕۆژهەڵات جیا دەکردەوە و، وڵاتی جزیرەشی لە وڵاتی فارس دابڕ دەکرد. لەبەر ئەوە (عماد الدين زەنگی) فووی لەدۆ نەکرد و کوشتارێکی گەرمی دژ بە بریکاری سوڵتانی سەلجووقی[1](مسعود بن محمد بن ملکشاه)ی سوڵتانی ئازەربێجان بەرپا کرد، کە ئەوکات حوکمی شارەکەی دەکرد. (عماد الدين زەنگی) لەم شەڕەیدا هەندێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام بریکاری سوڵتان توانیی بیداتە دواوە و خۆی و هێزەکانیشی لە قەڵای[2] شارەکەدا خۆیان قایم کرد. پاشان، بریکارەکە هەواڵی ئەم هەرایەی ناوشاری گەیاندە سوڵتان، سوڵتانیش هەرکە ئەمەی بیست، دەستبەجێ بۆ داکۆکی لە حوکمی سەلجووقی کەوتە خۆ و، دەیزانی ئەم ڕەفتارەی ئەتابەگ زەنگی کارێکی ترسناکە و، بەدووریشی نەزانی ئەنجامێکی خراپی لێ بکەوێتەوە. لەبەر ئەوە بەخۆی و لەشکرێکەوە، بۆ فریاکەوتنی بریکارەکەی گەیشتە هەولێر. ئەوجا، ئەتابەگ ناچار گەمارۆکەی لابرد و بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ موسڵ، بەڵام لە ڕێگا، لەسەر زێی ژووروو دابەزی و، کەوتە چاوەڕوانی تا بزانێ کار دەگات بە چی، ئنجا دەستی کرد بە ناردنی تەتەر و نامە و نامەکاری لەگەڵ سوڵتان تا گەیشتە ئەوەی ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان هەردووکیاندا مۆر بکەن، کە بەپێی دەقی ئەو ڕێکەوتننامەیە، ئەتابەگ زەنگی بکەوێتە خزمەتی سوڵتان و، وەك ناوبژیوان و دەمڕاستێك بکەوێتە نێوان ئەو و

---

(١) (ابن واصل) و، مێژوو نووسەکانی دیکەش ناوی ئەم بریکارەیان نەنووسیوە، وەلێ، وەك پێشتر باسمان کرد، پێدەچێ (ابو الهيجاء الهذباني) بووبێت.

(٢) ابن واصل، مفرج الكروب ١/ ٩٧.

خەلیفە (المسترشد)، ئەمە خوایە، خەلیفە دانی پێدا بنێ و بە فەرمی بیکات بە سوڵتان و، لە مینبەرەکانی بەغدایشدا بەناوی سوڵتانەوە خوتبە بدرێت[1].

ئیدی، سوڵتان بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە، هەولێری ڕادەستی ئەتابەگی موسڵ (عماد الدین زەنگی) کرد و، ئەویش بەناوی میر (زین الدین علی کچك)ەوە دایبڕی[2]. ئیدی لەو ڕووداوە بەملاوە، بووە بەشێك لە ئەتابەگایەتیی موسڵ.

## چوار: ئەتابەگ (زین الدین علی کچك کوڕی بکتگین کوڕی محمد) دامەزرێنەری ئەمارەتی ئەتابەگایەتیی هەولێر:

وەها زانراوە کە میر (زین الدین علی کچك) [3]پۆستی فەرماندەی لەشکری موسڵی بە دەستەوە بووە، جا، لەبەر ئەوەش کە بریکاری ئەتابەگی ئەم شارە بووە، سیاسەتەی ئەتابەگایەتییەکەیشی هەڵدەسووڕاند و بریکار (نوێنەر)ی خۆیشی دەنارد بۆ هەولێر کە حوکمی شارەکە بەڕێوەببەن. لەبەر ئەوە ناتوانین ژیانی ئەم میرە بە بەشێك لە مێژووی هەولێر دابنێین. بەڵام لەبەر ئەوەی کە خۆی ئەمارەتی هەولێری دامەزراندووە و، ئەو کەسانەش کە دوای گرتنی شارەکە، تا خۆی لە موسڵ بووبێ - حوکمی هەولێریان کردووە، بریکاری خۆی بوونە و، لەبەر ئەوەش باوکی

---

(١) ابن الأثیر)، لە (الکامل) دا باسی ئەم ڕووداوە لەگەڵ ڕووداوەکانی ساڵی (٥٢٦ك)دا، دەکات بەبێ ئەوەی ئاماژە بە گرتنی هەولێر بدات.. الکامل ١٠/ ٦٧٥ ـ ٦٧٦.

(٢)مفرج الکروب ١/ ٩٧.

(٣) وشەی (کچك) یان (کوچك) لەبزێکی تورکییە، ئەکا (بچووك)، واتا: (کورتە باڵا)... ابن خلکان، وفیات الاعیان: ٣/ ٢٧٠.

سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٣.

ئەسڵی وشەکەش تورکییە، وەلێ لە فارسی و کوردیشدا هەیە. بنۆڕە: شمس الدین سامی، قاموس ترکی، ص ١١٩٢.

ئـەو دوو مـیرە بـووە کـە دوو بـەش لـە سـێ بەشـی سـەدەیەك حـوکمی هـەولێریان کردووە، نەخاسمە کە ئەمارەتەکەش بەشێك بوو لە موسڵ، جا، لەبـەر ئەوانـە، نـابێ لەبیری بکەین و، پێویستە، کەموزۆر، ڕەوشی ژیان و چالاکییەکانی بخەینە بەرچاو.

**أ – لەدایکبوونی (زین الدین علی کچك):**

ساڵی لەدایکبوونی ئەم میرە، بەتەواویی، نازانین، وەلێ بەپێی گێڕانەوەی هەندێ لەمێژونووسان، کەموزۆر، دەتوانین بیزانین. (ابن خلکان) دەڵێت - کەسـانی دیکـەش هەر لەو دەگێڕنەوە - کە (زین الدین علی کچك) تەمـەنی درێـژی بەسـەر بـردووە و، دەڵێن سەد ساڵی تێپەڕ کردووە[1]، جا، ئەگەر ئـەوە ڕاسـت بێـت، ئـەوا، دەبێ لەسـاڵی (٤٦٣ك/ ١٠٧٠ز)دا لەدایك بووبێت، چونکە، لەساڵی (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز)دا مردووە.

بەهەرحاڵ، ئەوەی کە دێتە ڕێگامان دەقی قسەکەی (ابن الأثیر)ە، کە باسی ژیانی (عماد الدین زەنگـی) دەکـات و دەڵێـت: "کـە - قـسیم الدولـة آقـسنقر - کـوژرا، (عمـاد زەنگی)ی کوڕی، جێگای گرتەوە، بەڵام (عمادالـدین زەنگـی) ئـەو کـات منـداڵێکی - دە ساڵان - بـوو، کۆیلـە و برادەرانـی بـاوکی لـە دەوری خـڕ بوونـەوە، (زیـن الـدین علـی کچك)یشیان لەگەڵدابوو، ئەمیش هەر منداڵ بوو[2]."

خـۆ ئەگـەر بـزانین کـە (آقسنقر) لـە سـاڵی (٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز) کـوژراوە و، تەمـەنی کوڕەکەی ئەو کات، دە ساڵ بووبێت، ئەوە مانای وەهایە کە ئەو کـوڕە لـە دەوروبـەری ساڵی (٤٧٧ك/ ١٠٨٤ز)دا لەدایك بووە، لـەدایکبوونی (زیـن الـدین علـی کچك)یـش هـەر بەو پێودانگەیە. بەهەر حـاڵ ئەگـەر پـشت بـە قـسەکانی (ابـن الأثـیر)یـش ببەسـتین،

---

(١) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ٣/ ٢٧٠.

الذهبي، العبر في خبر من عبر، ٤/ ١٨٢.

ابن العماد، شذرات الذهب، ٤/ ٢٠٩.

(٢) ابن الأثیر، الباهر، ص ١٥.. ابوشامة، کتاب الروضتین ١/ ٢٧. (دواداری)یش دەڵێت: زەنگی، کاتێ باوکی مرد، هێشتا باڵغ نەبوو بوو، سەیری کتێبەکەی بکە: (کنز الدرر وجامع الغرر) ص ٤٩٩.

ئەوا، (زین الدین علی کچك) ڕێك، لە دەوروبەری تەمەنی نەوەد ساڵیدا بووە کاتێ کە مردووە.

**ب - بەشداریکردنی (زین الدین علی کچك) لە دامەزراندنی ئەتابەگایەتیی موسڵدا (٥٢١ك/ ١١٢٧ز):**

ئەم میرە، بەشدارییەکی چالاك و کارای لە دامەزراندنی ئەتابەگایەتیی موسڵدا کردووە و[1]، پشتی (عماد الدین زەنگیی) گرتووە و، دنەی داوە کە ئاواتی خۆی بێنێتە دی و، واز لە دوودڵی و ڕاڕایی بێنێت. ئەوە بوو، کاتێ کە (زەنگی) لە (بصره) بوو، (آقسنقر البرسقی)[2]- کە میرێك بوو لە میرەکانی سوڵتانی سەلجووقی محمودی کوری سوڵتان مسعود) ناردی بەشوێنیا کە بێت بۆ لای بۆ موسڵ - ئەو دەمە (البرسقی) لە بریکاریی ئەم سوڵتانەدا حوکمی موسڵی دەکرد - بەڵام زەنگی حەزی نەدەکرد لەگەڵ (البرسقي)دا کاربکات، لەبەر ئەوە، هاوڕێ و هەڤاڵانی خۆی خڕکردەوە و، لەگەڵیاندا کەوتە ڕاوێژکاری و گوتی: "لەم ژیانە بێزار بووین، هەر ڕۆژە و میرێك حوکمی ئەو وڵاتە دەکات، فەرمانیشمان پێ دەدرێت کە بە قسەی بکەین و، بەئارەزووی ئەو هەڵسوڕێین، ئیدی بەهەوەسی خۆی.. جارێك لە عیراق داماندەنێ و، جارێك لەموسڵ و، جارێك لە وڵاتی جزیرە و، جارێکیش لە شام، جا، ئێوە ڕاتان چییە و چی بکەم باشە[3]؟

لە وەڵامدا (زین الدین علی کچك) کە - وەك (ابن الأثیر) دەڵێ دۆستێکی دڵسۆزی (عماد الدین زەنگی بووە - هەڵیدایە و گوتی: "تورکمان، مەسەلێکیان هەیە، دەڵێت،

---

(١)لەبارەی ئەم ئەتابەگایەتی و، حوکمی (عماد الدین زەنگی) یەوە، بنۆڕە: (الدکتور عماد الدین خلیل، عماد الدین زنکي، رسالة ماجستیر، طبعة الدار العلمیة، بیروت ١٩٧١.

(٢)لە ساڵانی (٥١٥ك) حوکمی موسڵی لەدەست بوو، تا کوژرانی بەدەست یەك لە فیدائییەکانی ئیسماعیلییەکان.

(٣) الباهر، ٢٧.

ئەگەر بەردێك دەخەیتە سەر سەرت، بەردی چیایەکی گەورە بێت باشترە"، جا ئێمەش ئەگەر بمانەوێت خزمەتی خەڵك بکەین، ئەوا سوڵتانی سەلجووقی گەورەترە و چاکترە. (عماد الدین زەنگی) قەناعەتی بە قسەکەی هێنا و، هەستا، لە (بصره)وە بەرەو (أصفهان) کەوتەڕێ و خۆی گەیاندە لای سوڵتان مەحمود - ئەمە لەساڵی (٥١٧ك/ ١١٢٣ز)[١] دا رووی دا. ئیدی لەو کاتەوە (زین الدین علی کچك) بووە ناودارترین میر لە میرەکانی (عماد الدین زەنگی)، ئەمیش هەرکاتێ تووشی گێچەڵێك ببوایە، بەو میرەی دەگوت: "ها... علي (واتا زین الدین علي).. ئەوا، بەقسەی تۆمان کرد و[٢] بەردە گەورەکەمان خستە سەر سەری خۆمان."

لە ساڵی (٥٢١ك/ ١١٢٧ز) (عماد الدین زەنگی) توانیی ئەتابەگایەتیی موسڵ دابمەزرێنێت، بۆ ساڵی دواتر ٥٢٢ك (یان ٥٢٦ك) زەنگی ئەربیلی داگیر کرد و رادەستی (زین الدین علی کچك)ی کرد، ئەمیش بووە جێگای متمانەی ئەو و، بەردەوام لەژێر ئاڵاو ئیتاعەتیدا مایەوە و... لەساڵی (٥٣٩ك/ ١١٤٤ز)دا (نصیر الدین جقر)ی بریکاری (جێگری) ئەتابەگ لە موسڵ بە دەستی (الب أرسلان) ناسراو بە (الخفاجی بن السلطان محمود) کوژرا، هەواڵی کوژرانی گەیشتە ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی) لە کاتێکدا کە بە گەمارۆدانی قەڵای (البیرة)[٣] وە سەرگەرم بوو، هەندەی نەمابوو داگیری بکات، بەڵام کە ئەم هەواڵەی پێ گەیشت، لەوە ترسا کە وڵاتەکەی لێ یاخی ببێت و بقەومێت، لەبەر ئەوە وازی لە گەمارۆکە هێنا و، (زین الدین علی کچك)ی نارد بۆ قەڵای موسڵ تا جێگەی جێگرە کوژراوەکەی بگرێتەوە[٤].

(١) ن. م. ص.

(٢) ن. م. ص.

(٣) (البیرة): شارۆچکەیەکە، نزیك بە (سمیساط) دەکەوێتە نێوان حەڵەب و بەندەرە رۆمییەکانەوە، قەڵایەکی قایمە، یاقوت ١/ ٥٢٦.

(٤) البنداري، تأریخ دولة آل سلجوق، ص ١٨٨. الکامل ١١/ ١٠٢. ابن العدیم، زبدة الحلب، ٢/ ٢٨١.

(زین الدین علی) لە موسڵ کەوتە پێڕۆکردنی سیاسەتێکی بەئاوەز و هەقیانەت، بە پێچەوانەی سیاسەتە چەوتەکەی (نصیرالدین جقر)، لەبەر ئەوە خەڵکەکەی دڵنیاییان لێ پەیدا کرد و، وڵاتەکە زێتر کەوتە ئاوەدانی[1] و خۆشگوزەرانی و، هەندێ سەرچاوەش دەڵێن کە ئەتابەگ زەنگی دوا بەدوای گرتنی شاری (الرها)[2](٥٣٩ك/ ١١٤٤ز)، (زین الدین علی)ی دامەزراندووە بە سەرداری ئەم شارە، (زین الدین علی)یش خۆئاسایی، بە ئاوەز و بە نەرمی[3] بەڕێوەی بردووە.

کاتێکیش کە (زەنگی) کوژرا (٥٤١ك/ ١١٤٦ز)[4]، (زین الدین علی کچك) بەیارمەتیی وەزیری ئەتابەگی (جمال الدین الاصفهانی) و، (صلاح الدین الیاغسیانی) لەپاش (زەنگی) تەختی ئەتابەگییەکەیان پاراست و دژ بە هەڵپەی (الب أرسلان)ی کوڕی سوڵتان محمود راوەستان کە دەیویست هەلی ئاژاوەی کوژرانی ئەتابەگ

---

(١) ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ٢٨١.
ابن الأثير، الباهر، ص ٧٣.
ابو شامة، الروضتين، ١/ ٤١، ابن واصل، مفرج الكروب، ١/ ٩٦.
ابن خلكان، وفيات، ١/ ٣١٦، ط ١٩٤٨.

(٢) شارێکی جزیرەیە، دەکەوێتە نێوان موسڵ و شامەوە: یاقوت، معجم البلدان، ٣/ ١٠٦.
لە سەرچاوە ڕۆژاوایی و مەسیحییەکانیشدا بە (ادیسا = Edessa) ناودەبرێت، ئێستا کەوتووەتە ناو سنوری تورکیاوە و پێیدەڵێن (ئورفە).
Segal, I. b. Edessa The blesses City, p. ٢٤٧.

(٣) ستيفن رنسيمان، تأريخ الحروب الصليبية، ج ٢، ص ٣٨٢.
سەرچاوە عەرەبییەکان هەواڵی ئەم دامەزراندنە نالێن، پێدەچێ ئەم دوو مێژوو نووسە لە سەرچاوە لاتینی یان ئەرمەنییەکانەوە وەریانگرتبێت.

(٤) (زەنگی) بەدەستی نۆکەرەکەی خۆی (برنقش) لە کاتێکدا کوژرا کە گەمارۆی قەڵای (جعبر)ی دابوو. ئەم قەڵایە، لەسەر فورات، لە (صفین)ەوە نزیکە و، پێیان دەگوت قەڵای (دوسر): بنۆڕە - ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق ٢٨٤ - ٢٨٥. ابن الجوزي، المنتظم، ١٠/ ١١٩. الكامل، ١١/ ١١٠.
سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ١٩١.
ابن خلكان، ط القاهرة، ٢/ ٨٠.
ابن قاضي شهبة، الكواكب الدرية في السيرة النورية ١١٩.

بقۆزێتەوە، بەڵام، ئەوان نەیانهێشت سوود لەو هەلە ببینێ، ئەوە بوو، (زین الدین علی) دەستبەجێ زەلامی نارد بۆ لای میر (سیف الدین غازی)ی کوڕە گەورەی (عماد الدین زەنگی) کە لەو دەمەدا لەجیاتی باوکی حوکمی شارەزووری دەکرد. ئەویش بەهەڵەداوان، بەر لەوەی پیلانەکەی (ألب أرسلان) [1] سەر بگرێ، گەیشتەجێ و، تەختی ئەتابەگییەکەی گرتە دەست و، کوچکەکانی دەوڵەتەکەی باوکی [2] بەر قەرار ڕاگرت و، حوکمی (زین الدین علی)ی بەسەر قەڵای موسڵدا چەسپاند و، بگرە زەویی زێتریشی بۆ دابڕی و پێگە و جێگەیشی بەرزتر کردەوە [3].

## ج- (زین الدین علی کچك) لە سەردەمی (قطب الدین مودود)دا، ٥٤٤ - ٥٦٥ك/ ١١٤٩ - ١١٦٩ز:

لە ساڵی (٥٤٤ك/ ١١٤٩ز)دا، ئەتابەگ (سیف الدین غازی) بە نەخۆشی، مرد و، بڕیاردرا کە (قطب الدین مودود بن زنگی) [4]ی برای حوکم بگرێتە دەست. ئەمیش حوکمی موسڵی وەرگرت و (زین الدین علی)ی کرد بە بریکاری خۆی. ئەستێرەی

---

(١) البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ص: ١٩٠.
الكامل، ١١/ ١١٣.
الباهر، ٨٥ ـ ٨٦.
سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ١٩١.
وفيات الاعيان، ط القاهرة، ٣/ ١٧٦.
ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ص ٢٠٧.
K. M. Setton, A History of The Crusades, V. I, P. ٤٦٢.
(٢) الباهر، ٨٦.
ميرخواند، تأريخ روضة الصفا، ٤/ ٥٩٦.
هەرچی (نور الدین محمود)ە، کە کوڕی دووەمی ئەتابەگە، لە ناکاودا، لە هەموویان ڕاپەڕی و پەنجەوانەکەی باوکی لەگەڵ خۆیدا برد و، خۆی گەیاندە حەڵەب و چووە لای مەلیکی حەڵەب، ئیدی، بەوەش؛ ئەتابەگایەتییەکەی زەنگی، بوو بە دوو بەش، بەشی موسڵ، بۆ (سیف الدین غازی) و، بەشی حەڵەبیش کەوتە دەست (نور الدین محمود الشهید).
(٣) الباهر ٩٢ ـ ٩٣.
(٤) ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص ٣٠٦.
الباهر، ٩٤. الكامل ١١/ ١٣٩. أبو الفداء، المختصر في اخبار البشر، ٣/ ٢١.

بەختی ئەم میرە، لە سەردەمی حوکمی ئەم ئەتابەگەدا، لە ڕۆژانی پێشتر زێتر دەدرەوشایەوە. ئەم میرە، واتا (زین الدین علی) سەرەڕای پۆستی بریکاری ئەتابەگ، کرا بە فەرماندارى لەشکری موسڵ و لەشەڕەکانی ناوچەکەدا بەشداریی کرد، نەخاسمە لە شەڕەکانی نێوان خودی سەلجووقییەکاندا کە لەسەر تەختی بەغدا و، بۆئەوەش کە خوتبە بە ناویانەوە بدرێت، لە کێبڕکێ و ململانێدا بوون.

بە نموونە، لە ساڵی (٥٥١ك/ ١١٥٦ز)دا ناکۆکییەك لەنێوان سوڵتان (محمد بن محمود) و، مامیدا (سلیمان شاه ابن السلطان محمد بن ملکشاه) هەڵایسا و، خەلیفەی بەغدا (المقتفي لأمر الله) لایەنی (سلیمان)ی دەگرت و یاریدەی دەدا، کاتێکیش کوشتار لەنێوانیاندا قەوما، سوڵتان محمد، بە کۆمەکی ئەتابەگی موسڵ (قطب الدین مودود)[1] بەسەر (سلیمان)دا سەرکەوت، سلیمان هەڵات و، بەنیازبوو لەڕێگای شارەزوورەوە خۆی بگەیەنێتە بەغدا - بەڵام شارەزوور، ئەو دەمە بەشێك بوو لە موڵکی (زین الدین علی کچك) و، لەجیاتی خۆی، میر (بزان) حوکمی دەکرد[2]. ئەم دووانە کەوتنە سووسەی هاتنی سوڵتانی بەزیوو، بۆسەیان بۆ نایەوە و گرتیان. ئەوجا (زین الدین علی) بردی بۆ موسڵ و، لەوێ، لە بەندیخانەی توند کرد[3].

پاش چەندین ساڵ (سلیمان شاه) لەسەر داوای میرە سەلجووقییەکانی هەمەدان (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) لە بەندی ئازاد کرا، چونکە ئەو میرانە، دوای مردنی سوڵتان (محمد بن محمود)[4] بەنیاز بوون، لەجێگای ئەم سوڵتانە بیخەنە سەر تەخت. ئەوە بوو (سلیمان شاه) لەگەڵ (زین الدین علی) پێکەوە. بەرەو هەمەدان کەوتنە ڕێ و، لەسەر

(١) ابن الجوزي، المنتظم، ١٠/ ١٦٥. البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ٢٢٢.
الكامل ١١/ ٢٠٧. تأريخ ابن الوردي ٢/ ٨٠.
(٢) الباهر، ١٠٨ ـ ١٠٩. الكامل ١١/ ٢٠٧.
(٣) الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ١٤٢.
البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ٢٢٢.
(٤) الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ١٤٣.
البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ٢٦٤. الراوندي، راحة الصدور، ٢٩٣. الكامل ١١/ ٢٥٤. الصفدي، الوافي، ٥/ ٨.
ابن الوردي، تأريخ ابن الوردي، ٢/ ٨٨.

ئــەوەش پێکهــاتن کــە یەکێتییــەك لــە نێــوان ســەرکردایەتیی (مەملەکەتــە سەلجووقییەکەی هەمەدان و ئەتابەگایەتیی موسڵدا) دامەزرێنن. بەڵام ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت، (زين الدين علی) - پاش ئەوەی سوڵتانی نوێی گەیاندە هەمەدان -، خۆی بەدەستی بەتاڵ زڤرییەوە بۆ موسڵ[1].

ململانێ، لەسەر وەرگرتنی تەختی بەغدا هەڵگیرسایەوە، چونکە خەلیفە قایل نەبوو، بەناوی (سوڵتان محمد ابن محمود) [2]ەوە خوتبە بدرێت، سوڵتانیش دیسان هانای بردەوە بەر ئەتابەگی موسڵ، ئەویش دەستبەجێ لەشکرێکی لەژێر فەرماندەی بریکار و سەرلەشکرەکەی خۆی (زين الدين علی کچك)دا پێکەوە ناو، کردیە سەر بەغدا و[3]، لەوێ شەڕ و کوشتارێکی کەلەلایی لەنێوان ئەمان و خەلیفەدا قەوما... وەلێ (زين الدين علی) ئەو کەفوکوڵەی پێشتری بەرەو ساردبوونەوە دەچوو، تا

---

(١) المنتظم، ١٠/ ١٩٢. الباهر، ١١٤ ـ ١١٥. الكامل، ١١/ ٢٥٤ ـ ٢٥٥.

ابن خلدون، كتاب العبر، ٥/ ١٦١ ـ ١٦٢. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٥/ ٣٣.

(١) المنتظم، ج (١٠)، ص ١٦٤ و (١٦٨ ـ ١٧١) و (١٧٣ ـ ١٧٦).

الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ١٣٤ ـ ١٣٧.

الراوندي، راحة الصدور، ص ٢٨١.

الذهبي، العبر، ٤/ ١٤٥.

احمد بن زيني دحلان، تأريخ الدول الاسلامية، ص ٤٨.

(٢).المنتظم، ج (١٠)، ص ١٦٤ و (١٦٨ ـ ١٧١) و (١٧٣ ـ ١٧٦).

الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ١٣٤ ـ ١٣٧.

الراوندي، راحة الصدور، ص ٢٨١.

الذهبي، العبر، ٤/ ١٤٥.

(٣) المنتظم، ١٠/ ١٦٥. الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ١٣٥.

الباهر، ١١٣. حمدالله المستوفي القزويني، تأريخ گزيدة، ص ٣٦٢.

٤٥٩ ـ ٤٦٠. الذهبي، دول الاسلام، ٢/ ٤٩.

وەهای لێ هات دەستی لە شەڕی خەلیفە بەردا[1]. هۆکاری ئەمەش پێدەچێ ئەتابەگی حەڵەب (نورالدين محمود) بووبێت. کە دەڵێن، گوایا ئەو فەرمانی داوە بە (زین الدين) شەڕ لە دژی خەلیفەی بەغدا ڕابگرێت[2]. یان، ڕەنگە پاداشت و قەرەبووی وەرگرتبێت، یان بەڵێنی ماددیی پێ درابێت و دەمی شیرین کرابێت[3]. سا، بەهەر حاڵ سەرەنجام، خەلیفە لەم ململانێیەدا بەسەر سوڵتانی سەلجووقیدا - کە (زين الدين علي کچك) بە هانایەوە هاتبوو، سەرکەوت.

---

(١) (وتارێکی - عباس العزاوي - لە گۆواری - المجمع العلمي العربي - دا، دمشق، مجلد (٢١) لەژێر سەردێڕی (آل بكتگين)دا، ویستوویەتی (زين الدين علی) وەها نیشان بدات کە گوایا لایەنی خەلیفەی گرتبێ و، دەڵێت: "ئەم فەرمانداره، هەوای دەوڵەتی عەبباسیی لەسەردا بووه و، لەبنەوه لایەنی عەبباسیی گرتووه و نەیویستووه تووشی پەندی بکات"، کەچی هەواڵەی سەرچاوه گەلێکمان دەکات کە ئەو قسانەی خۆی ئاوەژوو دەکەنەوه، (لاپەڕەی: ٤١٥). بەلام (دکتۆر مصطفى جواد) - زين الدين علي کچك بە پیاوێکی بەدڕەوشت دادەنێت چونکە دوژمنی تەختی عەبباسی بووه و دەڵێت: "زين الدين" پشتیوانی - عماد الدين - و سەلجووقییەکان بووه و دژ بە عەبباسییەکان بووه؛ بەد ڕەوشتیش لەوه زیاتر نابێت"... بنۆڕه: پەراوێزی لاپەڕەی (٧٢٨) لە کتێبی (مجمع الآداب)ی، ابن الفوطي، ق٤، جـ ٤..

(٢) المنتظم، ١٠/ ١٧١. الكامل ١١/ ٤١٢. ابن خلدون، ٥/ ١٥٦.

(الصفدي)یش دڵێت: (زين الدين علي کچك) داوای لە خەلیفە کردووه کە لێی ببوورێت، بەوەش هاتووەتە سەر ڕێ (واتا ملکەچ بووه). سەیری دەستنووسی (الوافي بالوفيات)، جـ ١٢، ق ١، وەرەقەی ١٣، بکە.

(٣) د. طليمات دەڵێت: گومانی تێدا نییە کە (زين الدين علي کچك) پشتی - ملك محمد - ی بەرنەدا، بە پاداشتی خەلیفە نەبێت کە پێشەکی لە خەلیفەی وەرگرت. بنۆڕه کتێبەکەی. د. طليمات (مظفر الدين كوكبري)، لاپەڕه. ٣٢.

(ابن الأثير)یش دەڵێت: (خەلیفە، هەند نامەی بۆ - زين الدين - نووسی و دڵخۆشیی دەدایەوە، تا، لە شەڕەکە ساردی کردەوه). بنۆڕه: لاپەڕەی ١١٤ لە (الباهر).

**د- پێوەندیی (زین الدین علی کچك) لەگەڵ (نورالدین محمود)ی ئەتابەگی حەڵەب (٥٤١ - ٥٦٩ك/ ١١٤٦ - ١١٧٣ز):**

هەرچەندیشە بە مردنی ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی) ساڵی ٥٤١ك/ ١١٤٦ز، حەڵەب لە ئەتابەگایەتیی موسڵ دابڕا، وەڵێ (زین الدین علی کچك) پێوەندی و دۆستایەتیی لەگەڵ سەرداری حەڵەب (نورالدین محمود)ی کوڕی ئەتابەگ زەنگی هێشتەوە. ئەم پێوەندییە بەرەو چاکتریش گۆڕا و، شاری (حران)یشی پێ بەخشی[1]. ئەمەش لەساڵی (٥٥٤ك/ ١١٥٩ز)دا رووی دا چونکە لەو ساڵەدا پێوەندیی سەرداری حەڵەب لەگەڵ (نصرة الدین - أمیر أمیران)ی برایدا تێکچوو لەبەر ئەوەی (نصرة الدین) مرخی لە تەختی براکەی خۆش کردبوو، لە شاری (حران) ئاڵای یاخیبوونی هەڵکردبوو. (نورالدین)یش - کە لە نەخۆشییەکەی هەڵسایەوە - بەرەو (حران) کەوتە رێ و، (نصرة الدین) هەڵات و منداڵەکانی لە قەڵای شارەکەدا بەجێ هێشت، ئیدی (نورالدین) شاری (حران)ی وەرگرتەوە و رادەستی (زین الدین علی کچك)ی کرد[2]. بەو جۆرە، ئەم شارە کەوتە سەر موڵکی ئەم ئەمیرە.

لە ساڵی (٥٥٩ك/ ١١٦٤ز)دا (نورالدین محمود) بانگێشتی میرگەلی موسوڵمانانی کرد، بێنە شەڕی خاچپەرستان و، (قطب الدین مودود)ی برایشی کە ئەتابەگی موسڵ بوو، بۆ ئەو شەڕە بانگهێشت کرد، (قطب الدین) کەوتە خۆ و لەشکری موسڵی خڕکردەوە و، (زین الدین علی کچك)ی کرد بە پێشەنگی لەشکرەکە و ئەمیش بە پەرۆشەوە بەرەو شەڕی خاچپەرستان کەوتەڕێ و[3]هەندەی نەبرد لەگەڵ خاچپەرستاندا جەنگیان لێك

---

(١) (حران): شارێکی بەناوبانگە، شاری وڵاتی (مضر)ە، رۆژە رێیەك لە (رها)و، دوو رۆژەڕێ لە (الرقە)وە دوورە. معجم البلدان، ٢/ ٢٣٥.

(٢) ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ٣٥٨. الكامل، ١١/ ٢٥٢.

مفرج الكروب، ١/ ١٣١. زبدة الحلب، ٢/ ٣١٠ ـ ٣١١. الروضتين، ١/ ١٢٣.

ابن شداد، مخطوط (الاعلاق الخطيرة)، قسم الجزيرة، ورقة ١٨أ.

(٣) الكامل، ١١/ ٣٠٢. الباهر، ١٢٣.

سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٢٤٦.

ابن العديم، زبدة الحلب، ٢/ ٣١٨. ابن الفرات... مجلد٤، جـ ١، ص ١٣.

گیر کرد و پێکدا هەڵپڕژان، هەرچیش کە خاچدروشمانە ئامادەگییەکی زەبەنیان هەبوو[1]، بەڵام موسوڵمانان، غەڵەبەیان سەند و قەڵای (حارم)یان داگیر کرد[2]و، (نور الدین محمود) دەستبەجێ خستیە سەر خاکی ژێر دەستی خۆی. (زین الدین علی کچك) لەو شەڕەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا[3]وێڕای ئەوەش کە تەمەنی، خۆی دابوو لە نەوەد.

**هـ- شەخسیەتی (زین الدین علی کچك):**

مێژوونووسان گەلێك باسی خەسڵەت و ئاکاری ئەم میرەیان کردووە و، بە شانوباڵیدا هەڵیانداوە. جا، لەبەر ئەوەش کە ئازا و چاوتێر و بەحورمەت و خاکەڕایی (متواضع) بووە، بە سوارچاکێکی زەمەنی خۆی لە قەڵەمیان داوە. وەك دەشڵێن، گوایا، لەشکرێك (زین الدین علی کچك)ی تێدا بووبێت، هەرگیز نەبەزیوە[4]، چونکە زەلامێکی تا بڵێی بەهێز و جوامێر و[5]تەواوێ بەجەرگ و

---

(١) ابن الأثير، الكامل ١١/ ٣٠٢. الباهر، ١٢٤.

ابوشامة، الروضتين، ١/ ١٣٣ ـ ١٣٤.

(٢) (حارم): قەڵایەکە و شارێکی بەخێر و بەرەکەتە و، سەر بە حەڵەبە و، دەکەوێتە بەرامبەر (انطاكية).. معجم البلدان، ٢/ ١٥٥.

(٣) ابن العديم، زبدة الحلب، ٢/ ٣٣٠.

ابن قاضي شهبة، الكواكب الدرية في السيرة النورية، ص ١٦٧.

(٤) ابن الأثير، الكامل، ١١/ ٣٣١. الباهر، ١٣٦.

سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٢.

ابوشامة، الروضتين، ١/ ١٥٢. مفرج الكروب، ١/ ١٥٤.

ابن الفرات، مجلد ٤، جـ١، ص ١٣.

(٥) ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٨١.

ابن خلكان، ٣/ ٢٧٥. الذهبي، العبر، ٤/ ١٨٢.

ابن أبي عذيبة، مخطوط (انسان العيون، ص ٢٩٢).

شۆڕەسوار بووە و[١]، کەسانێکیش بە سوارچاکی بەناوبانگ و قارەمان ناویان بردووە[٢]، کە پاڵەوانێك بووە لە پاڵەوانەکانی ئیسلام و کەڵە پیاوی مەیدان و[٣]، زەلامی بەهیممەتی وەك ئەو، کەم هەڵکەوتووە[٤]. (ابن دحیة)[٥]یش بە نازناوی (شۆڕەسواری ئیسلام و سەرداری هەولێر) ناوی دەبات. (حمدالله المستوفي القزويني)یش باسی هەڵوێستی ئەم پیاوە دەکات بەرامبەر بە ململانێی نێوان سوڵتانە سەلجووقییەکان کە لەسەر زەوتکردنی تەختی بەغدا لەنێوانیاندا قەوما دەڵێت: (زین الدین علی کچك) پیاوەتی و ئازایەتی نواند[٦].

(اسامة ابن منقذ) (ت ٥٨٤ك/ ١١٨٨ز) کە یەکێك بووە لە هاوزەمەنی (زین الدین علی کچك) و، ئەو کات سەری لە موسڵ و هەولێر داوە[٧]، دەربارەی ئازایەتیی ئەو پیاوە، دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (ئەتابەگ عماد الدین زەنگی، جار جارە، قسەی بۆم دەکرد، دەیگوت: سێ نۆکەر هەن، یەکیان لە خوا دەترسێ، لەمن ناترسێ، ئەوە (زین الدین علی کچك)ە. دووەمیان لە من دەترسێ و لەخوا ناترسێ، ئەوەیان (نصیرالدین

(١) ابن خلكان، ٤/ ٢٨٧.

(٢) الذهبي، العبر، ٤/ ١٨٢.

ابن العماد، شذرات الذهب، ٤/ ٢٠٩.

(٣) ابن الفرات، م. ن. ص.

الصفدي، مخطوط (الوافي بالوفيات) جـ ٢، ق١، ورقة: ١٣.

(٤) الذهبي، دول الاسلام، ط ١٣٦٥ ك، ٢/ ٥٥.

(٥) ابن دحية، النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس، ص ١٥٥.

(٦) حمدالله المستوفي القزويني، تأريخ گزيدة، ص ٤٦٠.

(٧) دەربارەی هاتنی (اسامة بن منقذ) بۆ هەولێر، بنۆڕە کتێبەکەی خۆی (المنازل والديار) لاپەڕەی ٣٠٧ ـ ٣٠٨. هەروەها:

ابن خلكان، وفيات الاعيان، ط بيروت ١/ ١٩٦، لە (ابن المستوفي)یەوە وەریگرتووە، هەروەهاش ١/ ٤٦٣.

سنقر)ی وەزیرە، سێیەمیان، نە لە خوا دەترسێ و، نە لە خۆم، ئەمیان (صلاح الدین محمد الیاغیسیانی)یە[(١)].

جوامێرییەكی دیكەی (زین الدین علی كچك) ئەوەیە، كاتێ خەلیفەی لێكەوتوو[(٢)](الراشد) هەڵات و گەیشتە موسڵ و هانای بردە بەر ئەتابەگ و لە ساڵی (٥٣٠ك/ ١١٣٥ز)دا پای غوربەتی لەلای ئەتابەگ كرایەوە، سوڵتان مەحموود نامەیەكی كردە سەر ئەتابەگ و داوای لێ كرد كە (الراشد)ی ڕادەست بداتەوە، وەلێ (زین الدین علی كچك) نەیهێشت[(٣)]. ئەوەش ئەتابەگی ناچار كرد كە داوای لێبووردن لە سوڵتان بكات و بڵێت: (من لە وڵاتی خۆم بە دەری دەنێم، تۆش سەرباز بنێرە سەری تا بیگرن، بەڵام نەك لە نزیك ئێمە). پاشان (زین الدین علی) تاقمێ كوردی بۆ ئامادە كرد و ڕایسپاردن بیگەیێننە ناوچەكانی ئازەربێجان تا، سەربازەكانی سوڵتان نەیگەنێ و نەیگرن[(٤)].

(زین الدین علی كچك) پیاوێكی چاوتێر و سنگفراوان و دەستبڵاو بوو. دەگێڕنەوە، دەڵێن، كاتێ هۆزانڤان "الحیص بیص"[(٥)] هۆزانێكی (شیعرێكی) بەسەردا هەڵدا،

(زین الدین علی) بە خەڵكەكەی گوت: من نازانم ئەم هۆزانڤانە چ دەبێژێ، بەڵام دەزانم داوای شتێك دەكات، فەرمانی دا پێنج سەد دینار و ئەسپێك و خەڵاتێك و

---

(١) اسامة بن منقذ، الاعتبار، ص ١٥٦.

(٢) لە ساڵی (٥٣٠ك/ ١١٣٥ز) لە تەختی خەلافەت لادرا. بنۆڕە: الكامل ١١/ ٤٢. لەساڵی (٥٣٢ك/ ١١٣٧ز)دا بەدەستی ئیسماعیلییەكان كوژرا.. بنۆڕە: الكامل ١١/ ٦٢. هەروەهاش: الحسینی، اخبار الدولة السلجوقیة ص ١٠٩.

(٣) ابن دحیة، النبراس في تأریخ خلفاء بني العباس، ١٥٤.

(٤) م. ن. ص: ١٥٥.

(٥) الحیص بیص: شاعیر (ابو الفوارس سعد بن محمد صیفي، ت ٥٧٤هـ) ژیاننامەكەی لە: وفیات الأعیان ٢/ ١٠٦. الاسنوي، طبقات الشافعیة ١/ ٤٤٣.

الصفدي، دەستنووس (الوافي بالوفیات) جـ ٨، ص: ٣٢ ـ ١٢٤.

جل و بەرگی بدەنێ سەرجەم بایی هەزار دینار[1] بێت. - پیاوێك بوو، زۆری دەبەخشی خەڵاتی گەورەی لەدەست دەهات، وڵاتی زۆر فراوان و پڕ بەرەكەتی بەدەستەوە بوو، كەچی هیچیشی لەپاش بەجێ نەما، ئەوەی هەیبوو بەخشی و، كردی بە چاكە و، دای بە خەڵك[2]. كەچی، دەبینین (ابن الجوزی) - كە هاوزەمەنی - (زين الدين علی)بوو، بە گیر و دەستتەنگ (رمزيل)ی ناودەبات و، دەڵێت: (زين الدين علی كچك) لە ساڵی (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز)دا لەتەك میر شێركۆ سەرداری (الرحبة)[3]پێكەوە، چوون بۆ حەج، میر شێركۆ لە مەككە و مەدینە خێرێكی زۆری بەخشی بەڵام (زين الدين علی) هەرچی پارەیەكی زۆریشی لەلا بوو، بەڵام هیچی ئەوتۆی نەكرد بە خێر[4]. وەلێ (ابوشامة) بە پێچەوانەی ئەو مێژوونووسە قسان دەكات و، لەباسی ڕووداوەكانی هەمان ئەو ساڵەدا، دەڵێت: (زين الدين علی كچك) كە چوو بۆ حەج، لەڕێگای مەككە خێرێكی زۆری بە هەزاران كرد و، پارەیەكی زۆری بەخشی، ئەو وەرزەش وەرزێكی پڕ بەرەكەت بوو[5]. (ابن الأثیریش) دەڵێت: (زين الدين علی

---

(١) ابن الأثير، الكامل، ١١/ ٣٣١. الباهر، ١٣٦.

ابوشامة، كتاب الروضتين ١/ ١٥٢. العبري، مختصر تأريخ الدول: ٢١٢.

The Chronography of Gregory, V. i. p. ٢٩٣.

ابن الفرات، مجلد ٤ جـ ١ ص: ١٥.

(٢) الباهر: ١٣٥. ابن واصل، مفرج الكروب، ١/ ١٥٤.

دەربارەی خواردەیی و دەستبلاویی (زين الدين علی كچك)، سەیری ئەمانەش بكە:

اسامة بن منقذ، الاعتبار، ص ١٧٨.

ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٥، ٣٧٨.

(٣) الرحبة: شارێكی جزیرەیە لەسەر ڕووباری فورات، كەوتووەتە خوارووی (قرقيسيا).. معجم البلدان، ٣/ ٢٧١.

(٤) المنتظم: ١٠/ ١٩٦.

(٥) ابوشامة، كتاب الروضتين، ١/ ١٢٤.

کچك) لە ڕێگا چاکەی زۆر و خێرێکی زۆری بـە خەڵکەکە کـرد[1]. وەلـێ (سـبط ابـن الجوزي) دەڵێ: (زیـن الـدین علـی) دەسـتی تـەنگ بـوو و پیـاوێکی گـیر (ڕەزیـل) بـوو، بەڵام لە دوادوای تەمەنیدا کەوتە چاکەکردن و.. هیچی لەپاش بـەجێ نـەما، چـونکە هەر پارەیەکی هەیبوو کردی بەخێر و دای بەخەڵك[2].

## و - (زیـن الـدین علـی کـچك) لـە موسـڵ دەردەچـێ و بـەرەو هـەولێر دەچـێت (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز):

ئەم میرە، لە موسڵ بە بریکاری ئەتابەگی موسڵ و فەرمانـداری لەشکری موسـڵ مایـەوە و، بـە ئاکـار و خەسـڵەتی چـاکی خـۆی، بـووە جێگـای دڵنیـایی و بـاوەڕی ئەتابەگـەکان، باشـترین بەڕێوەبـەر و چـاکترین ئامۆژگـار و ڕاوێـژکار بـوو[3]، بـەڵکو بوشبوو بە حوکمبەدەستی دەوڵـەتی ئەتابـەگی[4]. ناوچـەگەلێکی زۆریـشی لـە وڵاتـی جزیرە، هەر لە (حران و سنجار)ەوە بیگرە تا دەگاتە هەولێر و شـارەزوور، بـە قـەڵاو قایمکارەکانییـــەوە هـــەروەها، لـــە تکریتـــەوە، تـــا وڵاتـــی (الحمیدیـــة) [5]و قـــەڵای هەکاری[6]بە (العمادیـة)شـەوە، بـە قـەڵای موسڵیشەوە، ئەمانـەی هـەموو بەدەسـتەوە بوو، لەماڤی خۆی دەستی هـەڵگرت و هـەمووی خـستە بـەر دەسـتی ئەتابـەگ (قطب

(١) الباهر، ١١٥.

(٢) سبط، مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٣.

(٣) وفیات الاعیان، ٤/ ٢٨٧، ط ١٩٤٨.

(٤) الکامل، ١١/ ٣٣١.

(٥) بەناوبانگترین شاری وڵاتی (الحمیدیة) قـەڵای (عقـر - عقـرة)یـە، قەڵایـەکی قایمـە کەوتووەتـە ڕۆژهەڵاتی موسڵ.. معجم البلدان، ٤/ ١٣٦. هـەروەها: (شـوش) قەڵایـەکی دیکـەی سـەر بـە موسـڵە، تـا بڵێی بەرزە، دەکەوێتە نزیك - عقر - ی (الحمیدیة)وە... معجم البلدان، ٣/ ٣٧٢.

(٦) (الهکاریة): شار و ناحیە و چەندین گوندە لە ژوورووی موسڵ لە (جزیرەی ابن عمر)، نشینەی کوردانە، پێیان دەڵێن کوردی هەکاری.. معجم البلدان ٥/ ٤٠٨.

(آشب)یش شارێکە لە شارە گەورەکانی هەکاری، کاتی خۆی مەزنترین قەڵای هەکاریی سەربە موسڵ بووە، ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی) وێرانی کرد و، لەجیاتی (العمادیة)ی لەنزیکیەوە بنیات نا و، بەناوی خۆیشیەوە ناونرا.. بنۆڕە: معجم البلدان، ١/ ٥٤ و، ٤/ ١٤٩.

الدین مـودود)[١] و تـەنیا هـەولێری بـۆ خـۆی هێـشتەوە، ئـەوەش لەبـەر ئـەوەبوو کـە ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی)[٢] پێشتر هەولێری بۆ دابڕیبوو، ئەمیش شانازیی پێوە دەکرد و، ماڵ و منداڵ و گەنجینە و نەختینەی لەم شارە دانابوو[٣].

(زین الـدین علـي کـجك) بـە تەمەنـدا چووبوو، کاتێکیش کوێر و کەڕیش بـوو، ئیدی لەکار کەوت و پەکی کەوت، ئنجا داوای لـە (قطـب الـدین مـودود) کـرد، ڕێگای بدات لە موسڵ باربکا و بگوازێتەوە بۆ ئەربیل و پێیگوت: من لەمەودوا بەکەڵکی تۆ نایەم، من پیربووم و برستم لـێ بـڕاوە و شـەکەتم، کـەڕ و کـوێریش بوومـە[٤]. ئیـدی ماڵاوایی لە ئەتابەگ کرد و، لە موسڵ بە دەرکەوت و، هەواڵیشی نارد بۆ بریکارەکانی کـە لەسـەر شـارگەل و قـەڵاکانی خـۆی بـە حـاکمی کردبـوون، هـەمووی ڕادەسـتی سـەرداری موسـڵ بـدەن، ئـەوانیش داواکـەیان بـەجێ هێنـا، تـەنیا (تـبر - طـبر) بریکارەکـەی تکـریتی نـەبێت، ئـەو بـە سـەرداری تکریـت[٥]مایـەوە و، (بـوزان)ی بریکاریشی لە شارەزوور[٦]مایەوە.

(زین الـدین علـي کـجك) گەیشتە هـەولێر، تـەواو پـیر بـوو بـوو، ماوەیـەکی کـەم مایـەوە و، لـە دوادوای سـاڵی (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز)دا مـرد و بـە گۆڕێکیـان سـپارد، بـەناوی

---

(١) الکامل، ١١/ ٣٣١. الباهر، ١٣٥.

مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٢. الروضتین، ١/ ١٥٢.

(٢) ابن العبري

The Chronography, V, I, p. ٢٩٢.

(٣) الکامل، ١١/ ٣٣١. ابن العبري، تأریخ مختصر الدول، ٢١٢.

ابن الفرات، مجلد ٤، ج ١، ص ١٤.

The Encycl of islam, (art, begteginds) V. I, p. ١١٦٠.

(٤) مرآة الزمان، ١٨/٢٧٢، النجوم الزاهرة، ٥، ٣٧٨.

(٥) الباهر، ١٣٥، الروضتین، ١/ ١٥٢. وفیات الاعیان، ٣/ ١٦٧.

(٦) الباهر والروضتین: ن. ص..

خۆیەوە دەناسرا، کەوتبووە تەنیشت مزگەوتە کۆنەکەی ناو شوورەی دەوری شاری هەولێر[١].

(زين الدين علي كچك) ئاسەوار و ئەوقافێکی زۆری لەشاری موسڵ لەپاش بەجێ ما، لەو ماوە دوور و درێژەی کە لەو شارەدا بەسەری بردبوو فەرمانی دابوو بنیاد بنرێن.

(زين الدين علي كچك) هەر لە موسڵ گەورە بووە، پاشان نزیکەی چارەکە سەدەیەکیش بریکاری ئەتابەگی ئەم شارە بووە (٥٣٩ - ٥٦٣ك/ ١١٤٤ - ١١٦٨ز). ئاسەواری گەڵێ خوێندنگە و تەویلە و پردی[٢] لەم شارەدا دیارە و بەناوی خۆیەوە ناسرابوون، بەنموونە، وەك قوتابخانەی (الزينية) کە بە قوتابخانەی (يونس النحوي الاربيلي)یش ناو دەبرا[٣].

---

(١) وفيات الاعيان، ٣/ ٢٧٠. ابن عذيبة، مخطوط (انسان العيون)، ٢٩٢.

دەربارەی مردن و ناشتنیشی لە هەولێر، بنۆڕە: ابن الأثير، الكامل، ١١/ ٣٣١. الباهر، ١٣٥. مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٢. كتاب الروضتين، ١/ ١٥٢.

ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، مجلد ٤٧، جـ ١ لسنة ١٩٥٣، ص ١٩.
The Chronography, V. I, p. ٢٩٢.

ابن الفرات، تأريخ ابن الفرات، مجلد٤، جـ ١، ص ١٤.

"مێژوونووس، أبو الفضائل محمد بن علي الحموي، لە کتێبەکەی خۆیدا، - التأريخ المنصوري - ط موسكو ١٩٦٠، ص ١٧٧، تەنیا مێژوونووسێکە دەڵێت: "زين الدين علي كچك بە تووڕەیی لە موسڵ بەدەرکەوت، کە گەیشتە ئەربیل نەخۆش کەوت و دوای یەك مانگ مرد". تەنیا (الفارقي)یش گوتوویەتی: (زين الدين علي كچك) ساڵی ٥٦٤ك مردووە. سەیری پەراوێزی لاپەڕەی ٢٨١ی کتێبەکەی (ابن القلانسي) (ذيل تأريخ دمشق) بکە.

(٢) مرآة الزمان، ٨/ ٢٧٣. ابن الأثير، الباهر، ١٣٦. ابن خلكان، ٣/ ٢٧٠.

(٣) د. داود الجلبي، مقال تحت عنوان (الملك بدرالدين لؤلؤ والآثار القديمة في الموصل)، مجلة سومر، جـ ١، لسنة ١٩٦٤، ص ٢١.

# فەسلی دووەم

**یەک**: بریكارەكانی زین الدین علی كچك لە حوكمكردنی هەولێردا.

١- سرفتكین كوڕی عبدالله الزینی.

٢- مجاهدالدین قایماز كوڕی عبدالله الزینی.

٣- عزالدین الیاس كوڕی عبدالله الزینی.

٤- دەرچوونی موزەففەرەددین گۆكبوری لە هەولێر

**دوو**: میر زین الدین یوسف ینالتكین - كوڕی زین الدین علی كچك - سەرداری هەولێر.

# فەسلی دووەم

## یەك: بریکارەکانی (زین الدین علی کچك) بۆ هەڵسووڕاندنی حوکم لە هەولێر:

گوتمان، هەرکە ئەتابەگ (عماد الدین زەنگی) ئەربیلی داگیر کرد، شارەکەی بۆ سەرلەشکرەکەی خۆی (زین الدین علی کچك) دابڕ کرد. ئەمیش لەساڵی ٥٣٩ تا ٥٦٣ك (١١٤٤ - ١١٦٨ز) بریکاری ئەتابەگ بوو لە موسڵ، ئیدی موسڵی بەجێ هێشت و گەیشتە هەولێر، ئەو، چەند ڕۆژێکی کەمی لەژیاندا مابوو، حەزی دەکرد لەم شارەدای بەسەر بەرێ.

بەڵام (زین الدین علی کچك) کە هێشتا لە موسڵ بوو، بەر لەوەی بچێتە هەولێر، بریکاری لە جیاتی خۆی بۆ حوکمی هەولێر دادەنا، تا کاروباری شارەکە بەڕێوە ببەن. بریکارەکانیش ئەمانەن:

### ١- (سرفتکین ابو منصور) کوڕی (عبدالله الزینی) (... - ٥٥٩ك/ ... - ١١٦٣ز):

دەربارەی سەرەتای دامەزراندنی ئەم بریکارە هیچ سۆراخێکمان بە دەستەوە نییە. پێدەچێ یەکەم کەس بووبێ سەرداری هەولێر، دوای گرتنی شارەکە بۆ بەڕێوە بردنی داینابێت. (سرفتکین)[1] ئەرمەنی بوو، پاشان بوو بە ئیسلام و، (زین الدین علی کچك)ی خاوەنی سەرفرازی کرد. وا دیارە لە هەڵسووڕاندنی هەولێردا توانستی نواندووە و خاوەنی (گەورەی) خۆی ڕازی کردووە، هەر لەبەر ئەوەشە کە بۆ حوکمی هەولێر بەچاکی زانیوە و نەیگۆڕیوە.

(سرفتکین) هەندێ دامودەزگای لەناو شاری هەولێر و دەرەوەی شارەکەدا

---

(١) سرفتکین في الصفدي/ مخطوط الوافي بالوفيات، ٨/ ١٨.

دامەزراند. لە سەردەمی ئەتابەگیدا، ساڵی (٥٣٣ك/ ١١٣٨ز) لەناو شارەكەدا، یەكەم قوتابخانەی دامەزراند، ناونرا (مدرسة القلعة) [١] واتا قوتابخانەی قەڵا، مامۆستایانیشی لەسەر دامەزراند و (الشیخ الخضر بن نصر بن عقیل الاربیلي الشافعي - (ت ٥٦٧ك/ ١١٧١ز) كرد بە سەرۆكی مامۆستاكان.

ئەم بریكارە، مزگەوتگەلێكی لە هەولێر و گوندەكانیدا بنیاد نا، هەروەها هەندێ پرۆژەی خێرخوازییشی لە دەرەوەی ئەمارەتەكە دامەزراند، ئەوەبوو، شوورەی بۆ شاری (فید) [٢] دروست كرد.. بە قسەی (ابن خلكان) [٣] هەموو ئەو شتانەی لە كیسەی خۆی دروست كردووە. ئەگەر خۆیشی لە هەولێر ئامادە نەبووایە، میر (الحسین بن گرجی بن هارون الاربیلی) كە یەكێك بووە لە میرەكانی هەولێر[٤]، لەجیاتی خۆی حوكمی دەگرتە دەست و بەڕێوەی دەبرد. سەرفتگین حوكمی ئەمارەتەكەی هەڵسووڕاند تا لە ساڵی (٥٥٩ك/ ١١٦٤ز) دا كۆچی دوایی كرد. بەمردنی ئەویش، میر (زین الدین علی كچك) حوكمی هەولێری بە (مجاهد الدین قایماز) سپارد[٥].

## ٢- (ابو منصور مجاهد الدین قایماز) كوڕی (عبدالله الزینی):

بریكاری (نوێنەری) (زین الدین علی كچك) بووە لە هەولێر (٥٥٩ - ٥٧١ك/ ١١٦٤ - ١١٧٥ز). ئەم (مجاهد الدین قایماز)ە خەڵكی سجتان[٦] بووە و بەمنداڵی لەوێوە هێنراوە و، بووەتە كۆیلەیەك لە كۆیلەكانی (زین الدین علی كچك) و لە سێبەری

(١)باسی ئەم قوتابخانەیە لە جێگەیەكی تردا دەكەین.

(٢)فید: شارۆچكەیەكە لە نیوەڕێی نێوان مەككە و كوفە. حاجییەكان بار و بارخانەیان لەوێ دەخەن و بەوێی دەسپێرن.. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ٤/ ٢٨٢.

(٣)ابن خلكان، ٢/ ١٣.

(٤)ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٩، ترجمة (هارون) بن الامیر المذكور: (الحسین بن كرجي الاربیلي).

(٥)ابن خلكان، ٤٦٣. الكامل، ١٢/ ١٥٣.

(٦)سجستان: ناحیەیەكی گەورە و، ویلایەتێكی بەرینە، لەشاری هەراتەوە دە ڕۆژە ڕێ (هەشتا قۆناغ) دوورە.. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ٣/ ١٩٠.

ئەم هەرێمە كەوتۆتە باشووری خوراسان.. كي لسترانج، بلدان الخلافة الشرقیة، ص ٣٧٢.

ئەودا پەروەردە کراوە. کاتێکیش گەورەبوو، سیمای بە وێڵی و زیرەکیی پێوە دیار بوو، لەبەر ئەوە خاوەنەکەی (ئاغاکەی) سەرفرازی کرد و، کردی بە ئەتابەگ (لەلە = پەروەرشتکار)ی کوڕەکانی خۆی لە هەولێر چونکە (زین الدین علي) گەنجینە و نەختینە و منداڵەکانیشی لەم شارە دانابوو[1]. پاشان، کاتێك (سرفتگین)ی بریکاری پێشتری هەولێر لەساڵی (٥٥٩ك/ ١١٦٣ز)دا سەری نایەوە، ئنجا حوکمی ئەمارەتەکەی پێ سپارد و، کردی بە بریکاری خۆی کە هەولێر بەڕێوە ببات.

ئیدی لەو بەروارەوە (مجاهد الدين قايماز) کاروباری هەولێری بەجۆرێ هەڵدەسووڕاند، خاوەنەکەی خۆی ڕازی دەکرد. بە هەقیانەت سەیری مسکێنی (الرعيه) دەکرد و، باشترین سەردار بوو، بەکاری خێر و چاکە دەناسراو[2]. کاریگەرییەکی زۆریشی لە هەولێر کرد. ئەوەبوو شارەکەی ئاوەدان کردەوە و، دامودەزگای هەمووەکی (گشتی)ی لەشارەکەدا دامەزراند، گرنگترینیان ئەو خوێندنگەیەیە کە بەناوی خۆیەوە[3]ناودارە. هەروەها خانەقایەکیشی[4]تێدا دروست کرد.

---

(١)الكامل، ١١/ ٣٣١. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ٢١٢.

ابن الفرات، مجلد ٤، جـ ١، ص ١٤.

(٢)الكامل، ١١/ ١٥٣. ابن خلكان، ٣/ ٢٤٦.

ابن الفوطي، تلخيص معجم الآداب، ط/ لاهور، جـ ٥، ص ٨٣ ـ ٨٤.

الغساني، العسجد المسبوك، بالرونيو، ص ٩٢.

ابن الفرات، مجلد ٤، ص ١٦٨.

(٣) باسی ئەم قوتابخانەیەش لە جێگەیەکی دیکەدا دەکەین.

(٤) ابن خلكان ٣/ ٢٤٦. ابن ابي عذيبة، مخطوط (انسان العيون)، ٨٨.

و(الخانقاه - خانكاه): ئەو خانوومیە کە سۆفییان و دەروێشان پەرستشی تێدا دەکەن و وەختی خۆیانی تێدا بەسەر دەبەن، یان وەك (المعتكف)، واتا وەك خەڵوەتخانە وەهایە... بنۆڕە: ابن خلف التبريزي: برهان قاطع، ص ٤١٦.

**٣- (مجاهد الدين قايماز) دوای مردنی (زين الدين علی کچك):**

دەربارەی حوکمی ئەم بریکارە لە هەولێر، زانیاری زۆرمان نییە، هەندەی دەیزانین ئەوەیە کە (زين الدين علی کچك) متمانەی پێ کردووە و لەسەر حوکمی هەولێر هێشتوویەتییەوە و، کاروباری شارەکەش تا پاش مردنیشی لەسالّی (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز)دا بەدەست خۆیەوە بووە و هەردوو کوڕەکەشی[1]: (موزەففەرەدین گۆگبوری و زين الدين يوسف)ی لەژێر چاودێریی ئەودا دانا، حوکمکردنیش - بەڕەفتار - هەر بەدەست ئەوەوە بووە، هەرچەندیشە کوڕە گەورەکەیان واتا (موزەففەرەددین گۆگبوری) پاش مردنی باوکی، لەسەر تەختی هەولێر دانیشت.

(ابن الأثير) لەم بارەیەوە دەڵێت: حوکمکردنی هەولێر - هەر بەناو - بەدەست موزەففەرەددین گۆگبوریەوە بوو، هیچ مانایەکی تێدا نەبوو، وەلێ حوکمی ڕاستەقینە چ بەشێوە و چ بەمانا[2] بەدەست (مجاهد الدين قايماز)ەوە بوو، پێدەچێ

---

(١) سەرچاوەکان دەڵێن: (زين الدين علی کچك) بێجگە لەو دوو کوڕە، کوڕێکی دیکەشی هەبووە، ناوی (آق بوری) بەتورکی واتا (گورگی چەرمگ) بووە. ئێمە هیچ شتێك لەم (آق بوری)یە نازانین، تەنیا هەندە نەبێ ـ کە دوو کوڕی هەبووە، یەکێکیان، ئەوە، میری شاعیر (عیسی کوڕی آق بوری)یە، کە لە سێبەری مامیدا: (موزەففەرەددین گۆگبوری) لە هەولێردا ژیاوە.. عقود الجمان، ٥/ ٢٢٨.

دووەمیان میر (ابو الحسن قطب الدين موسی کوڕی آق بوری)بووە، کە (ابن الفوطي) باسی دەکاو دەڵێت: کابرایەکی چاوتێر بووە، بە بەخشش بووە و، بەدەستخەتی هەندێ لە هەولێرییان، شیعری ئەو پیاوەم دیوە.. بنۆڕە: "مجمع الآداب، ق٤، جـ٤، ص ٢٢٥". وا دیارە (آق بوری) بەر لەساڵی (٥٨٦ك) مردووە، واتا بەر لەوەی (موزەففەرەددین گۆگبوری) حوکمی هەولێر بگرێتە دەست. (ابن الأثير) لە کتێبەکەی (العماد الكاتب الاصفهاني): (البرق الشامي)یەوە وەری گرتووە، کاتێ کە باسی مردنی زين الدين يوسف ابن زين الدين علی کچك) دەکات، دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆگبوری) لەم مردووە زێتر، واتا لە (زين الدين يوسف) زێتر هیچ برای دیکەی نەبوو.. الكامل، ١٢/ ٥٦.

(٢) ابن الأثير، الباهر، ١٧٧.

Setton, A History of the Crusades V. 1, P. ٥٢٦.

ئەو حاڵەتەش لەبەر ئەوە بوّوبێ کە (مجاهد الدین) پێی باش نەبووبێ کاروباری ئەمارەتەکە ڕادەستی سەردارێك بکرێت باڵغ نەبووبێت و منداڵ بێت، چونکە (موزەففەرەددین گۆکبوری) تەمەنی لە چواردە ساڵان زیاتر نەبوو کە باوکی مرد[1]. کەچی لەسەر تەختی ئەمارەتەکەش دانیشت، بەڵام بە ڕێنمایی (مجاهد الدین قایماز) ئیش و کاری بەڕێوە دەبرد.

بارودۆخەکە، هەر بەو شێوەیە بە ئارامی بەردەوام بوو، تا، ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوولا، واتا لایەنی (موزەففەرەددین گۆکبوری) کە مافی خۆیەتی و، حوکمی بەمیران لە باوکەوە بۆ ماوەتەوە چونکە کوڕە گەورەی دامەزرێنەری ئەمارەتە ئەتابەگییەکەی هەولێرە، بەڵام هەندە هەیە لەبەر منداڵیی نەیدەتوانی شارەکە بەڕێوە ببات و، ئەو ئەزموونەشی نەبوو بتوانێ شان بداتە بەر باری گرانی حوکم و حوکمڕانی. هەرچی لایەنی دووەمە، ئەوە، پشت بە باوەڕ و متمانەی دامەزرێنەری ئەمارەتەکە دەبەستێ کە پێی دابوو، وێڕای ئەو هەموو ئەزموونەش کە لە ساڵانی حوکمڕانیدا فێری ببوو.

لەو سەرچاوانەوەی کە دەستمان کەوتووە، وادیارە ئەم ناکۆکییە زیاتر تینی سەندووە و، مەسەلەکە گەیشتووەتە ئەوەی کە ئیدی خۆگرتن و بێدەنگی هەڵناگرێت و، هیچ دەرفەتێکی تەبایی و ڕێککەوتنەوەش نەدەڕەخسا- جا، کەوابێ - چارنییە، پێویستە مەسەلەکە بەلایەکدا بکەوێت و یەکجارەکی ساغ بکرێتەوە، ئیدی ئەوە بوو (مجاهد الدین قایماز) غەڵەبەی کرد و گرەوی بردەوە بەوەی کە بەرە بەرە بەخۆشی و بەبێ توندوتیژی، کابرای نەیاری لە تەختی حوکم دوورخستەوە، سەرباری ئەوەش بیانووی شەرعییەتیشی بۆ ئەم ڕەفتارەی هێنایەوە و بەڕاشکاوی بۆ هەموو لایەنەکانی ڕوون کردەوە، کە ململانێ تەنیا لەنێوان خۆی و (موزەففەرەددین گۆکبوری) دا نییە، بەڵکو ململانێکە لەنێوان (موزەففەرەددین

---

(١) وفيات الاعيان، ٣/ ٢٧١. انسان العيون: ٢٩٢.

The Encycl of islam, V, II, P. ١٠٥٧.

گۆگبـوری) و هـەموو بەرپرسـانی حوکمیـشدا هەیـە، ئیـدی بـەو بیـانووە، کەوتـە بانگهێـشتی گـەورە پیـاوانی هـەولێر و ڕاوێـژ و ڕاوێـژکاری لەگەڵیانـدا. کـە دژ بـە (موزەففەرەددین گۆگبوری) چ بکرێت باشە؟ ئنجا. هەموویان بڕیاریان دا کە دووری بخەنەوە (واتا دەری بکەن). ئیدی (مجاهد الدین قایماز) ڕەشنووسی کۆبوونەوەکەی نووسی و، تێیدا ڕوونـی کـردەوە کـە ئـەم مـیرە بـۆ حـوکمکردن ناشـێ. پاشـان لەگـەڵ دیوانی خەلافەتدا پێوەندیی گرت و (موزەففـەرەددین گۆگبـوری)ی باڵبەسـت کـرد و حەپـسی کـرد. (زیـن الـدین یوسـف ینـالتگین)ی بـرای لەجێگـەی دانـا، هەرچـەندە ئەمیش هێشتا هەر منداڵ بوو، پاشان (موزەففەرەددین گۆگبوری) لە وڵات دەرکرا[1].

ئەو هەموو ڕووداوە، ڕوویان داوە، کەچی مێژوونووسان باسی هۆکارەکانی ناکـەن و، تـەنیا هـەر هەنـدە دەڵـێن کـە خـەتای کەللەشـەقی (تعـصب)ی (قایمـاز علـی موزەففەرەددین گۆگبوری) بووە[2]. ئەمە لە حاڵەتێکدایە، کە کەس تانە و تەشەر لە کەسایەتیی ئـەم سـەرداره نـادات لـەم ڕووەوە نـەبێت، بـەڵکو، مێـژوو نووسـان، هـەر هەموویان شاگەشکەن بە ڕەوش و ڕەفتـاری ئـەم پیـاوە و، دەڵـێن کـە: بـە لێبـوردەیی خزمـەتی گەورەکانی خۆی کردووە چ لە هەولێر و چ لە موسڵ[3].

پێدەچێ، گرنگترین هـۆی نـاکۆکیی ئـەم دوو لایەنـە، لەسـەر هەڵوێـستی هـەولێر

(١) ابن خلكان، ٣/ ٢٧١.

ابن أبی عذيبة، انسان العيون، ٢٩٢.

الامام المكي الفاسي، العقد الثمين، ٧/ ١٠١.

(٢) ابن خلكان، ٣/ ٢٧١.

الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨٠. العبر، ٥/ ١٣١.

الامام المكي الفاسي، العقد الثمين، ٧/ ١٠١.

ابن ابي عذيبة، انسان العيون، ٢١٢.

ابن العماد، شذرات الذهب، ٥/ ١٣٨.

(٣) الباهر، ١٨٥، و ١٩٢ ـ ١٩٣. الكامل، ١١/ ١٥٣ ـ ١٥٤، و ١١/ ٤٣٤، و ١٢/ ١٠٠. مرآة الزمان، ٨/ ٤٥٨. وفيات الاعيان، ٣/ ٢٤٦.

بەرامبەر بە موسڵ بووبێت، وەك بڵێین (موزەففەرەددین گۆکبوری) ویستبێتی هەولێر سەربەخۆ بێت و لە موسڵ جیا بێتەوە و، (مجاهد الدین قایماز) ئەوەی بەچاك نەزانیبێت و، زۆربەی پارە و داهاتی هەولێری بۆ موسڵ دەنارد[1].

ئێمە، وەهای بۆ دەچین کە ئەم جۆرە ململانێیە لە هەموو حاڵەتێکدا لەوانەبوو ڕوو بدات، چونکە بە چاوێکی جیاواز سەیری ڕوداوەکانیان دەکرد و هەڵوێستیشیان جیاواز بوو. هەرچی (مجاهد الدین قایماز)ە، ئەوە پیاوێکی لەسەرخۆیەو خاوەن بیر و بۆچوونێکی دروستە. ئەم خەسڵەتەشی لەوەوە بەدیار دەکەوێت کاتێ لەسەر داوای ئەتابەگ (عزالدین مسعود) گەیشتە موسڵ، لەوێ ڕاوێژ و ئامۆژگاریی بەسوودی پێشکەش بە ئەتابەگەکانی موسڵ کرد.

بەڵام (موزەففەرەددین گۆکبوری) هەرزەکارانە دەخوڕی و منداڵانە تاوی دەدا، ئەمەش لەگەڵ سیاسەتی (مجاهد الدین قایماز)دا - کە دەیویست حوکمی دوولایەنە لەسەر ئەم ئەمارەتە یەکلا بکاتەوە - یەکیان نەدەگرتەوە، ئەوەبوو، دەستی لە حوکمی (موزەففەرەددین) وەشاند و، کێشەکەی بەخێر، بۆ خۆی گەڕاندەوە و کۆتایی بە ڕاڕایی و دوودڵی و دوو بەرەکی هێنا.

لێرەدا، بەباشی دەزانین ئەوەش بڵێین کە مێژوونووسی ئەربیل ناسراو بە (ابن المستوفی)[2]- وەك بزانین - تەنها هەر ئەو، پەردەی لەسەر ناوی بریکاری سێیەمی (زین الدین علی) لابردووە و دەڵێت: ناوی (عزالدین الیاس کوڕی عبدالله)یە و، وەك (سرفتگین و قایماز) حوکمی هەولێری کردووە. بەڵام (ابن المستوفی) باسی ئەوەی نەکردووە، ئایا (الیاس) لە چ ساڵێکدا بووەتە بریکار و؟ کەینێ مردووە[3]؟ هیچ

---

(١) ابن خلکان، ٣/ ٢٤٦.

(٢) (شرف الدین المبارك بن احمد الأربلي "ت ٦٣٧هـ/ ١٢٣٩م")

(٣) ساغکەرەوەی کتێبی (تأریخ اربل) دکتۆر سامی السید خمیس الصفار دەڵێت: لە ساغکردنەوەی زانیارییەکانی ناو ئەو کتێبەدا ـ کە دانەرەکەی ناوی ناوە "نباهة البلد الخامل ومن ورد الیه من الأماثل في تأريخ اربل" نەمتوانی: (کەسایەتی و بەرواری حوکموەرگرتنی ـ الیاس بن عبدالله ـ لە اربل ساغ بکەمەوە).

بنۆڕە: تأريخ أربل، جـ٢، ق٢، ص٧٦/ الهامش.

ناونیشانێکیشی نەگوتووە تا بزانین - بەر لەوەی ببێتە بریکار - پێگە و جێگەی کۆمەڵایەتی و ئیداریی چۆن بووە و چی بووە، کەچی بە پێچەوانەوە، دەربارەی (سرفتگین)، دەڵێت (دەرگاوانی میر بووە) [١]و، دەربارەی (قایماز)، دەڵێت (خزمەتکار)[٢]بووە و، (ألیاس)یش تەنیا بە (ئەمینداری[٣]هەولێر) ناودەبات. وا دیارە، ئەم پیاوە - وەکو پێشتریش باسمان کرد - دوای ئەوە حوکمی شارەکەی کردووە کە (مجاهد الدین قایماز) لە موسڵەوە داواکرا. ئەوەتا (جبریل کوڕی محمد کوڕی منعة)ش کە شاعیرێکی هەولێری بووە (ت/ ٥٨٩ك/ ١١٩٣ز) شیعرێکی بۆ پێدا هەڵدانی (قایماز) داناوە و، پاشان گۆڕیویێتی و ناوی (ألیاس)ی لەجیاتی ئەو داناوە چونکە (قایماز) لەوێ نەمابوو، چووبوو بۆ موسڵ، واتا کابرای شاعیر، ئیدی ئیشی بە ئەمینداری کۆن (قایماز) نەماوە و، ناوی ئەمینداری نوێ (ألیاس)ی لە شیعرەکەدا لەجێگەی ئەو داناوە. (ابن المستوفي) دەڵێت: لە شیعرەکەیدا وشەی (كفّ قایماز) هەبوو، دوایی گۆڕیی کردی بە (كفّ ألیاس) لەم بەیتەی خوارەوەدا:

"وندیً الأ ندیً تسكبه كف ألیاس علی مرّ الزمان"[٤]

واتا: لەپی (ألیاس) بە درێژایی زەمەن بە بارشتە و لە خێر و بەرەکەت ناکەوێت.

---

(١) تأريخ اربل، ص ٣٦٤.

(٢) م. ن، ص ٦٣، ٢٣٩.

(٣) ص ١٧٣.

(٤) تأريخ اربل، ص ٧٨... دوای چەندین ساڵ لەوەی کە پلەی ماجستێرم وەرگرت، کتێبەکەی (ابن المستوفي) ساغ کرایەوە و بلاو کرایەوە. لە (دار الرشید) لە بەغدا، ساڵی ١٩٨٠ چاپ کرا. ئەم زانیارییە کەمە، بووە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەیەک، لەساڵی ١٩٨٤دا، گۆڤاری دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاریی عێراقی بەرگی (١١) لاپەڕەی ٣٣٤ ـ ٣٤٩ بە ناونیشانی (أضواء جدیدة علی نواب زین الدین علي کوچك في اربیل) بلاومان کردەوە.

## ٤- دەرچوونی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە هەولێر:

(موزەففەرەددین گۆکبوری) بێدەنگ نەبوو، چەکیشی دانەنا، ئەو بیری لەوە دەکردەوە کە دەبوو شتێك بکات، بیری لە لایەنێك دەکردەوە بتوانێ لەو نەهامەتییەیدا کۆمەکی پێ بکات و فریای کەوێ، یەکەم جار بیری لە بەغدا کردەوە، وای دەزانی خەلیفە[1] دەتوانێت یارمەتیی بدات، یان هەر هیچ نەبێ، خەلیفە بیقۆزێتەوە و بیکات بە بیانووی ئەوەی دەست لە کاروباری هەولێر وەربدات و بیخاتەوە سەر مەملەکەتەکەی خۆی. بەلام ئەم ئاواتەی هەروەکو بزرکانی خەو وەهابوو، هیچی لێ دەرنەچوو[2]، ئەوەبوو، خەلیفە دەستخەرۆی کرد، راستیشت دەوێ خەلیفە نەیدەتوانی هیچی بۆ بکات، چونکە خودی خەلیفە دەمێك بوو، ببوو بە حاکمێکی بێ ئیرادە و بێدەسەلات و، لە دەوڵەتەکەشی تەنیا مەملەکەتێکی بچووکی بەدەستەوە مابوو، هیچ دەسەلاتێکی یەکە و راستی تەنانەت بەسەر

---

(١) مێژوو نووسان ناوی ئەو خەلیفەیەیان نەگوتووە کە ئەودەمە حوکمی بەغدای کردووە و (موزەففەرەددین گۆکبوری) پەنای بۆ بردووە. بەلام ئەگەر ئەو ماوەیەی (٥٦٥ ـ ٥٧٦ك/ ١١٦٩ ـ ١١٨٠ز) کە ئەتابەگ (سیف الدین غازی) تێیدا حوکمی موسڵی کردووە و هەر لەو ماوەیەدا، دوای نائومێد بوونی لە بەغدا ناچار پەنای بۆ موسڵ بردووە "وفیات ٣/ ٢٧١" لەگەڵ ئەو ماوەیەدا کە خەلیفەکانی بەغدا حوکمیان کردووە بەراورد بکەین، ئەوجا، بۆمان دەردەکەوێ، ئەو خەلیفەیە، یان (المستنجد بالله) بووە کە لە ساڵی (٥٦٦ك/ ١١٧٠ز)دا بەهۆی نەخۆشییەکی سەختەوە مردووە... "المنتظم، ١٠/ ٢٣٢. الکامل، ١١/٣٦٠"، یانیش (المستضئ بالله) بووە. کە دەسەلاتێکی ئەوتۆی نەبووە چونکە کاربەدەستانی تەلاری خەلافەت لە وەزیر و سەرکار و میری لەشکر لێی یاخی ببوون "المنتظم، ١٠/ ٣٣٢ ـ ٣٣٣. الکامل ١١/ ٣٦١". پێدەچێ نەیتوانیبێ لەبەر ئەو دۆخە و لەبەر ئەوەش کە تازە هاتبووە سەر تەخت، یارمەتیی (مظفر الدین) بدات.

(٢) وفیات الاعیان ٣/ ٢٧١. العقد الثمین، ٧/ ١٠٢. انسان العیون، ٢٩٣.

ناوچەکانی باکووری بەغداشدا نەبوو[١]، نەخاسمە هەرێمی چیاکان و ناوچەی جزیرە، (بەگشتی) تەنانەت لە ڕۆژانی زەبر و زەنگ و شکۆی خەلافەتی عەبباسیشدا کە خەلیفە حوکمی ئەو دوو ناوچەیەی دەکرد، کێشە و سەرێشەیەکی زۆریان بۆ حوکمی خەلیفە دەنایەوە. لەبەر ئەوە خەلیفەی بەغدا خۆی لێ گێل کردبوو نەیدەویست دەستی تێوەربدا، چونکە - بەڕای ئەو - مەسەلەکە ئەوەی نەدەهێنا، نەخاسمە ئەو کەسەی لە هەولێر جێگای (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی گرتبووەوە، براکەی خۆی بوو، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە، دووریش نییە، خەلیفە بڕوای بە (مجاهد الدین قایماز) کردبێ کە گوتبووی (موزەففەرەددین گۆکبوری) کەڵکی ئەوەی پێوە نییە حوکم بگرێتە دەست. سەرباری ئەوەش، خەلافەت لەو ماوەیەدا کەوتبووە دۆخێکی ئاڵۆز و نالەبارەوە[٢].

(موزەففەرەددین گۆکبوری) بەغدای جێهێشت و بەرەو موسڵ کەوتەڕێ، موسڵ ئەوکات، ئەتابەگ (سیف الدین غازی کوڕی مودود) (٥٦٥ - ٥٧٦ك/ ١١٦٩ - ١١٨٠ز) حوکمی دەکرد، (موزەففەرەددین) خۆی گەیاندێ و ئامادەگیی خۆی بۆ خزمەت نیشان دا[٣]. بەڵام ئێمە بەرواری ئەم پەنابردنەی بۆ موسڵ نازانین، کە ئەگەر بمانزانیبا، بەرواری دەرکردنی لە هەولێر و، سەرەتای حوکمی (زین الدین یوسف ینالتگین)ی برایشمان بۆ ڕوون دەبووەوە، پێدەچێ لە سەرەتای دانیشتنی ئەتابەگ (سیف الدین غازی) لەسەر تەختی موسڵدا بووبێت و هەرکە (موزەففەرەددین گۆکبوری) ئەمەی بیستووە، بەغدای بەجێ هێشتووە و، چووە بۆ لای بۆ موسڵ، بۆ

---

(١) (دکتۆر محمد صالح داود القزاز) لە کتێبەکەیدا (الحیاة السیاسیة في العراق في العصر العباسي الاخیر) دەڵێت: خەلافەت، لەم ماوەیەدا، هیچ دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆی بەسەر وڵاتی کوردانەدا نەبوو.

(٢) سەیری یەکەم پەراوێزی لاپەڕەی پێشتر بکە.

(٣) وفیات الاعیان ٣/ ٢٧١. الذهبي، مخطوط، تأریخ الاسلام، ورقة ١٨١. الفاسي المکی، العقد الثمین ١٠٢/٧

ئەوەی سکاڵای دڵی خۆی بۆ بکا، ئەمە خوایە، تەختی لێ زەوتکراوی بۆ بسەنێتەوە، وەلێ ئەتابەگ ئاواتی میری دەرکراو و لێقەوماوی نەهێنایە دی، بەلام شاری (حران)ی بۆ دابڕی کە بچێتە ئەوێ[1].

دەشبینین، دکتۆر (طلیمات) دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەر لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) پەنای بۆ موسڵ نەبردووە، واتا بەر لە مردنی ئەتابەگ (نورەددین محمود)ی سەرداری حەڵەب پەنای بۆ موسڵ نەبردووە، چونکە موسڵ، بەدرێژایی ماوەی نێوان (٥٦٦ - ٥٦٩ك/ ١١٧٠ - ١١٧٣ز) سەر بەو ئەتابەگە بووە و، (سیف الدین غازی)یش هەر سەر بەو بووە و دەسەڵاتی ئەوەیشی نەبووە زەوی بۆ کەس دابڕێت. کەواتا هانا بردنی (موزەففەرەددین گۆگبوری) بۆ موسڵ - بەقسەی طلیمات - دوای مردنی نورەددین (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) بووە، کاتێ کە (سیف الدین غازی) موسڵی سەندەوە[2]و، دەسەڵاتی ئەوەی کەوتەوە دەست کە زەوی بۆ هەر کەسێ دابڕێ، ئیدی، بەو جۆرە، شاری (حران)ی بۆ (موزەففەرەددین گۆگبوری) دابڕی.

ئێمەش لەم ڕووەوە دەڵێین: بەڵێ، (سیف الدین غازی) - بەڕاستی - لەماوەی نێوان (٥١٦ - ٥٦٩ك)دا بوو بە دەسدای (نورەددین محمود)ی مامی. وەلێ، ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئیدی نەیدەتوانی دەستکاری کاروباری وڵاتەکە بکات، نەخاسمە (سەر بە حەڵەب بوونی) موسڵ حوکمی (سیف الدین غازی)ی لا نەبرد[3]، بەڵکو نورەدین محمود، دوای ئەوەی موسڵی خستە سەر مەملەکەتەکەی خۆی، تەنیا بیست و چوار

---

(١) هەمان ئەو سەرچاوە و لاپەڕانەی لە پەراوێزی پێشتردا ئاماژەیان پێدراوە.

(٢) د. طليمات: مظفرالدين كوكبري امير اربل، ص ٧٠ ـ ٧١.

دکتۆر (محمد باقر الحسيني) دەڵێت: (مظفر الدين گۆگبوری) لە ساڵی (٥٦٣ك)دا دەرکراوە، واتا ساڵی مردنی (زين الدين علي كجك)ی باوکی، سەیری کتێبەکەی خۆی (العملة الاسلامية في العهد الاتابكي) بکە، لاپەڕەی ١٣٨. ئەمەش بێگومان وەها نییە و هەڵەیە.

(٣) الكامل، ١١/ ٣٦٤. ابن قاضي شهبة، الكواكب الدرية في السيرة النورية، ص ١٩١.

ڕۆژ لە موسڵدا مایەوە و[١]، گەڕایەوە بۆ حەڵەب و، کاروباری موسڵی بۆ (سیف الدین غازی) بەجێ هێشت، ئیدی مێژوو نووسان هیچیان بۆ نەمایەوە لەوە زیاتر کە بڵێن: سەرداری موسڵ لەو ڕۆژەدا کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) پەنای بۆ بردووە، (سیف الدین غازی) بووە[٢].

## دوو: میر (زین الدین یوسف ینالتگین) کوڕی (علی کچك) سەرداری هەولێر:

(زین الدین یوسف ینالتگین) [٣]بەسەرپەرشتی ئەتابەگ حاکمی ڕاستەقینەی ئەم ئەمارەتە (مجاهد الدین قایماز) [٤]، لە هەولێردا دەستی بە حوکم کرد.

وێڕای ئەمەش کە ئەم میرە بزاڤ و چالاکی سەربازیی هەبووە، چ لەبواری پاراستنی هەولێر لە هەڵپە و تەماعی موسڵ، چ لەو بوارەشدا کە لە شەڕی خاچدروشماندا بەشدار بووە و چووەتە ژێر ئاڵای سەلاحەددینی ئەییوبی و، یەکەم میریش بووە لەو میرانەی کە لە ڕیزەکانی لەشکری سەلاحەددیندا جەنگاوە، کەچی مێژوو نووسان و ڕەوشتنووسان باسی ژیان و ئیشەکانی ئەم میرەیان نەکردووە.

ئەمە، سەرباری ئەوەش کە ئەم میرە بە خەسڵەتی باڵاو چاکەی بەردەوامی خۆی، لەو ماوەیەدا، ئەو پلە و پایە پرشنگدارەی بەدەست هێناوە.

(العماد الکاتب الاصفهانی) کە بەرچاوترین مێژوو نووسی ئەو دەورانە بووە، میر

---

(١) الکامل، ١١/ ٣٦٥.

(٢) وفیات الاعیان، ٣/ ٢٧١.

الذهبي، مخطوط، تأریخ الاسلام، ورقة ١٨١.

الفاسي المکي، العقد الثمین، ٧/ ١٠٢.

(٣) (عماد الدین الکاتب الاصفهاني) وشەی (ینالتگین)ی خستووەتە سەر ناوی ئەم میرە ـ (الفتح القسي، ٢٩٨، ط لیند).

(٤) ابن الأثیر، الباهر، ١٧٧. الکامل، ١٢/ ١٥٣.

(زین الدین یوسف) بە چاکەکار و چاوتێر و خێرخواز ناو دەبات و گەلێکیشی بە شان و باڵدا هەڵداوە[١]. (ابن تغری بردی)یش دەڵێت: (زین الدین یوسف) میرێکی مەزن و ئازا و بوێر و قاڵ بووە[٢]. وەلێ ئەم دوو مێژوو نووسە و - هی دیکەش - لەبیریان چووە هەندێکیش لە ڕەوش و ئیشی باس بکەن، دووریش نییە، ئەم لەبیرچوون و کەمتەرخەمییە، میرانی دیکەشی بێبەخت کردبێت.

هەندێکان ئەم کەمتەرخەمییە بەوە لێك دەدەنەوە کە ڕەوشتی (زین الدین علی کچك)ی باوکی و ڕەوشتی (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی مامی غەڵەبەی لەسەر ڕەوشتی ئەمیشدا کردووە[٣]. هەرچەندە ئەم قسەیە ڕاستە، وەلێ ناوبانگی (زین الدین یوسف ینالتکین) نەگەیشتبووە ناوبانگی باوکی و برایەکەی. بەڵام ئەم بۆچوونە پاساوی ئەو کەمتەرخەمییەی تێدا نییە کە بزانین بۆچی مێژوونووسان باسی ڕەوشتی ئەم میرەیان پشتگوێ خستووە؟ بە پێچەوانەوە، هەق وابوو، لەبەر ناوبانگی باوکی و براکەی، باسی ڕەوشتی ئەمیشیان کردبا، نەخاسمە، ئەم میرە (واتا زین الدین یوسف) نزیکەی بیست ساڵ (٥٦٦ك/ ١١٧٠ز) - (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) لە هەولێردا حوکمی کردووە.

خۆ ئەگەر ئەو ماوەیەشی لێ لابدەین کە لەبەر منداڵی، دەسەڵاتی حوکمڕانی نەبووە و، (مجاهد الدین قایماز) لەجیاتی ئەو ئەمارەتەکەی بەڕێوە بردووە، ئەوا، ئەو ماوەیەی کە بە ڕاستەقانی حوکمی ئەمارەتەکەی تێدا کردووە. لە (٥٧١ك/ ١١٧٦ز)ەوە دەست پێ دەکات تاوەکو (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)، واتا لەو ساڵەوەی کە (مجاهد الدین قایماز) هەولێری بەجێ هێشت تا قەڵای موسڵ بگرێتە دەست و، ببێتە بریکاری ئەتابەگ لە موسڵ (٥٧١ك)، لەو کاتەوە، (زین الدین یوسف) - بەدەستی

---

(١) الفتح القسي في الفتح القدسي، ط لندن، ١٨٨٧، ص ٢٩٨.

ئەوەی (ابو شامة)یش کە لە (الروضتين) ٢/ ١٦٤دا باسی دەکات، هەر لەوی وەرگرتووە.

(٢) النجوم الزاهرة، ٦/ ١١٢.

(٣) د. طليمات، مظفر الدين گۆکبوری أمير أربل، ص ٤٨.

خۆی - حوكمی ئەو ئەمارەتەی كرد تا لە ساڵی (٥٨٦ك)دا گیانی سپارد.

(عباس العزاوي) لەم ڕووەوە دەربارەی كەمتەرخەمیی مێژوو نووسان كە باسی ڕەوشتی ئەم میرەیان نەكردووە، دەڵێت: عاجباتییە، مێژوو نووسان باسی كارەكانی ئەم میرەیان نەكردووە، تەنیا وەك چاو تروووكاندنێك یان وەك تیژیی بروسكەیەك بەسەریدا تێپەڕیون[1]. لەبەر ئەوە لە چالاكییە سەربازییەكانی زێتر هیچی تر لەسەر ئیشەكانی نازانین. لە دوا دوای ساڵی (٥٧١ك/ ١١٦٧ز)دا ئەتابەگی موسڵ (سیف الدین غازی)، (مجاهد الدین قايماز)ی لە هەولێرەوە بانگ كرد بۆ موسڵ بۆ ئەوەی بیكات بە بریكاری خۆی[2]و سوود لە ئەزموونە سەربازییەكانی كە لە كۆمەكی سەلاحەددینی ئەییوبیدا فێری ببوو ببینێ و گوێ لە ئامۆژگارییەكانی بگرێت. جا، ئەم بانگكردنە و، ئەم دووركەوتنەوەیەی (مجاهد الدین قايماز)ە لە هەولێر، بوو بە هەلێك و، بۆ (زین الدین یوسف) ڕەخسا، كە بەبێ كێبڕكێ، بەتەنیا، دەست بەسەر حوكمدا بگرێت، ئەوەبوو كاتێكیش هێز و توانستی بەخۆیەوە دی، ئیدی ئاڵای یاخیبوونی لێ هەڵكرد و، ئەمارەتی ئەربیلی لە موسڵ جیا كردەوە، پاشانیش خۆی گەیاندە ڕیزەكانی سەلاحەددینی ئەییوبی و، ملی ئیتاعەتی بۆ كەچ كرد و[3]، ئەتابەگییەكی لە موسڵ دابڕاوی دامەزراند.

سەرچاوەكانیش تەكەز دەكەن كە (زین الدین یوسف) دوای ئەو بەروارە، دەسدایی ئەمارەتەكەی بە موسڵەوە نەهێشتووە. مێژوو نووسی پێوەندخۆش بە تەلاری موسڵەوە (ابن الأثیر) دەڵێت: كاتێ ئەتابەگ (عزالدین مسعود)، بریكارەكەی خۆی (مجاهد الدین قايماز)ی باڵبەست كرد، میری هەولێر ئەم هەلەی قۆستەوە و،

---

(١) عباس العزاوي، مقال (آل بكتگين امارة اربل في عهدهم)، في مجلة المجمع العلمي العربي - دمشق، مجلد ٢١، ص ٥٢٤.

(٢) ابن الأثير، الكامل، ١١/ ٤٣٤. ابن خلكان، وفيات الاعيان ٣/ ٢٤٦، ط ١٩٤٨.

(٣) الروضتين، ٢/ ٦١.

دابڕینی وڵاتەکەی لە ئیتاعەتی موسڵ ڕاگەیاند و، لە موسڵ جیا بووەوە[١]. ئیدی هەولێر لەو بەروارەوە، بوو بە گرێیەك لە سەر دڵی سەرداری موسڵ[٢]. پاشان (زین الدین یوسف) ئەم باسوخواس و کارانەی خۆی نارد بۆ سەلاحەددینی ئەیوبی و بۆی ڕاگەیاند کە ئەمارەتەکەی خۆی دەخاتە ژێر ئیتاعەتی ئەووەوە[٣].

هەرکە میری هەولێر، جیاکردنەوەی ئەمارەتەکەی خۆی لە موسڵ لە ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز)دا ڕاگەیاند و، چووە پاڵ مەملەکەتەکەی سەلاحەددینی ئەیوبی، ئنجا (عزالدین مسعود) بۆی دەرکەوت، ئەو ئیشەی ئەم میرە کردی، مەترسییەکی گەورەی بۆ ئایندەی ئەتابەگییەکەی دەبێت، کە لەوە دەچوو کەوتبێتە نێوان دوو ئاگرەوە، دوژمنێکی بوێر و جوامێر و کەڵە پیاو گەمارۆی داوە و بەتەمایەتی کە ناوی سەلاحەددینی ئەیوبییە.

ئیدی، ئەتابەگی موسڵ، لەوە زێتر کە هانا بەرێتە بەر خەلیفەی عەبباسی (الناصر لدین الله)، (٥٧٥ - ٦٢٢ك/ ١١٣٥ - ١١٨٠ز) ئەمە خوایە، ململانێی نێوان خۆی و سەلاحەددینی ئەیوبی ببڕێنێتەوە، هیچ دەسەڵاتێکی دیکەی نەمابوو. ئەوەبوو خەلیفەش کەوتە نێوانیان و، کاربەدەستێکی دیوانی خۆی (شێخ الشیوخ صدرالدین عبدالرحیم بن اسماعیل)ی نارد بۆ موسڵ و، لەوێش نوێنەرێکی ئەتابەگی (قاضي القضاة أبو حامد محي الدين محمد بن كمال الدين محمد بن عبدالله بن القاسم الشهرزوري)ی لەگەڵ کەوت و، بوون بە شاندێك. شاندەکە گەیشتە دیمەشق و سەلاحەددینیش لە دیمەشق بوو[٤]. دانوستان لەنێوان هەردوولادا دەستی پێ کرد،

---

(١) الکامل، ١١/ ٥٠٠.

(٢) م. ن. ص

(٣) ن. ص.

ابو شامة، الروضتین، ٢/ ٥٤. ابن واصل، مفرج الکروب، ٢/ ١٥٢... تەنێش، هەر (ابن العبری) دەڵێت: هەولێر لە ساڵی (٥٨١ك)دا کەوتە ناو دەوڵەتی سەلاحەددینەوە، بنۆڕە کتێبەکەی:
The Chronography V. I, P. ٣٢٧.

(٤).سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٣٧٨.

کتاب الروضتین، ٢/ ٥٣ ـ ٥٤.

مفرج الکروب، ٢/ ١٥٦.

بەڵام گیر و گرفتی تێ کەوت، نوێنەری موسڵ سوور بوو لەسەر ناوبردنی هەولێر لە رێکەوتننامەکەدا[1]، واتا دانوستانەکە لەسەر چارەنووسی هەولێر بکرێت و سەرداری هەولێر ئەو مافەی نەبێت بەهەوەسی خۆی هەولێر بخاتە سەر دەوڵەتێك خۆی بیەوێت، چونکە نوێنەری سەرداری موسڵ دەیزانی سەرداری هەولێر لە لایەنی سەلاحەددینی ئەیوبی بەولاوە هیچ لایەنێکی دیکە بەگەن ناکات. بەڵام سوڵتان سەلاحەددین داخواستی ئەوەی موسڵی رەت کردەوە و، گوتی: سەرداری موسڵ مافی ئەوەی نییە باسی بابەتی هەولێر بێنێتە پێشەوە[2]، چونکە سەرداری هەولێر ئازادە چارەنووسی هەولێر دیاری بکات و بەپاڵ کام لایەن دەکەوێ، با بکەوێت، واتا، سوڵتان سەلاحەددین، ئامادە نییە هەولێر هەراج بکات (مساومة). (محي الدين) رازی نەبوو، گوتی: هەولێر هی ئێمەیە[3].

(محي الدين) کەوتە هەرەشە کردن و گوتی: ئەگەر سەلاحەددین پرۆژەکەی بداتە دواوە، ئەوا، ئەتابەگی موسڵ داوای کۆمەك لە شایەکانی عەجەم دەکات (واتا وڵاتی چیاکان و ئازەربێجان). سەلاحەددینی ئەیوبی گوێی بەو هەرەشەیە نەدا و، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەولێر لەگەڵ خۆیەتی و[4]، بەرپەرچی هەرەشەکەی نوێنەری موسڵیشی بە هەرەشەیەکی توندتر دایەوە و[5]، وێڕای ناوبژیوانییەکەی بەغدایش، دانوستانەکە سەری نەگرت. ئیدی بەو جۆرە، رەوشتی نوێنەرەکەی موسڵ، مەسەلەی چارەسەر و یەکلاکردنەوەکەی - وەك سێر هاملتۆن دەڵێت - خستە

---

(١) ابن شداد، النوادر، ص ٦٥.

(٢) الكامل، ١١/ ٥٠٠.

(٣) م. ن. ص: ٥٠١.

(٤) م. ن. ص.

Setton, A History of The Crusades V. 1, P. ٥٧٩.

(٥) العماد الكاتب الاصفهاني، البرق الشامي، على الصفحة ١١٦ من كتاب السير هاملتون جب، (صلاح الدين).

مرآة الزمان، ٨/ ٣٧٨.

خانەی گرێ کوێرەوە[1].

(ابن الأثير) دەڵێت: سەلاحەددینی ئەیبوبی دەیزانی کە دۆخی موسڵ لاوازە و کەوتووەتە لێژی و، ئاگاشی لە ململانێی ناو تەلاری حوکمی موسڵ هەبوو، کە بە فیتی دوو میری گەورەی موسڵ (عزالدين زلفندار و، شرف الدين أحمد بن أبو الخير)، ئەتابەگی ئەم شارە، بریکارە تواناکەی خۆی (مجاهد الدين قايماز)ی دەستبەسەر کرد و، ئەو دوو میرە گەورەیە جێگای بریکارە بەندکراوەکەیان گرتەوە[2]. لەبەر ئەوە، سەلاحەددین بەسەر ئەم لاوازییەوە نەچوو، لەسەر مەسەلەی هەولێر زێتر پێی داگرت و مکوڕ بوو.

هەرچی (زين الدين يوسف)ە، ئەوە، ئەو، لە بەڵای ئەتابەگی موسڵ بەسڵ بوو، لەوە دەترسا ئەمارەتەکەی لەناو ببات هەرچەندیشە سەر بە سەلاحەددینی ئەیبوبی بوو، لەبەر ئەوە دەیویست ڕاگەیاندنێکی فەرمیی لە سوڵتانەوە دەستکەوێ، تێیدا، سوڵتان سەلاحەددین پشتگیری لە هەولێر بکات و، لە هەر دەستدرێژییەکی چاوەڕوانکراو بیپارێزێت و، سنووری ناوچەکانی ئەمارەتی هەولێریشی بۆ دیاربکات کە خۆی دایمەزراندبوو. سوڵتان سەلاحەددینیش دەستبەجێ لە بڵاو کراوەیەکدا[3] لایەنگیری و پشتگیریی لە هەموو ئەو هێزانە ڕاگەیاند کە دەستی یارمەتی بۆ ئیسلامەکانی شەڕی خاچدروشمی دوژمن درێژ دەکەن و، هەر کۆمەڵ و هێزێکیش بە هەوەسی خۆی ڕەفتار بکا و ئایین و هەق و هەقیانەت وەلاوە بنێ و ناهەقی بکا و یارمەتی موسوڵمانان نەدات (لێرەدا مەبەستی یەکەمی لە موسڵ بوو)، ئەوا جەنگی لە دژ بەرپا دەکات.

سەلاحەددینی ئەیبوبی، مەبەستی لە دەرهێنانی ئەو بڵاوکراوەیە ئەوە بوو کە هەڵوێست بەرامبەر بە هەڵوێستی ناڕەوای موسڵ پێشان بدات، چونکە ئەو کات

---

(١) جب، صلاح الدين، ص ١٩٧.

(٢) الكامل، ١١/ ٤٩٩ ـ ٥٠٠.

(٣) بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١).

هەڵوێستی موسڵ بەرامبەربە شەڕی خاچدروشمان کە سەلاحەددین فەرمانداریی دەکرد، خراپ بوو. زیاد لەوەش، سەلاحەددین کۆمەکی بە سەرداری هەولێر دژ بەموسڵ، کرد. ئەم بڵاوکراوەیە، سنووری ئەو ناوچانەشی دەستنیشان کرد کە کەوتنە ناو ئەمارەتی هەولێرەوە. واتا، سەرباری هەولێر هەموو ئەو ناوچانەشی گرتەوە کە زێی بچووکی پێدا دەڕوات، بە شارەزوور و مەڵبەندەکانی هەوارگەی (بنی قفجاق) [١]و هەوارگەی (القرابلی) [٢]و (الدست) [٣]و (الزرزارية) [٤]ی سەر بە شارەزووریشەوە.

بەم بڵاو کراوەیە سنووری ئەتابەگایەتی هەولێر دیاری کراو سیماکەی ڕوون بووەوە، کە هەموو ناوچەکانی نێوان دیجلە - لە ڕۆژاواوە - تا، هەردوو زێ - لە باکوور و باشوورەوە - ی دەگرتەوە و، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە گەیشتە ئەوپەڕی شارەزوور و

---

(١) پێدەچێ، مەبەستی لە ئەمارەتی هۆزی (قفجاق) ـ الأمارة القفجاقية ـ بێت، کە لە ناوچەیەکی نزیک هەولێر دامەزرابوو، شارەزوور و قەڵاکانی شارەزووریشی دەگرتەوە: (الكامل، ١١/ ٧٥. الباهر، ٥٧). هەروەها (الكرخاني ـ الكرخيني) واتا کەرکووکی ئێستایشی، کە لە هەولێرەوە نزیکە، دەگرتەوە، بنۆڕە: (ابن شداد، النوادر، ١٩٨. أبو شامة، الروضتين، ٢/ ١٩٣. وفيات الاعيان، ٣/ ٤٥٨، ط بيروت). سەیری بابەتی: (پێوەندی لەگەڵ ئەمارەتی "القفجاقيه"دا بکە).

(٢) لە (معجم ياقوت البلداني)دا پێناسە نەکراوە، هەروەها لە کتێبەکانی دیکەی (البلدانيين)یشدا ناوی نەهاتووە. ڕەنگە مەبەستی لە (دربند قرابلي) بێت کە (ابن الأثير، لە ـ الكامل، ١٢/ ٥٦ ناوی هێناوە). (د. احسان عباس)یش لە پەراوێز (٢)ی (وفيات الاعيان)دا، ط بيروت، ٧/ ١٧٢، دەڵێت: دەربەند لە ئەیالەتی (کرکور)ە، دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژاوای دیجلە، ڕەنگە دەربەندی بازیانی ئێستای مەبەست بووبێت.

(٣) (الدست): لەوەدەچێ (الدست) نەبێ، (دەشت) بێت، (یاقوت) باسی دەکات و دەڵێت کەوتووەتە نێوان چیاکانی هەولێر و تەورێزەوە، شارۆچکەیەکی ئاوەدانە و خێروبێرێکی زۆری هەیە و، خەڵکەکەی هەموویان کوردن، (معجم البلدان، ٢/ ٤٥٦)

(٤) (الزرزارية)، کتێبگەلی (البلدانيين) پێناسەی ناکەن، بەڵام لە ناوەکەیڕا دیارە مەبەستی شوێنی زراریەکانە.

قـەڵا و مەڵبنـەدەکانی شـارەزوور. سـەلاحەددینی ئـەیيوبی دەیویـست ئـەمارەتێکی مەزن و بەهێز لە ناوجەرگەی ناوچـەیەکی نـەیاری خۆیـدا دامـەزرێنێت کە لـە لای ڕۆژهەڵاتییەوە بە (وڵاتی چیا) بە سەرۆکایەتی (شمس الدین البهلوان محمد ابن ایلدکز (ت ٥٨٢ك/ ١١٨٦ز) [١]و بە وڵاتی ئازەربێجان بە سەرۆکایەتی (قـزل أرسـلان عثمـان بـن ایلـدکز) - لەسـاڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) [٢]دا کـوژرا - کـە هـەردووکیان نـەیار و دوژمـنی بـوون[٣]، دەوره بـوو.. لـە لای ڕۆژاوایـشەوە ئەتابەگایـەتیی موسـڵ دەورەی دابـوو کـە هـەتا سـاڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)یـش دوژمنایـەتیی سـەلاحەددینی دەکـرد، کـە ئیـدی لـەو سـاڵەدا پەیماننامـەی تـەبایی لـە نێـوان هـەردوو لادا مـۆرکرا و بـەپێی ئـەو پەیماننامەیەش، موسڵ کەوتە ژێر ڕکێفی سەلاحەددینی ئەیيوبییەوە[٤].

**(زین الدین یوسف ینالتکین) بەسەر تاڵانکاراندا سەرکەوت:**

ئەتابەگ (عزالدین مسعود) بۆی دەرکەوت کە بەنـد کردنـی بریکارێکی توانـا و زیرەکی وەك (مجاهدالـدین قایمـاز) لـە ئـازاری ئـەو و، دامـاوی و دەسەپاچـەیی خۆی بەرامبەر بـە سـەلاحەددین هیـچی تـری تێـدا نییـە و هەسـتی کـرد کەسێکی وەهـای نەماوە، لەم دۆخە ناهەموارە و پێگە شلۆقەیدا پـرس و ڕایـەکی پـێ بکـات. هـەروەها بۆیشی ساغ بووەوە، ئەو دوو میرەی، جێگای ئەم بریکارەیـان لـە ئەتابەگایەتییەکەدا گرتووەتەوە، نەیانتوانیوە جێگای پڕ بکەنەوە. لەبەر ئەوە، ئـازادی کـرد، بـەڵام پـاش ئەوەی نزیکەی دە مـانگی لـە زینـدانـدا کێشا[٥]. لەسـەر تکـای (شمـس الـدین البهلـوان

(١) الکامل، ١١/ ٥٢٦.

(٢) م. ن. ١١/ ٧٥ ـ ٧٦.

(٣) م. ن. ١١/ ٥٠٤. مرآة الزمان، ٨/ ٣٧٨.

(٤) الکامل، ١١/ ٥١٧. الروضتین، ٢/ ٦٤.

(٥) الباهر، ص ١٨٤.

محمد بن ایلدکز) سەرداری وڵاتی چیا[١]، لە زیندان دەری کرد.

هەر، کە (مجاهد الدین قایماز) بەردرا، (عزالدین مسعود) ناردی بۆ لای سەرداری وڵاتی چیا و (قزل أرسلان عثمان بن ایلدکز) برای کە سەرداری وڵاتی ئازەربێجان بوو بۆ هانابردن و داوای کۆمەککردن دژ بە سەلاحەددینی ئەییوبی و سەندنەوەی هەولێر کە کەوتبووە ژێر ئاڵای سەلاحەددینەوە[٢]. پێش ئەمەش، باسی (قاضي القضاة ابا حامد محي الدين) مان، کرد کە بە نوێنەرایەتیی ئەتابەگی موسڵ، چوو بۆ دیمەشق و لەگەڵ سەلاحەددین کەوتبووە دانوستان و هەڕەشەی لێ کردبوو کە ئەتابەگی موسڵ ناچار دەبێ هانا بەرێ بۆ هەردوو سەردارەکەی وڵاتی عەجەم، "مەبەستی لە هەردوو کوڕەکەی - ایلدکزە - کە باسمان کردن"، هەردووکیان دەکات بە گژیا، ئەگەر سوور بێت لە سەر موڵکایەتیی هەولێر[٣]، برایان (بهلوان و، قزل أرسلان) کە نەیاری سوڵتان بوون، دەیانزانی ئەگەر هەولێر بچێتە ژێر ئاڵای سوڵتان سەلاحەددینەوە، کێشە و مەترسییەکی گەورەیان بۆ پەیدا دەبێت، نەخاسمە بەپێی بڵاو کراوەکەش سنووری هەولێر دەبوو بگاتە سنووری وڵاتەکانی ئەوان واتا، بگاتە سنووری وڵاتی چیاکان و سنووری ئازەربێجان.

(مجاهد الدين قايماز) لەبەرایی ساڵی (٥٨٠ك/ ١١٨٤ز)دا، لە موسڵ دەرچوو، بەرەو وڵاتی عەجەم کەوتە ڕێ، تا گەیشتە ئازەربایجان و، لەوێ خۆی گەیاندە لای سەردار (قزل أرسلان)، ئەویش بەگەرمی پێشوازیی کرد و، دەستبەجێ ئامادەگی خۆی نیشان دا بۆ بەدەنگەوە چوونی ئەتابەگ (عزالدین مسعود) و پێیشی گوت کە پێویست ناکات بچێت بۆ لای (البهلوان ابن ایلدکز)ی برای، ئنجا هەڵگەڕایەوە و پێیگوت:

---

(١) الكامل، ١١/ ٥٠٤.

(٢) م. ن. ص.

(٣) العماد الكاتب، البرق الشامي، على صفحة (١١٦) من كتاب السير هاملتون جب.

صلاح الدين، مرآة الزمان ٨/ ٢٧٨.

"ئەوەی دەتەوێ، من دەیکەم"[١]، پاشان لەشکرێکی سێ هەزار سواری خستە ژێر دەستی، (مجاهد الدين قايماز) و بەرە و هەولێر بەرێی خستن بەنیازی گەمارۆدان و داگیر کردنی شارەکە، بەڵام سەربازەکان بەر لەوەی بگەنە ناو جەرگەی ئەمارەتی هەولێر، هەر بەدەم رێوە، لە شارۆچکە و گوندەکاندا کەوتنە دەستدرێژی و کاولکاری، گوندەکانیان وێران و تاڵان دەکرد، دەستیان بۆ ئافرەتان دەبرد و، بەزۆر راپێچیان دەکردن[٢].

هەواڵ و باسوخواس گەیشتە میر (زين الدين يوسف ينالتگين)، وەلێ، ئەم دۆش دانەما، ناچار هەستا لەشکرێکی تەیار و ئامادە کرد و بەرەو ڕووی چەتە و هێرشهێنان کەوتە رێ و ئازایانە و زیرانە بۆ بەرەنگار بوونەوەیان کەوتە پیلان و تەگبیر، ئەو دەیزانی کە ناتوانێت بە یەك تەکان لەگەڵ سێ هەزار جەنگاوەردا دەسەو یەخە بکەوێتە پەلامار، لە لایەکی تریشەوە، نەدەبوو گوریسیان بۆ شل بکات و بە هەوەسی خۆیان بکوژن و ببڕن و تاڵان بکەن و ئاگری شەڕ و بەڵایان لەوە زیاتر بتەنێتەوە. بەڵام خواو ڕاسان و خۆشبەختانە دیتی، وا دوژمنان بە گوندەکاندا بڵاو بوونەتەوە و، هەر گرووپەو بە لایەکدا سەرگەرمی تاڵان و برۆن - ئەمیش نەیهێشت بە سەریانەوە بچێت، زۆر بەخێرایی پشتی لێیان گرت و، هەر گرووپێکی دیتبا یەکەم جار، بەخۆی و بە قورسایی لەشکرەوە دەیدا بەسەریاندا. کوشتارێکی زۆر لە نێوانیاندا ڕووی دا، تا، بەتەواوی بەسەریاندا سەرکەوت و دوژمنی بەزیو هەڵات و کەلوپەلی زۆر و چەك و تفاق و وڵاغێکی زۆری بەجێ هێشت. بەو جۆرە ئەو عەجەمانە بە دەستی بەتاڵ بەرەو پاش لەکوێوە هاتبوون بۆ ئەوێ گەڕانەوە[٣].

وا دیارە (مجاهد الدين قايماز) نەیدەویست مەسەلەکە بگاتە ئەو ئاستە و تۆڵە لە خەڵکەکە بکرێتەوە. ئەو گەلێکی لە شان گران بوو ئەو هێرشبەرانە بکەونە تاڵان

(١) الكامل، ١١/ ٥٠٤.

(٢) م. ن. ص.

(٣) م. ن. ص.

و سووتاندن و ڕاپێچانی ئافرەتان، چونکە ئەو ڕەفتارانە بە دڵی ئەو نەبوون و بە پیاوێکی ئایینپەروەست ناسرابوو[1]، وەلێ هیچی پێ نەدەکرا و، نەیدەتوانی بەر لەو سەربازانە بگرێت. (ابن الأثیر) دەڵێت: (مجاهد الدین قایماز) دوای شکان و هەڵاتنی هێزەکانی، گەڕایەوە بۆ موسڵ و، دەیگوت: من هەتا ئێستاش چاوەڕوانم خوا تۆڵەی ئەو خراپەکارییەم لێ بکاتەوە کە عەجەم کردی، ئەوەی من لەوانم دی، قەت بە خەیاڵمدا نەدەهات ئیسلام بە ئیسلامی بکات، من دەمگوت: مەکەن، بەڵام ئەوان گوێی خۆیان لێ کەڕ کردبوو، تا، ئەو بەزینە، بەزین[2].

بەڵام ئەگەر لەشان هەولێرەوە سەیری ئەو هەڵاتنە بکەین، دەبینین ئەو سەرکەوتنەی سەربازانی هەولێر بەسەر ئەو جەردە و چەتانەدا بەدەستیان هێنا، هێز و توانستی ئەم ئەمارەتەی پێشان دا و، دەری خست کە دەتوانێ دژ بە داگیرکەرانی دەرەکی بووەستێ و، بوون و سەربەخۆیی خۆیشی لە ئەتابەگایەتیی موسڵ بپارێزێت.

میر (زین الدین یوسف) بەپێویستی زانی باسی ئەم ڕووداوانە بگەیێنێتە سەلاحەددینی ئەیوبی، ئەوەبوو نوێنەری خۆی نارد بۆ دیمەشق، سووڵتان بەم کارەساتە زۆر تووڕە بوو، کەوتە ئامادەسازی بۆ تۆڵە سەندنەوە لە ئەتابەگ، ئنجا، لەپایزی ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا بەرەو موسڵ کەوتە ڕێ[3] و گەیشتە (کفر زمار)[4]،

---

(١) م. ن. ص. هەروەها: ابن شداد، النوادر: ٦٧.

ابن العدیم، زبدة حلب، ٣/ ٨٠.

ابو شامة، الروضتین، ٢/ ٦٠. ابن واصل، مفرج الکروب، ٢/ ١٦٣.

ابن خلدون، کتاب العبر، ٥/ ٥٨١. Setton, V. I. P. ٥٨٠.

(٢) الکامل، ١٢/ ١٥٣ ـ ١٥٤. الباهر، ١٩٣.

وفیات الاعیان، ٣/ ٢٤٦. ابو الفداء، المختصر في اخبار البشر، ٣/ ٩٧.

(٣) کتاب الروضتین، ٢/ ٦٠.

(٤) (کفر زمار): گوندێکە لە گوندەکانی موسڵ، معجم البلدان، ٤/ ٤٦٩.

وەلێ نەیتوانی درێژە بە ڕێگا بدات، دیارە زانیبووی بۆی ناکرێ موسڵ داگیر بکات[١].

ئەم تەکانەش، تەکانی سێیەم و (دوا تەکان)ی بوو دژ بەم ئەتابەگایەتییە[٢].

سەلاحەددینی ئەییوبی، دوو مانگ لە (کفر زمار) مایەوە، لەو ماوەیەدا تەتەر لەنێوان خۆی و ئەتابەگی موسڵدا دەهاتن و دەچوون، تا، لەئەنجامدا ئاشت بوونەوە - (ابن شداد) دەڵێت: موسڵ ناچار بوو ئەم سوڵحە مۆر بکات چونکە ئەتابەگی موسڵ (عزالدین مسعود) نەیتوانی هیچ کۆمەکێ، نە لە بەغدا و نە لە هەردوو مەلیکەکەی عەجەم (البهلوان و، قزل أرسلان) وەربگرێت و تەنانەت کەف و کوڵێکی دڕۆیشیان دژ بە سەلاحەددین دەست نەکەوت[٣]. لەبەر ئەوە، ئەتابەگ نەخۆشکەوتنی سەلاحەددینی بە هەل زانی و، دەشیزانی کە سەلاحەددین لەم بارەدا قسەی ناشکێنێ و دڵیشی نەرمە[٤]. ئیدی بەم تەبایینامەیە پێکدادانی نێوانیان کۆتایی هات کە لە دە ساڵ پتر درێژەی کێشا. (مجاهد الدین قایماز) ڕۆڵێکی بەرچاوی لە مۆرکردنی ئەو تەبایی نامەیەدا گێڕا[٥].

بەپێی ئەم تەبایینامەیەش، ئەمارەتی موسڵ کەوتە ژێر ئاڵای سەلاحەددینی ئەییووبییەوە، ئیدی ناوی سوڵتان سەلاحەددین کەوتە سەر خوتبە و دراویش[٦] و

---

(١) الكامل، ١١/ ٥١٧.

(٢) تەکانی یەکەم لە ساڵی (٥٧٨ك) و، تەکانی دووەم و سێیەم لەساڵی (٥٨١ك)دا ڕووی دا.

(٣) ابن شداد، النوادر السلطانية، ص: ٧٠.

(٤) ن. م. ص.

ئەم مێژوو نووسە، بە قسەکانیدا دەردەکەوێ کە موسڵاوییەکان ناردبوویان، ئەوەتا دەڵێت: "ناردمیان بۆ ئەم ئیشە ـ واتا بۆ سوڵحاندن ـ (لە ساڵی (٥٧٩ك)یشدا ئەتابەگ - عزالدین مسعود ـ ئەوەبوو، ناردی بۆ لای خەلیفە (الناصر لدين الله) بۆ ئەوەی لەگەڵ سوڵتان سەلاحەددین ئاشتی بکاتەوە. بنۆڕە: النوادر السلطانية، ص: ٦٤، ٧٠.

(٥) الكامل، ١١/ ٥١٧.

(٦) ن. م. ص. مرآة الزمان ٨/ ٣٨٤.

الروضتين، ٢/ ٦٤.

مفرج الكروب، ٢/ ١٧٢.

المقريزي، السلوك، ١/ ٨٩ ـ ٩٠.

ناوی سوڵتانی سەلجووقییان لەسەر نەما و، ئەمارەتی هەولێریش ئیتر ترس و گێچەڵی موسڵی لەسەر ڕەوییەوە.

### بەشداربوونی (زین الدین یوسف ینالتگین) لە شەڕەکانی خاچدروشمان و، مردنی لە ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا:

سەرداری هەولێر، هەرچەندە، لەبەلای موسڵ دڵنیا ببوو، وەلێ هەولێری بەجێ نەهێشت و، بۆ ئەو شەڕەش نەچوو کە سەلاحەددینی ئەیوبی دژ بە خاچدروشمانی دەکرد، پێدەچێ ترسی لەوە بووبێت غەدرێك لە هەولێر بکرێت، نەخاسمە لە لایەن (قزل أرسلان عثمان کوڕی ایلدکز)ەوە کە سەرداری ئازەربێجان بوو، ئەوەبوو کە لە ساڵی (٥٨٢ك/ ١١٨٦ز) [1]دا (شمس الدین بهلوان محمد کوڕی ایلدکز)ی برای مرد، وڵاتەکەی ئەویش کەوتە سەر ئازەربێجان و، مەملەکەتەکەی - قزل ارسلان - هەندەی دی زیادی کردبوو، وەکو باسیشمان کرد (زین الدین یوسف) کوتەکی جەرگبڕی لەو لەشکرە گەورەیە وەشاندبوو کە سەرداری ئازەربێجان لەگەڵ (مجاهد الدین قایماز) لە سەرەتای ساڵی (٥٨٠ك/ ١١٨٤ز) [2]دا بەرەو هەولێری ناردبوو، واتا، لەو کۆنە قینەش ترسی هەبوو.

وا دیارە، سەرداری هەولێر (زین الدین یوسف) لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)دا بەشداریی لە شەڕی خاچدروشماندا کردبێ، واتا ئەوکات کە سەلاحەددینی ئەیوبی، لەگەڵ میرەکانی تردا، بۆ شەڕی خاچدروشمان داوای کردبوون[3]. ئەوە بوو، (زین الدین یوسف)یش چوو بە دەنگییەوە و بە (لەشکرێکی چاك و ورەیەکی چاکترەوە) لە لای سەلاحەددین ئامادە بوو[4]، سەلاحەددین جێگای تایبەتی لە ڕیزەکانی

---

(١) الکامل، ١١/ ٥٢٥.

(٢) م. ن. ١١/ ٥٠٤.

(٣) الروضتین، ٢/ ١٥٠. مفرج الکروب، ٢/ ٣٠٦.

(٤) ابن شداد، النوادر السلطانیة، ص ١٢٣.

لەشکردا بۆ میرەکان دانابوو، کاتێکیش سەرداری هەولێر گەیشتە لای، ڕێزی لێنا و، لە قۆڵی چەپی لەشکرەوە، لەگەڵ (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی برای جێگای بۆ کردەوە، کە (موزەففەرەددین)ی برای، ئەوکات سەرداری (حران) و (الرها) بوو، ئەویش لەگەڵ لەشکری سەلاحەددیندا ڕیزی گرتبوو.

(عماد الاصفهانی) بە وشەگەلی هاوئاهەنگ (سجع)، بەسەر شادیی ئامادەبوونەکەی سەرداری هەولێر و لەشکرەکەیدا هەڵدەڵێت و، دەڵێت: "زین الدین یوسف کوڕی زین الدین علی کچك، سەرداری هەولێر گەیشتە جێ، ئەو میرە، خێرکەردەیە و لێبووردەیە، ئومێدچێن و خانەدانە، خاوەن دیوەخان و نانە، پیاوێکی ئەسڵ و ڕەسەنە، خاوەن ڕەوشتی پەسەنە، لەشکرەکەی دەگرمێنێ، هەر دەڵێی تاوی بەهارە، هەوران لە زێڵاوە دێنێ، باران دێنێ، هەرد و وەردان دەنەخشێنێ، خەلە دێنێ، خەرمان دێنێ، بەچەشنی گوانی حوشتران کاسە و جامی پڕ لە شیرە، بۆ سەربازە، بۆ ئەمیرە، بۆ وەزیرە، بۆ گزیرە. ئەو ئەمیرە، چەندی حەزکەی بە تەگبیرە، خەڵکێکی زۆری لەگەڵە، بەکاوە خۆ و نە شڵەژاوە، ترسی لەدڵ دەرهێناوە، نوخشەی ئارامیی لێداوە، موژدەی غەڵبەی هێناوە... ئەمە یەکەم جاری بوو چاوی بە سوڵتان ڕوون بێتەوە و، سوڵتانیش ڕێزی لێنا و بەرەکەتی بەسەردا داباراند... حەشاماتێکی زۆری لەگەڵدا بوون، سەربازانە ڕیز کرابوون، وەستایانە ساز درابوون، میری هەولێر بە فەرمانی سوڵتان، لەنزیك (موزەففەرەددین)ی برایەوە کەوتە قۆڵی چەپی لەشکر و، ترسێکی زۆری خستە دڵی دوژمنانەوە".

**(مردنی- زین الدین یوسف ینالتگین):**

سەرچاوەکان، باسی بزاڤ و چالاکیی سەربازیی (زین الدین یوسف) ناکەن، ئەویش، تا سەر، لەسەر شەڕ، بەردەوام نەبوو، چونکە لە یەکەم شەڕیدا، لەمەیدانی شەڕی خاچدروشماندا، بەڕێکەوت، گیانی سپارد، ئەوەبوو، لە ڕەمەزانی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا نەخۆشکەوت، پێدەچێ لەرز و تای بووبێ، ناوە ناوە تای لێ دەهات،

دەیخست، لەبەر ئەوە نەیتوانی لەڕیزی لەشکر بمێنێتەوە.

ئەوەبوو، داوای کرد کە سوڵتان ئیزنی بدات بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، وەلێ سوڵتان ئیزنی نەدا، ئنجا داوای لێ کرد ڕێگای بدات بچێت بۆ شاری (الناصرة) لە فەلەستین، سوڵتان بەم داوایەی قایل بوو.

(زین الدین یوسف) قەڵاکاری (الخروبة) [1]ی بەجێ هێشت کە کەوتبووە نزیک (عکا)وە، گەیشتە (الناصرة)، لەوێ بە دەرمان و چارەسەرەوە، ماوەیەك خەریکی خۆی بوو، بەڵام بێ هوودە بوو، تایەکەی هەتا دەهات گەرمتر دەبوو، ئەنجام، کۆڵی پێ دا و خستی، شەوی (٢٨)ی ڕەمەزانی[2] هەمان ئەو ساڵە تەواو بوو (مرد). (موزەففەرەددین گۆکبوری) برای بە دیاریەوە بوو، خەڵکی بەمردنی خەمناك بوون، چونکە (زین الدین یوسف) هێشتا لە بەرایی تەمەنیدا[3] بوو، دیارە و ئاخریش بوو[4].

---

(١) (الخروبة): قەڵاکارێکە لە کەنارەکانی دەریای شام و، بەسەر (عکا)دا دەڕوانێت. معجم البلدان، ٢/ ٣٦٢.

(٢) وەك لە: (الروضتین ٢/ ١٦٤) و لە (مفرج الکروب ٢/ ٢٣٩) و لە (وفیات الاعیان ٣/ ٢٧٢)دا هاتووە. وەلێ (ابن شداد) دەڵێت: لە ١٨ی ڕەمەزاندا گیانی سپارد. بنۆڕە: النوادر: ١٤٤، هەروەهاش ئەوەی (عماد الکاتب). بنۆڕە: (الفتح القسي، لیدن، ص ٢٩٨.. لەکاتێکدا، ئەم دوو مێژوو نووسە، بەر لەم ڕووداوەش دەنگوباسی "ڕۆژی ١٩ی ڕەمەزانی هەمان ئەو ساڵەیان باس کردووە: (النوادر، ن. ص)، و (الفتح القسي ٢٩٦)، هەروەها (ابن الأثیر)یش کە لە (العماد)ەوە وەری گرتووە: (الکامل ١٢/ ٥٦). هەروەهاش (الغساني، العسجد المسبوك، ص: ٤٣. بەڵام (ابو الفداء)، نەك، وەك ئەوان، ئەم دەڵێت لە (٨ی شوال)دا مردووە. بنۆڕە: المختصر، ٣/ ٧٩، هەروەها. (ابن الوردی) لە پاشکۆی (المختصر ٣/ ١٤٧)دا.

(٣) لە (مظفر الدین گۆکبوری)ی برای بچووکتر بوو، ئەو، لەساڵی (٥٤٩ك/ ١١٥٤ز)دا لە دایك ببوو. ئەمەش مانای وایە کە (یوسف) لە دەوروبەری نیوەی دەیەی چوارەمی تەمەنیدا بووە.

(٤) ابن شداد، النوادر السلطانیة، ص: ١٤٤. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٤٠٧. ابوشامة، کتاب الروضتین: ٢/ ١٦٤. ابن واصل، مفرج الکروب، ٢/ ٣٣٩. تأریخ ابن الفراق، مجلد ٤، ج١، ص ٢٣٥.

(ابن شداد) کە ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە، بەچاوی خۆی دیویەتی، چونکە ئەو، لە بەرایی (جمادی الاولی/ ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)ەوە[١]، چووبووە ڕیزەکانی لەشکری سەلاحەددینەوە و، هەر لەو بەروارەشەوە لەهەموو شەڕەکانی سەلاحەددینی ئەییوبیدا ئامادە دەبوو. (ابن شداد) دەستی کرد بە نووسینی ئەو ڕووداوانەی کە لەو ماوەیەدا بەچاوی خۆی دەیدین، یان کەسێکی کە بڕوای پێی هەبوو، بۆی دەگێڕایەوە[٢]. بەڵام سەیر لەوەدایە ئەوەی (ابن شداد) دەیگێڕێتەوە و، ئەوەی (العماد الكاتب الاصفهاني) دەیگێڕێتەوە ئاسمان و ڕێسمانە. خۆ، (العماد)یش لەو ڕۆژەوەی کە لە (جمادی الاولی/ ساڵی ٥٧٠ك/ کانوونی دووەمی ١١٧٤ز) [٣]دا چووەتە ڕیزەکانی لەشکری سەلاحەددینەوە، ئەویش شەڕەکانی سەلاحەددینی جێ نەهێشتووە. (العماد) ببوو بە نووسەری نهێنییەکانی[٤]سوڵتان تا ئەو ڕۆژەش کە سوڵتان لە ساڵی (٥٨٩ك)دا کۆچی دوایی کرد.

دەبینین، ئەم مێژوو نووسە بەجۆرێکی ئەوتۆ (موزەففەرەددین گۆکبوری) دەخاتە بەرچاو کە خۆزگەی بە مردنی براکەی خواستبێ، چونکە چاوی لە تەختی هەولێر بڕیبوو، بەئاواتیشەوە بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بگەڕێتەوە و حوکمی هەولێر بگرێتەوە دەست. (العماد الكاتب) وەها باس دەکات کە (زین الدين يوسف ينالتگين) دەرمانیان بۆ پەیدا کردووە بەڵام لە کەسی وەرنەدەگرت تەنیا لە دۆستێکی خۆی نەبێ کە دەرمانی بۆ دەهێنا، چونکە لەوە دەترسا براکەی پزیشکێکی بنێرێتە سەر و بەیەکجاری لەکۆڵی بکاتەوە[٥]. بەڵام (ابن شداد) هەندە دەڵێت کە (زین الدين يوسف

---

(١) ابن شداد، النوادر، ص: ٨٧. ابن خلكان، ٦/ ٨٥، ط ١٩٤٨.

(٢) النوادر: ص. ن.

(٣) ابن خلكان ٤/ ٢٣٥.

الباز العريني. مؤرخو الحروب الصليبية، ص: ٢٢٩.

(٤) ابن خلكان: ص. ن.

(٥) الفتح القسي، ص: ٢٩٨، ط ليدن.

چەندین رۆژ بە دەستی خۆی چارەسەری نەخۆشییەکەی دەکرد، تا، مرد[١].

هەردوو مێژوو نووس (ابن شداد و، العماد) لەسەر ئەوە رێکن کە پزیشك نەچووەتە سەری، یەکەمیشیان بە قەتعی، باسی بزیشکی، هەر نەکردووە، وەلێ دووەمیان دەڵێ: (زین الدین یوسف) لە دەرمانی دۆستێکی خۆی زێتر[٢]، بە دەرمانی هیچ بزیشکێك قایل نەبوو. جگە لەوەش (ابن شداد) گومانی لە نیازی (موزەففەرەددین گۆگبوری) نەکرد، وەك (العماد) کردی، دووریش نییە (ابن شداد) لەبەر ئەوە بێدەنگ بووبێ کە سەروسەختێکی چاکی لەگەڵ (موزەففەرەددین گۆگبوری) دا هەبووە[٣].

(العماد)، کەخۆی لەو رووداوەدا ئامادە بووە و، بەقسەکانیشیدا دەردەکەوێت کە لەگەڵ (زین الدین یوسف) دا بووە، دەڵێت: کە پزیشکی تایبەتی سەلاحەددینی بۆ بانگ کردووە، بەڵام میری نەخۆش دەرمانەکەی لێ وەرنەگرتووە چونکە لێی دڵنیا نەبووە و، لەوە ترساوە موزەففەرەددین گۆگبوریی برای ناردبێتی کە چاوی لە تەختی ئەم بڕیوە، (زین الدین یوسف) بە بڕوای خۆی، دەرمانی برادەرەکەی بەس بوو، وەلێ ئەو برادەرەی نەیدەزانی نەخۆشییەکەی چییە و چی نییە. لەبەر ئەوە نەیتوانی چارەسەری بکات، بگرە، ئارەزووی هەر خۆراکێکیشی کردبا، بۆی دەبرد، پێیشی نەکەوتایە، ئیدی بەو جۆرە، نەخۆشییەکە لێی پیس کردو.. مرد[٤].

لەوەش زیاتر، ئەم مێژوو نووسە دەڵێت: موزەففەرەددین گۆگبوری بەدیار براکەیەوە دانیشتبوو، بەجێی نەهێشت تا مرد، وەلێ هیچ سۆز و خەمێکی پێوە دیار نەبوو، لەبەر ئەوە، دەڵێن: "مردنی براکەی لە بەرژەوەندی ئەو بووە، بۆیە پێی

---

(١) النوادر السلطانية، ١٤٤.

(٢) الفتح القسي: ص. ن.

(٣) وفيات الاعيان، ٦/ ٨٧، ط ١٩٤٨.

(٤) الفتح القسي، ص ٢٩٨.

خۆش بووه"[١] کاتێکیش خەڵکەکە، بۆ پرسە و سەرەخۆشی چوونە لای، پێیان سەیربوو کابرا باکی نەبوو، هەروەکو هیچ ڕووی نەدابێت، وەها بوو، هەر دەتگوت (لەڕۆژی شادیدایە)، لە دەوارەکەیدا (چادرەکەیدا) دانیشتبوو، چاوی لە کەلوپەل و میراتی براکەی بڕیبوو. پاشان سەردارانی قەڵاگەلی هەولێری بانگ کرد و داوای لێ کردن، هەرچییەکیان لە لایە، ڕادەستی بکەن[٢]. پێدەچێ لەوەش ترسابێ کە بگەڕێنەوە بۆ قەڵاکانیان، لێی یاخی ببن.. ئەوەش کە مەسەلەکەی قووڵتر کردووە، ئەو تۆمەتە گەورەیەیە کە (سبط ابن الجوزي) دەیخاتە پاڵ (موزەففەرەددین گۆگبوری) کە گوایا میر (زین الدین یوسف) بەدەستی خۆی چارەسەری خۆی دەکرد و (موزەففەرەددین گۆگبوری)ی برای یاریی دەدا، کە "گوایا زەهرخواردی کردووە و، مردووە"[٣]. جا، ئەوەش کە ئەم تۆمەتەی زێتر لە ڕاستییەوە نزیک کردووەتەوە، ئەوەیە، کە ئەم برایە - بەقسەی ئەو مێژوو نووسە[٤]- بەو مردنە دڵتەنگ نەبووە و، هەر گوێشی پێ نەداوە، وەلێ، ئەوەندە هەیە، ئەم گێڕانەوەیەی (ابن الجوزی) وەك بەچاو دیتەکانی (ابن شداد) و (عماد الاصفهانی) نییە.

ئێمە، لێرەدا نە داکۆکی لە (موزەففەرەددین گۆگبوری) دەکەین و، نە تۆمەتەکەشی بەسەردا ساغ دەکەینەوە، وەلێ پێویستە دەمامك لەسەر ئەم لچ و لێوەش هەڵماڵدرێت و، ئەم ڕووداوە ئاشکرا بکرێت و، قسەی مێژوو نووسەکانی هاوزەمەنیشیان بخەینە بەرچاو کە دەڵێن: لەو کاتەوەی (موزەففەرەددین گۆگبوری) لەسەر تەخت لادراو لە دەوروبەری ساڵی (٥٦٦ك)دا لە هەولێر دەرکرا، پێوەندیی بە گومانی، یان هەر هیچ نەبێ پێوەندیی ناتەبای نێوان ئەم دوو برایە - هەرچەندیشە (زین الدین یوسف) لە بەسەرهاتی براکەی بەر پرس نەبووە، چونکە ئەوکات منداڵ

---

(١) م. ن. ص

(٢) م. ن. ص. کتاب الروضتين، ٢/ ١٦٤.

(٣) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٤٠٧.

(٤) م. ن. ص.

بووە[1]- کارێکی وەهای کرد، خەڵکەکە بکەونە سەر ئەو خەیاڵەی کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) براکەی کوشتبێ، وەك ئەوەی کە (ابن الجوزی) دەیگێڕێتەوە، یان بە مردنی براکەی شاگەشکە بووبێت، وەك ئەوەی (العماد الاصفهانی) دەیگێڕێتەوە. گێڕانەوەی یەکەمیان بەڵگەی لەگەڵدا نییە و لاوازە، لەبەر ئەوە ناگاتە پلەی ڕیوایەتی باوەڕپێکراو، خۆ، کابرای مێژوونووس سوورنییە لەسەر ئەوەی کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) براکەی خۆی کوشتووە، نەخێر، ئەو دەڵێت: "دەڵێن گوایا زەهرخواردی کردووە و مردووە"[2]. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە تۆمەتەکە بەشێوەیەکی بنبڕ ڕەت ناکەینەوە، چونکە، لەو سەردەمەدا، کوشتنی خزم و براو، بگرە، کوشتنی باوك و فرزەندیش، لە تەلاری شا و سوڵتانەکاندا، وەك فوو لە دۆ بکەی ئاسایی بووە.

وا دیارە، ئەو دوو برایە کە لە ژێر یەك دەواردا، پێکەوە بوون و (زین الدین) دەرمانی پزیشکی ڕەت کردووەتەوە، تۆمەتەکە لێرەوە سەری هەڵداوە، وێڕای ئەوەش کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) هەند بە تەنگەوە نەبووە، بەڵکو بە خڕ کردنەوەی میراتی براکەیەوە سەرگەرم بوو[3]. بەڵێ، هەندێ لە میرەکانی برا مردووەکەی دەسگیر کرد، پێدەچێ لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەوەکا لێی یاخی ببن، یان هەولێری لێ

---

(١) (ابن الأثير)، دەڵێت: (زين الدين يوسف، مێرد منداڵێکی بچووك بوو، حوکم و فەرمانی بەدەست نەبوو، لەشکر و فەرمانیش بەدەست ـ مجاهد الدين قايماز ـ ەوە بوو).. الكامل، ١١/ ٥٠٠، ئەم مێژوو نووسە حیکایەتەکەی بەبۆنەی دەرکردنی (موزەففەرەددین گۆکبوری)یەوە (لە دەوروبەری ساڵی ٥٦٦ك) نەگێڕاوەتەوە، بەڵکو بەو بۆنەیەوە گێڕاویەتەوە کە ئەتابەگی موسڵ لە ساڵی (٥٧٩ك)دا، (مجاهد الدين قايماز)ی حەپس کرد. هەرچەندیشە قسەی ئەم مێژوو نووسە موبالەغەی تێدایە، چونکە (زين الدين يوسف) ئەو منداڵە بچووکە نەبووە کە ئەو دەڵێت، ئەگەر بزانین (زين الدين علي كچك)ی باوکی زۆر پیر بووە و لەساڵی (٥٦٣ك)دا مرد.

(٢) مرآة الزمان، ٨/ ٤٠٧.

(٣) الفتح القسي، ط ليدن ٢٩٨ ـ الكامل، ١١/ ٥٦. كتاب الروضتين، ٢/ ١٦٤.

مفرج الكروب، ٢/ ٣٣٩.

داگیر بكەن - بەقسەی (العماد الاصفهانی)[1]- لەبەر ئەوە (موزەففەرەددین گۆگبوری) دەیویست بە هەر نرخێك بێت، واوەست و ملكەچیان بكات، بۆ ئەوەی ئیزن لە سەلاحەددینی ئەییوبی وەربگرێت و، تەختی هەولێر بسەنێتەوە.

(موزەففەرەددین گۆگبوری) كەم و زۆر، هەقی بوو ئەم ڕێكارانە بگرێتە بەر، چونكە هەر كەمتەرخەمییەكی تێدا كردبا، بەزیانی خۆی دەشكایەوە و، ئەنجام تەختی حوكمیشی لەدەست دەچوو، كە هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان كردبوو، لەو ڕۆژەوەش كە (مجاهد الدین قایماز) تەختی لەژێر پێی دەرهێنابوو، هەر بە ئاواتی وەرگرتنەوەی دەژیا، با، ئەمە لەو لاوە بووەستێت، بەلام ئەوەی كە شایانی گومانە ئەوەیە كە مێژوو نووسان (موزەففەرەددین گۆگبوری) تۆمەتبار دەكەن، گوایا - بەقسەی (العماد) - (زین الدین یوسف) دەرمانەكەی لە پزیشكە تایبەتەكەی سەلاحەددینی ئەییوبی وەرگرتووە، نەك لە پزیشكی (موزەففەرەددین گۆگبوری) - ئەگەر ئەمیش پزیشكی خۆی هەبووبێت -، باشە، لەم بارەدا، تۆ بڵێی (زین الدین یوسف) لە نیازی پزیشكەكەی سوڵتان سەلاحەددین بەگومان بووبێت[2]؟

ئەگەر (موزەففەرەددین گۆگبوری) - وەك (سبط ابن الجوزي) دەڵێت گوایا براكەی - زەهرخوارد كردبێ - خۆ، دەبوو (العماد الكاتب)یش، كە خۆی لەوێ بووە، باسی كردبا، نەخاسمە لە سەرەتاوە گومانیشی لەوە دەكرد كە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەو جۆرە لەگەڵ براكەیدا ماوەتەوە و لێی جیا نەبووەتەوە - ئەوەش بە قسەكانیدا دەردەكەوێت واتا قسەكانی (العماد الكاتب)، نەك هەر هەندە، بگرە (العماد الكاتب)، (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەوەش تۆمەتبار دەكات كە بە مردنی براكەی شاگەشكە بووە[3].

---

(١) الفتح القسي، ص. ن.

(٢) ن. م. ص ٢٩٩. النوادر: ١٤٤. الكامل ١٣/ ٥٦ ـ ٥٧. كتاب الروضتين ٢/ ١٦٤.
مفرج الكروب ٢/ ٣٣٩. الغساني، العسجد المسبوك ٤٣ ـ ٤٤.

(٣) الفتح القسي، ط ليدن، ص ٢٩٨.

وەلێ، لەگەڵ ئەم گومانەشدا، کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) وەك سێبەری براکەی لێی دانەبڕاوە، بەڵام تۆمەتباری نەکرد بە کوشتنی براکەی. لەوەوە دەردەکەوێت کە (سبط ابن الجوزي) تۆمەتێکی ناڕەوای داوەتە پاڵ (موزەففەرەددین گۆکبوری). تەنیا مێژوو نووسێکیش کە ئەم تۆمەتەی داتاشیبێ (سبط ابن الجوزي)یە، کە لەو ڕووداوەدا هەر لەوێش نەبووە و، بگرە، هاوزەمەنی ئەو ڕووداوەش نەبووە[1]، جگە لەوانە ڕەخنەیەکی زۆریش لەم حەکایەتەی گیراوە[2].

بەهەموو ئەوانەشەوە، ئەگەر لە قسەکانی (عماد الكاتب) ورد بینەوە، دەبینین دەڵێت، (زين الدين يوسف) دۆستێکی خۆی سەرپەرشتی چارەسەری نەخۆشییەکەی دەکرد، ئەو دۆستەش لەو کارەدا "کۆڵ و ناشی و ناشارەزا بوو"[3]، سەرباری ئەوەش "هەرچی حەزی لێ کردبا، بۆی دەهێنا، دەیخوارد"[4] تا، بۆخۆی گیانی لەدەست دا و مرد. کەچی (سبط ابن الجوزي) دەڵێت، برا (بکوژەکەی) چارەسەری دەکرد.

(موزەففەرەددین گۆکبوری) دوای مردنی براکەی، یەکسەر لەسەر تەختی براکەی دانیشت، ئەم جێگرتنەوە دەستوبردەش، مێژوو نووسانی خستە سەر گومانی ئەوەی، هەریەکە و بە بۆچوونی خۆی، بەدووی بەڵگە و نیشانەدا بگەڕێت و (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی پێ پیاو خراپ بکات. خۆ ئەگەر هاتبا و، بەو پەلەیە و، لەو هەل و مەرجە دراماتیکییەدا تەختی براکەی وەرنەگرتبا، لەوانەبوو، بەم شێوە ناشیرینە تۆمەتبار نەکرابا.

بەهەر حاڵ، باسوخواسی مردنی (زين الدين يوسف ينالتكين) گەیشتە هەولێر، خەڵکەکەی شڵەژا، هەندێکیان، ناردیان لە دووی (مجاهد الدين قايماز) بریکاری

---

(١) سبط ابن الجوزي، لەساڵی (٥٨١ك)دا لەدایك بووە.

(٢) عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين، ص ٧٣.

(٣) الفتح القسي، ن. ص.

(٤) م. ن. ص.

ئەتابەگی موسڵ، کە بگەڕێتەوە بۆ لایان و، دووبارە حوکمی ئەمارەتەکە بگرێتەوە دەست، چونکە، ئەو، ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی شارەکەدا باش بوو[1]. پێدەچێ ئەوەشیان لەبەر ئەوە کردبێ کە ئایندەی وڵاتەکەیان لەژێر مەترسیدا نەمێنێ و، ئەمارەتە کۆرپەکەشیان نەکەوێتە ژێر حەز و ئارەزووی سەردارێکی نەفام کە نەزانێ بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوا حوکمی ئەمارەتەکە هەڵسووڕێنێ، دووریش نییە لەوە ترسابن، دووبارە بکەونەوە ژێر حوکمی هۆزەکانی (هەزمبانی و، الحكمية) - کە بەر لەوەی ئەتابەگ (عماد الدین زنگی) هەولێر داگیر بکا و بیخاتە سەر ئەتابەگایەتییەکەی خۆی، ئەو هۆزانە حوکمیان دەکرد.

ئەوەکا، یەکێکیان هەڵی مردنی (زین الدین یوسف) بقۆزێتەوە و تەختی هەولێر بسەنێتەوە و، ببێتەوە مایەی پاشا گەردانی و نا ئارامی و دووبەرەکی و ململانێی هۆزایەتی و، ئەو ئارامی و سەقامگیرییەش کە دەمێك بوو لەسەری ڕاهاتبوون، ئەوەشیان نەمێنێ.

خەڵکی هەولێر، کەسیان لە (مجاهد الدين قايماز) بە چاکتر نەزانی، ئەوەی کە دامەزرێنەری ئەتابەگییەکەی هەولێر (زين الدين على كچك) بە بریکاری خۆی لەسەر هەولێر دایانبوو، کە دوازدە ساڵ (٥٥٩ - ٥٧١ك/ ١١٦٣ - ١١٧٦ز) بەردەوام حوکمی هەولێری بەدەستەوە بوو، خەڵکەکە، ئەویان باشتر دەناسی کە پیاوێکی لەخواترس و خێرخواز بووە و، حەزی لە ئاوەدانکاری بووە[2]و، بە هاتنەوەشی، هەولێر، دووبارە وەك جارانی. بە موسڵەوە دەبەسترێتەوە، وێڕای ئەوەش لەژێر ئاڵای سەلاحەددینی ئەییوبیدا دەمێنێتەوە وەك جارانی موسڵ و پێشتریش هەولێر کە ئەوەبوو لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)

(١) ابن الأثير، الكامل ١٢/ ٥٦.

الغساني، العسجد، ٤٤.

(٢) الكامل، ١٢/ ١٥٣ ـ ١٥٤. الباهر ١٩٧.

مرآة الزمان ٨/ ٤٥٨. وفيات الاعيان ٣/ ٢٤٨.

کەوتبووە ژێر ڕکێفی سەلاحەددینەوە[١].

پێدەچێ خەڵکی هەولێر لەبەر ئەوە (موزەففەرەددین گۆگبوری)یان، داوا نەکردبێ چونکە ئەو حوکمی (حران) و (الرها)ی هەڵدەسووڕاند و، ئەمانیش وایان دەزانی کە خۆی دەستی لە هەولێر هەڵگرتووە، یان وەهای بۆ چووبن کە بە کەڵکی هەولێر نایەت و، کاتی خۆی (مجاهدالدین قایماز)یش هەر لەبەر ئەوە لە هەولێر دەری کرد، دووریش نییە لەوە ترسابن ئەگەر بگەڕێتەوە هەولێر، دووبارە لەگەڵ (مجاهدالدین قایماز)دا دەیکاتەوە بە ململانێ و، دیسان لەگەڵ موسڵیش، - کە هەروەکو ڕووی دا -. لە لایەکی ترەوە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بە شەڕی خاچدورشمانەوە خەریک بوو، هەمیشە لە مەیدانی شەڕدا بوو، لە هەولێریشەوە دوور بوو، ڕەنگە ئەوەش پێوەندیی بە مەسەلەی بۆ هەولێر بانگنەکردنەوەی بووبێت.

بەڵام (موزەففەرەددین گۆگبوری) لە هەموویان خێراتر بوو، نەیهێشت وەختی بە فیڕۆ بچێت و، پێویستی بە کەسیش نەبوو فەرمووی لێ بکات و، دەرفەتی بە کەسیش نەدا بیر لە موڵکی هەولێر بکاتەوە.

ڕاستیشت دەوێ، ئەتابەگی موسڵ (عزالدین مسعود)، ئەو پیاوە ئازا و بەجەرگە نەبوو، دەنا، ئەگەر هاتباو بەقسەی خەڵکی ئەربیلی کردبا و، (مجاهدالدین قایماز)ی بۆ هەولێر ناردبا، ئەوا ئەتابەگەکانی موسڵ، لەپاش خۆی، ئەو هەموو کێشە و ماندووبوونەیان بە دەست (موزەففەرەددین گۆگبوری)یەوە تووش نەدەبوو، چونکە (موزەففەرەددین گۆگبوری) هەر دوای گەڕانەوەی بۆ هەولێر، هەندەی نەبرد وەك (ابن الأثير) دەڵێت - بوو بە گرێیەکی ڕەق و لە قورگی بنەماڵەی ئەتابەگیی موسڵ گیرا، هەرچەندیان دەکرد بۆیان قووت نەدەچوو[٢]. بەڵام ئەتابەگی موسڵ (عزالدین مسعود) نەیدەتوانی بە قسەی خەڵکی هەولێر بکات، چونکە، خۆی - وەکو گوتمان - کەوتبووە

---

(١) الكامل، ١١/ ٥١٧. ابن شداد، النوادر، ٧٠. مضمار الحقائق وسر الخلائق، ص ٢١٣.

(٢) الكامل ١٢/ ٥٧.

بنۆڕە: ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، ط لاهور، جـ ٥، ص ٥٩٠.

ژێر دەسەڵاتی سەلاحەددین و، لەوە دەترسا، سوڵتان بەو کارە قایل نەبێت.

(مجاهد الدین قایماز)یش قایل نەبوو، بە دەنگ داواکردنی خەڵکی هەولێرەوە نەچوو، چونکە نەیدەویست حوکمی موسڵ بۆ رکابەرەکانی بەجێ بهێڵێت، هەرچەندیشە لەو ساوەی کە ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز)دا ئەتابەگ (عزالدین مسعود) حەپسی کردبوو، ئەو رێز و رووەی جارانی لە تەلاری حوکمی موسڵدا نەمابوو. هەرچەندیشە ئەو ئەتابەگە لە حەپسی ئازادی کردبوو، بە بریکاری خۆیشی وەك جاران دایمەزراندبووەوە، بەڵام دەسەڵاتەکانی جارانی پێ نەدایەوە و، دۆستێکی خۆیشی بۆ موراقەبەکردنی بەسەریەوە دانا. بەمەش (مجاهدالدین قایماز) تووڕە بوو، لەبەر ئەوە لەگەڵ بنەماڵە و دۆستانی ئەتابەگیشدا کەوتە ململانێ و، بەپێویستی زانی پێی خۆی لە تەلاردا داکوتێ و وەزیفەیەکی چاکتر لەپێشتر، وەدەست بێنێت. لەبەر ئەوە قایل نەبوو لە موسڵ دەرچێ، نەوەکا رکابەرەکانی حوکم بگرنە دەست، یان وەکو خۆی، رۆژێکیان لای خزم و دۆست و باوەڕپێکراوەکانی خۆی گوتبووی - بەقسەی (ابن الأثیر)-: "شتی وەها ناکەم، نەوەکا فلانەکەس حوکم بگرێتە دەست و، دەستم لەکار بکێشێتەوە"[١].

لەوانەشە (مجاهدالدین قایماز) ئاگادار بووبێت کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) داوای تەختی ئەمارەتی هەولێر دەکات و، مافی شەرعیی خۆیەتی و، بۆ خۆی ماوەتەوە، لەبەر ئەوە، نەیدەویست ململانێیەکی نوێی لەگەڵ بەرپا بکات، نەخاسمە سەر و سەختی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ سەلاحەددینی ئەییوبیدا تەواوێ بەهێز بوو، ئازایەتی و سەرکەوتنەکانیشی لەڕیزی لەشکری ئەییوبیاندا، بۆی ببوون بە بەڵگەی دڵسۆزی، بەتایبەتیش لە شەڕە چارەنووسسازەکەی (حطین)دا، سەرباری ئەوەش لەگەڵ بنەماڵەی سوڵتان سەلاحەددیندا خزمایەتی ژنخوازیی هەبوو[٢].

---

(١) الکامل: ص. ن. الغساني، العسجد: ٤٤.

(٢) سەلاحەددین (ربیعة خاتوون)ی خوشکی خۆی لە (موزەففەرەددین گۆکبوری) مارە کرد. پێشتریش (ربیعە خاتوون) ژنی (الامیر الکبیر سعدالدین مسعود کوڕی معین الدین انر) بوو،

(موزەففەرەددین گۆکبوری) چوو بۆ لای سەلاحەددین و داوای لێ کرد ڕێگای بدات بگەڕێتەوە بۆ هەولێر، بەو پێودانگەی کە ئەمارەتی هەولێر بەشەرعی لە باوك و براکەیەوە بۆ ئەم ماوەتەوە. سەلاحەددینیش دەستبەجێ قایل بوو. (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەرامبەر بەو چاکەیە، پەنجا هەزار دیناری ڕادەستی سەلاحەددین کرد و، دەستیشی لە ئەمارەتەکەی خۆی، بۆ سوڵتان هەڵگرت کە شارگەلی (حران، الرها،

---

کە یەکێك بوو لە میرەکانی نورالدین محمودی سەرداری حەڵەب ـ سبط، مرآة الزمان ٨/ ٣٥٨. عبدالقادر النعیمي، الدارس في تأریخ المدارس، ١/ ٥١٠. پێشتر، سەلاحەددین ئەم خوشکەی خۆی لەو مارە کردبوو، خۆیشی (عصمت خاتوون)ی خوشکی (سعدالدین)ی هێنابوو (ساڵی ٥٧٢ك/ ١١٧٦ز):- =الدارس في تأریخ المدارس ١/ ٥٠٧. الصفدي، مخطوط الوافي بالوفیات، ٨/ ٦٧. بەڵام (سعدالدین) لەساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا کۆچی دوایی کرد: (مضمار الحقائق، ٢٢٧. مرآة الزمان ٨/ ٣٨٥. کتاب الروضتین ٢/ ٦٦)، پاش مەرگی ئەم، ئنجا سەلاحەددین لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا خوشکەکەی (واتا بێوەژنەکەی ئەم میرە)ی لە (موزەففەرەددین گۆکبوری) مارە کرد: (کتاب الروضتین ٢/ ٦٧. الصفدي، مخطوط الوافي بالوفیات ٨/ ٦٧. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٦/ ٣٥٣.

(ربیعة خاتوون)، لەگەڵ (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی مێردیدا نزیکەی پەنجا ساڵ، پێکەوە ژیانیان بردە سەر و، لەساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٣)دا (موزەففەرەددین گۆکبوری) کۆچی دوایی کرد: (البدایة والنهایة ١٣/ ١٧٠). پاش ئەو؛ ئنجا (ربیعة خاتوون) چوو بۆ دیمەشق و، لەوێ، لە ساڵی (٦٤٣ك/ ١٢٤٥ز)دا ئەویش، کۆچی دوایی کرد ـ هەموو سەرچاوەکانیش تەکەزی لەسەر دەکەن ـ.
ئێمە نازانین (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەر لە (ربیعة خاتوون) ژنی دیکەی هێناوە یان نەهێناوە، وەلێ لە (ربیعة خاتوون) دوو کچی هەبوون، لە دوو کوڕی ئەتابەگی موسڵ (نورالدین أرسلان شاه) (ل ٦٠٧ك/ ١٢١٠ز) مارەی کردن، ئەو دوو کوڕەش، یەکێکیان: (الملك القاهر عزالدین مسعود) ئەتابەگی موسڵ (٦٠٧ ـ ٦١٥ك/ ١٢١٠ ـ ١٢١٨ز) بوو، دووەمیان (عماد الدین زەنگی سێیەم بوو کە سەرداری (العقر) و (شوش) و پاشانیش سەرداری شارەزوور بوو (٦٠٧ ـ ٦٣٠ك/ ١٢١٠ ـ ١٢٣٢ز).

سمیساط[1] و الموزر[2]) و شاری دیکەشی دەگرتـەوە و، ڕادەستی سـەڵاحەددینی ئـەییوبیی کردن. بەڵام داوای لێ کرد کە وڵاتی شارەزووری بۆ بخاتە سەر ئەمارەتی هەولێر، سوڵتان قایل بوو[3].

وەلێ سەڵاحەددینی ئەییوبی، داوای لێ کـرد، چاوەڕوان بێـت و، مۆڵـەتی بـداتێ، تـا، (الملك المظفر تقي الدين عمر)ی برازای دەگاتە جێ، بـۆ ئـەوەی جێگاکەی بگرێتـەوە[4]و، بەچۆڵی نەمێنێتەوە، هـەروەها جێگـای (زیـن الـدین یوسـف)یـش بگرێتـەوە کـە بـەهۆی مردنییەوە چۆڵ ببوو.

جا، بۆ ئەوەی هەولێر، کەس خۆی بە خاوەنی نـەکا و، بـەبێ کێـشە و خـوێن ڕشـتن ڕادەستی (موزەففەرەددین گۆگبوری) بکرێت، سەڵاحەددین فەرمانی دا بـڵاو کراوەیـەك بـەو مەبەسـتە ئامـادە بکرێـت و، لـەو بـڵاو کراوەیـەدا خـەم و پـەژارەی خـۆی بەبۆنـەی کۆچی دوایی میر (زین الدین یوسف)ەوە ڕاگەیاند و، ئەوەشی تێدا ڕاگەیاند کـە موڵـك و ماڵی، بەر (موزەففەرەددین گۆگبـوری)ی بـرای دەکـەوێ، لەسـەر وەسـیەتی (زیـن الـدین علی کچك)ی باوکیان[5].

---

(١) سمیساط: شارێکە لەسەر کەناری ڕۆژاوای فورات (معجم البلـدان ٣/ ٢٥٨) ئێستا کەوتووەتـە نـاو سنووری تورکیاوە.

(٢) الموزر: شارێکە لە دەوروبەری فوراتی جزیرە، نزیکی (نصیبین): (معجم البلدان ٥/ ٢٢١).

(٣) الفتح القسي، ٢٩٩. الكامل ١٢/ ٥٦. النوادر السلطانية، ١٤٤. مخطوط الاعلاق الخطيرة، ورقة ١٨ب. ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب ط/ لاهور ٥/ ٥٩٠.

(٤) الفتح القسي، ٢٩٩. النوادر السلطانية، ١٤٤. أبو الفداء، المختصر في اخبار البشر، ط ١٣٢٥ك، ٣/ ٧٩.

(٥) دەقی ئەو بڵاوکراوەیە لە پاشکۆی ژمارە (٢)دا دەبینیت.

## بەشی دووەم

# حوکمڕانیی موزەففەرەددین گۆگبوری لە هەولێر

## ٥٨٦ - ٦٣٠ك

## ١١٩٠ - ١٢٣٣ز

## فەسلی سێیەم

### ئەمارەتی هەولێری سەردەمی موزەففەرەددین گۆگبوری

### پێوەندییەکانی گۆگبوری لەگەڵ دەرەوەی ئەمارەتی هەولێر.

یەك : لەگەڵ موسڵ.

دوو : لەگەڵ ئەییوبیان.

- لەگەڵ سەلاحەددین و بەشدار بوونی گۆگبوری لە شەڕی خاچدروشمان.

سێ : پێوەندیی نێوان گۆگبوری و خەلافەتی عەباسیان. سەردانەکەی بەغدای سالی (٦٢٨ك/ ١٢٣٣ز)ی.

چوار : پێوەندیی بە (جلال الدین منکبرتی)ی دوا سولتانی خواریزمەوە.

پێنج : پێوەندیی لەگەڵ میرانی دەوروبەردا.

أ- پێوەندیی لەگەڵ علاوالدین قراسنقر سەرداری (ئازەربێجان).

ب - پێوەندیی لەگەڵ ئەمارەتی قەفجاقیان (کرخینی - کرکوك)

ج- پێوەندیی لەگەڵ مەلیکی ئەرتەقیان لە (ماردین).

## بەشی دووەم

# فەسلی سێیەم

## ئەمارەتی هەولێری سەردەمی (موزەففەرەددین گۆكبوری)

## (٥٨٦ - ٦٣٠ك/ ١١٩٠ - ١٢٣٣ز)

(موزەففەرەددین گۆكبوری) هاتەوە سەر حوكمی هەولێر و پاڵی لێدایەوە. وەها چاوەڕوان دەكرا، سیاسەتێكی لەبار بۆ سەركوتكردنی نەیارانی حوكمی خۆی پێڕۆ بكات، بۆ ئەم مەبەستەش گەلێ شتی گۆڕی. ئەو دەیزانی كەسانێك هەن حەزناكەن بگەڕێتەوە سەر تەختی حوكم، لەبەر ئەوە لێیان سرك و بەسووسە بوو، هەناسەی ئەوانەشی بڕی كە نیاز و نییەتیان بە گومان بوو، وەك ئەوەی كاتی مردنی براكەی یەكسەر لەگەڵ میرەكانیدا كردی[1]، كە هێشتا نەگەڕابۆوە بۆ هەولێر. لە هەولێریش، یەكەم گەورە پیاوێك كە دەستبەسەری كرد (صارم الدین بلداجی) میری قەڵای خفتیان (خفتیدكان)[2] بوو. (موزەففەرەددین گۆكبوری) كە بەر لەوەی بگاتە هەولێر، نەیارانی خۆی سەركوت كردبێ، بێگومان كە لە هەولێر جێگای خۆی گەرم

(١)الفتح القسي ٢٩٨ ط ليدن - كتاب الروضتين ٢/ ١٦٤.

(٢)خفتیان: دوو قەڵای گەورەی سەر بە هەولێرن، یەكێكیان دەكەوێتە سەر ڕێگای مەراغە (لە ئازەربێجان)، پێشی دەڵێن: (خفتيان الزرزارى)، بەسەر شاخێكەوەیە، لەخوارەوە ڕووبارێكی خوڕ و بازاڕێك و دۆڵێكی گەورەیە - بەوی دیكەیان دەگوت (خفتيان سرخاب بن بدر) دەكەوێتە سەر ڕێگای شارەزووری سەر بە هەولێر، ئەمیان لەوی دی مەزنترە. (ياقوت، معجم البلدان ٢/ ٣٨٠ و وفيات الاعيان، ط القاهرة) ٣/ ١٧٢. (محمد امين زكى) لە (خلاصة تأريخ الكورد وكوردستان)، لە پەراوێزی (٣٦٤)دا دەڵێت: (خفتیان، هەمان ئەوهفتیانەی ئێستای نزیك ڕەواندزە).

- پێدەچێ مەبەستی لە یەكەمینەكەیان بێت ..

بکات، لەسەر ئەو ڕەفتارەی بەردەوام دەبێت. وا دیارە زانیبووی کە هەندێ لە دۆستانی (مجاهدالدین قایماز)ی نەیارە کۆنەکەی، لە موسڵەوە داوایان لێ کردبوو، بچێتەوە کە دووبارە سەرۆکایەتییان بکات، لەبەر ئەوە، بڕیاری دا دۆستانی ئەو نەیارەی لەناو بەرێت.

سەرچاوەکان باسی ئەو کارانە ناکەن کە ئەم میرە، دوای گەڕانەوەی بۆ هەولێر، لەم شارەدا کردبێتی، بەڵکو باسی ئارەزووی لە گرتن و حەپسکردنی خەڵکیدا دەکەن. ئەم ئارەزوومشی تا کۆتایی حوکم هەر لەگەڵیدا بووە، بەڵام ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەولێردا کردی، لەوە ناچێ، تەنیا، هەر شتی خراپی کردبێ، واتا تەنیا هەر ناحەز و نەیارانی لە حوکم یان لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەمارەتەکە لادابێت و، دۆستان و لایەنگرانی خۆی لە جێگەیان دانابێ، نەخێر، گۆڕانکارییەکانی هەر ئەوە نەبووە، بەڵکو لەوەش تێپەڕی. ئەو، سروشت و سیستەمی حوکمی گۆڕی و، وەزیفەگەلێکی ئەوتۆی داهێنا لەگەڵ بارودۆخی قۆناغی نوێی مێژووی ناوچەکەدا بەگشتی و ئەمارەتی هەولێردا بەتایبەتی بگونجێت. ئەو نەگەڕابۆوە سەر حوکمی ئەمارەتێکی ئارام و هێور و ڕێکوپێک، دەشیزانی کێشە و سەرئێشەی لەم حوکمە تازەیەوە دەستی پێ کردووە، ئەمارەتەکەی بە هێزگەلێکی نەیار دەورە درابوو، یان هەر هیچ نەبێ، بە خەڵکانێکی نادۆست دەورە درابوو، لەبەر ئەوە، دەبوو کاروباری ئەمارەتەکەی ڕێکبخات، نەخاسمە کاروباری لەشکر و سەربازی، دەبوو هێزێک سازبدات لەوەبێت، لێی دڵنیا بێت و پشتی پێ ببەستێت و، بەبێ هێزێکی دەست وەشێن نەیدەتوانی لەڕووی ئەتابەگایەتیی موسڵدا بوەستێ، چونکە موسڵ بەهێزترین ئەمارەتی ناوچەکە بوو، بۆ هەلێکیش دەگەڕا چنگ لە هەولێر گیر بکات، چونکە ئەمارەتی هەولێر خەوی لە کاربەدەستانی موسڵ زڕاندبوو. ئەوان بە هەڵەیان دەزانی ڕێگا بدەن هێزێکی دراوسێیان گەورە بێت و تووشی مەترسییان بکات و ئارامی و ئاسایشیان لێ تێک بدات، نەخاسمە کە پێشتریش ژێردەستەی خۆیان بووە. بەڵام سەرداری موسڵ نەیدەوێرا هیچ شتێک لە دژی ئەمارەتی هەولێر

بكات، چونكە هەولێر بەهێز و لەشكری سەلاحەددین پشتی قایم بوو.

كاتێك، ئەتابەگ (عزالدین مسعود) ویستی لە بەرایی ساڵی ٥٨٠ك/ (نیسانی ١١٨٤ز)دا - بە كۆمەكی (قزل ارسلان عثمان كوڕی ایلدكز) سەرداری ئازەربێجان، حوكمی میر (زین الدین یوسف) لەناو بەرێت، ئەم میرە جەردە و تالآنچییانی بریكاری ئەتابەگی موسڵ (مجاهد الدین قایماز)ی تەفروتوونا كرد. پێدەچێ دەستدرێژیی ئەتابەگی موسڵ و شەڕفرۆشتنی بە ئەمارەتی هەولێر كە ئەوكات لەژێر ئاڵای سەلاحەددیندا بوو، بووبێتە هۆی ئەوەی كە سوڵتان دووبارە، جەنگ لە دژی موسڵ ڕاگەیێنێ، تا، ئەتابەگی موسڵ ناچاربوو تەباییننامەیەكی لەگەڵدا مۆر بكات، ئیدی بەپێی ئەو تەباییننامەیە، موسڵ، بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی ئەییوبیی سەلاحی[1].

## یەك: پێوەندییەكانی دەرەوەی ئەمارەتی هەولێری سەردەمی (موزەففەرەددین گۆكبوری).

### ١- پێوەندییەكانی لەگەڵ ئەتابەگایەتیی موسڵ:

#### أ- لە سەردەمی (عزالدین مسعود)دا:

ئەوەمان دی كە چۆن چۆنی هەندێكان لە خەڵكی هەولێر، دوای مردنی میر (زین الدین یوسف (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) میری ئەربیل، ناردبوویان لە دووی (مجاهدالدین قایماز) كە ئەوكات بریكاری ئەتابەگی موسڵ بوو، بچێت بە دەنگیانەوە و حوكمی ئەمارەتی هەولێریان بۆ هەڵسووڕێنێ. ئەوەبوو ئەتابەگی موسڵ (عزالدین مسعود) لەترسی سەلاحەددینی ئەییوبی ئەو داوایەی قەبوڵ نەكرد. چونكە هەولێر پارچەیەك بوو لە دەوڵەتی ئەییوبی. ئەنجامەكەشی ئەوەبوو (موزەففەرەددین

---

(١) الكامل ١١/ ٥١٧.

المقريزي، السلوك، ١/ ٨٩ ـ ٩٠.

گۆگبوری) گەڕایەوە بۆ هەولێر و زۆری نەخایان، "بوو بە ئێسکێك و لە قوڕگی بنەماڵەی ئەتابەگ گیرا و، هەرچەندیان دەکرد بۆیان قووت نەدەچوو"[١].

سەلاحەددینی ئەییوبی لە ساڵی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز)دا کۆچی دوایی کرد. ئەتابەگی موسڵ (عزالدین مسعود) بە دەرفەتی زانی و دەرگای بۆ کرایەوە، نەك تەنها بۆ سەندنەوەی هەولێر، بەڵکو مرخی لە ناوچەکانی تری وڵاتی جزیرەش - کە پێشتر لە موسڵ سەندرابوونەوە - خۆش کرد، شاری (جزیرة ابن عمر) و (سنجار و نصیبین)یش لەو موڵکانەن کە لە موسڵ سەندرابوونەوە.. ئەتابەگ (عزالدین مسعود) دەیویست دەست بخاتە ڕێگای (الملك العادل ابابکر الایوبی) و دەرفەتی نەداتێ ئەو وڵاتانە وەژێرچنگ بنێ کە پێشتر ببوون بە پارچەیەك لە دەوڵەتەکەی سەلاحەددینی برای - پاشان، ئەتابەگ دیتی ئەم کارەی کە مرخی لێ خۆش کردووە، کارێکی قورس و ترسناکە، لەبەر ئەوە، پەلەی نەکرد و، دوای خست تا، تەگبیر و ڕا و ڕاوێژ لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیدا بکات.

ئەتابەگ، دەمسپی و کارمەندانی تەلاری خڕ کردەوە، کە (مجاهدالدین قایماز)ی بریکاری ئەتابەگ و (أبو السعادات مجدالدین المبارك ابن الأثیر)[٢]یش ئامادە بوون. ئنجا ڕووی پرسیاری لێیان کرد و پرسی: بۆ سەندنەوەی ئەو وڵاتانەی لە کیسمان چووە چ بکەین باشە؟ (مجدالدین ابن الأثیر) وەڵامی دایەوە، کە باشتر ئەوەیە لەشکرکێشییەکی خێرا و دەستوبرد سازبدا، ئنجا نامە بۆ سەردارانی ناوچەکانی

---

(١)الکامل ١٢/ ٥٧.

(٢)برای مێژوو نووسی ناودار (عزالدین علي ابن الأثیر)ە. (ل/ ٦٠٦ك/ ١٢١٠ز). باسی ژیانیشی لە (الکامل ٢/ ٢٨٨) و (وفیات الاعیان، ٣/ ٢٨٩ ـ ٢٩١)دا دەبینیت. ئەم مێژوو نووسە قسەزانێکی نییەتپاك بوو، (دیوانی الانشاء)ی (عزالدین مسعود) و (نورالدین ارسلان شاه)ی کوڕیشی بەدەستەوە بووە.

بنێرێت و داوایان لێ بكات كە هەموویان لە (نصیبین) لە دەوری خڕ ببنـەوە[١]، بـەو جۆرە لە سەنگی محەكیان دەدات، كامیـان حـەز بـە گەڕانـەوە بـۆ سـەر موسـڵ بكات، ئەومیان قایلە و، ئەتابەگ بە دۆست و لایەنگری خۆی دایبنێت. كامیـشیان داواكـەی ڕەت كـردەوە، ئـەومیان بـە یـاخی دابنێـت و، ئەتابـەگ وەك دوژمـنی خـۆی ڕەفتـاری لەگەڵدا بكات[٢].

(مجاهدالدین قایماز) كە بە پیاوێكی ئاقڵ و دووربین ناسرابوو، هەڵیدایە و گوتی مەسڵەحەت لەوەدایە، نامە بۆ ئـەو میرانـە بنووسـرێت، بـە مـیری هەولێریـشەوە، تـا، بزانرێـت ڕایـان لەسـەر لەشكركێشی چییە و، هـەوڵ بـدرێت قایـل بكـرێن و، بـەلای موسڵدا ڕابكێشرێن. وەڵێ (مجدالدین ابـن الأثـیر) بەرپەرچـی دایـەوە و، پرسـیی، ئـەی ئەتابەگی موسڵ ئەبێ چۆن چۆنی ڕەفتاریان لەگەڵدا بكات ئەگەر سووربوون لەسـەر ڕەتكردنەوەی داواكەی[٣]؟

گفتوگـۆ لـەنێوان دەسـتوپێوەنددا، بـەردەوام بـوو، تـا، هـەموویان لەســەر ڕای (مجاهدالدین قایمـاز) گیرسـانەوە، ئـەوجا، ئەتابـەگ كەوتـە نامـە و نامـەكاری لەگـەڵ میرەكانــدا، بــەڵام لــە (عمادالــدین زەنگــی - دووەم -) بــەولاوە، كــە ئــەویش بــرای ئەتابەگ و سەرداری سنجاریش بوو، هیچ میرێكی دیكەیان ڕازی نەبوو[٤].

(موزەففـەرەددین گۆكبـوری) یـەكێك بـوو لـەو میرانـەی كـە داواكـەی (ئەتابـەگ عزالـدین مـسعود)یـان، ڕەت كـردەوە. وا دیـارە بـە توانـستی سـەربازیی ئەمارەتەكـەی خۆیدای نازیبێت و، ئەو هێزەی بووبێت كـە لـە ڕووی سـەرداری موسـڵدا ڕاوەسـتێت،

---

(١)نصیبین: شارێكی ئاوەدانی وڵاتی جزیرەیە، دەكەوێتە سەر ڕێگاری كاروانی نێوان موسڵ و شام، لە سنجارەوە نۆ قۆناغ دوورە و، لە موسڵەوە شەش قۆناغ... (معجم البلدان).

(٢)لكامل ١٢/ ١٠٠. كتاب الروضتین ٢/ ٢٢٦. مرآة الزمان ٨/ ٤٣٥.

النجوم الزاهرة ٦/ ١٣٣.

(٣)الكامل ١٢/ ١٠٠.

(٤)م. ن. ص: ١٠١. كتاب الروضتین ٢/ ٢٢٧.

ئەو سەردارەی کە نەهەولێر و نەهیچ ئەمارەتێکی دیکەی دەستکەوتەوە، چونکە بەر لەوەی هیچ شتێك بکات، سەری نایەوە و مرد[١].

**ب- پێوەندیی نێوان هەولێر و ئەتابەگایەتیی موسڵ لە سەردەمی (نورالدین ارسلان) (٥٨٩ - ٦٠٧ك/ ١١٩٣ - ١٢١١ز) و، (عزالدین مسعود)ی کوڕیدا (٦٠٧ - ٦١٥ك/ ١٢١١ - ١٢٢٨ز):**

پێوەندیی نالەبار، لەنێوان ئەمارەتی هەولێر و ئەمارەتی موسڵ، لە سەردەمی (نورالدین أرسلان شاە) دا هەروا مایەوە، وەلێ سەرداری هەولێر، بەچاوی پڕ گومان و، زۆریش بەئاگاییەوە سەیری موسڵی دەکرد، لەوەش دەترسا ئەتابەگی موسڵ کارێکی دوژمنانەیان لە دژ بکات، لەبەر ئەوە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەو پەڕی توانایەوە هەوڵی دەدا موسڵ بێهێز بکات یان تەریك ڕایبگرێت، بگرە کۆمەکی بەو لایەنانەش کرد کە کەوتبوونە بەر شاڵاو و تاڵاوی تەماعی ئەتابەگەکانی موسڵ، بۆ ئەوەی موسڵ لەوە زیاتر گەورە نەبێت و پەل نەهاوێت.

لەساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٤ز)[٢]دا: (موزەففەرەددین گۆگبوری) لەشکرێکی تەیار و

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە: الباهر، ١٨٥. مرآة الزمان ٨/ ٤٣٥.
مفرج الكروب ٣/ ١٧ ـ ١٨.

(٢) لەبەر کەمتەرخەمیی مێژوونووسان، دەربارەی مێژووی هەولێر، لەماوەی نێوان ساڵی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز) تا ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٤ز) هیچ نازانین، نەخاسمە (ابن الأثیر) کە ناودارترین مێژوونووسی ئەو سەردەمەیە. پێدەچێ لەو ماوەیەدا ڕووداوێکی گرنگی ئەوتۆ ڕووی نەدابێ شایانی باس بووبێت، یان ئەوەش کە ڕووی دابێت بەدڵی (ابن الأثیر) نەبووە و حەزی نەکردووە باسی بکات، چونکە بە ئاشکرا لایەنگیری ئەتابەگەکانی موسڵ بووە و، خۆی و براکانی و باوکیشیان شۆرباخۆری ئەوان بوون. تەنانەت ئەو کتێبەش کە تایبەتە بە مێژووی ئەو بنەماڵەیە (الاتابكية الزنكية) هەر ئەو دایناو، پێشکەشی کرد بە (الملك القاهر عزالدین مسعود الثاني) (٦٠٧ـ ٦١٥ك) کوڕی (نورالدین أرسلان شاە الاول).←

ئامادە کرد و هێرشێکی بردە سەر نەینەواو، ئاگری تێ بەرداو خەڵەو خەرمانی تاڵان کرد.

مەبەستیشی لەم کارە ئەوەبوو (نورالدین أرسلان شاه)ی سەرداری موسڵ کەمهێز بکات، کە لەو دەمەدا (نصیبین)ی سەر بە ئەتابەگایەتیی سنجاری گەمارۆ دابوو، بە سەردارەکەشیانەوە، کە ئەوکات (قطب الدین محمد کوڕی عمادالدین زەنگی - دووەم -) سەرداری بوو، کە پێشتر ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ (الملك العادل ابوبکر الایوبی)ی سەرداری میسر و شامدا مۆر کردبوو بەپێی ئەوەش (قطب الدین محمد) ببوو بە دۆست و لایەنگری ئەو مەلیکە ئەییوبییە. سەرداری موسڵ ئەمەی قبوڵ نەکرد و، بە پیلانێکی ئەو دوو لایەنەی دژ بە موسڵی لە قەڵەم دا کە گوایا دەیانەوێ ناهەقی لە موسڵ بکەن[1]. لەبەر ئەوە شەڕی دژ بە ئامۆزاکەی خۆی (سەرداری سنجار) جاڕدا و، بەخۆی و لەشکرەوە گەیشتە (نصیبین) و داگیری کرد[2]، تەنیا قەڵاکەی نەبێ کە ئەگەر جموجووڵی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە دەوری

---

← کتێبە گەورەکەشی (الکامل فی التأریخ) لەسەر داوای (بدرالدین لؤلؤ)ی سەرداری موسڵ (ل/ ٦٥٧ك/ ١٢٥٩ز)دانا. لەبەر ئەوە، ڕەنگە باسوخواسی خراپەی ئەتابەگەکانی موسڵی لادابێت. هەروەها، دەشبینین، ئەم مێژوو نووسە باسوخواسی ئەمارەتی هەولێر ناکات، تەنیا لەبەر ئەوەی پێوەندیی بە موسڵەوە هەیە، ئەگەر باسیشی بکات وەهای دەخاتە ڕوو کە سەرداری هەولێر پیاوی خراپ بووە و شەڕفرۆش بووە.

(١)ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، ج (٤ - ٥) ص ٤٢٤.

حميدالدين محمد (ميرخوند)، روضة الصفا، ٤/ ٥٩٨.

(٢)پێدەچێ جموجووڵی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بە پەنجەی (الملك العادل الأيوبي) بووبێت، چونکە (موزەففەرەددین گۆکبوری) و (قطب الدین محمد)ی سەرداری سنجاریش، هەردووکیان واوەستی خۆی بوون، بگرە، (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ (الملك الاشرف موسی)ی کوڕی (الملك العادل) و، میرانی دیکەدا وەها ڕێککەوتبوون کە نەیەڵن (نورالدین أرسلان شاه) هیچ دەستکەوتێکی لە هەرێمەکەدا بەربکەوێت. ئەنجام، هێرشیان بردە سەر (کفر زمار)ی سەر بە موسڵ و شاری دیکەشیان تاڵان کرد نەخاسمە شاری (بلد). بنۆڕە: الکامل ١٢/ ١٩٣.

موسـڵ نەبوایـە، قەڵاکەشـی داگـیر دەکـرد. (موزەففـەرەددین گۆکبـوری) لـەو جموجووڵەی لە دەوروبەری موسڵ، مەبەستی ئەوەبوو پیلانەکەی (نورالدین ارسلان شاە) نەچێتە سەر، ئـەوەبوو ناچاری کـرد گەمارۆکە لابـدا و بگەڕێتـەوە بـۆ موسـڵ. وەڵێ لە ڕێگای گەڕانەوەی بۆ موسڵ کە لە دیجلە پەڕییەوە، بە نیازبوو بەرەو هەولێر بایداتەوە و تاڵانی بکات و هەقی خۆی لە (موزەففەرەددین گۆکبوری) بکاتەوە، بەڵام کـە (موزەففـەرەددین گۆکبـوری) بیـستی ئەتابـەگی موسـڵ گەیـشتووەتە (بلـد) [1]، دەستبەجێ دەستی لە (نینوی) هەڵگرت و گەڕایەوە بـۆ وڵاتەکـەی خـۆی. ئیـدی بـەو شێوەیە (نورالـدین أرسلان شـاە) نەیویـست نیـازی تـاڵانکردنی هـەولێر بباتـە سـەر، نەخاسمە زانیبووشی کە تاڵانەکەی (نینـوی) هەنـد گـەورە نـەبووە و، لـە گێڕانـەوەی باسی ڕووداوەکەدا گەلێکیان ناوەتە سەر[2]. گرنگیش ئەوەیە پلانی پاراستنی سـنجار کە سەرداری هەولێر دایڕشتبوو سەری گرت و مەترسیی (نورالدین ارسلان شـاە) لـە سنجار دوورخرایەوە.

پێوەنـدیی دوژمنانـەی نێـوان هـەولێر و موسـڵ تـا ماوەیـەکی کـەمیش بـەر لـە مردنـی (نورالـدین أرسـلان شـاە) درێـژەی کێـشا. پاشـان پێوەندییـەکی دۆسـتانە لـە نێوانیاندا پەیدا بوو، درێژەی کێشا تا کۆتایی حوکمی ئەتابەگ (الملك القاهر عزالدين مـسعودی - دووەم - کـوڕی نورالـدین أرسـلان شـاە) کـە لـە سـاڵی (٦٠٧ - ٦١٥ك/ ١٢١١ - ١٢١٨ز) حـوکمی موسـڵی کـرد. ئـەم پێوەندییـە تازەیـە ئـەوەی سـەلماند کـە سـەرداری هەولێر تـوانی موسـڵ وەهـا لـێ بکات کـە بـە چـاوێکی باشـتر لـە هـەولێر بڕوانێـت و ئەتابەگەکانی موسڵیش بۆیان دەرکەوت کە سیاسەتی دژ بـە هـەولێر هـیچ سـوودێکی

---

(١)بلد: شارێکی کۆنی سەر دیجلەیـە، زۆور موسـڵ کـەوتووە، حـەوت قۆنـاغ لێـوەی دوورە، بـەڵام لـە (نـصيبين)ەوە بیـست و سـێ قۆنـاغ دوورە. (معجـم البلـدان، ٢/ ٤٨١) ئێـستا پێـی دەڵـێن (اسـکی موسڵ) (یاسین بن خیرالله الخطیب العمري، منیة الأدباء في تأريخ الموصل الحدباء، ص ١٣٠.

(٢)الكامـل ١٢/ ١٩٢. بـڕوانە: رشـیدالدین فـضل الله الهمـداني، جـامع التـواريخ (بالفارسـية)، ص ٣١٦، وتأريخ ابن الفرات، مجلد (٥)، جـ ١، ص ٤.

تیدا نەماوە و، باشتر ئەوەیە (موزەففەرەددین گۆكبوری) بكەن بە دۆستی خۆیان و، لە رۆژی تەنگانەدا سوود لە هێز و توانستی ببینن، نەخاسمە بەرژەوەندی هەردوو لایشیان ئەوەی دەخواست كە پێوەندییەكی هاوبەش و هاوكۆمەك لە نێوانیاندا هەبێت.

ئەوەبوو، پاش رووداوەكانی ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٤ز) لێك نزیكبوونەوەیەك لە نێوان (الملك العادل) و، ئەتابەگ (نورالدین أرسلان شاە)دا هاتە گۆڕێ و، پێوەندییەكی خزمایەتی و ژن و ژنخوازیشی بەسەردا هات و، كوڕی (الملك العادل) كچی ئەتابەگی لەساڵی (٦٠٥ك/ ١٢٠٨ز)دا مارەكرد[1]. پاشان هەردوولایان پێكهاتن لەسەر ئەوەی كە وڵاتی (الجزیرة) لەنێوان خۆیاندا بەش بكەن. ئەتابەگی موسڵ مەبەستی لەم پێكهاتنە، ئەوەبوو، حوكمی (قطب الدین محمد)ی كوڕی مامی بەسەر (سنجار و نصیبین)ەوە نەهێڵێ چونكە دوژمنایەتییەكی ریشاژۆیان لەنێواندا هەبوو[2].

(الملك العادل) لەساڵی (٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز) دا لە دیمەشقەوە بەرەو وڵاتی جزیرە بەمەبەستی (خابوور و نصیبین) كە سەر بە ئەتابەگایەتیی سنجار بوون كەوتەڕێ و ئەو دوو شارەی داگیر كرد، پاشان بایدایەوە سەر سنجار و گەمارۆی دا[3]. (الملك العادل) هەندەی نەمابوو سنجار بگرێت، وەلێ (قطب الدین محمد) كەوتە هەوڵی وەستاندنی شەڕ و، ئامادەگیی خۆی دەربڕی كە پێكهاتنێكی لەگەڵدا مۆربكات و

---

(١)الكامل ١٢/ ٢٨٤. ابن واصل، مفرج الكروب ٣/ ١٩١. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلد ٣٨، ص ٤٣١.

The Chronography, V, I, P. ٣٦٥.

عزالدین محمد بن ابراهیم ابن شداد، مخطوط (الاعلاق الخطیرة في امراء الشام والجزیرة) قسم الجزیرة، ورقة (٥١/ أ). تأریخ ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٨٨. میرخوند، روضة الصفا، ٤/ ٥٩٨.

(٢)الكامل، ن. ص. مخطوط (الاعلاق الخطیرة) و. ن.

(٣)لكامل ١١٢/ ٢٨٥. الباهر، ١٩٧. ابن العدیم، زبدة الحلب ٣/ ١٦٠.

مخطوط (الاعلاق الخطیرة): و. ن. مفرج الكروب ٣/ ١٩٣.

بەپێی ئەو پێکهاتنە دەست لە ئەمارەتەکەی خۆی هەڵبگرێت بەمەرجێك (الملك العادل) قەرەبووی بۆ بکاتەوە، بەڵام فەرمانداریکی سنجار ورەی بەبەردا کرد و، دنەی دا کە خۆی ڕابگرێت. بەو جۆرە کەوتە بەرگری و، شارەکەی پاراست[١].

ئەتابەگی سنجار، لەو گەمارۆیەدا کە زۆری بۆ هات، هانای بردە بەر خەلیفە (الناصر لدین الله) و مەلیکەکانی دەوروبەری بەتایبەتیش (موزەففەرەددین گۆکبوری) [٢]چونکە ئەمیان سەربە (الملك العادل) و زاوایشی بوو[٣].

جا، لەبەر ئەوەش کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) خزمەتی چاکی ئەو مەلیکەی کردبوو، داکۆکیشی لە تەخت و بەختی کردبوو[٤]، خاترێکی زۆری لای (الملك العادل) هەبوو. لەبەر ئەوە (قطب الدین محمد) کوڕەکەی خۆی نارد بۆ هەولێر، بۆ ئەوەی (موزەففەرەددین گۆکبوری) تکای لای (العادل) بۆ بکات کە لە سەر سنجار بیهێڵێتەوە[٥]. (موزەففەرەددین گۆکبوری) قایل بوو، ببێتە تکاکار لای (العادل)، بەڵکو - ئەمە خوایە - واز لە سنجار بهێنێ و، وایشی دەزانی کە ئەگەر تکای نیوەی موڵکەکانیشی بکات، دڵی ناشکێنێ[٦]، کەچی (العادل) نائومێدی کرد و تکاکەی ڕەت کردەوە، چونکە (العادل) لەگەڵ (نورالدین أرسلان شاه) ڕێك کەوتبوو، ئیدی بەتەنگ

---

(١)الكامل: ص ٢٨٥. الاعلاق الخطيرة. و (٥٢ب). ابن العبري تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق: م. ن. ص.
The Chronography, V, I, P. ٣٦٥.

(٢)الكامل، ١٩٧. زبدة الحلب ٣/ ١٦٠.

(٣)وەك باسمان کرد، میر (موزەففەرەددین گۆکبوری) (ربیعە خاتوون)ی خوشکی سەلاحەددینی ئەییوبی و (الملك العادل)ی ئەییوبیی هێنابوو.

(٤)لكامل ١٢/ ٢٨٦. مفرج الكروب ٣/ ١٩٤. الاعلاق الخطيرة، ن. و. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق. ن. ع. ص. ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٩٠.

(٥)الكامل، ص. ن.

(٦)م. ن. ص.

سەرداری هەولێرەوە نەبوو[1]، ئیشی پێی نەمابوو.

ئەم ڕەتکردنەوە چاوەڕوان نەکراوە (موزەففەرەددین گۆگبوری)ی ناچار کرد، نامە بۆ سەرداری موسڵ بنووسێ کە نەیاری کۆنی خۆی بوو داوای لێ بکات هەڵوێستێکی یەکگرتوو دژ بە تەماعی ئەم مەلیکە شەڕ فرۆشە بگرن. خاوەن ڕاو هزرمەندانی تەلاری موسڵیش کەوتنە مقۆمقۆ و بێزاری و دەیانپرسی، ئاخۆ سەرکەوتنی سەربازیی (الملك العادل) چ ئەنجامێکی لێ بکەوێتەوە[2]؟ دووریش نییە دوای داگیرکردنی سنجار، ئنجا مل بنێ لە موسڵیش هەرچەندیشە ئەتابەگی موسڵ پێوەندیی باشیشی لەگەڵیدا هەبووە و زن و ژنخوازیشیان پێکەوە هەیە و، ئەم ئەتابەگە تانەت لەشکرێکیشی لەژێر فەرمانەدەی (الملك القاهر عزالدين مسعود)ی کوڕیدا ئامادەکرد بۆ ئەوەی بینێرێ بۆ سنجار و کۆمەك بە (الملك العادل)ی هاوپەیمانی بکات[3].

تەتەری سەرداری هەولێر، شەو، گەیشتە موسڵ. پرۆژەیەکی بۆ هاوکاری نێوان هەردوولا، هێنابوو، یاریدەی (قطب الدين محمد) بدەن، ئەتابەگی موسڵ لەم هەڵوێستە تازەیەی سەرداری هەولێر سەرسام بوو[4]، وەڵێ پرۆژەکەشی لەلا پەسەند بوو، پێی خۆش بوو. لەبەر ئەوە، (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەخۆی و لەشکری هەولێر و شارەزوورەوە گەیشتە موسڵ و لەگەڵ (نورالدين أرسلان شاه) کۆبووەوە. دەشتوانین بڵێین ئەم سەردانە لاپەڕەیەکی نوێی پڕ سۆز و هاوکاری لەنێوانیاندا کردەوە دوای ئەوەی کە ماوەیەکی دوژمنایەتی و پێکدادانیان بەڕێ خست، لەو

---

(١)م. ن. ص. مفرج الكروب، ص. ن. الاغلاق الخطيرة، ص. ن. تأريخ الدول السرياني، ع. ن. ص. ابن الفرات. ن. م. ص.

(٢)الكامل، ١٢/ ٢٨٥.

(٣)الكامل، ١٢/ ٢٨٦. مفرج الكروب ٣/ ١٩٣. تأريخ ابن الفرات، مجلد/٥، جـ ١، ص ٩٠.

(٤)الكامل، ص. ن. مفرج الكروب ص. ن. ابن شداد، مخطوط (الاعلاق الخطيرة) ورقة ٥٢/ أ. ابن الفرات: م. ن. ص.

ڕۆژەوە لەنێوانیانـدا ئـاگری سـەندبوو کـە مـیر (زیـن الـدین یوسـف) چـووە پـاڵ سەلاحەددینی ئەییوبی و کەوتە دژایەتی موسڵ.

لە کۆبوونەوەی هەردوولا (گۆگبوری و، أرسلان شاه)دا، لەسەر ئـەوە پێکهـاتن کـە بنـەماکانی نـاکۆکی و دڵپیسی نـەهێڵن. ئـەوجا هـەردووکیان بـاوەڕ و دڵنیاییـان بـە تونـد و تـۆڵی لـە یـەکتری تـازە کـردەوە. - بەقسەی مێژوونووسـی تـەخت و تـەلاری ئەتابەگی (ابن الأثیر). - سەرداری موسڵ بەتەواوی لە میوانەکەی دڵنیایی پەیدا کرد، بەڕادەیەکی ئەوتۆ کە بـە شـەو، خـۆی لـە سـەربازگەکەی دەرەوەی موسـڵ خـەوت و، جێگـای خـەوی بـۆ (موزەففـەرەددین گۆگبـوری)ی میـوان لـە قـەڵای شـارەکەدا چـێ کرد[1].

ئنجا هەردوو میر کەوتنە دڵدانەوەی میرەکانی دیکەی ناوچەکە، کە دژ بـە الملك العادل بچنە پاڵیان و، نامەشیان بۆ خەلیفە (الناصرلدین الله) نووسی، داوایان لێ کرد کە بکەوێتە خۆ و، گەورەیی و دەسڕۆیی خۆی بەسـەر (الملك العـادل)دا بخاتـە کـار و، دەسـتی لـە سـنجار پـێ هـەڵبگرێت. ئیـدی، خەلیفـە چـەند کارمەنـدێکی گـەورەی تەلاری[2] خۆی شاند (نارد) بۆ ئـەوەی ناوبـژییان بکـەن. پاش بێنەوبەرەیـەك، (الملك العادل) ملی دا کە لەگەڵ سەرداری سنجاردا تەبایینامەیەك ببەستێ، بە مەرجێ ئـەو جێگایانـەی کـە داگیری کـردوون بەدەسـتیەوە بمێننـەوە. هەرچی شاری سنجاریـشە ئەوە، با، بۆ سەرداری سنجاربێت[3].

گرنگیش لەم پێوەندییە نوێیەی نێوان هەولێر و موسڵە ئەومیە کە ئەنجامەکەی گەیشتە خزمایـەتی و ژن و ژنخوازی لـەنێوان ئـەم دوو بنەماڵـە حاکمـەدا. ئـەوەبوو،

---

(١)الكامل، ص. ن. الباهر، ١٩٧.

(٢)الكامل، ١٢/ ٢٧٦. الباهر: ص. ن. ابوشامة، ذيل الروضتين، ٦٧.

مفرج الكروب ٣/ ١٩٧. مخطوط (الاعلاق الخطيرة) و. ن. تأريخ ابن الفرات، م. ن. ص. ٩٤.

(٣)الكامل، ص. ن. الباهر. زبدة الحلب ٣/ ١٦١. مفرج الكروب، ص. ن.

الاعلاق الخطيرة: ورقة ٥٣/ أ. ابن الفرات: م. ن. ص.

دوو کچی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە دوو کوڕی (نورالدین أرسلان)[١]، (الملك القاهر عزالدین مسعود و، عمادالدین زەنگی) مارە کران.

(نورالدین أرسلان شاه) بەر لە مردنی، وڵاتی موسڵی بەسەر هەردوو کوڕەکەیدا دابەش کرد، (عزالدین مسعود)ی کوڕە گەورەی لەسەر تەختی موسڵ دانا و هەردوو قەڵای (عقر الحمیدیة) و (قلعة شوش)ی، دا بە (عماد الدین زەنگی) و بشبێتە سەرداری ئەم دوو قەڵایە[٢]، بەمەرجێ (بدرالدین لؤلؤ)ی بریکاری ئەتابەگ کاروباری مەملەکەتی هەردوو برایەکە هەڵسووڕێنێ، چونکە هەردووکیان هێشتا منداڵ بوون و[٣]، بریکارەکەش خاوەن سیاسەتێکی چاك و، بەتەگبیر بوو، سەرباری ئەوەش لە

---

(١) نفس المصادر والصفحات. هەروەها بنۆڕە: ابن خلكان ٤/ ٢٩٥. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، ص ٤٣١.
The Chronography, V. I, P. ٣٦٥.

(٢) الكامل ١٢/ ٢٩٣. ابن خلكان ٤/ ٢٩٥. ابو الفداء، المختصر ٣/ ١٢١.
ابن خلدون ٥/ ٥٩٦. ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٥٦.
- (سبط ابن الجوزي) کە دەڵێت: (نورالدین ارسلان شاه) وڵاتی شارەزووریشی دا بە (عماد الدین زەنگی)ی کوڕی - لەوەدا بەهەڵە چووە. بنۆڕە: (مرآة الزمان ٨/ ٥٤٦. هەروەها: (ابن تغري بردي)یش، لە (النجوم الزاهرة ٦/ ٢٠٠)دا ئەو هەڵەیەی کردووە.

(٣) (عزالدین مسعود) حەڤدە ساڵان بوو کە تەختی موسڵی وەرگرت، ئەو لە ساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٣ز)دا لە دایك بووە، بنۆڕە: (وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٥.) کەچی، (ابن الاثير) دەڵێت: (عزالدین مسعود) - ئەوکات دە ساڵان بوو. بنۆڕە: (الكامل ١٢/ ٢٩٣). وا دیارە ئەم مێژوونووسە لەبەر ئەوە ئەم مەلیکەی بە بچووك لە قەڵەم داوە کە ببێتە پاساوی ئەوەی (بدرالدین لؤلؤ) جڵەوی بگرێتە دەست خۆی. بەڵام ئەم مێژوونووسە، خۆی بە درۆ دەخاتەوە کاتێ کە دەڵێت: ئەم مەلیکە لاوە، لەساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز)دا مردووە، ئەوەتا، دەڵێت: (کە گیانی دەدا، وەسیەتی کرد (نورالدین ارسلان شاهی - دووەم -)ی کوڕە گەورەی ببێتە مەلیك کە ئەوکات تەمەنی دە ساڵ بوو. بنۆڕە: (الكامل ١٢/ ٣٣٥). ئەمەش مانای وایە، (عزالدین مسعود) هەشت ساڵان بووە کە کوڕەکەی لەدایك بووە. شتی وەهاش ڕوونادات و ناشێت. بەڵام (ابن خلكان ئەو (هەڵەیەی) ڕاست کردووەتەوە کە - ابن الأثير - کردوویەتی) ئەوەتا - ابن خلكان - دەڵێت: (عزالدین مسعود) لەساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٣ز) دا لەدایك بووە، واتا، کاتێ کە مردووە تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بووە و، کوڕەکەشی دە ساڵان بوو کە مردووە.

حوکمڕانی و ئیدارەی کاروباری دەوڵەتدا خاوەن خەسڵەتی چاك و[1] بە ئەزموون بوو، ئەزموونێکی ئەوتۆ کە ئەتابەگی نوێ (زاواکەی موزەففەرەددین گۆکبوری) ئەو ئەزموونەی نەبوو. هەرچی پێوەندیی ئەم ئەتابەگە تازەیەیە لەگەڵ هەولێر، کە سەرچاوەکان باسی ناکەن، زۆرتر لەوەدەچێ کە پێوەندیی لەگەڵ خەزووریدا، تەواوێ پتەو بووبێت.

## ج- پێوەندیی نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و موسڵ، لە سەردەمی (بدرالدین لۆلۆ)دا (٦١٥ – ٦٣٠ك/ ١٢١٨ – ١٢٣٣ز)

ئەتابەگی لاو (الملك القاهر عزالدین مسعود) وەسیەتی کرد، کە پاش خۆی (نورالدین أرسلان شاە - الثاني -)ی کوڕی - هەرچەندە منداڵیش بوو - لەسەر تەختی موسڵ دانیشێ، ئەم کوڕە، دە ساڵانی تێپەڕ نەکردبوو[2]. زۆرتریش، پێدەچێ، دامەزراندنی ئەم منداڵە، دەستی (بدالدین لۆلۆ)ی تێدابووبێت، کە ئەوکات تەختی موسڵ، بە وەسیەت، لە دەستیدا بووە و، بەنیازی ئەوەبووە کە بە دەستییەوە بمێنێتەوە و لە دەستی دەرنەچێت.

بە مردنی (الملك القاهر) کە لە ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز)دا، لە بارودۆخێکی پڕ لە گوماندا گیانی سپارد[3]، (بدرالدین لۆلۆ) تەتەری ناردە لای خەلیفە (الناصرلدین

---

(١)الكامل ١٢/ ٢٩٣.

(٢)الكامل ١٢/ ٣٣٤. وفيات الاعيان، ٤/ ٢٩٦، ط ١٩٤٨.
ابوالفداء، المختصر في اخبار البشر، ٣/ ١١٨. ابن الفوطي، مجمع الآداب في معجم الألقاب، جـ٤، ق٢، ص ٧٢٦. (ابن خلدون)یش بەهەڵەدا چووە کە تەمەنی ئەو منداڵەی بە بیست ساڵ داناوە. بنۆڕە: ابن خلدون، (العبر) ٥/ ٥٩٥.

(٣)(ابو شامة) دەڵێت: (الملك القاهر عزالدين مسعود) ژەهرخوارد کرا. بنۆڕە: ذيل الروضتين، ص ١١٤. (الذهبي في العبر) ٥/ ٥٥. بەڵام (ابن خلكان) دەڵێت: لەناکاو مرد: وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٥. کەچی (ابن الأثير)ی مێژوونووسی تەخت و تەلار دەڵێت: بە لەرز و تا مرد. بنۆڕە: الكامل ١٢/ ٢٣٣.

الله) و داوای کرد کە (نورالدین أرسلان شاه) لەجێگای دابنێت و، کاروباری موسڵیش بەدەست خۆیەوە واتا بەدەست (بدرالدین لؤلؤ)ەوە بمێنێتەوە، خەلیفەش داواکەی قەبوڵ کرد[1]. (بدرالدین لؤلؤ) توانی مەلیکەکانی دەوروبەریش قایل بکات، یەك لەوانە سەرداری هەولێر بوو کە خۆی لەم ڕەفتارەی (بدرالدین لؤلؤ) بێدەنگ کرد، نەخاسمە ئەوەش کە حوکمی ئەتابەگییەکەی وەرگرت کچەزای خۆی بوو.

بەڵام (موزەففەرەددین گۆگبوری) هەڵوێستی خۆی گۆڕی و، چووە پاڵ (عمادالدین زەنگی)ی زاوای کە داوای تەختی موسڵی دەکرد. (عمادالدین زەنگی) تەختی موسڵی بۆخۆی، بەڕەواتر دەزانی، چونکە، خۆی گەورەترین کوڕی بنەماڵەی ئەتابەگیان بوو، زیاتر لەوەش سەرداری ناوچە شاخاوییەکانی ئەمارەتی موسڵ بوو، ئەو کەسەش کە تەختی موسڵی وەرگرتبوو یارای حوکمکردن نەبوو، منداڵیش بوو، ئەمەش مانای وایە دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەر (بدرالدین لؤلؤ) دەکەوێت کە وەسیەتدارێکی بەهێزبوو. ئەوەش سەرداری هەولێر دووبارە تووشی سەرێشە و شپرزەیی دەکات. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر (عمادالدین زەنگی) لەسەر ئەم تەختە دانیشتبا، ئەوا، (موزەففەرەددین گۆگبوری) دەیتوانی پشتی پێ ببەستێ و موسڵ بە پشتیوانی خۆی دابنێت و، ئەو هێزەش کە سەرداری هەولێر دژ بە موسڵ ئامادەی دەکات، دەیتوانی کەلێنێکی دیکەی پێ پڕ بکاتەوە و، هەندێ دەسکەوتی پێ وەدی بێنێت.

ئەو ئیشەی (بدرالدین لؤلؤ) کردی، هەردوو ئەمارەتەکەی دووبارە بردەوە سەر ناتەبایی و ڕووبەڕوو بوونەوەی سەربازی و، وەك جارانی بەر لە پێکهاتنەکە و ژن و ژنخوازییەکەی ساڵی (٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز)ی لێ هاتەوە و، هەولێر دەستی کرد بە شەڕ

---

(١)الكامل ١٢/ ٢٣٤ ـ ٢٣٥. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ص ٢٣٢.

ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، العدد/ ٤٨. لسنة ١٩٥٤، ص ٤٣٦.

The Chronography, V. I, P.٣٧١.

ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٢٥٥.

فرۆشتن بە موسڵ دوای ئەوەی بۆ ماڵە خەزوورانی (عمادالدین زەنگی) دەرکەوت کە ئەم زاوایەیان ماف خۆیەتی داوای هەقی خۆی بکات، بۆیە کەوتنە لەشکرکێشی و بەرپاکردنی جەنگ دژ بە زەوتکارانی تەختی موسڵ. (عمادالدین زەنگی) بۆی ساغ بووەوە کە (بدرالدین لؤلؤ) ئەو ئەتابەگە نابالغەی بۆ ئەوە فوت کردۆتەوە، تا، بنەماڵەی (زەنگییەکان) بێ بەها بکات و پاشانیش ڕەگیان لە تەخت و تەلاری موسڵ هەڵکێشێت[1]. لەبەر ئەوە، ناچار بوو، بەکۆمەکی سەرداری هەولێر، داکۆکی لەم بنەماڵە حاکمەی خۆی بکات.

دوای ئەوەی کە (بدالدین لؤلؤ) لە موسڵ دەری کرد[2]، (عماد الدین زەنگی) بەرە بەرە کەوتە پەلاماری ناوچەکانی موسڵ بەتایبەتیش لە ناوچە شاخاوییەکاندا. (بدرالدین لؤلؤ) باسوخواسی ئەم پەلامارانەی بەرگوێ کەوت، ئەوەبوو، قۆڵی لێ هەڵماڵی و خۆی تەیار و ئامادە کرد و دەستبەجێ و گەرماو گەرم هێزێکی نارد بۆ عمادیة (آمیدي) بۆ سەرکوتکردنی جموجووڵی (عمادالدین زەنگی)، وەلێ باری کەشوهەواو سەرماو بەفر و، کۆمەکی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بۆ زاواکەی، ڕیسەکەی کردەوە بە خوری و هیچی لێ پەیدا نەبوو.

ئنجا (بدرالدین لؤلؤ) ناچار، کەوتە نامە و نامەکاری لەگەڵ سەرداری هەولێر و، داوای لێ کرد کۆمەك بۆ (عمادالدین زەنگی) ڕابگرێت و هیچی بۆ نەنێرێت. عەهد و پەیمانی نێوانیانی[3] وەبیر هێنایەوە کە دەڵێت: نابێ لە ناوچەکانی موسڵ

---

(١)ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، المجلد نفسه. ص ٤٣٦.
The Chronography, V. I, P. ٣٧٢.
بنۆڕە: (سعید الدیوەجي، الموصل في العهد الاتابكي، ص ٣٨).

(٢)سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/ ٦٠١.

(٣)سەرچاوەکان هیچ لەبارەی ئەم پێکهاتنەوە کە بەر لەم پێکدادانە مۆر کراوە باس ناکەن.

دەستدرێژی بکرێت بە قەڵاکانی (هەکاری[1] و زۆزان[2]یشەوە. بەڵام سەرداری هەولێر گوێی خۆی لێ ئاخنی و بایەخی پێ نەدا. بەو جۆرە ئەو قەڵایانە بەدەست (عمادالدین زەنگی)یەوە مانەوە[3].

(بدرالدین لؤلؤ) ناچار کەوتە داواکردنی کۆمەك و پشتگیری لە دەرەوە، پێوەندی بە خەلیفە (الناصر لدین الله) کرد (٥٧٥ - ٦٢٢ك/ ١١٨٠ - ١٢٢٥ز)، خەلیفەش پشتگیریی لە حوکمی میرە بچکۆلە کرد[4]، بەڵکو گاڵیشی دا لەدژی (موزەففەرەددین گۆکبوری).

---

(١)الهکارية: هەکاری: شارۆچکە و ناحیە و چەند گوندێکە، کەوتووەتە ژووروروی موسڵ لە وڵاتی جزیرەی (ابن عمر). هەموو خەڵکەکەی کوردن، پێیان دەگوترێ (هەکاریەکان): (معجم البلدان ٥/ ٤٠٨).

(٢)زۆزان: ناحیەیەکی گەورە و فراوانە لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، لە جزیرەی (ابن عمر)، یەکەم سنووری، دوو ڕۆژەڕێ لە موسڵەوە دوورە، قەڵاگەلێکی زۆری سەخت و قایمکاری لێیە، هەموویان موڵکی کوردەکانی (پشتەوی و بەختییە): (معجم البلدان ٣/ ١٥٨).

(٣)الکامل ١٢/ ٣٣٦. ابن العديم، زبدة الحلب ٣/ ١٨٧. مفرج الکروب ٤/ ٢١. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، المجلد نفسه، ص ٤٣٦.

The Chronography, V, I, P. ٣٧٢.

ابن خلدون، کتاب العبر ٥/ ٥٩٧. الغساني، العسجد المسبوك: ٣٢٢.

سعيد باشا الدياربکري، مرآة العبر (ترکي) مجلد/ ٢، جـ٨، ص ١٧٣.

(٤)(سوادي عبد محمد الرويشدي) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ) وەهای بۆ دەچێ کە هۆکاری دنەدانی باوەڕی شیعایەتی لە موسڵ لە لایەن (بدرالدين لؤلؤ)ەوە، لەوەوە ئاو دەخواتەوە کە ئەم کابرایە ویستوویەتی لەلای خەلیفە (الناصرلدين الله) خۆی شیرین بکات، بەشکو لە پایەماڵکردنی باقیمەنی ئەتابەگەکانی موسڵدا یاریدەی بدات. (ص ٣٩ - ٤٠). دیارە ئەم خەلیفەیە هەست و سۆزێکی بەرامبەر بە شیعەی ئیمامی هەبووە بە پێچەوانەی باو و باپیری کە حەزیان لە شیعە نەدەکرد. (ابن الواصل) دەڵێ: خەلیفە (الناصرلدين الله) - شیعایەتی دەرکرد و، بەلای مەزهبی ئیمامیدا دایدەتاشی و هەمیشە کۆمەڵێ شیعە دەچوونە لای. (مفرج الکروب ٤/ ١٦٦، ٤/ ١٦٩). (ابن الطقطقي)یش لە (الفخري في الآداب السلطانية ص/ ٣٢٢)دا، هەر وەهای گوتووە. (ابن قنيتو الأربلي)یش، دەڵێت: ئەم خەلیفەیە گۆڕێکی لە تەنیشت مەرقەدی (الامام محمد الجواد - ع -) بۆخۆی ئامادەکرد بەڵام بەنسیبی نەبوو. (خلاصة الذهب المسبوك، ص ٢٨٢ - السيوطي، تأريخ الخلفاء، ص ٤٥١). (الصفدي)یش چەند بەیتە شیعرێکی ئەم خەلیفەیەی لە خۆشویستنی ئیمامی عەلیدا (خ) هێناوەتەوە: (مخطوط). الوافي بالوفيات، جـ ٥، ورقە ١٤٥.

(ضياء الدين ابن الأثير المنشئ) لە زمانی (بدرالدين لؤلؤ)ەوە نووسیویە و دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەشکرێکی لە هەولێرەوە بانگ کردووە، لەشکرێکە تا بڵێی قورس و گران، پتەو و ترسناك و بێ حەدد و حساب، لە دامێنی قەڵاکەیدا، کە بە (عقر) بەناوبانگە، هەڵیداوە[1]". هەرچەندیشە (بدرالدين لؤلؤ) لەم بوارەدا سەرکەوت، وەلێ دەشیزانی کە کۆمەکەکەی خەلیفە، هەر، بەزارەکییە و، بەکردەوە هیچی بۆ ناکات. ئەمەش ناچاری کرد بۆ لایەنگر و دۆستێکی تر بگەڕێت.

پاشان ئامانجی بزربووی لە لای (الملك الاشرف موسى ابن الملك العادل الايوبي) سەرداری وڵاتی جزیرە، دۆزییەوە[2] و (ت، ٦٣٥ك/ ١٢٣٨ز)، پێکەوە پەیمانیان بەست کە شەڕ و بەڵای (موزەففەرەددین گۆکبوری) و (عمادالدين زەنگی)ی زاوای لە ناوچەکە دوور بخەنەوە. ئیدی، دەستبەجێ (الملك الأشرف) ئاگاهییەکی نارده سەر سەرداری هەولێر و هەڕەشەی لێ کرد کە ئەگەر واز لە یاریدەدانی (عمادالدين زەنگی) نەهێنێ، ئەوا وڵاتەکەی داگیر دەکات. لە ئاگاهییەکەشیدا گوتی: ئەگەر ئەم تکایەم لێ قەبوڵ نەکەیت و سوور بیت لەسەر یارمەتیی (زەنگی)، ئەوا بەخۆم دێمە سەرت و شارەکەشت داگیر دەکەم[3]. داوایشی لێ کرد بە کۆمەکەوە بەرەو میسر ئامادەبێت بۆ دەرکردنی فەڕەنگەکان.

(موزەففەرەددین گۆکبوری) گوێی نەدایە، ئەمجارە کەوتە بزاڤی دەبلۆماسی و پەیداکردنی پشت و پشتیوان و هاندانی مەلیکەکانی دەوروبەر بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی هاوپەیمان کە لە ڕووی (الملك الأشرف)دا بووەستنەوە، ئنجا کەوتە نامە و نامەکاری لەگەڵ (الملك المنصور ناصرالدين آرتق تمرتاش

---

(١)ضياء الدين ابن الأثير، رسائل ابن الأثير، ص ٦١.

(٢)الكامل ١٢/ ٢٣٧. ابن العبري، مختصر تأريخ الدول، ص ٢٣٢.

ابوالفدا، المختصر في اخبار البشر ٣/ ١٣١. ابن شداد، مخطوط (الاعلاق الخطيرة) ورقة ٥٣/ ب. الدياربكري، مرآة العبر، مجلد/ ٢، جـ ٨، ص ١٧٣.

(٣)الكامل، ص. ن. مفرج الكروب ٤/ ٢٢.

ایلغازی کوڕی آرتق) [١] سەرداری ماردین[٢] و، لەگەڵ (الملك ناصرالدین محمود کوڕی محمد قرا أرسلان کوڕی سقمان کوڕی آرتق) [٣] سەرداری (ئامەد) [٤] و (قەڵای کیفا) [٥]. ئەوانە هەردووکیان بە دەنگییەوە هاتن[٦]، چونکە ئەوان لەگەڵ ئەییوبییەکاندا ناتەبا و ناکۆك بوون، لەو کۆنە قینەوەی کە ئەییوبیان حوکمی (ئەرتەقییەکانیان) [٧] لەناو بردبوو. بەم جۆرە، هەموویان لەسەر شەڕی (الملك الأشرف) و (بدرالدین لؤلؤ)ی هاوپەیمانی، پێك هاتن.

ئنجا (عمادالدین زەنگی) بەرەو (العقر) کە موڵکی خۆی بوو، کەوتە ڕێ و، لەوێ لەشکری مۆڵ دا بۆ ئەوەی دەستی بە ناوچەکانی موسڵ بگات. (موزەففەرەددین گۆگبوری)یش کۆمەڵێ سەربازی بۆ نارد. کاتێ (بدالدین لؤلؤ) بەم جموجووڵەی

---

(١)لەنێوان ساڵانی (٥٩٧ ـ ٦٣٧ك/ ١٢٠٠ ـ ١٢٤٠ز) حوکمی رانیوە (کردووە)، بنۆڕە: زامباور، معجم الاسرات، ص ٣٤٤. مرآة الزمان ٨/ ٧٣٠. بەڵام (ابن شداد) دەڵێت: لەساڵی ٦٣٦ك مردووە، بنۆڕە: مخطوط (الاعلاق الخطيرة) ورقه ١٣٤/ب.

(٢)ماردین قەڵایەکی بەناوبانگە، بەسەر شاخێکەوە لە جزیرة، معجم البلدان ٥/ ٣٩.

(٣)لەنێوان ساڵانی (٥٩٧ ـ ٦١٩ك/ ١٢٠٠ ـ ١٢٢٢ز) حوکمی رانیوە. بنۆڕە: زامباور، م. ن. ص. ابن تغري بردي، النجوم، ٦/ ٢٥٠.

دەربارەی ساڵی مردنی ئەم میرە، جیاوازییەك هەیە، (ابو شامة) دەڵێت: لەساڵی ٦١٧ك مردووە (ذيل الروضتين ١٢٤. ابن واصل ٦١٨. مفرج الكروب ٤/ ١٠٧). هەرچی (ابن الأثیر)ە کە هاوزەمەنی خۆیەتی، ئەوە، ئەو دەڵێت: لەساڵی (٦١٩ك)دا مردووە (الكامل، ١٢/ ٤١٢).. (ابن شداد: الاعلاق، ٥٣/ ب) هەروەهاش (ابو الفدا، المختصر، ٣/ ١٣٠) و (المقريزي ١/ ٢١٢)یش، هەرسێکیان، هەر قسەکەی ئەو دەکەن.

(٤) آمد (ئامەد)؛ گەورەترین و بەرێزترینی شارەکانی دیاربەکرە. معجم البلدان ١/ ٥٦.

(٥)حصن (قەڵای) کیفا؛ شارۆچکەیەك و قەڵایەکی مەزنە، بەسەر دیجلەدا دەڕوانێت و، کەوتووەتە نێوان ئامەد و جزیرەی (ابن عمر). معجم البلدان، ٢/ ٢٦٥.

(٦)لكامل ١٢/ ٣٣٨.

(٧)ابن خلكان، وفيات الاعيان، جـ٤، ص ١٧٣، ٤١٣.

زانی، ئەویش کۆمەڵێ سەربازی لە دەوروبەری موسڵ، بۆ پاراستنی شارەکە دامەزراند، کە بۆ لێدانی هەر هێرشێکی ناکاو[1] ئامادەبن. هەر، کە زستانی ساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز) بەسەرچوو، ئەم سەربازانە شەبەیخوونێکیان کردە سەر (عمادالدین زەنگی) لە شاری (العقر) و بوو بە شەڕ، لەم شەڕەدا سەربازەکانی (بدرالدین لؤلؤ) سەرکەوتن و، سەرداری (العقر و، شوش) رایانکرد بۆ هەولێر، سەرکەوتووەکانیش گەڕانەوە بۆ موسڵ. پاشان شاندی خەلیفە (الناصرلدین الله) و شاندی (الملك الأشرف) گەیشتنە ناوچەکە و کۆتاییان بە ململانێیەکە هێنا و تەبایینامەیەك لەنێوان هەردوولای شەڕەکەدا مۆر کرا[2].

بەڵام ئەتابەگی نوێ (نورالدین أرسلان شاه)ی (دووەم) کە چەند مانگێك بوو لەسەر تەختی موسڵ دانیشتبوو، مرد. بە مردنی ئەویش تەبایینامەکە دووبارە هەڵوەشایەوە، چونکە (عمادالدین زەنگی) و (موزەففەرەددین گۆکبوری) هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە چارەنووسی بنەماڵەی ئەتابەگی زەنگی کەوتووەتە سەر لەپی دەستی دێو (واتا: کوولەکەی ڕۆحی هەردووکیان بەدەستی دێوێکەوەیە)، جا ئەگەر بێت و گەرماو گەرم نەکەونە خۆ و بەرامبەر بەو خراپەیەی کە (بدرالدین لؤلؤ) دژ بە ئاغا زادەکانی کردی شتێك نەکەن، ئەوا چارەنووسیان بەرەو نەمان دەچێ، نەخاسمە کە ئەمە دووجارەیەتی لە ڕێوڕەسمی میراتی موڵك و حوکم لادەدات و، لە دژی دوژمنی خۆی کە منداڵێکی کەمتر لە سێ ساڵانی[3] وەك، (ناصرالدین محمود)ی

---

(١)الكامل، ص. ن. مفرج الكروب، ٤/ ٢٤.

(٢)الكامل، ص. ن. مفرج الكروب، ٤/ ٢٥. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ٢٣٣.
The Chronography, V. I, P. ٣٧٣.

ابن خلدون، تأريخ العبر، ٥/ ٥٩٨.

(٣)الكامل، ١٢/ ٣٣٩. مفرج الكروب، ن. ص. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول ٢٣٢.
The Chronography, V. I, P. ٣٧٤.

أبو الفداء، المختصر في اخبار البشر ٣/ ١٣١.

ابن كثير، البداية والنهاية ١٢/ ١٣٦. ابن خلدون، كتاب العبر، ٥/ ٥٩٨.

کوڕی دووەمی (الملك القاهر عزالدین مسعود) لەسەر تەختی حوکم دادەنێت.

(نورالدین أرسلان شاه) بەر لە مردنی، بە سەختی بریندار ببوو، لەبەر ئەم زامانەشی نەیدەتوانی لە جێگا هەستێ، یان خۆی پێشانی خەڵك بدات[1].

(عمادالدین زەنگی)ی مامیشی ڕای گشتی موسڵی[2]لە (بدرالدین لۆلۆ) گاڵ دەداو بەوە تۆمەتباری دەکرد کە ئەتابەگی شاردووەتەوە بۆ ئەوەی بیکوژێت. (عمادالدین زەنگی) نوێنەری خۆی نارد بۆ لای بەرپرسانی شارگەلی موسڵ، بەتایبەتیش بۆ ئامێدی کە بە زمانی ئەوەوە پێیان بڵێن: "برازاکەم مردووە و، (بدرالدین لۆلۆ) بەتەمایە وڵاتەکە بکاتە موڵکی خۆی، کە موڵکی باو و باپیری[3]منە و، هەقی خۆمە". ئەوەشی ڕاگەیاند کە ئەگەر (بدرالدین لۆلۆ) مکوڕبێت لەسەر دامەزراندنی ئەم منداڵە، واتا (ناصرالدین محمود) بەهەمان شێوەی کە پێشتر (نورالدین أرسلان شاه)ی دامەزراند، ئەوە، لەوبارەدا، هەر هیچ نەبێ، پێویستە (عمادالدین زەنگی) سەرپەرشتی ئەم حاکمە منداڵە بکات نەك (بدرالدین لۆلۆ)، ئنجا گوتی: (من لەبەرتر و موستەهەقترم سەرپەرشتیی برازای خۆم بکەم[4]. لەمەدا هەندێکان، لە موسڵ پشتگیرییان لێ کرد و، سەردارانی هەندێ لە قەڵاکانیش، بە قەڵای

---

(١)الكامل ١٢/ ٣٣٥. مفرج الكروب ٤/ ٢١.

(٢)لە نووسینەکانی (ابن الأثیر)ەوە، دەردەکەوێت کە هەوڵ و کۆششی (عمادالدین زەنگی) کارێکی زۆری لە خەڵکی موسڵ کردووە، چونکە ئەوانیش کەوتنە گومان کە ڕەفتاری (بدرالدین لۆلۆ)ی (وصي)، هەروەها ئەوەش دەردەخات کە خەڵکی موسڵ بە مەلیکەکانی عێلی زەنگییەوە واوەست بوون. (ابن الأثیر) دەڵێت: (بدرالدین لۆلۆ) (ناصرالدین محمود)ی بچکۆلەی کرد بە مەلیك، خەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو. کاتێکیش دەرکەوت کە سوڵتانەکەیان لە بنەماڵەی زەنگییە، ئەوجا ئارام و دڵنیا بوونەوە و، گێرەشێوێنییەکی زۆریش نەما. (الكامل ١٢/ ٣٣٩).

(٣)الكامل ١٢/ ٣٣٥. مفرج الكروب، ٤/ ٢١. ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٢٥٦.

(٤)ابن العديم ، زبدة الحلب ٣/ ١٨٧.

نامێدییشەوە[1] تەئییدیان کرد.

ئیتر بەم جۆرە، مردنی یەك لەدوای یەکی میرەکانی موسڵ لە ماوەیەکی زۆرکەمدا و، دەستگرتنی ئەتابەکی[2] لێهاتوو (بدرالدین لؤلؤ) بەسەر تەختی[3] حوکمدا، نەیانهێشت دۆستایەتی لەنێوان هەولێر و موسڵدا درێژە بکێشێ. چونکە (موزەففەرەددین گۆکبوری) دەیزانی کە (بدرالدین لؤلؤ) بەنیازە تەختی ئەتابەگی زەنگی[4] مایە پووچ بکات، ئەوەتا، هەر بەو نیازە نا باڵغەکان، بگرە نەخۆشەکانیش دەخاتە سەر تەخت و، میراتگرە باڵغەکان پەڕ دەکات، جا، بە بۆنەی دامەزراندنی ئەم (ناصرالدین محمود)ە منداڵەوە، (عمادالدین زەنگی)، بە پشتیوانیی سەرداری هەولێر، کەوتەوە داواکردنی تەخت و تەلاری موسڵ. دەرفەتیش ڕەخسابوو، چونکە موسڵ بەشێك لە لەشکرەکەی خۆی، لەسەر داوای (الملك الأشرف)

---

(١)الکامل، ن. ص. مفرج الكروب، ن. ص. ابن العبري، ن. ص.

ابن الفرات، ن. ص. ابن خلدون، تأريخ العبر، ٥/ ٥٩٦.

(٢)لەم (ئەتابەگ)ەی ئێرەدا مەبەستمان لە لایەنی زمانەوانییەکەیە، واتا: (لەلە).

(٣)ابن تغری بردی لە (النجوم الزاهرة، ٧/ ٧٠)دا، دەڵێت: "کاتێ - الملك القاهر - لە ساڵی (٦١٤ك)دا کۆچی دوایی کرد (ڕاستییەکەیشی لە ساڵی ٦١٥ك/ ١٢١٨ز)دا، مردووە، (بدرالدین لؤلؤ) دوو کوڕەزای (الملك القاهر)ی دامەزراند واتا هەردوو کچەزاکەی (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی سەرداری هەولێری دامەزراند، پاشان کوڕەکانی پرۆفیسۆرەکەی خۆی سەروون کرد و، یەك لەدوای یەك بە غەدر کوشتنی، پاشان مەملەکەتی موسڵ و شارۆچکەکانیشی خستە ژێر چنگی خۆی. (بنۆڕە: وفيات الاعيان، ٤/ ٢٩٦، ط، القاهرة).

(٤)(الرويشدی) دەڵێت: (بدرالدین لؤلؤ) لە موسڵ، شیعەکانی دنە دەدا و خەڵکی دەکرد بە شیعە، بۆ ئەوەی ئاسەواری ئەتابەگەکان کوێر بکاتەوە و پاشماوەی ماددی و هزرییان بنبڕ بکات چونکە دەیزانی ئەگەر ئەم ئاسەوار و پاشماوانە بمێننەوە زیان لە حوکمە تازە شەقوشڕەکەی دەدەن، لەبەر ئەوە قوتابخانە ئەتابەگییەکانی کرد بەگۆڕستانی کوڕانی ئیمامی عەلی (خ). بنۆڕە: کتێبەکەی خۆی: (امارة الموصل في عهد بدرالدین لؤلؤ، ص ٣٧، ٤٠). دیاریشە کە ئەتابەگەکانی موسڵ هەموویان سوننە مەزهەبی شافیعی یان حەنەفینە. بنۆڕە: (الباهر، ص ٩٣، ١٩١) هەروەهاش (الکامل ١٢/ ١٣٩).

ناردبوو بۆ بەرەی جەنگی خاچدروشمان، لەبەر ئەوە (عمادالدین زەنگی) و سەرداری هەولێر، لەشکرێکیان تەیار و ئامادە کرد و، ملیان نا لە موسڵ. پێدەچێ (بدرالدین لۆلۆ) بەتەمای ئەم هێرشەی هەولێر بووبێت، بۆیە، ناردی لەدووی هێزەکانی (نصیبین) کە پێشتر (الملك الأشرف)ی هاوپەیمانی خستبوونیە ژێر دەستی. ئەو هێزانەش بە فەرماندارییی (عزالدین ایبك) کەوتنە ڕێ و لە پایزی ساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز)دا گەیشتنە جێ و، فەرماندارەکەیان بەنیازبوو لە دیجلە بپەڕێتەوە و یەکسەر بەرەو هەولێر هێرش بەرێت، وەلێ (بدرالدین لۆلۆ) داوای لێ کرد پەلە نەکات و ئارام بگرێت تا سەربازەکانی ماوەیەك پشوو بدەن. پاش چەند ڕۆژێك، لەشکر لە رووبارەکە پەڕینەوە و، لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە، یەك فۆناغ[1] دوور لە موسڵەوە[2] لەشکرگایان لێ سازدا. ئنجا (بدرالدین لۆلۆ) کەوتە دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانی لەشکر و ڕێکخستنی کاروباری جەنگ و (ایبك)ی کرد بە (الجالیشیة) [3] واتا کردی بە پێشەنگی لەشکر و کوڕگەلی شیاو و ئازا و بە جەرگی لەناو سەربازەکاندا بۆ هەڵبژارد. هەرچی (موزەففەرەددین گۆگبوری)یە، ئەوە، ئەو

(١)فرسەخ (فۆناغ) دەکا دووریی سێ، تا، شەش میل ڕێگا. دەشڵێن، گوایا، دەکاتە دە هەزار باڵ، یان دوازدە هەزار: تاج العروس ٢/ ٢٧٢ ـ ٢٧٣.

(ادی شیر)یش دەڵێت: فۆناغ ئەکا ماوەی شەش کیلۆمەتر ڕێگا. ئەسڵی وشەکەش فارسییە، کۆی (فرسخ) فراسخە، بنۆڕە: (الالفاظ الفارسیة المعربة، ص ١١٨).

(٢) الكامل ١٢/ ٣٣٩. ابن العديم، زبدة الحلب ٣/ ١٨٧.

مفرج الكروب ٤/ ٣٦. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ٢٣٢.

تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، ص ٤٣٩.

The Chronography, V. I, P. ٣٧٤.

ابن خلدون، تأريخ العبر ٥/ ٥٩٩.

(٣)(١) الجالیشیة (پێشەنگ): ئەسڵی (الجالیشیة) واتا ئاڵای گەورە، لەسەرەوەی گورزیەك مووی پێوە بووە، پاشان ئەم ناوە بەسەر پێشەنگی دڵی لەشکردا بڕدرا، یان بە پێشەنگی لەشکرەکە دەگوترا.

(٢) الكامل ١٢/ ٣٤٠ ـ ٣٤١. ابن العبري، نفس المصدرين والصفحتين. تأريخ ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٢٥٨.

لە زێی ژووروو، بۆ دەسەو یەخەی لەشكری موسڵ پەڕییەوە. كاتێكیش ڕووبەڕووی وەستان، هەندێ تیر لێك گرتن دەستی پێكرد، هەندەی نەبرد تێك چرژان و، زۆری پێ نەچوو لەشكری هەولێر هێزەكانی (بدرالدین لؤلؤ) و (عزالدین ایبك)ی ڕاونا - هەرچەندیشە یەكەم جار قۆڵی چەپی لەشكری هەولێر كە (عمادالدین زەنگی) فەرماندارییی دەكرد، بەزیبوو.

بەم سەركەوتنەی هەولێر، (بدرالدین لؤلؤ) بەرەو موسڵ هەڵات و، لە دیجلە پەڕییەوە و، خۆی كوتایە قەڵاكەی موسڵ، بەڵام لەشكری هەولێر دووی كەوتن و لەبەری لای ڕۆژهەڵاتی دیجلە بارەگایان لەپشت قەڵاكەی (نینوی) بەرامبەر بە شاری موسڵ[1] هەڵدا. پاشان. لەوەترسا كە لەشكرەكەی (لؤلؤ)، لەوێ، پەلاماری بدەن، لەبەر ئەوە، تەنیا سێ ڕۆژ لە (نینوی) مایەوە، پاشان، بەبێ هەراو بگری زەنگ[2] و شەیپوور گەڕایەوە بۆ هەولێر. كاتێكیش (موزەففەرەددین گۆكبوری) لە ڕووباری زێ پەڕییەوە و، لەو بەرەوە لەشكرگای هەڵدا، شاندی موسڵ گەیشتنە لای و پرۆژەی تەبایینامەیەكی تازەیان ڕادەستی كرد و، ئەمجارەش ئاشت بوونەوە[3].

بەڵام ئەم تەبایینامە نوێیەش، سەرداری هەولێری لە كۆمەكی (عمادالدین زەنگی) نەخست، (عمادالدین زەنگی) بەردەوام، هەر دەرفەتێكی بۆ ڕەخسابا، شەڕی بە (لؤلؤ) دەفرۆشت و، سەردارگەلی قەڵاكانی لەدژی گاڵ دەدا و، تیایدا سەردەكەوت.

---

(١)الكامل ١٢/ ٣٤٠ ـ ٣٤١. ابن العبري، نفس المصدرين والصفحتين. تأريخ ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٢٥٨.

(٢)الكوس (زەنگ): وەكو تای تەرازوو وەهایە، لە مس دروست دەكرێت، لە قەڵفانێكی بچووك دەچێت، بە ئاهەنگێكی تایبەت، دەمە قوڵپ لێك دەدرێن: (القلقشندی، صبح الاعشی، ٤/ ٩. ئەگەر لەشكر زەنگ و شەیپووری لێ نەدا، واتا شەڕ لەئارادا نییە.

(٣)الكامل ١٢/ ٣٤١. مفرج الكروب ٤/ ٢٨. ابن العبري، تأريخ الدول ٢٣٢. تأريخ ابن الفرات، مجلد/ ٥، جـ ١، ص ٢٥٩.

ئەوەبوو، خەڵكی قەڵای (كواشی)[1] داوایان كرد لە موسڵ جیا ببنەوە و بچنە سەر هەولێر، (عمادالدین زەنگی)یش خێرا گەیشتە ئەوێ و قەڵاكەی[2] ڕادەست درا.

(بدرالدین لۆلۆ) نارەزایی بەرامبەر بەم ڕەفتارە دەربڕی و، بە سەرداری هەولێریشی ڕاگەیاند كە نەدەبوو عەهد و پەیمانی نێوانیان بشكێنێ كە زۆری بەسەردا نەچووبوو. داواشی لێ كرد كە هەموو توانستێكی خۆی لەلای زاواكەی بخاتە كار بۆ ئەوەی قەڵای (كواشی)ی بداتەوە بە موسڵ، بەڵام ئەم نارەزایی و گلەییە با بردی و بێ هوودە بوو، ناچار، سەرلەنوێ هانای بردە بەر (الملك الأشرف الأیوبي). بەڵام ئەم مەلیكە - هەرچەندیشە حەڵەبی بەجێ هێشت و لە فوڕات پەڕییەوە و گەیشتە (حرّان)[3]- بەڵام لەبەر هەندێ بارگۆڕانی ناكاو و، شەڕی دەوروبەر، نەیتوانی هیچ كۆمەكێ بەم هاوپەیمانەی بكات.

(موزەففەرەددین گۆكبوری) بۆی دەركەوت؛ سیاسەتی دوورە شەڕ و، هێرشی خێرا و، داگیركردنی قەڵاكان، هیچ سوودێكی نەبوو، چونكە، كەمێك نەبێ، (لۆلۆ)ی كەمهێز نەكرد، ئەنجامیش هەر خۆی، ناچار دەبوو لەگەڵ (بدرالدین لۆلۆ)دا ئاشت بێتەوە و تەبایینامەی لەگەڵدا ببەستێتەوە. لەبەر ئەوە، بڕیاری دا بگەڕێتەوە سەر سیاسەتی پەیمانبەستن و دۆست و لایەنگیر پەیداكردن و لەكاتی زەرووردا سوودیان لێ ببینێ، سا، بەدەم شیرینكردن و دڵدانەوەی ئەم كۆمەڵ و ئەو كۆمەڵ، یان بە دۆستكردنی ناحەزانی (لۆلۆ) لە موسڵ، بە نموونە، وەكو مەسیحی و تایفەی

---

(١)كواشی: قەڵایەكی قایمە لە چیاكانی ڕۆژهەڵاتی موسڵ، تەنیا یەك ڕچە ڕێگای بۆ دەچێت، لەیەك زەلامی پیادە زێتر هیچی دیكەی پێدا هەڵناگەڕێ: معجم البلدان ٤/ ٢٨٦... ئەم قەڵایە لە هەموو قەڵاكانی موسڵ سەختترە و دەكەوێتە نزیك زاخۆوە: سلیمان الصایغ، تأریخ الموصل ١/ ٢٠٥.

(٢)الكامل، ن. ص. ابن خلدون، تأریخ العبر، ٥/ ٥٩٩. الدیار بكري، مرآة العبر، مجلد/٢، جـ ٨، ص ١٧٣.

(٣)الكامل، ن. ص. مفرج الكروب ٤/ ٢٤. ابن العبري، تأریخ الدول السریاني، مجلة المشرق، نفس العدد، ص ٤٣٩. ابن خلدون، ٥/ ٦٠٠.

(العدويـــة) و كۆمـــەڵانی دۆســـتی (عمادالـــدين زەنگـــی) كـــە لايـــەنگری بنەماڵـــەی (زەنگـــی)يـــەكانن، يـــانيش پێوەنـــدی و پـــەيمانی نـــوێ لەگـــەڵ مـــير و بەرپرســـانی دەوروبەردا ببەستێت.

هەرچی مەسيحييەكانە، ئەوە، (موزەففەرەددين گۆكبوری) دەيزانی كە ڕقيان لە سەرداری موسڵە، چونكە ئەم سەردارە، پێشەواو پياوی ئايين و سەرۆكی كەنيسە و دێرەكانيـانی بێـزار و تـەنگاو كردبـوون، داوای پـارەی لـێ دەكـردن، ئەمـەش كـارێكی وەهـای كـرد كـە بـە نهـێنی نامـە بـۆ سـەرداری هـەولێر بنێـرن و لەگەڵيـدا دژ بـە (بدرالدين لؤلؤ) ڕێك بكەون[1]. نامەيەك لەم نامانـە كەوتـە دەسـت (بدرالـدين لؤلـؤ) كـە (المغريـان[2]شمعـون البرطلـي) سـەرۆكی گونـدی (برطلـي) [3]كـە يـەكێك بـوو لـە گەورەپياوانی مەسيحييەكان، بۆ (موزەففـەرەددين گۆكبـوری)ی نـاردبوو. (لؤلـؤ)يـش فووی لە دۆ نەكرد، گرتی و لەداری دا[4]. ڕەنگيشە، ئەمە يەكەم نامـە نـەبووبێت كـە گەورە پياوانی مەسيحی بۆ (موزەففەرەددين گۆكبوری) يان ناردبێت. گومـانی تێـدا نييـە كـە (موزەففـەرەددين گۆكبـوری) هـەمان جـۆرە پێوەنـدی لەگـەڵ تايەفـەی (العدويه)ی واوەستی شێخ (عدی) كوڕی مـسافر كـوڕی اسماعيـل كـوڕی موسـی كـوڕی

---

(١)بطرس نصري، ذخيرة الأذهان، جـ٢، ص ٥٤.

(٢)المغريان: ئەسڵی ئەم وشەيە ئاراميیـە، لـە (مفريونـو)وە هـاتووە، مانـای بـەرخوردارە، مەبەسـتی پلەی كەنيسەيە لەنێوان (بطريارك و قەشەدا):
سوادي الرويشدي، أمارة الموصل، ص ٤٥، هامشی (٢).

(٣)برطلي: گونـدێكی گەورەيـە (لـە شـار دەچێت)، دەكەوێتـە ڕۆژهەڵاتـی دیجلـە و، شـارێكی سـەربە موسڵە، خێر و بێری زۆرە، بازاڕ و كڕين و فروختی گەرمە و، زۆربەی خەڵكەكەی مەسيحينە:
معجم البلدان ١/ ٣٨٥. ئێستا ناوەكەی بووەتە (الحمدانية) و، مەركەزی ناحيەيەكی پارێزگاری موسڵە و، دەكەوێتە سەر ڕێگای نێوان هەولێر و موسڵ.

(٤)سوادي الرويشدي، امارة الموصل، ص ٤٧.

مروان الهكاری (ل ٥٥٧ك/ ١١٦١ز) [1]، ببەستێ، ئەم سەرداری هەولێرە هەمیشە باسی جوامێریی ئەم شێخەی دەكرد و، پێشتریش لە موسڵ[2]، بەمنداڵی یەكتریان دیتبوو كە لەگەڵ (زین الدین علی كچك)ی باوكیدا بۆ موسڵ چووبوون. ئەم تایەفەیە نەیاری (بدرالدین لؤلؤ) بوون، كە لە كێشە و بەڵایان زۆر دەترسا و نەیدەوێرا بیانورووژێنێ، گوایا، زۆرجاران داویانە بەسەر موسڵدا[3]. (لۆلۆ) هەڵێكی بۆ ڕەخسا و، شێخ (تاج العارفین شمس الدین الحسن كوڕی عەلی كوڕی أبو البركات كوڕی صخر كوڕی مسافر)ی كوڕەزای (أبی البركات)ی برای (شێخ عدي)ی دەستگیر كرد، كە شێخی ئەم تایەفەیە بوو، پاشان لە قەڵاكەی موسڵدا ژێ (وتر)ی كەوانێكی لە ملی ئاڵاند و خنكاندی[4]. بێگومان تایفەیەكیش ئەو خراپەیەی دەرهەق بكرێت، لەخوای دەوێ هەلێكی بۆ هەڵكەوێ، بۆ تۆڵە كردنەوە، لەبەر ئەوە، بەهەر شێوەیەك بۆیان كرابێت پشتگیرییان لە (موزەفەفەرەددین گۆكبوری) كە دوژمنی (لؤلؤ) بووە، كردووە.

لەڕووی پێوەندییەكانی دەرەوەشی، (موزەفەفەرەددین گۆكبوری)، دڵی میرەكانی دەوروبەری دایەوە بۆ ئەوەی بەلای خۆیدا ڕایانكێشێت و، (بدرالدین لؤلؤ) و (الملك الاشرف)ی هاوپەیمانی تەریك بخات و كەسیان لەدەور نەمێنێ. بەو جۆرە، توانیی هەریەكە لە (عزالدین كیكاوس كوڕی كیخسرو كوڕی قلج أرسلان)ی سەرداری وڵاتی ڕۆم و (ناصرالدین أرتق أرسلان)ی سەرداری ماردین و، (ناصرالدین محمود كوڕی نورالدین محمد كوڕی قرا أرسلان الارتقی)ی سەرداری وڵاتی ئامەد (دیاربكر) و قەڵای (كیفا) بكات بەدۆست و لایەنگری خۆی و، لەگەڵ هەموویاندا ڕێككەوت و بڕیاریان دا كە هەموویان ئیتاعەتی (عزالدین كیكاوس)ی سەرداری وڵاتی ڕۆم

---

(١)سەیری ژیانحاڵی بكە لە: وفیات الاعیان ٢/ ٤١٧ ـ ٤١٨، ط ١٩٤٨. الذهبي، العبر، ٤/ ١٦٣. ابن الوردي، ٢/ ٩٢ ـ ٩٤. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ٤/ ١٧٩ ـ ١٨٠.

(٢)ابن خلكان ٢/ ٤١٨.

(٣)الكتبي، فوات الوفيات ١/ ٢٤٢.

(٤)ن. م. ص. الذهبي، العبر، ٥/ ١٨٣. شذرات الذهب، ٥/ ٢٣٩.

بکەن و، خوتبەش هەر بەناوی ئەوەوە بێت[1].

بەڵام ئەم هاوپەیمانێتییە نەهاتە بەر، چونکە (عزالدین کیکاوس) گیانی سپارد. پاش ئەو، (علاء الدین کیقباد)ی برای حوکمی وڵاتی ڕۆمی گرتە دەست، ئەم، بڕیاری هاوپەیمانییەکەی هەڵوەشاندەوە و، نامەی بۆ (الملك الاشرف) نووسی و تاعەتی ئەوی نایە بان سەر. هەروەها (ناصرالدین محمود)یش لە عەهد و پەیمان لایدا و، پشتی لە (موزەففەرەددین گۆگبوری) کرد و، ئەویش خۆی خستە ڕیزەکانی (الملك الاشرف) و لەگەڵیدا ئاشت بووەوە. بەو جۆرە هاوپەیمانییەکە لێکترازا[2] و (بدرالدین لؤلؤ) وەك بەرزەکی بانان بێ ئارەق دەرچوو، هیچ مەترسییەکی لەسەر نەما.

هەرچەندیشە (موزەففەرەددین گۆگبوری) لەهاوپەیمانێتی سەردارانی دەوروبەردا مایە پووچ دەرچوو، بەڵام لە بەلای خۆدا ڕاکێشانی هەندێ لە گەورەمیرانی (الملك الاشرف)، سەرکەوت - گەورەترینی ئەو میرانەش (ابا العباس عمادالدین احمد کوڕی میر سیف الدین أبی الحسن علي کوڕی أبي الهیجاء الکوردي) بوو. (أبوالهیجاء الکوردي) کە بە (ابن المشطوب)ی هەکاری بەناوبانگە میرێکی گەورەی سەڵاحەددینی[3] ئەییوبی بووە. هەروەها، میر (عزالدین محمد کوڕی بدر الحمیدي) [4] و میرگەلێکی دیکەشی بەلای خۆیدا کێش کرد و، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بکەونە بەربەرەکانێی (الملك الاشرف) و لەتوانستی بخەن.

---

(١)الکامل ١٢/ ٣٤٢. مفرج الکروب، ٤/ ٢٢. ابن خلدون ٥/ ٦٠١.

الغساني، العسجد المسبوك: ٣٢٧.

(٢)الکامل ١٢/ ٣٤٢. مفرج الکروب ٤/ ٧١.

(٣)المقریزي، السلوك ١/ ٢١٤. ولابن المشطوب ترجمة في: الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ٢/ ٢٢٤ ـ ٢٢٩.

ابن الوردي، تأریخ ابن الوردي ٢/ ١٩٩ ـ ٢٠٠.

ابن الفوطي، تلخیص مجمع الآداب، جـ٤، ق٢، ص ٦٧١ ـ ٦٧٢.

المقریزي، السلوك ١/ ١٩٦. بنۆڕە: (الکامل ٢/ ٣٢٥ دەربارەی پێگەی سیاسیی لە میسر.

(٤)الکامل ١٢/ ٣٤٢. مفرج الکروب ٤/ ٧٠.

هەرچی میری یەکەمە (ابن المشطوب)، کاتێ لە (الملك الاشرف) هەڵگەڕایەوە، خۆی و سەردارەکانی بەرەو هەولێر کەوتەڕێ تا لە (نصیبین) دەرباز بوو، پاشان لووت بە لووت کەوتە بەرامبەر سەربازەکانی (الملك الاشرف) و کوشتارێکی گەرم لە نێوانیاندا هەڵایسا و، میری هەڵگەڕاوە بەزی و، هەندێك لە هاوڕێکانی دەستیان لێ بەردا، بەڵام خۆی ڕادەست نەکرد و، بەرەو سنجار کەوتە ڕێ کە ئەوکات (فروخ شاە کوڕی زەنگی کوڕی قطب الدین مودود) حوکمی سنجاری دەگێڕا و سەر بە (الملك الاشرف) بوو، ئەو دەستگیری کرد. بەڵام، دیاربوو (ابن المشطوب) توانی قەناعەتی پێبکا و بیکاتە دۆستی خۆی، بگرە لە خشتەشی برد و، لە (الملك الاشرف)یشی هەڵگێڕایەوە[1].

(ابن المشطوب) لە سنجار بەدەر کەوت و، دەستی کردەوە بە تەنگاوکردنی شارۆچکە نزیکەکانی موسڵ و، چوو بۆ (البقعا) [2]و جێگایانی دیکەش، پاشان گەڕایەوە بۆ سنجار، ئنجا ڕووی لە (تلعفر) کرد کە سەر بە سەرداری سنجار بوو. لەو لاوە (بدرالدین لؤلؤ) کەوتە خۆ بۆ پاراستنی وڵاتی موسڵ و، لەشکری نارد بۆ لێدانی (ابن المشطوب). بەڵام نەیانتوانی بیبەزێنن. (بدرالدین لؤلؤ) ئنجا، خۆی، هاتە مەیدان و، لەشکرێکی چاکی تەیار و ئامادە کرد و، کەوتە شەڕ، وەلێ خۆیشی نەیتوانی کۆڵی پێبدات، ناچار بوو، کەوتە فروفێڵ و، ڕایگەیاند کە ئەگەر واز لە تەنگاوکردنی خەڵکەکە بهێنێ، لێی دەبوورێت، سوێندیشی بۆ خوارد و، (ابن المشطوب)یش بڕوای پێکرد و خۆی ڕادەستی دا و لەگەڵیدا چوو بۆ موسڵ[3]. وەلێ (بدرالدین لؤلؤ)، هەر زوو، لەبڕیاری خۆی پاشگەز بووەوە و بەباڵبەستی ناردی بۆ

---

(١)الكامل ١٢/ ٣٤٣.

(٢)البقعا: شارێکی گەورەی موسڵە، دەکەوێتە نێوان موسڵ و (نصیبین)، دێهاتی زۆرە، معجم البلدان ١/ ٤٧٢.

(٣)مرآة الزمان ٨/ ٦٠٩. وفيات الاعيان ١/ ١٦٣. مفرج الكروب ٤/ ٧٢. ابن الوردي ٢/ ١٩٩.

لای (الملك الاشرف) بۆ ئەوەی زێتر خۆی لە لای شیرین بكات (پتر بچێتە دڵیەوە) [1].
(الملك الاشرف)یش فرێیدایە زیندانی ناو قەڵاكەی (حران)ەوە و كەللەی لە ئاسن و هەردوو دەستیشی لەتەختە گرت. بەم شێوەیە لە زیندانەكەدا بۆ ماوەیەكی زۆر مایەوە تا سەر و ڕیشی ئەسپێ و مۆریان تێی دا و[2]، لەساڵی (٦١٩ك/ ١٢٢٢ز)دا گیانی سپارد[3].

لەهەموو ئەوانەی باس كران بۆمان دەردەكەوێ كە سیاسەتی (موزەففەرەددین گۆكبوری)یش لەگەڵ لایەن و هێزەكانی ناوچەی موسڵ، بەهۆی لێكهەڵوەشانی هاوپەیمانیی نێوان خۆی و میرەكان و، بەهۆی زیرەكی و وریایی (بدرالین لۆلۆ)ەوە، سەری نەگرت و سوودی نەبوو، چونكە (لۆلۆ) هەندە وریا و بەئاگابوو نەیهێشت مەسیحییەكان هیچ ڕۆڵێك لەو ململانێیەی نێوان ئەو و سەرداری هەولێردا بگێڕن، نەخاسمە دوای هەڵماڵینی نهێنییەكەی نێوان (المفریان شمعون البرطلي) و سەرداری هەولێر. سەرباری ئەوانەش (موزەففەرەددین گۆكبوری) بە لەدەستدانی (ابن المشطوب)- كە دیتوانی بەرامبەر بە دوژمنانی هەولێر بوەستێت - زەرەرێكی گەورەی لەخۆی دا. هەرچی میری دووەم (عزالدین محمد الحمیدي)یە، ئەوە، ئەو گەیشتە هەولێر و، سەرداری هەولێر كردی بە بەرپرسی (متولی)ی قەڵای (سارۆ) [4].

سەرداری هەولێر - دووبارە - دەستی كردەوە بە ڕاڕایی و گۆڕینی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە حوكمی موسڵ و (الملك الاشرف)ی دۆستی موسڵ. ئەوەبوو لە تاوسانی (هاوینی) ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز)دا ئەم مەلیكە سەردانی موسڵی كرد، سەرداری هەولێر ئەم سەردانەی بە دەرفەت زانی، هەستا، شاندێكی ناردە لای و پڕۆژەی

---

(١)وفیات الاعیان، ن. ص. بنۆڕە: (ضیاءالدین المنشئ، رسائل ابن الأثیر، ص ٦٣ ـ ٦٦.

(٢)وفیات، ص. ن. أبو شامة، ذیل الروضتین، ١٢١.

(٣)هەمان دوو سەرچاوە و دوو لاپەڕەكە. بشنۆڕە: الكامل ١٢/ ٣٤٣. مرآة الزمان، ٦٠٩/٨. مفرج الكروب ٧٦/٤. الیونینی، ذیل مرآة الزمان ٢٢٦/٢. ابن الوردي ٢٠٠/٢. المقریزی، السلوك ٢١٤/١.

(٤)ابن الأثیر، الكامل، مطبعة الاستقامة، القاهرة، ٩/ ٣٨٢.

تەبایینامەیەکی نوێی وەپێش چاو خست. (الملك الاشرف) بە پرۆژەکە قایل بوو، بەمەرجێ (موزەففەرەددین گۆکبوری) (عمادالدين زەنگی)ی زاوای قایل بکات دەست لەهەموو ئەو قەڵایانە هەڵبگرێت کە داگیری کردوون و، بیانداتەوە بە (بدرالدين لؤلؤ) و تەنیا قەڵای (العمادية) بەدەست خۆیەوە بمێنێتەوە[1].

ئەم ڕێککەوتنە، هەر لە سەرەتاوە گرێ و گۆڵی تێ کەوت و، گفتوگۆ و چەند و چۆنی لە نێوانیاندا دوو مانگ درێژەی کێشا. ڕاستیشت دەوێ، (الملك الاشرف) مرخی لە خودی هەولێر خۆش کردبوو، دیاربوو، لەشکری بەرەو هەولێر بەڕێ خستبوو، لەشکرەکەی گەیشتە (السلامية)[2]ی نزیکی زێی ژووروو. باسوخواسی ئەم جموجووڵەی (الملك الاشرف) گەیشتبووە هەولێر. (موزەففەرەددین گۆکبوری)یش بە لەشکرەوە ڕووی لە موسڵ کرد و گەیشتە سەر زێ بەڵام نەپەڕییەوە. لەوێ، بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر ڕووداوێکی ناکاو کەوتە ئامادەباشی.

کاتێکیش هەردوو لەشکرەکە بەیەك گەیشتن، هیچ پێکدادانێك ڕووی نەدا، سەرداری هەولێر ئەمجارەش شاندێکی نارد بۆ لای (الملك الاشرف) و، چەند پێشنیازێکی پێدا نارد، بەڵام وەڵامەکەی، لەبەر نالەباری هەلومەرجەکە و، لەبەر بێزاربوونی لەشکرەکەی کە دەمێك بوو چاوەڕێیان دەکرد و بێزار بوون، کەمێك دواکەوت، پاشان (الملك الاشرف) قایل بوو، نەخاسمە (ناصرالدين محمود کوڕی نورالدين محمد کوڕی قرا أرسلان الارتقي)ی سەرداری وڵاتی (ئامەد)یش، بەرە، بەرە، بایدایەوە بۆ لای سەرداری هەولێر. لەبەر ئەوە تەباییناماکە مۆرکرا و، وادەیەکیان

---

(١)لكامل ١٢/ ٣٤٤. مفرج الكروب ٤/ ٧٥. أبو الفدا، المختصر في أخبار البشر ٣/ ١٣٥. تأريخ ابن الوردي ٢/ ٢٠٠.

Setton, V. II. P. ٦٩٩

(٢)السلامية: گوندێکی گەورە بوو، سەر بە موسڵ، لەسەر ڕۆژهەڵاتی دیجلە و شەش قۆناغ لێك دوور بوون. چاکترین و دڵگیرترین گوندی ناوچەکە بووە و، دوو قۆناغ لە زێیەکەوە دوور بوو: (معجم البلدان ٣/ ٢٣٤.).

دانا كە (عمادالدین زەنگی) لەو وادەیەدا هەر قەڵایەكی گرتبوو ڕادەستی بداتەوە. (الملك الاشرف) لە نیاز و نییەتی (موزەففەرەددین گۆكبوری) بەگومان بوو، لەبەر ئەوە داوای لێ كرد كە زاواكەی ڕادەستی بدات، بە بارمتە لەلای بمێنێ، تا قەڵاكان ڕادەست دەداتەوە بە (بدرالدین لؤلؤ) [1].

كاتێكیش قەڵایەكان ڕادەستی بریكارەكانی (الملك الاشرف) درانەوە، كە ئەویش بیانداتەوە بە سەرداری موسڵ، سەردارگەلی قەڵاكان، یاخی بوون، تەنیا قەڵای چیای (جورا) [2]ی سەر بە هەكاری[3] نەبێ، هیچیان قایل نەبوون بكەونەوە ژێر دەستی (بدرالدین لؤلؤ). بەڵام (عمادالدین زەنگی) زەلامێكی نارد بۆ لای (شهاب الدین غازي)ی سەرداری (خلاط) بۆ ئەوەی بە دەنگیانەوە بچێت و، ئاوێ بە ئاگرەكەدا بكات و، تكا لە (الملك الاشرف)ی برای (عمادالدین زەنگی) بكات كە بریكارەكانی خۆی لەسەر قەڵای (العقر) و قەڵای (شوش) لا بدات و ئەو دوو قەڵایە بدات بە (عمادالدین زەنگی). بەڵام سەردارانی قەڵاگەلی هەكاری و زۆزان، بە قەڵای (العقر) و (العمادیة)شەوە: تەنیا قەڵای شوش نەبێ، هەموویان - دووبارە - داوایان كردەوە بچنەوە ژێر ڕكێفی موسڵ، چونكە دیتیان كە (عمادالدین زەنگی) بەباشی لەگەڵیان هەڵنەسووڕا و - وەكو چاوەڕوانیش دەكرا دڵیانی نەدایەوە و ڕازیی نەكردن، بەڵكو تەنگاوی كردن و هیچی بە دڵی ئەوان نەكرد. (بدرالدین لؤلؤ)یش، لەخوای دەویست، بە گەرمی بەپیریانەوە چوو، قەڵاكانیانی خستەوە سەر موسڵ[4].

---

(١) الكامل ٢/ ٣٤٥. مفرج الكروب ٤/ ٧٥. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، نفس العدد، ص ٤٤٢.

ابن خلدون، تأريخ العبر، ٥/ ٦٠٢.

(٢) جبل جورا (چیای جورا): ناوەدانییەكی گەورەی ناوچەی ئەرمەنستانە، بە دیاربەكرەوە جووتەو، گوند و قەڵاگەلی تێدایە: معجم البلدان ٢/ ١٠٢.

(٣)الكامل ١٢/ ٣٤٥. مفرج الكروب ٤/ ٧٥.

(٤)الكامل ١٢/ ٣٤٦. ابن خلدون ٥/ ٦٠٣.

ئیدی لەپاش ئەم ڕووداوانە، بۆ ماوەی شەش ساڵی پاشتر (٦١٥ - ٦٢١ك/ ١٢١٨ - ١٢٢٤ز) ئاشتی و ئارامی باڵی بەسەر سەروسەخت و پێوەندییەکانی نێوان هەولێر و موسڵدا کێشا. وادیارە، سەرداری هەولێریش، ئیدی، وەك جاران ئەو بایەخە گەورەیەی بە (عمادالدین زەنگی) نەدەدا کە بەهۆی سیاسەتی چەوت و نیگەرانکردنی سەردارەکانی خۆیەوە، قەڵاکانیشی لەدەست چوو، بەڵکو تەنیا قەڵایەکیش، لە قەڵاگەلی چیاکانی موسڵ کە بە دەستییەوە مابوو، ئەویشی لەدەست دا کە قەڵای (شوش) بوو، لەدەستدانی قەڵای شوش لەو ماوەیەدا بوو، کە لە ساڵی (٦١٩ك/ ١٢٢٢ز)دا، قەڵاکەی بەجێ هێشت و چوو بۆ ئازەربێجان، بۆ لای (موزەففەرەددین اوزبك کوڕی البهلوان) و، لەوێ، لەلای ئەو، ماوەیەکی زۆر مایەوە، ئەویش هەندێ ناوچەی بۆ دابڕی[1]. ئەو بەو مەبەستە چووبوو لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتەوە و، لەدژی (بدرالدین لؤلؤ) بکەوێتەوە ململانێ، بەڵام بۆ (لؤلؤ) دەرفەتێك بوو، ڕەخسا و، بەسەریەوە نەچوو، پەلاماری قەڵای شووشی دا و، زۆر بە سەختی گەمارۆی داو تەنگاوی کرد، وەلێ بۆی داگیر نەکرا، ناچار گەڕایەوە بۆ موسڵ و، قەڵاکەی بۆ سەربازەکانی بەجێ هێشت، سەربازەکانیشی، دوای مۆرکردنی تەباییننامەیەك لەنێوان هەردوولا قەڵاکەیان وەرگرت[2].

لەم کارەساتەی (بدرالدین لؤلؤ) و سەربازەکانی بەسەر شووشیاندا هێنا (موزەففەرەددین گۆکبوری) بێدەنگ بوو، پێدەچێ ئەم بێدەنگییەشی لە ڕقی زاواکەی بووبێت کە قەڵاکانی خۆی بەجێ هێشت و، چوو بۆ ئازەربێجان و زۆری پێچوو، کە هەندەی نەدەهێنا. بەڵام ئەم داواکردنی کۆمەکە، لە (اوزبك کوڕی البهلوان) مەبەست و نیازێکی تری لەژێر سەری (عمادالدین زەنگی) وەشێردرابوو. مەسەلەیەك بوو پێوەندیی نێوان ئەو و ماڵە خەزوورانی ڕوون دەکردەوە کە بەرەو

---

(١)لكامل ١٣/ ٤١١. مفرج الكروب ٤/ ١١٥. رشيدالدين فضل الله الهمداني، جامع التواريخ، جلد/ ١، ص ٢٩٧. (بەزمانی فارسی).

(٢)الكامل ١٢/ ٤١٢. مفرج الكروب ٤/ ١١٥. جامع التواريخ، ن. ص.

خراپی دەچوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە داوای کۆمەکی لە سەرداری ئازەربێجان دەکرد، چونکە (موزەففەرەددین گۆکبوری)، بەر لەوەش هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەم زاوایەی گۆڕیبوو، کە ئەوەی لەباردا نییە بتوانێ ئاواتی خۆی و ئەمیش لەوڵاتی موسڵدا بێنێتە دی، بەڵگەی ڕاستی ئەم لێك زیزبوونەش ئەوەیە کاتێ لە ئازەربێجان گەڕایەوە، سەرداری هەولێر گرتی و حەپسی کرد و پاشان ڕادەستی (الملك الاشرف)ی[1]دا، وەلێ، ئەم ئازادی کرد، ئەمیش بە نائومێدی و ملکەچی گەڕایەوە هەولێر. ئەمجارەیان، (موزەففەرەددین گۆکبوری) شارەزوور و شارەکانی شارەزووری، لەجیاتی ئەو قەڵایانەی کە لە (نورالدین أرسلان شاه)ی باوکییەوە بەمیرات بۆی مابووەوە، خستییە ژێر دەستی (عمادالدین زەنگی) کەمێك بەر لە ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) [2] گەیشتە شارەزوور و، لەوێ مایەوە تا لەساڵی (٦٣٠ك)دا سەری نایەوە، (١٢٣٢ - ١٢٣٣ ) [3].

لەبەر ئەوانەی باسمان کرد (موزەففەرەددین گۆکبوری) سیاسەتێکی هێور و

---

(١)وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٦، ط ١٩٤٨.

(٢) قەشە (سليمان الصائغ) دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەنیاز بوو وڵاتی ئەتابەگەکان بخاتە ژێر چنگی خۆی، بۆیە، زاواکەی خۆی گرت و ناردی بۆ (الملك الاشرف). ئەم قەشەیە هەڵەی گوتووە. بنۆڕە کتێبەکەی خۆی: (تأريخ الموصل) ١/ ٢٠٧.

(١) سەرەتای چوونی (عمادالدین زەنگی) بۆ وڵاتی شارەزوور، نەزانراوە. بەڵام ساغ بووەتەوە کە لە ساڵی (٦٢٣ك/ ١٢٢٥ز)دا حوکمی شارەزووری کردووە. ئەم حەقیقەتەش، بەو دینارەدا دەردەکەوێ کە (عمادالدین زەنگی) لەو ساڵەدا لە سکەی داوە، چونکە لەو دینارەدا، ناوی خۆی و نازناوی (ملك الامراء گۆکبوری) و ناوی خەلیفە (الناصرلدين الله) هەڵکەنراوە. ئەم دینارە لە قاهیرە هەیە: بنۆڕە بابەتی دراوەکان. بشنۆڕە: محمد باقر الحسيني، العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص ٦٨ ـ ٦٩. قسەکانی (الحموي)یش، ئەوە دەردەخەن، کە دەڵێت: کاتێ سوڵتانی خەواریزم (جلال الدين منكبرتی) لە ساڵی (٦٢٢ك)دا لە لەوەڕگاکانی شارەزوور لایدا و، دابەزی، (عمادالدین زەنگی) چوو بەپیریەوە... هتد. بنۆڕە: (التأريخ المنصوري) ص ٣٠٧.

(٣)وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٤.

هێمنی لەگەڵ موسڵدا پێڕۆ دەکرد، نەخاسمە لێشاوی مەگۆلیش خاکێکی بەرفراوانی موسوڵمانانی داپۆشیبوو، مەترسیشی لەسەر ئەم ناوچەیەش پەیدا کردبوو. لەبەر ئەوە سەرداری هەولێر ئەم سیاسەتەی بە پێویست دەزانی بۆ بەرژەوەندی خۆی و ناوچەکەش و، دەستیشی کرد بە داواکردنی کۆمەك لە موسڵ و بەرەنگاربوونەوەی مەگۆلەکان، چونکە مەگۆل گەیشتبوونە دەروازەکانی ئەمارەتەکەی، ئەوەبوو مەراغەشیان[1] داگیرکرد و، لەسالی (٦١٧ك/ ١٢٢٠ز)شدا بەرەو هەولێر کشان و مەترسییەکی گەورەیان بەهەموو لایەکدا بڵاو کردەوە، ئنجا سەرداری هەولێر هانای بردە بەر (بدرالدين لؤلؤ)، ئەویش هێزێکی لە لەشکری موسڵ بۆ نارد.

## د - تازەبوونەوەی ململانێ لەنێوان ئەمارەتی هەولێر و موسڵدا لەسالی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز)دا:

باری تەبایی و ئاشتی لەنێوان هەولێر و موسڵدا زۆری نەخایان و، ململانێ دیسانەوە کەوتە نێوانیان، (بدرالدين لؤلؤ) ئاگرەکەی هەڵایسان، ئەوەبوو، حوکمی بنەماڵەی ئەتابەگە زەنگییەکانی بەربڕ کرد و، حوکمی دوا ئەتابەگ (ناصرالدين محمود)ی کچەزای (موزەففەرەددین گۆگبوری)یشی لەناو برد و، لەسالی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز)یشدا دەسەڵاتی لە موسڵ خستە ژێر دەستی خۆی. ئەم ڕەفتارە ناپەسند و ترسناکانەی (بدرالدين لؤلؤ)، بوونە هۆی ئەوەی کە هەردوو ئەمارەتەکە جارێکی تریش دەست بەرنەوە بۆ چەك.

جا، بەر لەوەی بچینە ناو باسوخواسی داچەروکانی پێوەندیی نێوان هەولێر و موسڵ، باشتر وایە گفتوگۆیەك دەربارەی کوشتنی دوا ئەتابەگی ناوبراو بکەین، چونکە قسەو هەواڵی جۆربەجۆری جیاوازی مێژوونووسان، پیاو سەرسام دەکەن. هەریەکەیان بەجۆرێك باسی دەکەن و، سالی لەناوبردنی ئەم ئەتابەگە لە لایەن

(١)(مراغە): شارێکی گەورەی بەناوبانگە، سەربە ئازەربێجانە: معجم البلدان، ٥/ ٩٣.

(بدرالـدین لؤلـؤ)ەوە، وەکـو یـەك دیـار ناکـەن. ئـەم ڕووداوە گرنگییـەکی سیاسـیی ئەوتۆی نییە، خۆ، هەر لە ساڵی (٦٠٧ك/ ١٢١١ز)ەوە، کە دوا ئەتابەگی گەورەی موسڵ (نورالدین أرسلان شاه)مرد، حوکم لەو ساوە هەر بە دەست (بدرالدین لؤلؤ)ەوە بووە، وەلـێ گرنگیـی ئـەم ڕووداوە (واتـا ڕووداوی کوشـتنی ئەتابـەگ ناصـرالدین محمـود) لەوەدایـە کـە هـەم هۆکـار و، هـەم کـات و سـاتی تێکـچوونی پێوەندییـەکانی نێـوان (بدرالدین لؤلؤ) و (موزەففەرەددین گۆکبوری) ڕوون دەکاتەوە.

ئەو دەقانەی لەبەر دەستماندا هەن و فەراهەمن دەڵێن کە (بدرالـدین لؤلؤ) لـە ساڵی (٦٣١ك/ ١٢٣٤ز)، لەسەر بڕیاری خەلیفە (المستنصر بالله) [1]خۆی کرد بە مـەلیکی موسڵ. دراوەکانی موسڵی ئەو سەردەمەش ناوی (بدرالـدین لؤلـؤ)یـان لەسـەرە. بـەڵام لەبەر قسەی جیاواز و ناچونیەکی سەرچاوەکان، سـاڵی مردنـی (کوشـتنی) ئەتابـەگ (ناصرالدین محمود) ڕوون نییـە. مێـژوونووس (ابـن العـبري) کـە لـە بـەرایی ژیانیـدا هاوزەمەنی ئـەم ڕووداوانـە بـووە و جێگـای بـاوەڕە، دەڵێـت: (ناصـرالدین محمـود) لـە ساڵی (٦٣١ك)دا مـردووە، واتـا هـەر لـەو سـاڵەدا کـە (بدرالـدین لؤلؤ) تـەختی موسـڵی زەوت کردووە[2]. ئەوەش کە (الـذهبي) دەیگێڕێتـەوە لـە قسەکانی (ابـن العـبري) زۆر نزیکە، بەڵام باسی مردنی ئەتابەگ - کە لەو ساڵەدا مردبێـت - ناکـات و، تـەنیا، هـەر هەنـدە دەڵێـت کـە "لـەو سـاڵەدا (بدرالـدین لؤلؤ) خـۆی کـرد بـە سـوڵتانی موسـڵ و، بنەماڵەی ئەتابەگایەتی، دوای بڕا (انقرض) [3]"

بەڵام ئەوەی کە (الذهبي) تووشی دوو هەوایی (التناقض) دەکات، ئەوەیـە کـە لـە گێڕانەوەیـەکی پێـشتریدا دەربـارەی ڕووداوەکـانی سـاڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز) دەڵێـت: لـەم سـاڵەدا (بدرالـدین لؤلـؤ) موسـڵی داگیرکـرد و، (ناصـرالدین محمـود کـوڕی القـاهر)ی

---

(١) ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ٢٤٩. الحوادث الجامعة ص ٥٢.

(٢)ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق للسنة ٤٩ سنة ١٩٥٥ ص ٧٣٩.

(٣)الذهبي، العبر، ٥/ ١٢٣.

خنكاند و، بەدرۆش گوتی: مرد[1]. ئەمەش، مانای وایە كە ئەتابەگ دە ساڵ بەر لەوەی (لؤلؤ) موسڵ زەوت بكات، مردووە. بەڵام ئەوەی مەسەلەكەی زێتر ئاڵۆزكاندووە ئەوەیە كە (أبو شامة) دەڵێت: "باسوخواسی مەلیك - ناصرالدین محمود - نقوم بوو، نەما و، پاش مردنی (موزەففەرەددین گۆكبوری)ی باپیری ئەم مەلیكە - لەدایكیەوە - واتا (باوكی دایكی) لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز)[2]دا، (بدرالدین لؤلؤ) حوكمی موسڵی گرتە دەست، كەچی لە جێگایەكی تردا و، لە ڕووداوەكانی ساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز)دا گوتوویەتی: (بدرالدین لؤلؤ) موسڵی داگیركرد و، وەهای نیشان دا كە (ناصرالدین محمود) مردووە، خۆی فەرمانی دا بە خنكاندنی[3].

سەیرەكەش لەوەدایە، مێژوونووسێكی هاوزەمەنی شارەزای وەك (ابن الجوزي) هەردوو ڕووداوی خنكاندنی ئەم مەلیكە و، دوابڕانی ئەتابەگایەتی دەخاتە ساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز) [4]ەوە. وادیارە مێژوو نووسەكانی تریش هەر، لەمیان وەرگرتبێ، چونكە رستە و دەستەواژەكانیان زۆر لەیەك دەچن. لەو مێژوونووسانەش، بەنموونە: (ابوشامة) [5]، (الذهبي) [6]، (ابن تغري بردي) [7]و (ابن العماد) [8]. كەچی دەبینین (أبا الفداء) [9]و (ابن الوردي) [10]هەردوو ڕووداوی مردنەكە و، دوابڕانی بنەماڵەی ئەتابەگی دەخەنە ساڵی (٦١٩ك/ ١٢٢٢ز) هەرچەندیشە قسەكانی

---

(١)م. ن. ٨١.

(٢) ابوشامة، ذیل الروضتین، ص ١١٤.

(٣)م. ن. ص ١٤٢.

(٤)مرآة الزمان ٨/ ٦٣٣.

(٥)ابوشامة، ص ١٤٢.

(٦)العبر، ٥/ ١٢٣.

(٧) النجوم الزاهرة، ٦/ ٢٥٧.

(٨) شذرات الذهب، ٥/ ٩٤.

(٩) المختصر في اخبار البشر، ٢/ ١٣١.

(١٠)تأریخ ابن الوردي، ٢/ ٢٠٦

هەردووکیان زۆر لە قسەکانی (سبط ابن الجوزي) و لە قسەی مێژوو نووسەکانی دوای ئەویش دەچن. پێدەچێ (ابو الفداء) و (ابن الوردي) قسەکانیان لە (ابن الواصل)ەوە وەرگرتبێ چونکە ئەو، مەسەلەی مردنی (ناصرالدین محمود)ی لەگەڵ ڕووداوەکانی ساڵی (٦١٩ك) دا باس کردووە، هەرچەندیشە تەکەزی لەسەر ساڵەکە نەکردووە[1].

هەرچی (ابن کثیر)ە، ئەوە، ئەو هەمان ڕای (ابو شامة)ی هەیە و ڕووداوەکە دەباتەوە بۆ ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز) و دەڵێت: (بدرالدین لؤلؤ)، لەو ساڵەدا، مردنی (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی باپیرەی - لە دایکەوە - (ناصرالدین محمود)ی بە دەرفەت زانی و، هەستا نان و ئاوی لێ بڕی بۆ ماوەی سیازدە ڕۆژ، تا، لە برسانا و لەبەر تێنوێتی پڕووکا و، مرد، (لؤلؤ) لە ژوورێکدا حەپسی کردبوو، بەجۆرێك نەدراوسێ و نە کەنیزەکی حەرام و حەلاڵیش نەگەنە لای و سۆراخی بزر ببێ و کەس جێگای نەگرێتەوە[2]. ئێمەش کە لە سۆراخی کات و ساتی کوژرانی دوا

(١)مفرج الكروب، ٤/ ١١٤.

(٢) البداية والنهاية ١٣/ ١٣٦. (ابو شامة)یش قسەیەکی لەو جۆرە دەگێڕێتەوە و، دەڵێت: (بدرالدین لؤلؤ) مەلیك (ناصرالدین محمود)ی خستە ناو حەمامێکەوە (گەرماوێکەوە) زۆر گەرم بوو، ئنجا دەرگاکەی لەسەر داخست و تاڵاو و خەفەتێکی زۆری پێدا و، ئاوی لێ بڕی و، کابرا هاواری دەکرد: لێرە دەرمبهێنن، تێر ئاوم بکەن، ئنجا بمکوژن. کاتێك دەریانهێنا، بەتەواوی، شێوابوو، ئاویان کرد بە دەمیەوە، پاشان بە ژێ (وتر) خنکاندیان: (ذیل الروضتین ١١٤).

ئەوەی زەمین کێش دەکات، ئەومیە، مێژوونووسانی نوێ، لەوانەی لە مێژووی ئەتابەگایەتیی موسڵیان کۆڵیوەتەوە، گوێیان بەم مەسەلەیە نەداوە و، ساڵی کوژرانی ئەم مەلیکەیان بە هەمان ئەو ساڵە داناوە کە (بدرالدین لؤلؤ) حوکمی موسڵی تێدا وەرگرتووە، واتا هەمان ئەو ساڵەی کە بە ناوی خۆیەوە و بە ئیزنی خەلیفە، سکەی لێداوە، واتا ساڵی (٦٣١ك). بنۆڕە: سليمان الصائغ، تأريخ الموصل ١/ ٢١٠.

سعيد الديوەجي، الموصل في العهد الاتابكي، ص ٣٨. رشيد الجميلي، دولة الأتابكة في الموصل، ص ٢٢٩. زامباور، معجم الانسان والاسرات، ص ٣٤١. ستانلي لين بول ١٦٢ Lane-Poole, The Muham, P.. (دکتور عبدالقادر طليمات) بەهەڵە، مردنی (ناصرالدین محمود)ی لەساڵی (٦٢٣ك)دا، داناوە، بنۆڕە کتێبەکەی خۆی: (موزەففەرەددین گۆکبوری، ص ١٣١). هەروەها (یاسین بن خیرالله

ئەتابەگی موسڵدا وێڵین و پەی پێ نابەین، خۆ، دەشبێت بڵێین، ئەم بێ سەروبەرییەی کە مێژوونووسان تێوەی گلاون و، مێژوو خوێنانیشیان بەدووی خۆیاندا چەواشە کردووە، لەوەوە ئاو دەخواتەوە، کە (ابن الأثير)ی ناودارترین مێژوونووسی ئەو سەردەمە، لەم مەسەلەیە بێدەنگە و، باسی ئەوەی بۆ نەکردووین، ئایا لە ساڵی (٦٢١ك)دا. لە تەخت و تەلاری موسڵدا، چی بەسەر ئەم ئەتابەگە لاوەدا هاتووە و، چارەنووسی چییە؟

دێمەوە سەر ئەوەی، ئەگەر ڕاست بێت - وەك مێژوو نووسان دەڵێن - (ناصرالدين محمود) لە ساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز)دا مردبێت، کەواتە، تێکچوونەوەی پێوەندییەکانی نێوان هەولێر و موسڵ، بەهۆی ئەم ڕووداوەوە سەری هەڵداوەتەوە. ئەم کارەساتە (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی ڕاچڵەکاند و بەئاگای هێناوە، ئیدی بەدووی تۆڵە سەندنەوەدا لەو دوژمنەی کە حوکمی کچە زاکەی لە موسڵ مایە پووچ کرد کەوتە تەگبیر و چالاکی. (موزەففەرەددین گۆکبوری) ئومێد و ئاواتی بە کچە زاکەی هەبوو کە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە لەسەر تەختی موسڵ دانیشێ و، ئەمیش لە سایەی ئەوەوە بەنیاز و ئارەزووی خۆی بگات و موسڵ بکات بە پەرژینێك بۆ پاراستنی هەولێر، کە کاتی خۆی (عمادالدين زەنگی)ی زاوای نائومێدی کرد چونکە ئەو توانست و ئاوەزەی نەبوو بتوانێت ئاواتەکانی خەزووری بێنێتە دێ و بێ وێل و بێ پلان و بێ ورە بوو.

بە داگیرکردنی موسڵ لە لایەن (بدرالدين لؤلؤ)ەوە، ئیدی سەرداری هەولێر دەستی لەبنی هەمبانەکە دەرچوو، دەسەڵاتی یەکلایەنی (لؤلؤ) لەموسڵ مەترسیی لەسەر هەولێریش پەیداکرد، نەخاسمە خۆیشی دابووە پاڵ هاوپەیمانێکی بەهێز و جوامێری وەك (الملك الاشرف الايوبي). لەبەر ئەوە (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەوە زێتر کە هەوڵ بدات هاوپەیمانێکی بەهێز پەیدا بکات. هیچ چارەیەکی تری نەبوو.

---

العمري)یش کە دەڵێت لە ساڵی (٦١٣ك)دا مردووە، ئەویش بە هەڵەدا چووە، سەیری کتێبەکەی خۆی بکە: (منية الأدباء في تأريخ موصل الحدباء، ص ٦٥).

سەرەنجام لەگەڵ هەردوو براکەی (الملك الاشرف)دا: (الملك المعظم[1]عیسی)ی سەرداری دیمەشق و، (الملك المظفر شهاب الدين غازی)ی سەرداری (خلاط)دا هاوپەیمانییەکیان مۆرکرد، چونکە ئەم دوو برایە لەگەڵ (الملك الاشرف)دا تەبا نەبوون. پاشانیش پێکدادان و گەلەکۆمەکێ لە نێوان ئەم لایەنانەدا دەستی پێکرد؛ لە جێگایەکی تردا باسیان دەکەین.

## دوو - پێوەندیی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ ئەییوبیاندا:

### ١ - پێوەندیی لەگەڵ سەلاحەددینی کوڕی ئەییوب:

پاش ئەوەی (مجاهد الدين قايماز) (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی لە هەولێر دەرکرد، ئەمیش پەنای بردە بەر موسڵ و، ئەتابەگی موسڵ (سيف الدين غازی) حوکمی شاری (حران)ی پێ بەخشی و، بۆ ماوەی دە ساڵ لەژێر سایە و بەڕێنمایی ئەم ئەتابەگە کاروباری (حران)ی هەڵسووڕاند. بەپێی سەرچاوەکانیش، گرنگترین بزاڤ و چالاکی سەربازیی لەو ماوەیەدا، تێیدا سەرکەوتنێ ئەوەبوو کە لە شەڕەکەی نێوان موسڵ و لەشکری سەلاحەددیندا، ئەوەی لە ساڵی (٥٧١ك/ ١١٧٦ز)دا قەوما، ئەم فەرمانداریی قۆڵی ڕاستی لەشکری موسڵی دەکرد و، ئەنجام بەسەر قۆڵی چەپی لەشکرەکەی سەلاحەددیندا سەرکەوت. بەڵام سەلاحەددین یەکسەر لەشکرەکەی بادایەوە و کەوتە پەلاماری لەشکری موسڵ و لە نەبەردی جەنگ دەرپەڕاندن و تێکی شکاندن.

(موزەففەرەددین)، دوای نزیکەی حەوت ساڵ، هەڵوێستی خۆی گۆڕی، چونکە

---

(١) ئەم مەلیکە و، (موزەففەرەددین گۆکبوری)یش، هەردووکیان نازناوی (الملك المعظم)یان هەیە. لەبەر ئەوە، بەچاکترم زانی، ئەمیان تەنیا بە ناوی خۆیەوە ناوبهێنم، بۆ ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵییەك لە نێوانیاندا روونەدات.

هەرچەندی دەکرد، نەیدەتوانی لەسەر پاشکۆیی موسڵ بەردەوام بێت، نەخاسمە (مجاهدالدین قایماز)ی کۆنە نەیاری، پۆستی بریکاری ئەتابەگیی بەدەستەوە بوو، ئەمەش ناچاری کرد لە ڕکێفی موسڵ دەرچێ[1] و، لە هەمان کاتیشدا دەیزانی کە تای هێز و قورسایی بەلای سوڵتانی ئەیوبیاندا شکاوەتەوە. بە هەرحاڵ، پشتی لە گەورەکانی پێشتری خۆی وەرگێڕا و لە فورات پەڕییەوە و لەساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢)دا، خۆی گەیاندە ڕیزەکانی لەشکری سەلاحەددینی ئەیوبی[2].

ئیدی لەو ڕۆژەوە، مێژووی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بە هاندانی سەلاحەددینی ئەیوبی دەست پێدەکات و، دنەی دەدات کە بەرنامە و هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە هێز و لایەنە ئیسلامییەکان بگۆڕێت و، زێتر لە هەموو لایەنێك، تەنیا خەمی[3] موسڵ بخوات و ئاگای لە موسڵ بێت. مێژوونووس (محمد بن تقي الدين عمر الأيوبي) کە ئەوکات لە خزمەتی سەلاحەددیندا بووە، باسی دیداری نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و ئەو سوڵتانە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەم میرە گەیشتە جێ و، بەتەنیا لەگەڵ سوڵتاندا کۆبۆوە و، داوای لێ کرد لە فورات بپەڕێتەوە و ئەو مەملەکەتانە داگیر بکات. ڕاشیگەیاند کە خۆی و لەشکری، بۆ لێدانی موسڵ دەخاتە ژێر فەرمانی سوڵتانەوە، چونکە سەردارانی موسڵ لە ئیمانیش و لە عەهد و پەیمانیش پەشیمان بوونەتەوە و، هیچ قەول و قەرارێکیان لا نەماوە. جا، بۆ زامنکردن و دەسەبەرکردنی دۆستایەتی و دەسدایی با قیمەنی میرانی ناوچەکە، پێویستە ئەمارەتی موسڵ لەناو ببات. سوڵتان سوپاسی قسەکانی کرد و، لە پلان و تەگبیری دڵنیایی پەیدا کرد، پاشان دۆعاخوازیی لێ کرد و داوای لێ کرد بگەڕێتەوە

---

(١) ابن خلكان ٣/ ٢٩٣، ط ١٩٤٨.

(٢) ابن شداد، النوادر السلطانية، ٥٧. مفرج الكروب ٢/ ١١٦.

وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٣.

(٣) محمد بن تقي الدين عمر الأيوبي، مضمار الحقائق وسر الخلائق، ص ١٠٥.

ابن العديم، زبدة الحلب ٣/ ٥٧. كتاب الروضتين ٢/ ٣٠.

بۆ (حران) [١]. پاش چەند ڕۆژێکیش شاری (الرها)ی خەڵات کرد[٢].

موسڵ، ببوو بە خولیای سەری (موزەففەرەددین گۆگبوری) و، ئەمجارەش داوای لە سەلاحەددینی ئەیوبی کردەوە، ئەم شارە داگیر بکات. (موزەففەرەددین گۆگبوری) تەتەرێکی نارد بۆ حەلەب بە سوڵتان بڵێت کە ئامادەیە هەموو ئازووقە و تفاق و پێویستییەك بۆ لەشکرەکەی دابین بکات و بە گەیشتنیشی بۆ (حەران) - بەنیازی موسڵ[٣] -، پەنجا هەزار دیناریشی پێشکەش بکات.

سەلاحەددین لەشاری حەڵەبەوە بەرەو (حران) کەوتەڕێ، کاتێکیش گەیشتەجێ، بۆی دەرکەوت کە (موزەففەرەددین گۆگبوری) گۆڕاوە و لەسەر عەهد و پەیمانی خۆی کە بە تەتەرەکەدا بۆ سەلاحەددینی ناردبوو، نەماوە. سوڵتان لەم کارەی سەری سوڕما و لێی بەگومان کەوت و، وایزانی کە کابرا گۆڕاوە یان دووبارە بایداوەتەوە بەلای ئەتابەگە کۆنە ئاغاکانی موسڵیدا، نەخاسمە نەیارەکانیشی بۆیان تێچاندبوو کە گوایا (موزەففەرەددین گۆگبوری) ڕاست ناکات، ئەوجا، سەلاحەددین خەریك بوو تۆڵەی لێ بکاتەوە. کە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەم نیازەی سوڵتانی زانی، دەستبەجێ خۆی گەیاندە سوڵتان و کەوتە سوێند خواردن و پێی گوت کە نەگۆڕاوە و، ئەو قسەیەش کە تەتەرەکەی کردوویەتی، ئەم ئاگای لێی نییە[٤].

(موزەففەرەددین گۆگبوری) بۆ ئەوەی نیازی پاکی دڵی خۆی بۆ سوڵتان بسەلمێنێت،

---

(١) الأيوبي، مضمار الحقائق، ص ١٠٢ ـ ١٠٣.

(٢) ن. م. ص ١٠٥. الكامل ١١/ ٤٨٤. مفرج الكروب ٢/ ١١٧.

وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٣، ط ١٩٤٨. ابن شداد، مخطوط (الاعلاق الخطيرة)، ورقة ٢٩/ ب.

محمد كرد علي، خطط الشام ٢/ ٥٦.

(٣) الكامل ١١/ ٥١١. ابن خلدون ٥/ ٣٧٥.

(٤) الأيوبي/ مضمار الحقائق ٢١٢/ ٢١٣. زبدة الحلب ٣/ ٨٠. كتاب الروضتين ٢/ ٦١.

ابن خلدون ٥/ ٣٧٥.

پێی گوت كە ئامادەیە وەك هەر كۆیلەیەك لە كۆیلەكان خزمەتكاریی بكات[1].

لەگەڵ ئەوەشدا، سەلاحەددین دڵی ئاوی نەخواردەوە و لێی دڵنیا نەبوو، لەبەر ئەوە دەستبەسەری كرد تا بەتەواوەتی بۆی ساغ دەبێتەوە، پاشان لەگەڵ سەردارەكانیدا كەوتە ڕا و ڕاوێژ كە چی لێ بكەن. هەندێكیان وایان بەچاك زانی بیكوژێت و، لە بەلای بەدوور بێت، نەخێر، هەندێكی تریان داوایان لێ كرد بەریبدات. ئەنجام، بڕیاری دا بەریبدەن بەڵام قەڵای (حران) و (الرها)ی بەدەستەوە نەمێنێت و لێی بسەندرێتەوە. پاش ماوەیەك، لە دوادوای ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٦ز) [2]دا هەردوو قەڵاكەی پێدایەوە. (ابن الأثیر) هۆكاری ئازادكردن و بەردانی وەها لێكدەداتەوە كە خەڵكی ئەو ناوچەیە لێی نەڕەنجێن و با نەدەنەوە، چونكە دەیانزانی (موزەفەرەددین گۆكبوری) لە ڕیزی لەشكری سوڵتاندا ڕۆڵی چاكی گێڕاوە بەتایبەتیش لە داگیركردنی شارەكانی ناوچەكەیاندا[3].

بەهەرحاڵ، (موزەفەرەددین گۆكبوری) لەدوا گەمارۆدانی موسڵدا بەشداریی كرد، ئەو گەمارۆدانەش ڕێگای بۆ مۆركردنی تەبایینامەیەك خۆش كرد كە لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٦ز) [4]دا، گۆڕینی ئەتابەگایەتیی موسڵی لێ كەوتەوە و، بوو بە ئەمارەتێكی سەر بە دەوڵەتی سەلاحەددینی ئەیوبی. دوای مردنی (شاە أرمن)ی

---

(١) الأیوبي ٢١٣.

(٢) الأیوبي، مضمار الحقائق ٢١٢ ـ ٢١٣. الكامل ١١/ ٥١١. كتاب الروضتین ٢/ ٦٧. ابن خلدون ٥/ ٣٧٥. الذهبي، مخطوط تأریخ الاسلام، مجلد/ ١، ورقة ٢.

بەڵام (ابن شداد) دەڵێت: سەلاحەددین تەنیا قەڵای (حران)ی پێدایەوە.. گفتیشی دا پێی قەڵای (الرها)یشی بداتەوە. خەڵاتیشی كرد و دڵیشی دایەوە: (النوادر السلطانیة، ص ٦٨). وەلێ (ابن العدیم) دەڵێت: (كە سوڵتان لە نەخۆشییەكەی هەستایەوە، (الرها)ی بۆ گەڕاندەوە: زبدة الحلب ٣/ ٨٣.

(٣) الكامل ١١/ ٥١١. الغساني، العسجد المسبوك، ص ٢٥.

(٤) الأیوبي، مضمار الحقائق، ٢١٣. الكامل ١١/ ٥١٧. كتاب الروضتین ٢/ ٦٤. وفیات الاعیان ٤/ ٢٩٥، ط ١٩٤٨.

سەرداری (خلاط) لە هەمان ساڵدا، سەلاحەددین (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی کرد بە فەرمانداری لەشکرێك و ناردی بۆ داگیرکردنی (خلاط) بۆ ئەوەی بیخاتە سەر دەوڵەتی ئەییوبی. بەڵام ئەم کارەی بەدەستەوە نەهات و سەرنەکەوت[1].

**ب – بەشداربوونی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە شەڕی خاچدروشماندا:**

(موزەففەرەددین گۆکبوری) لەو شەڕانەدا بەشداریی کرد. هەموو مێژوونووسانی ئەو سەردەمە دەڵێن چالاکییەکی چاکی لەو شەڕانەدا نواندووە. یەکەم بزاڤی ئەوەبوو کە لە ساڵی (٥٨٠ك/ ١١٨٤ز) دا لە هێرشەکەی سەر شاری (نابلس)[2]دا بەشداریی کرد. لەگەڵ دوو میری دیکەدا فەرمانداریی شەڕی (صفورية)[3]شیان گرتە دەست کە دەڵێن شەڕێکی هەند سەخت بووە و هەند ترسناك بووە، سەری ڕەشی سپی دەکرد[4].

وەلێ بەشداربوونی لە شەڕە هاتونەهاتەکەی (حطين)دا - چ لە ڕووی ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لەو شەڕەدا و، چ لەبەر گرنگیی ئەو شەڕە، کە ئەگەر لە هەموو شەڕەکانی خاچدروشمان گەورەتر نەبووبێ، شەڕێك بوو لە شەڕە گرنگەکان - لە هەموو بزاڤ و چالاکییە سەربازییەکانی گەورەتر بوو. (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەو شەڕەدا قارەمانێتییەکی چاکی نواند و، فەرمانداریی قۆڵی چەپی لەشکری ئەییوبیانی دەکرد[5].

---

(١) مضمار الحقائق ٢١٨. الكامل ١١/ ٥١٤. مرآة الزمان ٨/ ٣٨٣.

الغساني، العسجد المسبوك: ٢٥.

(٢) سبط ابن الجوزي ٨/ ٣٨٢.

(٣) (صفورية) شار و شارۆچکەیەکی ناوچەکانی ئەردونە لەشام، نزیکە لە (طبرية): معجم البلدان ٧/ ٤١٤.

(٤) الكامل ١١/ ٥٣٠ ـ ٥٣١.

(٥) النوادر السلطانية، ٨٧ الروضتين ٢/ ٨٧. مفرج الكروب ٢/ ٢٥٦.

النجوم الزهرة ٦/ ٣٩.

(ابن خلكان) و مێژوونووسانی تریش باسی ڕۆڵی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە شەڕی (حطین)دا دەکەن و دەڵێن: لە لای سەلاحەددین پێگەی گەورە و گرنگی هەبوو، لەو شەڕەدا، بەجەرگی و ئازایەتی و لەخۆبوردەیی و ورەی بەرزی نیشان دا، ئەگەر هیچی نەکردبێ لە ژیانیدا، ئەو قارەمانێتییەی (حطین)ی بەسە. لەگەڵ (تقی الدین عمر)ی برازای سەلاحەددیندا پێکەوە خۆیان ڕاگرت و نەکشانەوە هەرچەندیشە سوپای ئیسلام بەزی و ڕای کرد، بەڵام کە ئاوڕیان دایەوە و دیتیان هەردوو فەرماندارەکانیان بەریان لە دوژمن گرتووە و نابزوون، شەرم دایگرتن و کەوتنەوە پەلامار، ئەنجام لەشکری ئەییوبیان لەم شەڕەی (حطین)دا سەرکەوت و خاچدروشمان شکان[1].

چالاکییەکی زیرەکانەی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەم شەڕەدا، ئەوەبوو، کە ئاگری بەردایە پەرێز و پووش و پەڵاشەکان و ئاگر لەژێر سمی ئەسپەکانی دوژمندا تەنییەوە و، ئەسپ بەیەکجار ڕەوییەوە و دوژمن شکا و هەڵات[2]. (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە تاوسانی (هاوینی) ساڵی (٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)یشدا لە شەڕی (البرج)ی شاری (انطرسوس) [3]دا بەشداری کرد و ئازایەتی و زیرەکییەکی بەرچاوی تێدا نیشان دا[4].

---

(١) ابن خلكان ٣/ ٢٧٢.

الذهبي، العبر ٥/ ١٢٢.

الامام المكي الفارسي، العقد الثمين ٧/ ٦٠٢.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/ ٣٩٣. بۆزانینی زێتر بنۆڕە: د. نظير حسان سعداوي، التأريخ الحربي المصري، ص ١٨٧.

(٣) انطرسوس (انطرطوس): شارێکە لەسەر قەراغی دەریای شام، سەر بە دیمەشقە، دوو تاوەری قایمکاری وەك قەڵای هەیە، معجم البلدان، ١/ ٢٧٠.

(٤) الفتح القسي، ص ١٣٤. النوادر السلطانية، ٨٨.

النجوم الزاهرة، ٦/ ٣٩. بۆ زێتر زانینی ئەم شەڕە بنۆڕە: (الكامل ١٢/ ٧). هەرچەندیشە ـ ابن الأثير ـ باسی ڕۆڵی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە شەڕەکانی خاچدروشماندا ناکات و، هەروا بە ئەنقەست پشتگوێی دەخات.

دواییـنـی شـەڕەکانی کـە ئـەم فەرمانـدارە، بـەر لـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆ هـەولێر، بەشداری تێدا کـرد، شـەڕەکەی سـاڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز) بـوو کـە لـە نزیـك شـاری (عکا) قەوما. سەڵاحەددینی ئەییوبی میرەکانی بانگ کرد بۆ ئەو شەڕە. میری گـەورە و بـە شـکۆ (موزەففـەرەددین کوڕی زیـن الـدین) یەکـەم مـیر بـوو، گەیـشتە مەیـدانی ئـەو شەڕە. بەدوای ئەودا (الملك المظفـر تقـي الـدين عمـر)ی سـەرداری (حمـاە) بەلەشـکری خۆیـەوە گەیـشتە نەبـەردی جـەنگ، پاشـان لەشـکرگەلی ئـەییوبیان لەشـکر لـەدوای لەشکر گەیشتنەجێ[1]. لەم شەڕەدا (زین الدين يوسف ينالتگين)ی برایشی بەشـداریی کرد، بەڵام لەبەر نەخۆشی لە شاری (الناصرة) کۆچی دوایی کرد.

ئەمـەبوو ڕۆڵـی (موزەففـەرەددین گۆگبـوری) و، بەشـداربوونی لـە شـەڕەکانی خاچپەرستاندا. ئەم میرە، فەرمانداریێکی بەناوبانگ بوو لەوانـەی کە سـەڵاحەددینی ئەییوبی لەکاتی تەنگانەدا پشتی پێ دەبەست. بەڵام، وادیارە، پاش ئەوەی لە هەولێر ئـارامی گـرت و پـاڵی لێدایـەوە، ئـەو چـالاکی و هەوەسـەی جـارانی بـۆ کوشـتاری خاچپەرستان بەرە بـەرە سارد بـووەوە، بگـرە هـەر وا بەئاسـانی گوێی بـە فـەرمانی سەڵاحەددینیش نـەدەدا و، ئـەو تـین و تـاوەی جارانی نـەما و، لـەوە دەچـوو بڕیـاری دابێت هەولێر بەجێ نەهێڵێت.

پاش ئەوەی لەشکرگەلی ئەییوبیان، خاچپەرستانیان تووشی شکست کرد، ئـەوجا، ئـەورووپا کەوتـە ڕێکخـستنی هەڵمـەتی سـێیەم بـە تایبـەتیش بـۆ سـەندنەوەی شـاری (القـدس) کـە ئـەییوبیان دوای شـەڕەکەی (حطـين) داگیریـان کـردەوە. مەلیکـە گەورەکانی ئـەورووپا فەرمانـداریی ئـەم هەڵمەتـەیان دەکـرد، لەهەمووشـیان نـاودارتر (ڕیتـشارد شـێردڵ) بـوو. هێزەکـانی ئـەییوبیان بـە فەرمانـداریی سـەڵاحەددینی

---

(١) الفتح القسي ١٨٩.

النوادر السلطانية ١٠٥.

كتاب الروضتين ٢/ ١٤٢.

بشنۆڕە: (الكامل ١٢/ ٣٤.)

ئــەییوبی، بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی ئــەم هەڵمەتــەش کەوتنــە خــۆو کۆبوونــەوە. ســەلاحەددین نامــەی بــۆ هــەموو میرانــی ناوچــەکان و دەوروبــەر نــارد و بــارودۆخی ترسی لەنوێ پەیدابووی بۆ ڕوون کردنەوە کە ترسێکی گەورەی لە ناوچەکەدا بــەرپا کــردووە و، هەنــدێ لــە میرەکــانیش لــە ترســی جــەنگ خۆیــان وەشــێردووە و ڕایــان کردووە[1].

تەنیا کەسێکیش کە باسی ئەو نامانە دەکات (العمـاد الکاتـب الاصـفهانی)یـە، ئـەو لەسـەر فـەرمانی سـەلاحەددین، بەخـەتی خـۆی وشـەکانی بەشـێوەیەکی هاوئاهـەنگ ڕازاندووەتەوە و نامەکانیان بۆ میرانـی دەوروبـەر نـاردووە. یـەك لـەو نامانـە لەسـەر داوای سوڵتان بۆ (موزەففەرەددین گۆکبـوری) نێـردراوە، سـوڵتان ورەی وەبـەردەنێ و داوای لــێ دەکــات کــە بــچێت، بــۆ شــەڕی خاچــدروشمان ئامادەبێــت و، دەڵێــت: خاچــدروشمان چــەندین ســەرکەوتنیان بەدەســت هێنــاوە و، موســوڵمانان زیــانی گــەورەیان بەرکـەوتووە و شـەڕەکەش هێـشتا هـەر گەرمـە[2]. وا دیـارە، ئـەم نامەیـە، یەکەم نامـەی سـەلاحەددین نـەبووە کـە بـۆ (موزەففـەرەددین گۆکبـوری)ی نـاردووە، چـونکە لـە داڕشـتنی نامەکـەدا دەردەکـەوێت کـە پـێش ئـەوەش نامـەی بـۆ نـاردووە، ئـەوەتا (العمـاد الکاتـب) لـە دەسـتپێکی نامەکـەدا دەڵێـت: (پێـشتریش نامـەی باسـی بارودۆخەکەمان بۆت ناردووە)...

(موزەففــەرەددین گۆکبــوری) بــەدەنگ ســەلاحەددینەوە نەچــوو، لــە هــەولێر مایەوە، لەوەش ناچێت لە ئەنقەست پشتی لە سەلاحەددین کردبێت، دیارە شتێك لە ئارادا هـەبووە، ئـەم هەڵوێـستە نـا هـەموارەی لـێ پەیـدا بـووە. دووریـش نییـە لـەوە ترسابێت کە ئەگەر بۆ شەڕەکە بچێت کەسانێك لە هەولێر بە دەرفەتی بزانن تەخت و تەلاری لێ داگیر بکەن کە ئەو تازە بە دەستی هێناوەتـەوە، لەبـەر ئـەوە بەچاکتری زانی لە هەولێر بمێنیتەوە و بەجێی نەهێڵێت.

---

(١) النوادر السلطانية: ١٢٢. الروضتين ٢/ ١٨٧. مفرج الكروب ٢٩٦.

(٢) دەقی ئەم نامەیە، لە پاشکۆی ژمارە (٢)دا دەبینیت.

سەلاحەددین، دیسان نامەیەکی دیکەی کردە سەری و، باسی کارەساتی (عکا)ی بۆ نووسی کە خاچدروشمان داگیریان کردووە. (العماد الاصفهاني) لە نامەکەدا باسی گەورەیی لەشکری دوژمنی بۆ کردووە کە مەلیکی ئینگلستان و مەلیکی فەرەنگ فەرمانداریی دەکەن، ئنجا ورەی بەبەردا دەکات و دەنووسێت؛ لەشکری ئیسلام شەڕێکی ئازایانە دەکات و، دوژمنیان داوەتە دواوە - بەقسەی - (العماد الكاتب) پەنجا هەزار خاچدروشمیان لێیان کوشتووە و، پاشان خاچدروشمان دیسان دووبارە خۆیان خڕ کردووەتەوە و زەبرێکیان بە موسوڵمانان گەیاندووە. نامەکە - ئنجا - باسی خیانەتی هەندێ لە ناودارانی موسوڵمانانی ناو شارەکە (جاشەکان) دەکات کە لەگەڵ هەندێ لە ناودارانی خاچدروشمان کلکیان کردووە بە یەك و بوونەتە چاوساغی دوژمن و، بۆ ناو شارەکەیان هێناون و شەڕەکە کەوتە ناوشار و هەموو شەقام و کۆڵانەکانی گرتەوە، پاشان شارەکە کەوتە دەستی خاچدروشمان. جا، لەبەر ئەو دۆخە ناهەموارە، سەلاحەددینی ئەیوبی داوای لە (موزەففەرەددین گۆکبوری) کرد کە بە پەلە بگاتە مەیدانی شەڕەکە و بچێتە ڕیزی جەنگاوەرەکانەوە[1].

بانگکردنی ئەم میرە، بەو گەرمییە، بۆ مەیدانی شەڕ، بێگومان بەلگەی پێگەی پتەوی و ئازایەتی ئەو فەرماندارەیە، دەنا سەلاحەددین ئەوەندە لەسەر ئامادەبوونی مکوڕ نەدەبوو، دووەم نامە و سێیەم نامەشی بۆ نەدەنارد. سوڵتان دەیزانی ئەو پیاوە لە کوشتاری خاچدروشماندا چ ڕۆڵێکی دەگێڕا بەتایبەتیش لە شەڕەکەی (حطین)دا کە خۆی ڕاگرت و ورە و بوێرییەکی بەرچاوی نیشان دا. لەبەر ئەوە، سوڵتان ئامادەبوونی ئەوی زۆر بە زەروور دەزانی، تا ئەمجارەش ڕۆڵی پێویستی خۆی لە مەیدانی شەڕەکەدا بگێڕێت بەتایبەتیش لەم هەلومەرجە ئاڵۆزەدا کە بەهۆی ئەم هەڵمەتە تازەیەی ئەوروپاوە ئاڵۆزتر بووە. بەلام سەرداری هەولێر، ئەمجارەش بە دەنگییەوە نەچوو، هەولێریشی بەجێ نەهێشت. سەلاحەددینی ئەیوبی، ناچار، بۆ جاری

---

(١) دەقی ئەم نامە دوورو درێژە، لە پاشکۆی ژمارە (٤)دا دەبینیت.

سێیەمیش داوای ئامادەبوونی کرد، نەخاسمە خاچدروشمان، دوای داگیرکردنی (عکا) پێیان لێ ڕاکێشا و کەوتنە پەلاماری زێتر و شەڕ ناوچەیەکی فراوانتری گرتەوە. چونکە بەو سەرکەوتنەی (عکا) دەمیان شیرینتر و کەللەیان گەرمتربوو، بۆ سەندنەوەی هەموو ئەو شارانەی کە پێشتر ئەییوبیان ڕزگاریان کردبوون[1].

وادیارە، ئەم نامە و داوایەی دوایین، کاری زۆری لە ویژدان و دەروونی (موزەففەرەددین گۆکبوری) کردووە و، بۆی دەرکەوتووە کە بارودۆخەکە زۆر لەوە ترسناکترە کە دەیزانی، گەڕانەوەشی بۆ مەیدانی شەڕ، بوو بە زەروورەت و، بەهیچ بیانوویەك نابێ دوابکەوێت. ئیدی لەشکرێکی ساز و ئامادە کرد و ڕووی کردە فەلەستین و ئەمجارەش لەژێر ئالای سەلاحەددینی ئەییوبیدا تێهەڵچووەوە و کەوتەوە شەڕ و پەلامار، تا تەبایینامەیەك لە سالی (٥٨٨ك/ ١١٩٢ز) [2]دا لەنێوان ئەییوبیان و خاچدروشماندا مۆرکرا.

(موزەففەرەددین گۆکبوری) بەو ئاواتە بوو ڕۆژێك زووتر بگەڕێتەوە هەولێر، لەبەر ئەوە، بەتەواوبوونی شەڕ و کوژانەوەی ئاگری جەنگ و گەڕانەوەی ئاشتی و ئارامی، سەلاحەددین ڕێگای دا بە میرەکان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. سەرداری هەولێر یەکەم کەس بوو ڕێگای گرتەبەرو لە ڕەمەزانی سالی (٥٨٨ك/ تشرینی یەکەمی ١١٩٢ز)[3]دا گەیشتەوە هەولێر - ئیدی ئەوە دوا جاری بوو لە هەولێر دەربچێت بۆ کوشتاری خاچدروشمان، نەخاسمە سەلاحەددینی ئەییوبیش پاش چەند مانگێك لەو شەڕە، لە (مانگی سەفەری سالی ٥٨٩ك/ مارتی ١١٩٣ز)دا کۆچی دوایی کرد.

---

(١) دەقی ئەم نامەیەش (نامەی سێیەم) لە پاشکۆی ژمارە (٥)دا دەبینیت.

(٢) الفتح القسي ٤٣٤، ط ليدن. النوادر السلطانية ٢٢٧. الكامل ١٢/ ٨٥ ـ ٨٦.

(٣) النوادر السلطانية ٢٣٦.

**ج- پێوەندیی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ میراتگرانی سەلاحەددیندا:**

سەرچاوەکان باسی هیچ جۆرە پێوەندییەکی نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری)و، (الملك العزيز عماد الدين عثمان) کە حوکمی دەوڵەتی ئەییوبیی لە ماوەی نێوان (٥٨٩ - ٥٩٥ك/ ١١٩٣ - ١١٩٨ز) [1]دا کردووە، ناکەن. (الملك العزيز عمادالدين عثمان) کوڕی (الملك الناصر صلاح الدين الايوبي) بووە، دوای مردنی باوکی لەو ماوەیەدا حوکمی مەملەکەتی ئەییوبیانی کردووە - لە ئەمارەتی هەولێریش هیچ دراوێکمان بەناوی ئەم مەلیکەوە نەدۆزییەوە. دوورنییە، هۆی ئەوەش ئەو تەریکی و گۆشەگیرییە بێت کە (الملك العزيز) دوای تێکشکانە یەکلەدوایەکەکانی شەڕەکانی وڵاتی شام[2]، بۆ خۆی، بە باشتری زانیبێت، نەخاسمە (الملك العادل أبوبكر)ی مامیشی، دوای ئەوە،[3] شاری دیمەشقی داگیر کرد و سەرداری هەولێریش بوو بە دەسدا (تبعية)ی ئەو مەلیکە، بەڵام کات و ساتی ئەو دەستداییە نازانین.

سەرچاوەیەکیش، کە ئەو دەستداییەی بۆ (الملك العادل) ساغ دەکاتەوە قسەکانی (ابن الأثير)ە کە دەڵێت: (الملك العادل) گەمارۆی سنجاری دابوو، (موزەففەرەددین گۆکبوری) داوای لێ کرد کە ئەو گەمارۆیە لابدات بەڵام (الملك العادل) بەقسەی نەکرد و داواکەی ڕەت کردەوە[4]. (ابن الأثير) باسی ئەم ڕەتکردنەوەیە دەکات، دەڵێت: "وێڕای ئەو هەموو خزمەتە چاکەی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بە (الملك العادل)ی کردبوو، وێڕای ئەوەش کە زیاتر لە یەك جار- وەك پێشتر باسمان کرد[5]- دەوڵەتەکەی بۆ پاراستبوو، کەچی بەقسەی نەکرد و داواکەی ڕەت کردەوە". بەڵام ئەم مێژوونووسە کە دەڵێت: (وەك پێشتر باسمان کرد) مەبەستی ئەم قسەیە ڕوون

---

(١) زامباور، معجم الاسرات، ص ١٥٠.

(٢) الكامل ١٢/ ١١٠، ١٢/ ١١٨.

(٣) م. ن. ١٢/ ١٢١.

(٤) م. ن. ١٢/ ٢٨٦.

(٥) م. ن. ص.

ناکاتەوە. ڕاستیشت دەوێ (ابن الأثير) باسی هیچ خزمەتێکی نەکردووە کە بە (الملك العادل)ی کردبێ و، باسی (لەیەك جار زێتر دەوڵەتەکەی بۆ پاراستبێ)یشی نەکردووە، چونکە (لەیەك جار زێتر) واتا (چەند جارێك)... ئەو باسی هیچێك لەو جارانەی نەکردووە.

پێدەچێ مەبەستی لەو خزمەتەی کە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بە (الملك العادل)ی کردووە، ئەوە بووبێ کە (موزەففەرەددین گۆگبوری)، پێشتر، لەبەهاری ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٤ز) دا هێرشی کردە سەر ئەمارەتی موسڵ و (نینوی)ی تاڵان کرد و خەلە و خەرمانی سووتاند بۆ ئەوەی فشار لەسەر (قطب الدين محمد کوڕی زەنگی)ی سەرداری سنجار سووك بکات کە ئەوکات سەر بە (الملك العادل) بووە و، شاری (نصيبين)یش کە سەر بە ئەتابەگایەتی سنجار بوو، لە لایەن ئەتابەگی موسڵ (نورالدين شاە)وە گەمارۆ درابوو - کە ئەوەبوو پێشتر باسمان کرد.

بەڵام (ابن الأثير) ناڵێت: سەرداری هەولێر ئەم کارەی بە فەرمانی (الملك العادل) کردووە. بەهەرحاڵ، وەك لە ڕووداوەکانەوە دەردەکەوێت، (موزەففەرەددین گۆگبوری) ئەم کارەی لەبەر خاتری ئەم مەلیکە کردووە و، بۆ ئەوەشی کردووە کە مەملەکەتی موسڵ لاواز بکات و نەیەڵێت ئەتابەگەکەی لە سنجاردا سەرکەوێت.

پێوەندیی دەسدایی کە سەرداری هەولێری بە (الملك العادل)ەوە بەستبوو درێژەی کێشا و، (موزەففەرەددین گۆگبوری) ناوی ئەم مەلیکەی لەسەر دراوی هەولێر دەنەخشاند[1]. بەڵام ئەوەی لەساڵی (٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز)دا ڕووی دا، پێوەندییەکەی شێواند، ئەوەبوو (الملك العادل) لەشکری بەرەو ڕۆژهەڵات رانی و، (خابور) و (نصيبين)ی داگیر کرد، ئەم دوو شارە موڵکی سەرداری سنجار (ئەتابەگ قطب الدين محمد کوڕی زەنگی) بوون. ئەمیش هانای بردە بەر (موزەففەرەددین گۆگبوری)، ئەوەبوو کوڕەکەی نارد بۆ لای، بۆ تکا، بەڵکو (موزەففەرەددین گۆگبوری) بۆی تێکەوێ و لەلای (الملك العادل) تکای بۆ بکات کە سنجاری بەدەستەوە بمێنێ و لێی

(١) سەیری بابەتی باسی (دراو) بکە.

داگیر نەکەن.

هانا بردنیشی بۆلای (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەو ئومێدە بووە، کە ئەم سەر بە (الملك العادل) بووە و، خەزووریشی بووە و خزمەتی چاکیشی کردووە و تەخت و بەختی بۆ پاراستووە. بەهەرحاڵ، (موزەففەرەددین گۆکبوری) چوو بە هانایەوە و تکای بۆ کرد و داوای لە (الملك العادل) کرد کە دەست لە سنجار هەڵگرێ زۆریش بڕوای بە (الملك العادل) هەبوو، وەهای دەزانی کە ئەگەر تکای نیوەی موڵکەکانیشی لێ بکات، تکای قبوڵە"[1] - بەڵام ئەوەی کە بەتەمای نەبوو، بوو، (الملك العادل) تکاکەی ڕەت کردەوە و، ڕازی نەبوو.

ڕاستیشت دەوێ، ئەگەر باشتر لە بارودۆخی مێژووی ئەو قۆناغە وردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە تکاکەی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەبەر چاوی ڕەشی (قطب الدین محمد)ی سەرداری سنجار نەبوو، لەبەر ئەوەش نەبوو کە تەخت و بەختی هەرەسهێناوی بۆ ڕاگرێ و بیپارێزێت، بەڵکو ئەم خەمی خۆی بوو، ترسی لەوەبوو گەمارۆکە سەرکەوێ، ئنجا (الملك العادل) مرخ لە هەولێر خۆش بکات و ئەم شارەش داگیر بکات. جا، لەبەر ئەوە هەوڵی دەدا، ئەم مەترسییە گەورەیە لە سنجاریش و لە هەموو ناوچەکەش دوور بخاتەوە.

(موزەففەرەددین گۆکبوری)، هەر بەو مەبەست و نیازەوە، کەوتە کۆششی ئەوەی چاو بە پێوەندییەکانی لەگەڵ موسڵدا بخشێنێتەوە و، هەستا (نورالدین أرسلان شاە)ی ئەتابەگی موسڵی خستە سەر دوودڵی و (الملك العادل)ی لەبەر چاو ڕەش کرد، کە ئەم مەلیکە بە هەڵپە و بە تەماعە و، بەرژەوەندی هەردوو ئەمارەتی هەولێر و موسڵ لەوەدایە کە نەیەڵن سنجار بکەوێتە ژێر دەستی[2].

سەرداری موسڵ باوەڕی بە (موزەففەرەددین گۆکبوری) کرد و قەناعەتی هێنا، ئەوجا، بەجووتە، بزافێکی دبلۆماسییان دەست پێکرد و، دڵی میرەکانی دیکەی

---

(١) الكامل ١٢/ ٢٨٦.

(٢) سەیری بابەتی (پێوەندییەکان لەگەڵ موسڵدا) بکە.

ناوچەکەیان بەلای خۆیاندا ڕاکێشا، (الملك الظاهر غازی کوڕی سەلاحەددینی ئەییوبی)ی سەرداری حەڵەبیان "ت ٦١٣ك/ ١٢١٦ز) قایل کرد. ئنجا (کێخسرو غیاث الدین کوری قلج أرسلان"ی سەرداری ولاتی ڕۆمیان (ت ٦٤٥ك/ ١٢٤٧ز)بەلای خۆیاندا راکێشا و، ئەم دووانە بەوە قایل بوون کە ئەگەر (الملك العادل) واز لە سنجار نەهێنێ و گەمارۆکەی لەسەر لانەدات و پڕۆژەی تەبایینامە ڕەت بکاتەوە، ئەوا هێرش دەکەنە سەر ولاتەکەی. سەرباری ئەوەش نامەیان نارد بۆ خەلیفە (الناصرلدین الله) کە دەست لە مەسەلەکە وەربدات و، دەسەلاتی خۆی بخاتە کار بە ئومێدی ئەوەی (الملك العادل) واز لە سنجار بهێنێ. ئەوە بوو، خەلیفە شاندێکی ناردەسەری، پێکهاتبوو لە (هبةالله کوڕی المبارك کوڕی الضحاك الاستدار) و (آق باش الناصري) کە هەردووکیان لە گەورە کاربەدەستانی تەلاری خەلیفە بوون[1]. ئیدی، پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر، (الملك العادل) قایل بوو بەوەی تەبایینامەیەك لەگەڵ (قطب الدین محمد)دا ببەستێ، وێڕای ئەو هەموو زەرەر و زیانەی بەر سنجار کەوت و (الملك العادل) بە مفتی خواردی[2].

وێڕای ئەوەش کە لە نێوان (موزەففەرەددین گۆگبوری) و ئەم مەلیکەدا ڕووی دا، بەلام پێوەندیی لەگەڵیدا نەبڕی و، هەر بە دەسدایی ئەو مایەوە، بگرە پێوەندییەکانیشی لەگەڵ بنەماڵەی ئەییوبییاندا درێژەی کێشا تا دوای ئەوەش کە (الملك العادل) لە ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز) دا کۆچی دوایی کرد و (الملك الكامل محمد)ی کوڕە گەورەکەشی لەسەر تەختی میسر دانیشت، (موزەففەرەددین گۆگبوری) ئەم

---

(١) الكامل ١٢/ ٢٨٧. مفرج الكروب ٣/ ١٩٥. مخطوط (الاعلاق الخطيرة) ورقة ٥٢/ ب. تأريخ الفرات، مجلد (٥) جـ ١، ص ٩٠.
الكامل ١٢/ ٢٨٧، الباهر ١٩٧. ابوشامة، ذيل الروضتين ٦٧، مفرج الكروب ١٩٧/٣.

(٢) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕەکان. ابن العديم، زبدة الحلب ٣/ ١٦١.

کوڕەی بەچاك زانی[١]، ئیدی لە مزگەوتەکانی هەولێردا بەناوی ئەوەوە خوتبە دەخوێندرایەوە و، ناوی لەسەر دراوی هەولێر چەسپا[٢].

بەڵام (موزەففەرەددین گۆکبوری) سەروسەخت و پێوەندیی وەکو ئەمەی لەگەڵ (الملك الکامل) دا هەیبوو، لەگەڵ برا مەلیکەکانی دیکەیدا نەیبوو، سەرچاوەکانیش باسی ناکەن بوویەتی یان نەیبووە. پێدەچێ لەبەر ئەوە بووبێ کە هەولێر لەوڵاتی ئەو مەلیکانەوە دوورە و، هەند بە تەنگەوەی نەبووبن، نەخاسمە، ئەگەر - بەناویش بووبێت - هەر، سەر بە (الملك الکامل)ی برایان بووە.

بەڵام (ابن الأثیر) و (ابن العبري) کە مێژوونووسی ناوچەکەن، خەبەر دەدەن کە جۆرە هاوکارییەك لە نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و (الملك الاشرف) و میرەکانی تری ناوچەکەدا لە دوا دوای ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٤ز)دا لەدژی (نورالدین أرسلان شاه)ی ئەتابەگی موسڵ کە هێرشی کردبووە سەر سنجار[٣]، سازدرا، ئەوکات (قطب الدین محمد)ی سەر بە (الملك العادل)ی باوکی (الملك الاشرف) حوکمی سنجاری

---

(١) (الملك العادل ابوبکر) بەر لەوەی بمرێ مەملەکەتەکەی بەسەر کوڕەکانیدا، دابەش کرد، (الملك الکامل محمد)ی (ت/ ٦٣٥ك/ ١٢٣٥ز) لەسەر میسر دانا. (الملك المعظم عیسی)ی (ت/ ٦٢٤ك/ ١٢٢٧ز)لەسەر دیمەشق دانا. (الملك الاشرف موسی)ی (ت/ ٦٣٥ك/ ١٢٣٥ز) لەسەر (الجزیرة و خلاط) دانا. (الملك شهاب الدین غازی)ی (ت/ ٦٤٥ك/ ١٢٤٧ز)لەسەر (رها) دانا و، قەڵای (جعبر)یش دا بە (الحافظ ارسلان شاه)ی کوڕی ـ بنۆڕە: الکامل ١٢/ ٣٥٢. (الملك العادل) کوڕی دیکەشی هەبوون، ناودارترینیان (الملك الفائز) بوو، ئەمەیان پیلانێکی سەرنەگرتووی لەگەڵ (ابن المشطوب) بۆ رووخاندنی حوکمی (الملك الکامل) نایەوە.. بنۆڕە: الکامل ١٢/ ٣٢٥. (الفائز)یش لە ساڵی (٦١٧ك/ ١٢٢٠ز)دا مرد.

(٢) lane. Poole, catalogue of oriental coins, v. lx, p. ٣١٠محمد باقر الحسیني، العملة الاسلامیة في العهد الاتابکي، ص ٧٠ ـ ٧١.

(٣) ئەم هاوکارییە دوای ئەوە پەیدابوو کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەزۆر (نورالدین أرسلان شاه)ی ناچار کرد، دەست لە سنجار بەربدات و بیگەڕێنێتەوە بۆ موسڵ، ئەوەبوو لەو زۆرلێکردنەدا (نینوی)یشی تاڵان کرد و خەلە و خەرمانیشی سووتاند: الکامل ١٢/ ١٩٢.

دەکرد. لەم شەڕەدا، ئەتابەگی موسڵیان ڕاو نا و، هێرشیان کردە سەر ناوچە و شارۆچکەکانی دیکەی موسڵ و، شاری کفرزماریان قڕ کرد و سووتاندیان[١]، پاشان هەرچی شتێك بەکەڵکیان نەهاتبێ لەناویان برد، بەتایبەتیش لەشاری (بلد)، ئەوە، هەربەجارێ تالانیان کرد و پرزۆڵێکی تێدا دەرنەچوو[٢].

بێجگە لەو هاوکارییە، سەرچاوەکان، باسی پەیدابوونی هیچ جۆرە هاوکارییەکی دیکەی نێوان موزەففەرەددین گۆکبوری و (الملك الاشرف) و براکانیدا ناکەن تا ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز) کە ئیدی لەو ساڵەدا (بدرالدین لؤلؤ) بەنیازی لەناوبردنی دەسەڵاتی بنەماڵەی زەنگییەکان باڵی بەسەر تەخت و تەلاری موسڵدا کێشا. بەرامبەر بەمەش (عمادالدین زەنگی)ی کوڕی (نورالدین ارسلان شاە) بە پشتیوانیی هێز و توانستی موزەففەرەددین گۆکبوری خەزووری ڕاپەڕی و کەوتە بەرەنگاربوونەوەی (لؤلؤ). (لؤلؤ)یش. ناچار، لەگەڵ (الملك الاشرف) دا کەوتە نامەونامەکاری و، پێکەوە لە دژی سەرداری هەولێر و زاواکەی پەیمانیان بەست، واتا، ئەمە - یەکەم جار بوو - کە سەرداری هەولێر، بەپێی ئەو پەیمانە - ترشی بێ و تاڵی بێ - دەبوو بە گژ مەلیکێکی ئەییوبیاندا بچێت، کە خۆی هێشتانیش دەسدای (الملك الكامل الايوبی) بوو.

بێگومان ئەم دەستلەناودەستەی (الملك الاشرف) و (بدرالدین لؤلؤ)ە تەنیا بۆ بەرژەوەند و مەسڵەحەتی هاوبەش بوو، چونکە هاوئاتاجی یەکتری بوون. هەرچی (بدرالدین لؤلؤ)ە - کە دەسەڵاتی ئەتابەگە زەنگییەکانی لەناوبرد -، ئەوە، ئەو، ئاتاجی (الملك الاشرف) بوو تا بە پشتی ئەو دژ بە داواکاری تەختی زەنگی و خەزوورەکەی ڕاوەستێ، هەرچی (الملك الاشرف)یشە، ئاتاجیی بەهاوپەیمانێکی بەهێزی وەك (بدرالدین لؤلؤ) هەبوو، تا باربووی لێ وەربگرێ و بۆ شەڕی

---

(١) کفر زمار: گوندێکی موسڵە، یاقوت، معجم البلدان ٤/ ٤٦٩.

(٢) الکامل ١٢/ ١٩٣. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق لسنة/ ١٩٥٤. ص ٤٢٤ ـ ٤٢٥.
The Chronography, V. I, P. ٣٥٩.

خاچدروشمانی بنێرێ و میرەکانی دوژمنی خۆیشی لە ناوچەکەدا پێ سەرکوت بکات، ئەوەبوو لەشکرێکی گەورە و گرانی لە (لؤلؤ)ەوە بۆهات و ناردی بۆ یاریدەدانی (الملك الكامل)ی برای لە میسر چونکە میسر، ئەوکات کەوتبووە بەر پەلامار و هێرشی خاچدروشمان[1]. (الملك الاشرف) بەهۆی ئەو هاوپەیمانییەوەی لەگەڵ (بدرالدین لؤلؤ)دا بەستی، هەندێ دەسکەوتی لە ناوچەکەشدا بەرکەوت. ئەوەبوو لەساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز)دا تەل ئەعفەر (تەلەعفەر)یشی داگیر کرد و، لەساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز)شدا[2]سنجاری داگیر کرد[3].

ئەم هاوپەیمانییە، ئەو سەرکەوتن و دەستکەوتانەی وەدیهێنا، بەڵام (موزەففەرەددین گۆکبوری) بەرامبەر بە (بدرالدین لؤلؤ) هیچی پێ نەکرا و سەرنەکەوت و چەرخی زەمانەش پێی سەلماند ئەو سیاسەتەی، بۆ دنەدان و یاریدەدانی (عمادالدین زەنگی) پێڕۆی دەرکرد هیچ سوودێکی نەبوو، چونکە (عمادالدین زەنگی)خۆی، ئەوەی لێ نەدەوەشایەوە کە بتوانێ ئەتابەگایەتیی زەنگییەکان لە موسڵ بەرقەرار ڕابگرێت، کابرا، ئەو کارەی لەباردا نەبوو، نەشیتوانی دەست بخاتە ڕێگای (بدرالدین لؤلؤ) و نەیەڵێت وڵاتەکە بخاتە ژێر چنگی خۆی، (عمادالدین زەنگی) بێ ورە بوو، مکوڕ نەبوو، نەشیدەتوانی دۆست و دڵسۆزان لەخۆی خڕبکاتەوە و دڵیانبداتەوە و سەروسەختی باشیان لەگەڵدا ساز بدات.

دیاریشە، (موزەففەرەددین گۆکبوری) لە ململانێی پاشتریدا دژ بە (لؤلؤ) نەیکردبووە هاوڕێی خۆی، ئەوە بوو، وڵاتی شارەزووری پێ دا و[4]، لە گۆڕەپانی ململانێیەکەی دوورخستەوە. ململانێی نوێی نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و (بدرالدین لؤلؤ)، دوای شەش ساڵی ڕەبەق لە پێوەندیی هێور و بێ هەرایی نێوانیان،

---

(١) الكامل ١٢/ ٣٣٩.

(٢) ن. ص ١٢/ ٣٤٥. مفرج الكروب ٧٦/٤.

(٣) الكامل ٣٣٩/٢. مفرج الكروب ٧٤/٤.

(٤) وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٦، ط ١٩٤٨.

(٦١٥ - ٦٢١ك/ ١٢١٨ - ١٢٢٤ز) ئنجا دەستی پێکردەوە. سەرداری هەولێر دەیزانی کە (بدرالدین لؤلؤ) بە وڵاتی موسڵ داناکەوێت (لایکتفي)، بەڵکو بەنیازە، یەکجارەکی دەسەڵاتی بنەماڵەی زەنگی ڕیشەکێش بکات. بەڵێ، (موزەففەرەددین گۆگبوری)، زاواکەی خۆی لە مەیدانی ململانێیەکە دوورخستەوە، بەڵام، ڕێگەش بە (بدرالدین لؤلؤ) نادات، گەمان، بەچارەنووسی ئەم بنەماڵەیە بکات، چونکە (موزەففەرەددین گۆگبوری) دەبێتە باپیرەی (دوا ئەتابەگ - ناصرالدین محمود -) کە چارەنووسی کەوتووەتە ژێر چنگی ئەو سەردارە بەهێزەوە. وەکو باسیشمان کرد، سەرداری هەولێر بە ئومێدی ئەم ئەتابەگە منداڵە بوو، چاوەڕوان بوو گەورە بێت و، ڕۆژێك دابێت، ببێتە خاوەن تەختی موسڵ، بەڵام (بدرالدین لؤلؤ) لە خەو و خەیاڵی خست و هەموو ئومێد و ئاواتێکی کوێر کردەوە و، لەساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز) [1]دا حوکمی ئەم ئەتابەگەی مایە پووچ کرد.

لام وایە، ژێرچنگخستنی یەکجارەکیی سەرلەبەری موسڵ لە لایەن (بدرالدین لؤلؤ)ەوە، لەو ساڵەدا، بووە هۆی ئەوەی کە سەرداری هەولێر لێی ڕاپەڕێ و دەست بداتە چەك و ئاوری جەنگ سەرلەنوێ لەنێوان هەردوو ئەمارەتە هاوسێکەدا بەرپا ببێت.

بەهەر حاڵ، سەرداری هەولێر دەستی کرد بە پەیداکردنی یاوەرو دۆستان بۆ شەڕی حوکمبەدەستی موسڵ، هەندەشی نەبرد، هەر لەناو براکانی خودی (الملك الاشرف)دا پشتیوانی بۆ ڕەخسا، ئەوە بوو، خواوڕاسان. ناکۆکییەکی گەرم لەنێوان ئەم مەلیکە و (الملك المعظم عیسی) [2]ی سەرداری دیمەشق و (الملك المظفر شهاب

---

(١) پێشتر گفتوگۆمان لەسەر ئەو کات و ساتە کرد کە (بدرالدین لؤلؤ)، ئەتابەگ ـ ناصرالدین محمود ـ ی تێدا کوشت، سا، لەساڵی ٦٢١ك، یان لەساڵی (٦٣١ك)دا کوشتبێتی، ئاشکرایە کە (بدرالدین لؤلؤ) موسڵی زەوت کرد و لەساڵی (٦٢١ك)یشەوە کەوتە ژێر دەستی.

(٢) پێشتریش گوتمان، ئەم مەلیکە و (موزەففەرەددین گۆگبوری)، هەردووکیان نازناوی (الملك المعظم)یان هەیە، لەبەر ئەوە تەنیا ناوی بەبێ نازناو دەهێنین، تا لێمان تێکەڵ نەبن.

الدين غازی)ی سەرداری (الرها) سەری هەڵدا، کە هەردووکیان برای (الملك الاشرف) بوون. ئەم پشتیوانی و هاوپەیمانییەش بەشێکی دیکەیە لە مەسەلەی پێوەندیی نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و مەلیکەکانی ئەییوبیدا.

هۆی ئەو ناکۆکییەش، کە لە نێوان برایانی ئەییوبیدا کەوتەوە، ئەوەبوو کە (الملك عیسی)ی سەرداری دیمەشق لەوە دەترسا (الملك الاشرف)ی برای شەڕی پێ بفرۆشێ و دیمەشقی لێ داگیر بکات. ئەو ترسەشی تا دەهات زیاتر دەبوو، نەخوازەلا کە (الملك الاشرف) بە سەردانێك، چوو بۆ میسر و ماوەیەکی[1] زۆر لە لای (الملك الکامل)ی برای مایەوە. (الملك عیسی) وای دەزانی کە هەردوو براکەی لەسەر بێبەشکردنی ئەو رێك کەوتوون و دەیانەوێت وڵاتەکەی لێ زەوت بکەن[2]، نەخاسمە کۆنە قینێکیش لەنێوان (الملك عیسی) و (الملك الاشرف)دا، لەو کاتەوە پەیداببوو کە (الملك الاشرف) پشتگیریی لە (الملك المنصور محمد کوڕی تقی الدین عمر - ت ٦١٧ك/ ١٢٢١ز)ی سەرداری (حماة) کردبوو کە نەیەڵن (الملك عیسی) ئەم شارە داگیر بکات و بیخاتە سەر موڵکەکانی خۆی[3].

سەرباری ئەوەش (الملك الاشرف) و (الملك الکامل) هەردووکیان لەناو خۆیاندا رێك کەوتبوون[4]. ئەمەش (الملك عیسی)ی ناچارکرد ڕوو لە سەرداری هەولێر[5] بکات کە ئەمانیش لە دژی دوژمنی هەردوو لایان ببن بە یەك جا، بۆ ئەوەی

---

(١) الکامل ١٢/ ٤٦٣.

(٢) م. ن. ص.

(٣) م. ن. ص. ابن العدیم، زبدة الحلب ٣/ ١٩٢. ابن العبري، تأریخ الدول السریاني، مجلة المشرق، نفس العدد ص ٤٥٢. محمد کورد علي، خطط الشام ٢/ ٨٩.

(٤) الکامل ١٣/ ٤٢٢. مفرج الکروب ٤/ ١٣٧. مرآة الزمان ٨/ ٦٢٣.

(٥) سێر هاملتۆن جب دەڵێت: (زۆرتر، وەهای بۆ دەچم ئەم هاوپەیمانییەی نێوان هەولێر و دیمەشق، دەستی خەلیفە (الناصرلدین الله)ی تێدا بوو بێت، بنۆڕە کتێبەکەی (جب): (صلاح الدین) ص ٢١٤. چونکە پێوەندیی نێوان ئەم خەلیفەیە و مەلیك زۆر خراپ ببوو، بنۆڕە: الکامل ١٢/ ٤٦٤.

(موزەففەرەددین گۆگبوری) بڕوای پێبکات، (الملك عیسی) هەستا، لە ساڵی (١٢٢١ز)دا کوڕەکەی خۆی (الملك الناصر صلاح الدین داود)ی لە دیمەشقەوە نارد بۆ هەولێر کە بە بارمتە لە لای سەرداری هەولێر بمێنێتەوە[1]. دیاریشە پێوەندی و هامشۆی نێوان هەولێر و دیمەشق لە ساڵی (٦٢٠ك/ ١٢٢٣ز)یەوە، دەستی پێکردبوو، ئەوەتا (ابن الشعار) دەڵێت: لە مانگی (ذی الحجة)ی هەمان ئەو ساڵەدا شاعیری ناوداری دیمەشق (ابو یوسف یعقوب بن عبدالله الرومي) لە لایەن (الملك عیسی)وە نادرا و گەیشتە هەولێر و (موزەففەرەددین گۆگبوری) پێشوازییەکی گەرم و شایستەی لێ کرد[2]. هەروەها (الصفدي)یش دەڵێت: سەرداری دیمەشق[3] شاعیرێکی دیکەی ناوداری دیمەشق (ابن عنین محمد بن نصرالله بن مكارم بن الحسين الدمشقي)ی نارد بۆ هەولێر (ئەم شاعیرە لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز)دا کۆچی دوایی کردووە). پاشان سەرداری دیمەشق لەگەڵ (الملك المظفر شهاب الدين غازي)ی برایدا کەوتە پێوەندیگرتن و، گاڵی دا لە دژی دوو براکەی دیکەیان کە لە میسر کۆببوونەوە ئنجا قەناعەتی پێهێنا کە هەردووکیان ببن بە یەك و سەرداری هەولێریش بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. ئیدی هەرسێکیان بە یەك دەنگ بڕیاریان دا شەڕ لە دژی (الملك الاشرف)[4] و (بدرالدين لؤلؤ)ی هاوڕێی بەرپا بکەن. ئەوەش بڵێین باشە (شهاب الدين غازي) پێشتر ملی بۆ (الملك الاشرف)" ی برای کەچ کردبوو، ئەویش ئەرمینیای بە

---

(١) مرآة الزمان ٨/ ٦٣٣. ابوشامة، ذيل الروضتين: ١٤٢. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣/ ١٠٤. ابن تغري، النجوم الزاهرة، ٦/ ٢٥٧.

(الحموي)یش لە کتێبی (التأريخ المنصوري) یەکەی خۆیدا دەڵێت: (سەرداری دیمەشق کوڕەکەی خۆی، لەسەر داوای (موزففەرقددین گۆگبوری) نارد بۆ هەولێر، چونکە سەرداری هەولێر گوتی: (دەمەوێت بیکەم بە جێگری خۆم)، سەرداری دیمەشقیش لەبەر خاتری دڵنیایی و دۆستایەتی کوڕەکەی خۆی ناردە هەولێر. بنۆڕە لاپەرەی/ ٣٠٧.

(٢) ابن الشعار، مخطوط "عقود الجمان في شعراء هذا الزمان" جـ ١٠ ورقة (٨٠).

(٣) الصفدي، الوافي، باعتناء (س. ديدرنغ) ٥/ ١٢٣.

(٤) مرآة الزمان ٨/ ٦٢٥.

محمد كورد علي: خطط الشام ٢/ ٨٩.

(خلاط)[1] و میافارقین[2] و شاری (حاني) [3] یشەوە پێدابوو، بەرامبەر بەوەش (الملك الاشرف) شاری (رەها) [4]ی لێ وەرگرتبوو.

(الملك الاشرف) باس و خواسی ئەم ڕێکەوتنەی کەوتە گوێ، نامەی بۆ (شهاب الدین غازي)ی برای نارد و، گلەیی ئەو کارەی لێ کرد و کەوتە دڵدانەوەی کە دەست لەو ئیشە هەڵگرێت، بەڵام، ئەم گوێپێنەدا و زێتر پێیلێڕادەکێشا و یاخی بوو[5]. هەرچی (الملك الاشرف)یشە، لەوە دەترسا یاخیبوونەکە بتەنێتەوە و گەورە ببێت، یان سەربازانی وڵاتەکەش تێوەبگلێن، لەبەر ئەوە، کەوتە خڕکردنەوە و ئامادەکردنی لەشکری شام و جەزیرە و موسڵ و، بەرەو (خلاط) کەوتەڕێ، لەوێ هێرشی کردە سەر براکەی و، بەئاسانی سەرکوتی کرد. (شهاب الدین غازي) پێگەی لاواز بوو، ڕەوشتیشی خراپ بوو - وەك (ابن الأثیر) دەڵێ: (الملك الاشرف) ڕەوشتی چاك بوو، خەڵکی وڵاتەکەش خۆشیان دەویست[6]. بڕیار وابوو هاوپەیمانان، لە هەموو لایەکەوە، بەیەکجار هێرش بکەنە سەر پێگە و بارەگاکان و (شهاب الدین غازي)یش دەست بکات بە شۆڕش و هەڵگەڕانەوە و (الملك عیسی)ی برایشی یەکسەر ئامادە ببێت و بە گەرمی بە دەنگیەوە بچێت، (موزەففەرەددین گۆکبوری)یش لەشکری بکێشێتە سەر موسڵ[7]. بەڵام ئەم هەموو تەگبیر و جموجۆڵە سەری نەگرت، چونکە

---

(١) خلاط: شارێکی ئاوەدانە لە وڵاتی جەزیرە، دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەرمەنستانەوە، معجم البلدان ٢/ ٣٨٠.

(٢) میافارقین: بەناوبانگترین شاری وڵاتی دیاربەکرە، معجم البلدان ٥/ ٢٣٥.

(٣) حاني: شارێکە لە دیاربەکر. م. ن. ٢/ ٢٠٨.

(٤) الكامل ١٢/ ٣٩٨، ٤٢١. ابو الفداء، المختصر ٣/ ١٣٤.

تأریخ الوردي ٢/ ٢٠٩. ابن کثیر، البدایة والنهایة ١٣/ ٩٩.

(٥) لکامل ١٢/ ٤٢١، مفرج الکروب ٤/ ١٣٨.

(٦) الكامل ١٢/ ٤٢٢.

(٧) م. ن. ص. ابن العدیم ٣/ ١٩٥.

(الملك عيسى) هيچ يارمەتييەكی براكەی نەدا و، لە هەڕەشەكەی (الملك الكامل)ی برای ترسا كە ئەگەر بێت و يارىدەی (شهاب الدين غازي)ی برای بدات، ئەوا، ديمەشقی لێ دەستێنێتەوە[1]. لەبەر ئەوە (الملك عيسى) گەڕايەوە بۆ ديمەشق و كۆمەكی بە برا ياخيبووەكەی نەكرد. (شهاب الدين غازي)يش بزووتنەوەكەی سەرنەكەوت و هەموو موڵك و ناوچەكانی خۆی لەدەست سەندرايەوە، تەنيا ميافارقين نەبێ، كە (الملك الاشرف)ی برای بۆی بەجێ هێشت و لێی نەسەندەوە[2].

هەرچی (موزەففەرەددين گۆكبوری)يە ئەوە، ئەو، دەرفەتێكی چاكی بۆ گرتنی شاری موسڵ بۆ هەڵكەوتبوو، ئەوەبوو بارێكی نالەباری ئابووری موسڵی داگرتبوو، گرانييەك بوو، هەر مەپرسە، وەرزێكی تا بڵێی نەهات بوو، قاتوقڕ بوو، كولە يەكپارچە بەری ئاسمانی گرتبوو، سەوز و وشكی ماشيبووەوە. سەرباری ئەوەش بەشێكی زۆری لەشكری موسڵ لەشارەكە نەمابوون، چووبوون بۆ (خلاط) بۆ يارمەتيی (الملك الاشرف) و سەركوتكردنی ياخيبوونەكەی (شهاب الدين غازي) [3]. (موزەففەرەددين گۆكبوری) گەيشتە موسڵ و گەمارۆی دا، وايدەزانی كە موسڵ خۆی پێڕاناگيرێ و، (بدرالدين لؤلؤ)يش، بەبێ كۆمەكی (الملك الاشرف)ی هاوپەيمانی ناتوانێت گەمارۆكە بشكێنێت و، ئەميش نەيدەتوانی كۆمەكی پێبكات چونكە هێزەكانی خۆی بە سەركوتكردنی ياخيبوونەكەی براكەيەوە خەريك بوون.

بەلام ئەم خەيالانەی (موزەففەرەددين گۆكبوری) خەوێكی بەتاڵ بوون و هيچيدی، (بدرالدين لؤلؤ) بێ ئاگا نەبوو، موسڵی قايم كردبوو، سەربازی زۆری

---

(١) الكامل م. ن. المقريزي، السلوك ١/ ٢١٥.

(٢) الكامل، ن. م. الحموي، التأريخ المنصوري، ص ٣٠٢.
زبدة الحلب ٣/ ١٩٦. ابوشامة، ذيل الروضتين، ص ١٤٢.
ابن كثير، البداية والنهاية، ١٣/ ١٠٤. ابو الفداء، المختصر ٣/ ١٣٤.
تأريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٠٩.

(٣) الكامل ١٢/ ٤٢٣ ـ ٤٢٤. مفرج الكروب ٤/ ١٣٩.
Setton, V. II, P. ٧٠١.

بەسەر شوورەکانەوە دامەزراندبوون و، هەرچی ئامراز و ئامێرێکی دژە گەمارۆی هەبوو، هەمووی تەیار و ئامادە کردبوو، چەك و خۆراك و ئازووقەی تەواوی بۆ جەنگاوەرەکانی پاشەکەوت کردبوو، سەربازەکانی لەهیچیان کەم نەبوو[١]. ئیدی هیچ دەرفەتێکی بۆ ئەو نەیارەی نەهێشتبووەوە، (موزەففەرەددین گۆکبوری)یش ناچار بوو، گەمارۆکەی لابرد و گەڕایەوە بۆ هەولێر. بەم جۆرە لێدانی موسڵ سەری نەگرت و، چارەنووسی ئەم ڕێکەوتنەش لەگەڵ ئەم دوو مەلیکە ئەیپووبییەدا، هیچ لە چارەنووسی ڕێکەوتنەکانی دیکەی پێشتری کە لەگەڵ میرانی ناوچەکەدا بەستبوونی چاکتر نەبوو. وێڕای ئەم شکستەش، کەچی وازی نەهێنا و دانەکەوت و، لەسەر دوژمنایەتی و ململانێی سەرداری موسڵ و هاوپەیمانەکەی مکوڕ و بەردەوام بوو. ئەوەبوو دوای دوو ساڵ، (٦٢٣ك/ ١٢٢٦ز) هاوپەیمانییەکەی پێشتری لەگەڵ (الملك عیسی)ی سەرداری دیمەشقدا بووژاندەوە و گوڕوتینی پێدایەوە. ئەم پەیمانە بەرەبەرە تەنییەوە و، دوا سوڵتانی خواریزم (جلال الدین منکبرتی) و، (الملك الصالح نجم الدین أیوب)ی سەرداری ئامەد و، (ناصرالدین ارتق)ی سەرداری ماردینیشی گرتەوە و، هەرچواریان ڕێك کەوتن پەلاماری وڵات و ناوچەکانی (الملك الاشرف) و (بدرالدین لؤلؤ)ی هاوپەیمانی بدەن. ئەوەبوو، (موزەففەرەددین گۆکبوری) دەستپێشخەری کرد و هێرشی کردە سەر موسڵ[٢].

(بدرالدین لؤلؤ) پەنای بردە بەر هاوپەیمانەکەی کە ئەوکات لە (الرقة) بوو، تکای لێ کرد، کە خۆی بێتە موسڵ و (موزەففەرەددین گۆکبوری) دەرپەڕێنێ (الملك الاشرف)یش هەستا، چوو بۆ (حران)، لەوێشەوە چوو بۆ (دنیسر)[٣] و شاری ماردینی وێران کرد. هەرچی (الملك عیسی)ی سەرداری دیمەشقە، ئەوە، ئەو هێرشی کردە سەر هەردوو شاری (حماه) و (حمص)، ئنجا ناردیە سەر (الملك الاشرف) و داوای لێ

(١) هەمان سەرچاوەگەل و هەمان لاپەڕەکان. ابوالفداء، المختصر ٣/ ١٣٤.

(٢) الکامل ١٣/ ٤٥٣. مفرج الکروب ٤/ ١٤٥ ـ ١٤٦، ٤/ ١٧٥.

(٣) (دنیسر) شارێکی گەورەی ناوداری وڵاتی جزیرەیە، لە ماردینەوە نزیکە و، دوو قۆناغ لێوەی دوورە و، (فوج حصار)یشی پێدەڵێن: معجم البلدان ٢/ ٤٧٨.

کرد دەست لە ماردین و حلب هەڵبگرێت و، ئەمیش دەست لە (حماە) و (حمص) هەڵبگرێت، (موزەففەرەددین گۆکبوری)یش، موسڵ بەجێ بێڵێت و بڕوات[1]. (الملك الاشرف) قایل بوو، هەریەکەشیان گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی. هێزەکانی سەرداری هەولێریش[2] بەهەر شارێکی ناوچەی موسڵدا تێپەڕین، کاولیان کرد. وێڕای ئەو هەموو دوژمنایەتییەش کە سەرداری هەولێر دژ بە (الملك الاشرف)ی هاوپەیمانی (بدرالدين لؤلؤ) نواندی، کەچی بەدۆستی و دەسدایی بۆ مەلیکە ئەییوبییەکەی تری سەرداری میسر مایەوە، واتا ئەو مەلیکەی ـ وەك باسمان کرد - دۆستایەتییەکی گەرمی لەگەڵ (الملك الاشرف)ی برایدا هەبوو. (الحموي)ی مێژوونووس و هەروەها (المقريزي)یش دەڵێن: (موزەففەرەددین گۆکبوری) تا دوای ساڵی (٦٣٦ك/ ١٢٢٩ز)یش پێوەندیی پتەوی لەگەڵ ئەم مەلیکەدا هەبووە. کاتێکیش (الملك الكامل) لەو ساڵەدا، بەرەو ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکە دەڕۆیشت، لە (الرقة) لای دا (دابەزی) و جەژنەکەی لەوێ کرد، مەلیك و میرانی ڕۆژهەڵات، بۆ جەژنە پیرۆزە گەیشتنە لای، نوێنەرانی سەرداری هەولێریشیان لەگەڵدابوون[3].

بەڵام ئەم دۆستایەتییە تا کۆتایی حوکمی (موزەففەرەددین گۆکبوری) درێژەی نەکێشا، بەڵکو خۆی لەسەری نەڕۆیشت و بایدایەوە بەلای خەلیفەی عەباسیدا و پێوەندیی لەگەڵ ئەو لەجاران بەهێزتر کرد. (الذهبي)ی مێژوونووس، لە زمان (ابن الساعي)یەوە دەقاودەق دەگێڕێتەوە، ئەم بادانەوەیەی هەولێر کە لە دوادوای ساڵەکانی مێژووی ئەتابەگیدا ڕوویداوە، ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆکبوری) زۆر بە چاودێری و خزمەتی کوڕەکانی (الملك العادل)ەوە، ماندوو بوو، (تەنیا الملك عیسی)ی سەرداری دیمەشق نەبێ، ماوەیەکی دوورو درێژ خزمەتی هەموو کوڕەکانی دیکەی کرد. وەلێ ئەوان لەهیچ نەهامەتییەکیدا فریای نەکەوتن و، چاکەیان نەدایەوە - کە ئەم لەهەموو شەڕ و جەنگێکدا بەدەنگیانەوە

---

(١) الكامل ١٢/ ٤٥٤. مفرج الكروب ١٨٨ ـ ١٨٩.

(٢) الكامل، ص. ن. مفرج الكروب ٤/ ١٨٩.

(٣) الحموي، التأريخ المنصوري، ٢٧٧. المقريزي، السلوك ١/ ٢٣٦.

دەچوو - لەبەر ئەوە، ڕقی هەستا و، کلیلی شاری هەولێر و کلیلەکانی هەموو قەڵاکانیشی هەڵگرت و ملی ڕێگای بەغدای گرت و لە سەرەتای ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)دا ڕادەستی (المستنصربالله)ی کرد[1]. (سبط ابن الجوزي)یش حیکایەتێکی لەم بابەتە بەجۆرە بزرکاوییەك دەگێڕێتەوە[2]. بەهەر حاڵ، پێوەندیی دۆستایەتیی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ (الملك الكامل)ی ئەیوبیدا لەساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)دا پچڕا.

## ٣- پێوەندیی نێوان موزەففەرەددین گۆکبوری و خەلافەتی عەبباسیان:

سەرچاوەکان باسی هیچ جۆرە پێوەندییەکی نێوان ئەمارەتی هەولێر و خەلافەتی عەبباسیان ناکەن، نە لە سەردەمی (زين الدين يوسف ينالتگين) و، نەش لە بیست ساڵ پێشەوەی حوکمی (موزەففەرەددین گۆکبوری)دا. بۆ ئەو باس نەکردنەش هیچ هۆیەك شك نابەین، مەگەر وەها دابنێین کە میری یەکەم دوای جیابوونەوەی ئەمارەتەکەی لە ئەتابەگایەتیی موسڵ و، بوونی بە دەستدای سەڵاحەددینی ئەیوبی کە لە (٥٧٩ - ٥٨٦ك/ ١١٨٣ - ١١٩٠ز) خایان، ماوەیەکی کەمی لە حوکمی ئەمارەتەکە بەسەر بردووە. ئەمارەتی هەولێریش لەم ماوە کەمەدا نەگەیشتبووە سەربەخۆییەکی ئەوتۆ کە میرەکەی بتوانێت بیر لە سازدانی پێوەندیی

---

(١) الذهبي، تأريخ الاسلام، الورقة ١٨٣. لە وەرەقەی (١٦٠)دا باسی ئەو سەفەرەی (موزەففەرەددین گۆکبوری) دەکات کە لە ساڵی (٦٢٨ك)دا بۆ بەغدا چووە.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٦٨٠ ـ ٦٨١.: ئەم مێژوو نووسە دەڵێت: پشتگیری (الملك الاشرف) لە (بدرالدين لؤلؤ) و سووربوونیشی لەسەر داگیرکردنی هەولێر، کارێکی وای کرد کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) پەنا بباتە بەر خەلیفە (المستنصربالله) و بچێتە لای بۆ بەغدا. (القزاز)یش لە لاپەڕەی (٧٢)ی کتێبی (الحياة السياسية في العراق في عهد السيطرة المغولية)دا دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆکبوری) هەرچەندیشە خەزووری ئەیوبیان بوو، لە شەڕی خاچدروشمانیشدا بەشداریی کرد بەڵام دادی نەدا و لێی نەگەڕان، ناچار خۆی هاوێشتە بەختی خەلیفەی بەغدا و، بوو بە دەسدای ئەو.

لەگەڵ ئەملا و ئەولادا بكاتەوە. پێوەندییە دەرەكییەكانی (موزەففەرەددین گۆكبوری)یش لە سێ ساڵی یەكەمی فەرمانڕانییدا، واتا، تا كۆچی دوایی سەلاحەددینی ئەیووبیش (ساڵی ٥٨٩ك/ ١١٩٣ز) هەر بەو جۆرە بووە. ئیدی، پاش ئەوە، بارودۆخەكە ناچاری كرد پێوەندیی سەربەخۆ لەگەڵ لایەنە جۆربەجۆرەكاندا ببەستێ، كە دواتر دێینە سەر ئەو باسەش.

پێوەندییە بەسوودەكانی ئەم میرە لەگەڵ خەلیفەكانی بەغدا، كەموزۆر، درەنگ دەستی پێكرد. ئەم درەنگ كەوتنەش لەبەر ئەوە بوو كە بەغدا بەچاوێكی كەم سەیری دەكرد چونكە كاتێ (مجاهدالدین قایماز) لەتەختی حوكم دایگرت و حەپسی كرد و لە هەولێریش دەری كرد، ئەو شكاتی بردە بەغدا، بەمەش خۆی سووك كرد.

لە لایەكی دیكەوە، سەرچاوەكان دەڵێن كە (موزەففەرەددین گۆكبوری)، میرێك لە میرەكانی ئەمارەتی قەفجاقی نزیك بە هەولێر[1] بەناوی میر (عزالدین حسن بن یعقوب بن قفجاق) دەستگیر كرد. ئەم میرە یەك لە دەسداكانی خەلیفەی عەبباسیان بوو. خەلیفەش، نارەزایی خۆی لەم رەفتارەی (موزەففەرەددین گۆكبوری)، بۆ سەلاحەددینی ئەیووبی دەربڕی و داوای لێ كرد فشار بخاتە سەر ئەم دەسدایەی خۆی كە میری ناوبراو ئازاد بكات و بینێرێتەوە بۆ كەرخینی[2]، وادیارە، دەستگیركردنی ئەم میرە ڕەزامەندی سەلاحەددینی لەسەر بووە. لەبەر ئەوە، سەلاحەددینی ئەیووبی بۆ خەلیفە دەنووسێ و دەڵێت: (موزەففەرەددین گۆكبوری) ئەم میرەی لەسەر ئەوە گرتووە كە خراپەكاریی، دنیای گرتووەتەوە[3]. زۆریش ڕێی تێدەچێ كە گرتنی ئەم كابرایە بووبێتە مایەی هەرەسهێنانی پێوەندیی نێوان بەغدا و هەولێر. لەم ڕووداوەش زێتر هیچ هۆیەكی دیكەی تێكچوونی پێوەندیی نێوان ئەم دوو لایەنەمان بەدەستەوە نییە. وێڕای ئەوەش (موزەففەرەددین

---

(١) بنۆڕە بابەتی: پێوەندی لەگەڵ ئەمارەتی قەفجاقیدا.

(٢) ابن شداد، النوادر، ١٩٨. أبوشامة، كتاب الروضتين ٢/ ١٩٣. ابن خلكان، ط بيروت ٣/ ٤٥٨.

(٣) ابن شداد، ن. م. ص. ابن واصل، مفرج الكروب ٢/ ٣٧٦.

گۆگبـوری) نـاوی (الخلیفـة الناصـرلدین الله)ی خـستبووە سـەر دراوی ئەمارەتەکـەی. دەشتوانین ئەمە بکەینە بەڵگەی ئەوە کە ئـەم مـیرە، خـۆی بـە دەسـدایەکی خەلیفـە دەزانی، بەڵام ئەم دەسدایيە بە گوفتار بـوو نـەك بـە ڕەفتـار. ئـەم پێوەندییـە لەقـە، هەروا مایەوە تا ئەودەمەی، (موزەففەرەددین گۆگبوری) هاتە سەر ئـەوەی کـە ئیـدی کاتی ئەوە هاتووە سەرلەنوێ بیری لـێ بکاتـەوە و پێوەندییـەکی بـەڕەفتاری گـەرم و پتەو لەگەڵ مەرکەزی خەلافەتی عەبباسیاندا سازبدات.

ئەم لێك نزیکبوونەوەیەش، لەساڵی (٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز)دا، لەسـەر دەسـتی (بتوسـط) (الملك العادل)ی ئەیوبیدا هاتەجێ، کە موزەففەرەددین گۆگبوری دەسدایەك بـوو لـە دەسداکانی ئەو - ئەومبوو ئەو مەلیکە، (الجمال - یونس بن بدران المصری)ی سەرۆکی شافیعییەکانی دیمەشقی، بەناوی خۆیەوە، لەگەڵ یەك لە برازاکانی (موزەففەرەددین گۆگبـوری)دا نـارد بـۆ بەغـدا. ئـەم شـاندە، هەرکـە گەیـشتە مەرکـەزی خەلافـەت، پێـشوازییەکی زۆر گـەرمی لـێ کـرا. نوێنـەری سـەرداری هـەولێر وەپـێش کـەوت و، لەڕێوە عەتەبەی بەر دەرگای (باب النوبي)ی ماچ کرد[1]. کابرا، کفنێکی لەبـەردابوو، شمـشێرێکی ڕووتیـشی بەدەسـتەوە بـوو[2]. ئنجـا کەوتـە پاسـاوهێنانەوە لـە زمـان مامییەوە، لەو ناوێڵییەی کە بەرامبەر دیوانی خەلیفایەتی پێشتر ڕوویداوە. هەرچی شـاندەکەی (الملـك العـادل)ە، ئـەوە، ئـەو، نامەیـەکی ڕادەسـتی خەلیفـە کـرد، داوای لێبوردن لە (موزەففەرەددین گۆگبوری)ی تێدا بوو. داوای هەردوو شـاندەکە قـەبووڵ کرا[3]. ڕاستیشت دەوێ شاندنی شاندێکی بەم گرنگییە، بۆمـان دەردەخـات کـە پێـشتر پێوەندیی نێوان هەولێر و بەغدا نالەبار بووە.

---

(١) (باب النوبی): دەرگای عەتەبەشیان پێ دەگوت، چونکە عەتەبەکەی تێدایە و، شاند و مـەلیك و سەرۆکانی حاجییان، بگەیشتنایە بەغدا، دەچوون ئـەو (عەتەبـە)یـەیان مـاچ دەکـرد.. بنۆڕە: مصطفى جواد و، احمد سوسة، دلیل خارطة بغداد، ط ٩٥٨، ص ١٥٨.

(٢) نیشانەی دڵسۆزییە تا مردن، بۆ ئەوەی لێی دڵنیا بین.

(٣) ابن الساعي، ٩/ ١٨٧ ـ ١٨٨. ابن کثیر، البدایة والنهایة ـ حوادث تلك السنة.

پاش ئەم دەستپێشخەرییە، لاپەڕەیەکی نوێی پێوەندیی دۆستانە کرایەوە، ئیدی (موزەففەرەددین گۆگبوری) بەپێی فەرمان و ڕێنمایی خەلیفە هەڵدەسووڕا. دوای شەش ساڵ، واتا لەساڵی (٦١٢ك/ ١٢١٥ز)دا، خەلیفە (الناصرلدین الله) لەشکرێکی تەیار و ئامادە کرد بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونەکەی (منکلی)ی کۆیلە (المملوك منکلی)، ئەو (منکلی)یە لە (اوزبك ابن بهلوان)ی ئاغای، سەرداری ئازەربێجان و لە خەلیفەش یاخی ببوو، وڵاتەکەشی داگیرکردبوو، لەساڵی (٦٠٨ك/ ١٢١١ز)یشەوە هەموو ڕێگاو بانەکانی بڕیبوو[1]، لەساڵی (٦١٠ك/ ١٢١٣ز)یشدا (شمس الدین أیدغمش)ی دۆستی خەلیفە سەرداری (هەمەدان و، ئەصفەهان و، ڕەی)ی کوشتبوو[2]. خەلیفە داوای لە (موزەففەرەددین گۆگبوری) کرد ببێتە فەرماندداری ئەو لەشکرە.

خەلیفە، دوای خڕکردنەوە و ئامادەکردنی لەشکرەکەی، نامەی نارد بۆ (جلال الدین بن حسن الصباح)ی[3]سەرکردەی قەڵاگەلی ئیسماعیلییەکان لە وڵاتی فارس و، نامەی بۆ (الملك الظاهر غازي بن صلاح الدین الأیوبي)ی سەرداری حەڵەب و، بۆ (الملك العادل الأیوبي)ی سەرداری میسر و شامیش نارد، داوای کرد، یاریدەی بدەن بۆ ڕامالینی هێزەکانی (منکلی). داوای خەلیفە قبوڵ کرا، ئنجا لەبەر سنگی لەشکرەکەوە، (مظفرالدین سنقری)ی کۆیلەی ناودار بە شێوە شێر[4](وجه الأسد)

---

(١) الکامل ١٢/ ٢٩٦. النجوم الزاهرة، ٦/ ٢١٢.

(٢) الکامل ١٢/ ٣٠١. رشیدالدین فضل الله الهمدانی، جامع التواریخ بالفارسیة، جلد (١) ص ٣٤٩. النجوم الزاهرە، ٦/ ٢٠٨.
Juvaini, The History of The World Conqueror. V. II, P. ٧٠٢

(٣) ئەم سەرکردە ئیسماعیلییە، بەپێچەوانەی ئیسماعیلییەکانی دی، ببوو بە دۆستی خەلیفە.. بنۆڕە: الکامل ١٢/ ٢٩٨. النجوم الزاهرة، ١٢/ ٢٠٣.
هورات CL. Huart، دائرة المعارف الاسلامیة، ط ١٩٣٣. مادة (الاسماعیلیة) جـ ٢، ص ١٨٩.

(٤) ئەم (شێوە شێرە) لە ساڵی (٦٢٣ك)دا ڕۆڵێکی گرنگی لە پاراستنی موڵکەکانی خەلیفەدا، دژ بە (جلال الدین منکبری)ی سوڵتانی خواریزم گێڕا. شێوە شێر، خۆی سەرداری خۆزستان بوو،

دانا، ئەوجا فەرمانی نارد بۆ (موزەففەرەددین گۆگبوری) کە بەخۆی و بە لەشکرەوە ئامادە بێت و، ببێتە پێشەنگی هەموو لەشکرەکان[1]. ئەمیش بە لەشکری خۆی و موسڵ و وڵاتی جزیرە و حەڵەبیشەوە گەیشتە مەیدان و، ملی نا لە هەمەدان و لەگەڵ لەشکری (منکلی)دا، لێرە و، لەوێ شەڕێکی چاکی کرد و، ئەنجام، (منکلی) شکا و هەڵات و، پاشانیش کوژرا[2].

لەساڵی (٦١٨ك/ ١٢٢١ز) [3]دا بۆنەیەکی دی هاتەپێش کە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بۆ دووەم جار شانبەشان لەشکری خەلیفە بچێتە شەڕەوە، ئەوەبوو، مەگۆل وڵاتی ئازەربێجانیانی داگیر کرد و، چوونە ناو شارۆچکەی مەراغەوە، ئنجا گەیشتنە تەورێز و داگیریان کرد، پاشان لێی کشانەوە و بەرەو باشوور کەوتنە ڕێ بۆ هەولێر، بەڵام دیتیان ڕێگای هەولێر هەمووی هەڵدێر و تاوێر و ڕچە ڕێگای تاکە کەسی پیادەیە و شیو و دۆڵی تەنگەبەرە و لەیەك سوار زیاتر ناکێشێ[4]، لەبەر ئەوە ڕێگای خۆیان گۆڕی. بەڵام خەلیفە لەوە دەترسا کە پیلانەکەیان گۆڕیبێ و بەرەو بەغدا مل بنێن و وازیان لە هەولێر هێنابێ، بۆیە نامەی کردە سەر سەرداری موسڵ و سەرداری هەولێریش کە بە پەلە بگەنە (داقوق) و لەگەڵ لەشکرەکانی خۆیدا یەك بگرنەوە و ڕێگای هێرشهێنان بگرن و بەرەو پاش بیشکێنن. (موزەففەرەددین گۆگبوری) قایل بوو، چونکە خەلیفە قەولی دە هەزار سەربازی پێدابوو کە بۆی

---

لەساڵی (٦٢٥ك)دا مرد.. بنۆڕە: الصفدي (مخطوط). الوافي بالوفيات ٨/ ١٩٥. ابن الفوطي، تلخيص مجمع الالقاب، ط/ لاهور، ٥/ ٥٢٥.

(١) الكامل ١٢/ ٣٠٦.

(٢) م. ن. ص. ٣٠٧. رشيد الدين فضل الله، جامع التواريخ، جلد (١) ص ٣٤٩. الغساني، المسجد المسبوك، ص ٢٠٧. النجوم الزاهرة، ٦/ ٢١٣.

(٣) (ابن الأثير) لە باسی ڕووداوەکانی ساڵی (٦١٧ك)دا، باسی ئەو ڕووداوەشی کردووە کە لە ساڵی (٦١٨ك)دا ڕوویداوە.. الكامل ١٢/ ٣٧٧.

(٤) الكامل ١٢/ ٣٧٨. مورازا دوهسون "موغول تأريخي" جـ ١، ص ١٥٢.

بنێرێ و بیکات بە فەرماندارى لەشکرەکە[1]. (موزەففەرەددین گۆگبورى) بەرەو (داقوق) کەوتە ڕێ و، هێزەکانى موسڵیش گەیشتنە ئەوێ. خەلیفە تەنیا هەشت سەد سەربازى بە سەرکردایەتى (جمال الدین قشتمر) لە داقوق هەبوو. کاتێ (موزەففەرەددین گۆگبورى) ئەم لەشکرە کەمەى خەلیفەى دیت، دەستبەجێ بڕیارى دا کە ئەم شەڕە نەکات، چونکە بۆى دەرکەوت ئەم شەڕە ناهاوتایە و، کارێکى هەڵە و نابەجێیە خۆى و سەربازەکانیشى بکات بە قوربانى و، لە تێکشکان و هەڵاتن و سەرشۆڕیش بەولاوە هیچى ترى بۆ نامێنێتەوە. کاتێکیش خەلیفە بۆ لێپێچینەوە بانگى کرد، لەبەردەمى خەلیفەدا داکۆکى لەخۆى کرد و بە خەلیفەى گوت: دوژمن بەهێزە، منیش سەربازم کەمە و ناتوانم بەو حاڵەوە دەستەویەخەیان ببم. من داواى دە هەزار سەربازم لە خەلیفە کردبوو، خەلیفە ڕازى بوو، منیش چووم بۆ (داقوق) بەڵام دیتم خەلیفە سەربازى کەمى ناردووە[2]، ئەوەش کە هاتە لاى من نەدەگەیشتە هەشت سەد (طواش) واتا هەشت سەد کۆیلەى خزمەتکارى نزیکى خەلیفە[3]، لەبەر ئەوە منیش دانیشتم و خۆم و موسوڵمانانیشم لە مەرگ ڕزگار کرد[4]. هەرچى، مەگۆلەکانیشە، کاتێ باسوخواسى ئەو کۆبوونەوەیەى (داقوق)یان

(١) الكامل ١٢/ ٣٧٩. ابن الكثير، البداية والنهاية، ١٣/ ٩٠. ابن خلكان ٥/ ٢٤٤. مورازا دوهسون، "موغول تأريخي، ١/ ١٥٢.

(٢) الكامل ١٢/ ٣٧٩. مفرج الكروب ٤/ ٤٩. الغساني، العسجد المسبوك ٣٤٩.

(٣) (طواش): واتا مەمالیك ـ یان خزمەتکارە (نۆکەرە) نزیکەکانى خەلیفە، یان ئەوانەى کە (الاستاذون)یشیان پێدەڵێن.. القلقشندي، صبح الاعشى ٣/ ٤٧٧. یان خزمەتکارى (خەساون) ٥/ ٤٥٦. بنۆڕە: د. حسن الباشا، الالقاب الاسلامية في التأريخ، ص ٣٨٢.

(٤) الكامل ١٢/ ٣٧٩.. (الذهبي) شتێکى تەواو جیاواز لەوەى (ابن الأثير) دەگێڕێتەوە، دەڵێت: سەردارى هەولێر داروبەردى دەربەندەکانى پڕ کرد لە کورد و کردنى بەگژ مەگۆلەکاندا. کوردان کەلوپەلى مەغۆلیان تاڵان دەکرد و لە شیرینى خەودا دەیانکوشتن. کاتێکیش بەیانیان بە خەبەر دەهاتن نەیاندەزانى کەوتوونەتە بەر شەبەیخونى کورد و، سەریان لەو لێقەوماوى و نەهامەتییەى خۆیان سوڕ دەما، نەیاندەزانى ئەم دوژمنە نادیارە چۆن چۆنى هەموو←

بەرگوێ کەوت لە هێرش پەشیمان بوونەوە و ترسی بەزین و دۆڕاندنیان کەوتە دڵ، وایاندەزانی هێزەکانی ئیسلام بە دوویانەوەن، بەڵام کە دیتیان هیچ دیار نەبوو، وەستان و دەواریانلێهەڵدا و کەوتنە چاوەڕوانی، تا بزانن چی ڕوودەدات و مەسەلەکە دەگات بە چی، بەڵام هیچ شەڕێك لە نێوانیاندا ڕووی نەدا[1].

لەم دوو ڕووداوەی، سەرکوتکردنی یاخیبوونەکەی منکلی و کۆبوونەوەکەی داقووقەوە، پێوەندیی دۆستانەی نێوان هەولێر و بەغدامان بۆ دەردەکەوێت، تا ڕادەیەکی ئەوتۆ کە خەلیفە سەرداری هەولێر بکات بە فەرمانداری گشتی هەموو ئەو لەشکرانەی لەو دوو ڕووداوەدا بەشدارییان کرد.

(بدرالدین لؤلؤ) مەترسییەکی گەورەی لەم پێوەندی و ڕێککەوتنە دوو قۆڵییەی نێوان هەولێر و بەغدا کەوتە دڵ. لەبەر ئەوە، بەهەموو هێز و توانای خۆی کەوتە کۆشش بۆ تێکدانی و بۆ دڵڕەشکردنی خەلیفە (الناصرلدین الله)، بەڵام خەلیفە نەخلیسکا، وەلێ بە ئاگا هاتەوە و کەمێك کەوتە دووربینی، لەگەڵ ئەوەشدا، خەلیفە پشتگیری لەو هاوپەیمانییە دووقۆڵییەی نێوان سەرداری هەولێر و مەلیکی ئەییوبی (عیسی)ی سەرداری دیمەشقدا دەکرد، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە خەلیفە لەگەڵ

←شەوێ هەڵدەکوتێتە سەریان و لەکوێوە دێن. پاشان خەلیفە کۆمەڵ کۆمەڵ هەموو لەشکرەکانی کۆکردەوە و بانگەوازی هەڵدا، لەهەموو لایەکەوە نوێنەران ڕوویان تێ کرد، کاتێك بیستیان شاندی مەگۆل گەیشتووە، ڕوویان لە سەرداری هەولێر کرد کە هەموو لەشکرەکەی دەربخات و خەڵکی ڕەشەکی و وەرزێرانیان تێکەڵ بکات، کاتێکیش گەیشتە ناو (داقوق) چەندین جار هەندەی لەشکرەکەی بۆ دیار کرد، سەرداری داقوقیش لە مەملوکەکانی خەلیفە بوو. فەرمانی دا دەوارێکی زۆر گەورە هەڵبدرێت، هەندەی نیو قۆناغیش ڕایەخیان ڕاخست و، سەکۆیەکی بەرزیشیان بەسەر تەختێکەوە دامەزراند بە پەیژە بۆی سەردەکەوتن، وێنەیەکی گەورە و جوان بوو. بیست هەزار کەسیش دەست بە شمشێری ڕووتەوە ڕیزببوون. بنۆڕە کتێبەکەی: مخطوط (تأریخ الاسلام)، ورقة ١٣٥ ـ ١٣٦.

(١) لكامل ١٢/ ٣٧٩. الذهبي، ن. م. ورقة ١٣٣. العبر ٥/ ٦٥.

ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ٥/ ٧٢.

بەرگوێ کەوت لە هێرش پەشیمان بوونەوە و ترسی بەزین و دۆڕاندنیان کەوتە دڵ، وایاندەزانی هێزەکانی ئیسلام بە دوویانەوەن، بەڵام کە دیتیان هیچ دیار نەبوو، وەستان و دەواریانلێهەڵدا و کەوتنە چاوەڕوانی، تا بزانن چی ڕوودەدات و مەسەلەکە دەگات بە چی، بەڵام هیچ شەڕێك لە نێوانیاندا ڕووی نەدا[1].

لەم دوو ڕووداوەی، سەرکوتکردنی یاخیبوونەکەی منکلی و کۆبوونەوەکەی داقووقەوە، پێوەندیی دۆستانەی نێوان هەولێر و بەغدامان بۆ دەردەکەوێت، تا ڕادەیەکی ئەوتۆ کە خەلیفە سەرداری هەولێر بکات بە فەرمانداری گشتی هەموو ئەو لەشکرانەی لەو دوو ڕووداوەدا بەشدارییان کرد.

(بدرالدین لؤلؤ) مەترسییەکی گەورەی لەم پێوەندی و ڕێککەوتنە دوو قۆڵییەی نێوان هەولێر و بەغدا کەوتە دڵ. لەبەر ئەوە، بەهەموو هێز و توانای خۆی کەوتە کۆشش بۆ تێکدانی و بۆ دڵڕەشکردنی خەلیفە (الناصرلدین الله)، بەڵام خەلیفە نەخلیسکا، وەلێ بە ئاگا هاتەوە و کەمێك کەوتە دووربینی، لەگەڵ ئەوەشدا، خەلیفە پشتگیری لەو هاوپەیمانییە دووقۆڵییەی نێوان سەرداری هەولێر و مەلیکی ئەییوبی (عیسی)ی سەرداری دیمەشقدا دەکرد، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە خەلیفە لەگەڵ

---

←شەوێ هەڵدەکوتێتە سەریان و لەکوێوە دێن. پاشان خەلیفە کۆمەڵ کۆمەڵ هەموو لەشکرەکانی کۆکردەوە و بانگەوازی هەڵدا، لەهەموو لایەکەوە نوێنەران ڕوویان تێ کرد، کاتێك بیستیان شاندی مەگۆل گەیشتووە، ڕوویان لە سەرداری هەولێر کرد کە هەموو لەشکرەکەی دەربخات و خەڵکی ڕەشەکی و وەرزێرانیان تێکەڵ بکات، کاتێکیش گەیشتە ناو (داقوق) چەندین جار هەندەی لەشکرەکەی بۆ دیار کرد، سەرداری داقوقیش لە مەملوکەکانی خەلیفە بوو. فەرمانی دا دەوارێکی زۆر گەورە هەڵبدرێت، هەندەی نیو قۆناغیش ڕایەخیان ڕاخست و، سەکۆیەکی بەرزیشیان بەسەر تەختێکەوە دامەزراند بە پەیژە بۆی سەردەکەوتن، وێنەیەکی گەورە و جوان بوو. بیست هەزار کەسیش دەست بە شمشێری ڕووتەوە ڕیزببوون. بنۆڕە کتێبەکەی: مخطوط (تأریخ الاسلام)، ورقة ١٣٥ ـ ١٣٦.

(١) لکامل ١٢/ ٣٧٩. الذهبي، ن. م. ورقة ١٣٣. العبر ٥/ ٦٥.

ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ٥/ ٧٢.

(الملك الكامل)ی ئەییوبیی سەرداری میسردا لێك نیگەران بوون بەهۆی ئەو سووکایەتییەی کە کوڕی ئەم مەلیکە - سەرداری یەمەن - بە میری حاجییانی عیراقی کردبوو، لەبەر ئەوە خەلیفە لە (الملك الكامل) و لە هاوپەیمانی ئەم مەلیکە و لە (الملك الاشرف)ی برایشی نیگەران بوو، ئەنجام هاوپەیمانەکەی (بدرالدین لؤلؤ)یشی گرتەوە. خەلیفە نامەی بۆ (موزەففەرەددین گۆکبوری) نارد و ئەم بارە نوێیەی بۆ ڕوون کردەوە، ئنجا هەردووکیان پێوەندییان بە سەرداری دیمەشقەوە کرد[1].

لەگەڵ ئەوەشدا، خەلیفە پشتگیری لەو ڕێکارانە دەربڕی کە (بدرالدین لؤلؤ) لەبارەی دانانی میرە منداڵەکان لەسەر تەختی حوکمی موسڵ پێڕەوی کردبوو[2]، بەوەش (عمادالدین زەنگی)ی زاوای (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی لە تەختی موسڵ بێبەش کردبوو، کە ببووە هۆی تێکچوونی پێوەندی و پەیدابوونی دوژمنایەتی لەنێوان سەرداری هەولێر و موسڵدا، وەك پێشتریش باسمان کرد.

ئەم خەلیفەیە لەساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز)دا مرد، کاتێ کە دوژمنایەتی نێوان هەولێر و موسڵ گەیشتە ئەوپەڕی توندی. (بدرالدین لؤلؤ) لەوە دەترسا خەلیفەی نوێ (المستنصر بالله)[3](٦٢٣ - ٦٤٠ك/ ١٢٢٦ - ١٢٤٢ز) پشتی تێ بکات و دەستی لێ بەربدات. لەبەر ئەوە نامەی بۆ دەنارد و خۆی لێ نزیك دەکردەوە تا لە (موزەففەرەددین گۆکبوری) هەڵیگێڕێتەوە و بیکات بە دوژمنی. دەیویست وا لە خەلیفە بگەیێنێ کە ئەو میرە بە قسەی ناکات و ملی بۆ کەچ ناکات. لەو نامانەدا کە (ضیاءالدین ابن الأثیر) لە تەلاری موسڵ دەینووسی، لە نامەیەکیاندا نووسرابوو کە سەرداری هەولێر ویستوویەتی دەوڵەتی غەیرە عەرەب (الاعاجم) بهێنێتەوە

---

(١) الكامل ١٢/ ٤٦٣.

(٢) هـ. س. ١٢/ ٣٣٤.

(٣) بەر لە (المستنصر بالله) (الظاهر بامرالله)ی باوکی، خەلیفە بوو، بەڵام لە دەمانگ زێتری نەخایان. لە ڕەجەبی ساڵی (٦٢٣ك/ تەمووزی ١٢٣٦ز) مرد، بنۆڕە: الكامل ١٢/ ٤٥٦.

هـەولێر و بەئاشـکراش باسـی کـردووە و ڕێگـای پـێ داوە - هەرچەندیـشە گـیر و، چاوبرسییە - بەڵام لـە گەنجینـە پڕەکانی کۆمەکیـشی پـێ کـردووە[١]. لـەوەش زیـاتر دەڕواو دەڵێـت: (موزەففـەرەددین گۆگبـوری) دوژمنـانی خەلیفـەی لـە ناوچـەکە خـڕ کردووەتـەوە و بـەنیازە هێرشـیان پـێ بکاتـە سـەر بەغـدا و دەڵێـت: سـەرگەورەی خواریزمی گاڵ داوە و، سەرگەورەی خۆراسانیشی لە خەلیفە ڕاست کردووەتەوە[٢].

وادیـارە، (بدرالـدین لؤلـؤ) لـەم درۆ و دووزمانییـەدا سـەرکەوتووە و خەلیفـەی بەلای خۆیدا کێش کـردووە، ئـەوەتا، (الحمـوي) دەڵێـت: خەلیفـە نامەیـەکی نـارد بـۆ سەرداری موسڵ، پشتگیری لێ دەکات دژ بە (موزەففەرەددین گۆگبـوری) و بەڵێنیـشی دەداتێ هەموو یارمەتییەکی بدات[٣].

بـەڵام پاشـان خەلیفـە بایدایـەوە بـەلای سـەرداری هـەولێردا، پێدەچـێ سـەرداری هەولێر دبلۆماسییەتێکی عاقڵانەی گرتبێتە بەر کە خەلیفە چاو بە ڕەفتاری خۆیـدا بەرامبەر بەو بخشێنێتەوە و بۆی دەرکـەوتبێ کـە سـەرداری هـەولێر بێتاوانـە و لـەو تۆمەتەی کە (بدرالدین لؤلؤ) داویەتییە پاڵی بێبەرییە. ئەم بادانەوەیەی خەلیفـەش لەوەوە هاتووە کە خاڵێك لەخاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنەی ساڵی (٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز)ی نێـوان خەلیفە و سوڵتانی خواریزم (جلال الدین منگبرتی) ئەوەی تێدایە کە خەلیفە داوای لەم سـوڵتانە کـردووە دەسـت بـۆ زەوی و زاری میرەکانی ناوچـەکە درێـژ نـەکات، کـە (موزەففەرەددین گۆگبوری)یش یەکێکە لەو میرانە، چونکە ئەوانـە سـەر بـە دیـوانی خەلافەت و دەسەڵاتی ئەوون[٤].

پێوەندیی دۆسـتانەی نێـوان هـەولێر و بەغـدا دەوامـی کێـشا، نـەخوازەلا هـەموو

---

(١) ضياء الدين ابن الأثير، رسائل ابن الأثير، ص ٧١.

(٢) م. ن. ص.

(٣) الحموي، التأريخ المنصوري، ٢٢٤.

(٤) النسوي، سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، ص ٢٠٤.

الجويني، تأريخ جهانشكاي ٢/ ١٥٥. عباس اقبال، تأريخ مفصل ايران، ص ١٣.

ناوچەکەش سەرلەبەری کەوتبووە بەر مەترسیی مەگۆلان و، چەندین ساڵیش بوو پەلاماریان دەدا و هێرشیان دەهاتی. ئەمارەتی هەولێریش لەو پەلامار و هێرشانە سەر سەلامەت نەبوو، بەڵکو کاری لە بەرگری و لە توانستی هەولێر کردبوو، لەبەر ئەوە، سەرداری هەولێر وەهای بەچاکتر زانی بەرگرییەکی هاوبەش لەدژی ئەو دەستدرێژکارانە رێك بخرێت. هەولێر هەند لاواز و کەم هێز ببوو، هەندێ گرووپی چەتە و رێگر پەلاماری دەوروبەری شارەکەیان دەدا. (ابن الأثیر) دەڵێت: لەساڵی (٦٢٧ك/ ١٢٢٩ز)دا، میر (شمس الدین سونج) پەیدا بوو. ئەو کابرایە سەرۆکی ئێلی (قشیالوا)ی تورکمانە، دۆست و لایەنگرانی خۆی کۆ کردەوە و گاڵیانی دەدا لەناوچەی نێوان هەولێر و هەمەداندا[1] بکەونە تاڵان و برۆ و رێگا بڕین و چەتەیی و تێکدانی ئاسایش و ئارامی، تا قەڵای (سارۆ) [2]شیان داگیر کرد، قەڵای (سارۆ) قەڵایەکی سەختی ناوچەی هەولێر بوو (عزالدین محمد الحمیدي) کە بەرپرسی قەڵاکە و یەکێك بوو لە گەورە میرانی (موزەففەرەددین گۆگبوری) [3]، ئەویشیان کوشت. ئنجا، سەرداری هەولێر، خۆی، بەرەنگاریان بووەوە، وەلێ نەیتوانی قەڵاکەیان لێ بسەنێتەوە، داگیرکاران خۆیان لە قەڵاکەدا قایم کردبوو، (موزەففەرەددین گۆگبوری)، ناچار، تەبایینامەیەکی لەگەڵیاندا مۆرکرد و قەڵاکەی بۆ ئەوان بەجێ

---

(١) لکامل ١٢/ ٤٩٣. مفرج الکروب ٤/ ٣٠٦.

(٢) (سارۆ): جێگای ئەم قەڵایەمان لە کتێبگەلی وڵاتگەڕاندا نەدیتەوە، بەڵام کەوتبووە نزیك رویندوز (ڕەواندزی ئێستا) وەك لە قسەکانی (ابن الأثیر)ەوە دەردەکەوێت، ١٢/ ٤٩٣.

(٣) (ابن الأثیر) ناوی ئەم میرە لە نوسخەکەی چاپی (دار صادر ـ بیروت، ساڵی ١٩٦٦)دا نابات، کە ئێمە پشتمان پێی بەستووە، وەلێ لە نوسخەکەی (مطبعة الاستقامة ـ القاهرة)دا کە لە (الکامل ٩/ ٣٨٢)ەوە وەریگرتووە ناوی دەبات. ئەم میرە یەکێك بوو لە گەورە میرانی (الملك الاشرف الأیوبي)، بەڵام لێی جیابببووەوە و خۆی گەیاندبووە لای سەرداری هەولێر. بنۆڕە: لاپەڕەی (١١٩).

هێشت. (شمس الدین سونج) قەڵای (روینـدز)[1] یـشی داگیر کـرد کـە قەڵایـەکی قایمکاری ناوچەکەیە.

ئەم غەڵبەو سەرکەوتنانەی ئەم گروپە لە دەوروبەری هەولێردا بەدەستیان هێنا، (موزەففەرەددین گۆکبوری) ناچار کرد پێوەندییەکانی لەگەڵ خەلیفەدا چاکتر بکات، نەخوازەلا کە مەترسیی مەگۆلانیش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو[2]. ئەم هەموو ڕووداوانە کارێکی وەهای کرد پێوەندیی نێوان سەرداری هەولێر و خەلیفەی بەغدا زیاتر توند و تۆڵتر ببێت و، لە ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)دا، (موزەففەرەددین گۆکبوری) سەردانێکی خەلیفەی کرد لە بەغدا، ئەو سەردانە دەنگی دایەوە و بوو بە نیشانەی ئەوپەڕی پێوەندی و دۆستایەتی.

## سەردانەکەی بەغدای[3] ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)ی موزەففەرەددین گۆکبوری

دوای پتەوبوونی پێوەنـدیی دۆسـتانەی نێـوان ئـەمارەتی هـەولێر و خەلیفـەی بەغدا، خەلیفە (المستنصربالله) داوەتی (موزەففەرەددین گۆکبوری)ی کرد، بۆ بەغدا. بەو نیازەش خەلیفە، هەر یەکە لە (محي الدين يوسف ابن الجوزي)[4] و (سعدالدین

---

(١) ابن الأثير، وەسفی قەڵای رویندز (رەواندز) دەکات، دەڵێت: چاکترین و سەختترین قەڵایە، کە وێنەی نەبووە. ئەوکات سەر بە ئازەربێجان بووە: (الكامل ١٢/ ٤٩٣. (ياقوت الحموي)یش هەروەها دەڵێت: معجم البلدان ٣/ ١٠٥.

(٢) محمد رضا الشبيبي، مؤرخ العراق ابن الفوطي، جـ٢، ص ١١.

(٣) ئەوە دووەم جار بوو، (موزەففەرەددین گۆکبوری) بە میوانی بۆ بەغدا بچێت. جاری یەکەمیشی ئەوەبوو کە لە تەختیان خست و لە هەولێریش دەریانکرد. کەچی هەندێ لە مێژوو نووسان ئەم سەردانەی (٦٢٨ك) دەکەنە سەردانی یەکەم.. بنۆڕە:

أ. الحوادث الجامعة، ص ١٩. دانەری ئەم کتێبە دەڵێت: " موزەففەرەددین گۆکبوری بەر لەوە، بۆ بەغدا نەچووە".

(٤) ئەم (محی الدين يوسف)ە، کوڕی مێژوو نووسی بەناوبانگ (ابو الفرج عبدالرحمن بن علي (ابن الجوزي) یە (ت ٥٩٧هـ). کە خاوەنی کتێبی (المنتظم في تأريخ الامم) و کتێبی دیکەی زۆریشی هەیە. (محي الدين يوسف) کەسێك بوو لە پیاوە گەورەو ناودارەکانی تەلاری خەلیفە و، پلەی کوێخایەتیی تەلاری لە ساڵی (٦٤٢ك)دا لە سەردەمی خەلیفە (المستعصم)دا هەبوو: مرآة الزمان ٨/ ٧٤٧.

حسن ابن الحاجب علي)ی لە ساڵی (٦٢٧ك/ ١٢٣٠ز)[1]دا نارد بۆ هەولێر کە خەلیفە بەنیازە میوانداریيەکی بکات لە بەغدا. سەرداری هەولێریش بەسوپاسەوە ڕەزامەندیی دەربڕی و، فەرمانی دا، گەورە پیاوانی تەلار بکەونە خۆ و ئامادەبن. کاروان، لەمانگی موحەڕەمی (٦٢٨ك/ تشرینی دووەمی ١٢٣٠ز)دا کەوتە ڕێ و (موزەففەرەددین گۆکبوری) کلیلی هەولێر و هەموو قەڵاکانیشی لەگەڵ خۆی برد کە پێشکەشی بکات بە خەلیفە[2]وەك ڕادەستدانێکی پێشەکیی ئەمارەتەکەی و، بەستنیشی - دوای مردنی خۆی - بە مەملەکەتی خەلیفەوە.

دەمێ (کاتێ) میوانەکان لە بەغدا نزیك بوونەوە، هێشتا قۆناغێکیان مابوو بگەنە شوورە[3] و دەرگای شار، ئا لەوێدا پێشوازییەکی گەورە و گەرمیان لێ کرا. (فخرالدین احمد بن مؤید القمي)ی جێگری وەزیری خەلیفە، سەرگەورەی پێشوازیکاران بوو، میر و قازی و مەلا و هەموو کارمەندانی گەورەی تەلاری (المستنصر) وەپێر میوانەکانەوە هاتبوون، پاشان هەموو پێکەوە چوونە ناو شاری بەغدا، کە گەیشتنە عەتەبەی دەرگای پاسەوان (باب النوبي)[4]، (موزەففەرەددین گۆکبوری) دابەزی و عەتەبەکەی ماچ کرد، ئەوجا هەموويان بەرەو خانووی خەلافەت کەوتنەڕێ[5].

خەلیفە فەرمانی دابوو، میوانەکەی ببرێتە تەلاری (التاج)[6]لەسەر ڕووباری

---

(١) الحوادث الجامعة ص ١٩.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/ ٦٨١. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨٣.

(٣) شوورەکەی باکووری قەڵاکەیە، دەوری بەغدای دابوو، تا دەگەیشتە سەر دیجلە و لە (الباب الشرقی)دا دەگوژایەوە (کۆتایی دەهات)؛ الحوادث الجامعة، ص ٢٠.

الهامش للمحقق الدكتور مصطفى جواد.

(٤) (باب النوبي)، بنۆڕە لاپەڕەکانی دوای لاپەڕەی ١٥٢، پەراوێزی (٣).

(٥) الحوادث الجامعة ص ٢٠.

(٦) ناودارترین تەلاری (دارالخلافە)یە لە بەغدای لای ڕۆژهەڵات. لەسەر کەناری دیجلە، لە سەردەمی (الرشید)دا، (جعفر بن يحيى ابن خالد ابن برمك) بنیادی ناوە: معجم البلدان، مادە تاج ٢/ ٣ ـ ٥.

دیجلە. هەرچی دەست و پێوەندەکانیشە بەسەر چەند ماڵێکدا دابەش کران (داکران)". پاش ئەوەی میوانان ماندوویان حەسایەوە، خەلیفە (موزەففەرەددین گۆگبوری)ی بۆ ئەنجومەن بانگ کرد، ئەمیش خۆی و میرەکانی چوون و خاکەکەیان ماچ کرد. سەرداری هەولێر، بە پەیژە وەسەر کورسییەك کەوت بەخۆی و جێگری وەزارەت و کوێخای تەلارەوە، پەردە لادرا و، میوان سڵاوی لە خەلیفە کرد و، ئایەتی "اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي"[١] ی بەگوێی خەلیفەی عەباسیدا هەڵ دا. خەلیفە، سڵاوی سەندەوە و، ئایەتی: "انك اليوم لدينا مكين امين"[٢]ی بەسەردا خوێندەوە. (موزەففەرەددین گۆگبوری)یش چەندین جاران خاکەکەی ماچ کرد[٣]. پاشان سوپاسی ئەو زیافەتەی خەلیفەی کرد.

ئیدی، دوای تەواو بوونی ئەم ڕێوڕەسمە، خەلیفە خەڵات و دیارییەکی زۆری پێشکەش بە سەرداری هەولێر کرد. دوو شمشێر و، ئەسپێکی زینزێڕ و بنزینێك (كنبوش)[٤] و بەرسنگێکی (مشدة)[٥] ئاوریشم و کیفێکی قایشی (سیر)ی بە دوو ئاڵاکەر[٦] زێڕ نەخشەوە[٧] تێدا بوون. پاشان (موزەففەرەددین گۆگبوری) لە دەرگای (القائمي)یەوە کە دەکەوێتە سەر ئاوە پاکەکە و دەرگای (التمر)ر[٨]یشی پێدەڵێن،

---

(١) القرآن الكريم، سورة المائدة، الآية (٣). واتا: (ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆتان تەواو کرد و، بەرەکەتی خۆشم بەسەرتانا گەیاندە جێ).

(٢) القرآن الكريم، سورة يوسف، الآية (٥٤). واتا: (تۆ، ئەمڕۆ لەلای ئێمە پشتئەستووری، دڵنیابە).

(٣) الذهبي، مخطوط، تأريخ الاسلام، ورقة: ١٧٦.

(٤) (كنبوش ـ البرذعة) واتا: (بن زین) یان (ئارەقگیر) پارچە لبادێکە لەبن زینەوە دەخرێتە سەر پشتی ئەسپ: أدي شير، الألفاظ الفارسية المعربة، ١٣٨.

(٥) مشدة: بەرسنگ ـ بەرسینە، وەك ملوانکە دەگرێتە ملی ئەسپ، کەمێك بەرسنگی دەگرێتەوە، بۆ جوانییە: الحوادث الجامعة ـ هامش ص ٢١.

(٦) (سنجق) = ئاڵا، القلقشندي، صبح الاعشى ٥/ ٤٥٨. ادي شير، ص ٩٥.

(٧) الحوادث الجامعة، ص ٢١. الذهبي، تأريخ الاسلام، ورقة ١٧٦.

(٨) باب التمر، او باب سوق التمر، دليل خارطة بغداد، ١٥٨.

لەوێوە چووە دەرەوە.

سەرداری هەولێر، لەو ماوەیەدا كە لەبەغدا بوو، زیارەتی جێگا ئاینییەكانی كرد و، ڕووی لە هەر جێگەیەك[1]كردبا زیافەت و ئاهەنگی گەورە بۆ خۆی و دەست و پێوەندەكانی دەگێڕدرا. پاشان میوانییەكی تری بۆ لای خەلیفە بۆ سازدراو كە گەیشتە دیوەخانی خەلیفە، خەلیفە پێیگوت (چیی پێ خۆش بووە و حەزی بە چییە)، (موزەففەرەددین گۆكبوری) ئەمجارەش عەردەكەی لستەوە و كەوتە دۆعا بۆكردنی و ئەم ئایەتەشی بۆ خوێندەوە: "يا ليت قومي يعلمون بما غفر لي ربي وجعلني من المكرمين"[2] پاشان، زیل و بەم (الكوسات)[3]ی بۆ لێدرا، ئنجا شەست هەزار دیناری پێدرا بۆ ئەركومەسرەفی ڕێگا و خەرجی دەست و پێوەندەكانیر[4].

پاش تەواو بوونی زیارەت ئنجا، چوو بۆ دایەرەی وەزارەت، پاشان بۆ گەڕانی ناو بەغدا و، سەری لەو چادرگایەش دا كە بۆ سەربازەكانی لە دەرەوەی شوورەی بازاڕی سوڵتان سازدرابوو[5].

ئەو سەردانە بیست ڕۆژی خایان[6]. بە حورمەت و ڕێزێكی زۆرەوە بە ڕێخراو گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی[7]و، هەردوو نوێنەرەكەی خەلیفە: (محي الدين يوسف ابن الجوزي) و (سعدالدين حسن بن الحاجب علي) بەگەڵی كەوتن و تا ماوەیەكیش لەلای

---

(١) الحوداث الجامعة، ص ٢٢.

(٢) القرآن الكريم، سورة يس، الآية (٢٧): واتا خۆزگە قەومەكەم دەیانزانی كە خوا بە چی لێم بووردووە و سەرمی بەرز كردووەتەوە.

(٣) بنۆڕە پەراوێزی ژمارە (٣)ی دوای لاپەڕەی (١١٥) لێكدانەوەی (الكوسات).

(٤) الحوادث الجامعة، ن. ص. الذهبي، مخطوط "تأريخ الاسلام"، ورقة ١٧٦.

(٥) باب سوق السلطان: (باب المعظم)ی ئێستا. ئەم بازاڕە لە (ساحة الميدان)ی ئێستاوە دەیگرتەوە تا (المدرسة المستنصرية). (سوق الثلاثاء) یان پێدەگوت: دليل خارطة بغداد، ص ١٦٠.

(٦) ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، ط/ لاهور، جـ ٥، ص ٥٩٠.

(٧) ابن كثير، البداية والنهاية، ١٣/ ١٢٩.

مانــەوە. پاشــان گەڕانــەوە بــۆ بەغــدا و بــە خەلیفــەیان گــوت: (موزەففــەرەددین گۆگبوری) سوێندی میران و گەورەپیاوانی خەڵکی وڵاتەکەی دا کە بۆ خەلیفە ملکەچ بن و، کە مردیش هەولێری ڕادەست بدەن[١]. سەربارێش خوتبەی کوڕانی (العـادل)ی ئـەیوبیی وەسـتاند و، دەسـدایی خۆیـشی لەگـەڵ (الملـك الکامـل محمـد)ی سـەرداری میسریش بـڕی و، خوتبـەی بـەناوی خەلیفـە کـرد و دەسدایی خۆیشی بـۆ خەلیفـە ڕاگەیاند[٢].

(ابـن کـثیر) لـە باسـی ئـەم میوانێتییـەدا دەڵێـت: شـەرەفێك بـوو بـۆ سـەرداری هـەولێر، هـەموو مەلیکـەکان خۆزگـەیان بـۆ دەخواسـت و، ئـەوانیش دەیانویـست زیارەتێکی وەك ئەوەی ئەو بکەن و بەو شەرەفە بگەن، بەڵام بەختیان نەیبڕی[٣].

بێگومان ئەو سەفەرەی بەغـدا، پێوەنـدیی نێـوان هـەولێر و بەغـدای لـە هـەموو وەختێك پتەوتر کرد. ئیدی سەرداری هـەولێر، وێـڕای ئـەوەش کـە پـیر ببـوو بـەڵام خەلیفە بەچاوی فەرمانداڕێکی لێوەشاوە و شایان لێی دەڕوانی و لـە هـەموو کەسـێك زێتر پشتی پێی قایم بوو، بەدۆستی ڕۆژی تەنگانەی دادەنـا. سەرچـاوەکانیش دەڵێن؛ لـەو هێرشەشـدا بەشـداریی کـرد کـە خەلیفـە بردییـە سـەر ئـەو مەگۆلانـەی وڵاتـی ئازەربێجانی نزیك بە ئەمارەتی هەولێر و مەملەکەتی خەلیفەیان وەژێـر پـێ نـابوو، ســەرباری ئــەوەش وڵاتــی شارەزووریــشیان - کــە (عمــاد الــدین زەنگــی)ی زاوای (موزەففــەرەددین گۆگبــوری) حــوکمی دەکــرد - تــەنگاو کردبــوو، (جــلال الــدین

---

(١) الحوادث الجامعة، ص ٢٣.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٦٨١.

(٣) ابن کثیر، البدایة والنهایة ١٣/ ١٣٩. ئەوەی جێگـەی ڕامـان و شـایانی پرسـیارە ئەوەیـە، کـە (ابـن الأثیر) باسـی ئـەم سـەفەرەی سـەرداری هـەولێر ناکـات، سـەیرەکەش لەوەدایـە، ئـەو سـەروەرە، مێژووەکەی دەنووسی کە تـا کۆتـایی سـاڵی (٦٢٩ك)یـش لەسـەر نووسـینی هـەر بـەردەوام بـوو، بـەڵکو تـا کۆتـایی مـانگی سەفەری ساڵی (٦٢٩ك)یـش (کـانونی یەکـەمی سـاڵی ١٢٣١ز) هـەر بـە نووسینەوە خەریك بوو: ... بنۆڕە: الکامل ١٣/ ٥٠٤.

منکبرتی)ی سوڵتانی خواریزمیش کە لە ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز)دا کوژرا ئیدی ئەو بەربەستەش لە ڕێگەی کشانی مەگۆلاندا نەمابوو، چونکە ئەو (جلال الدین)ە وەك دیوارێك ڕێگای لێ گرتبوو[1].

خەلیفە کەوتە خۆ و، سەرباز و لەشکری تەیار کرد، (جمال الدین قشتمر)ی سەرلەشکرەکەی خۆی، کرد بە فەرمانداریان[2]. ئەوجا کردیە سەر وڵاتان کۆمەکییان پێبکەن. لەو دەمەدا بوو، لەپڕ نوێنەری (موزەففەرەددین گۆگبوری) بە هەڵەداوان گەیشتە بەغدا و هانای بۆ خەلیفە برد کە مەگۆل گەیشتوونەتە وڵاتەکەی و گوندەکانیان تاڵان کردووە و خەڵکێکی زۆریشیان کوشتووە. بگرە لە کۆتایی ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣١ز)دا چوونە ناو شاری هەولێریشەوە - وەك ابن الأثیر دەڵێ - خراپەکاری و بێئابڕووییەکی ئەوتۆیان لە شارەکەدا کردووە، لەوە پێش نەکراوە و نەبیستراوە[3]. هەندەشیان لە خەڵکەکەی کوشتووە مەگەر هەر خوا بزانێ چەندن[4]. ئەوجا، ملیان نا لە (کرخینی)، واتا کەرکوك و، لەوێشەوە گەیشتنە داقوق و خەڵکێکی زۆریشیان لەو دوو شارەدا کوشت[5].

(جمال الدین قشتمر)ی فەرمانداری لەشکرەکانی خەلیفە، بەخۆی و سەرباز و میرەکانیترەوە بەرەوباکوور کەوتەڕێ تا لەگەڵ لەشکرەکەی (موزەففەرەددین گۆگبوری)دا یەك بگرنەوە و گرووپە مەگۆلەکانی ئەم ناوچەیە لەناو ببەن. هەردوو لاش، (لایەنی خەلیفە و لایەنی هەولێر) لەلای قەڵای کەرخینی (کەرکوك)

---

(١) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/٦٧٠. الذهبي، العبر، ١١٣/٥.
رشيدالدين فضل الله الهمداني، جامع التواريخ، مجلد/٢، جـ ١، ص ٢٩٩.
النجوم الزاهرة، ٢٧٧/٦. الغساني/العسجد المسبوك، ص ٣٢٠.
(٢) ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق لسنة ٤٩، ص ٧٣٧.
(٣) لكامل ١٢/ ٥٠١. مفرج الكروب ٤/ ٣٢٨.
(٤) المقريزي، جـ ١، ص ٢٤١.
(٥) الكامل، ص. ن. مفرج الكروب ٤/ ٣٢٨.

کۆبوونەوە و چادرگایان لێ هەڵدا، بەڵام هیچ ئاسەوارێکی مەگۆلیان نەدیت. بەهەر حاڵ، تا ماوەیەکی زۆریش، لەوێ چاوەڕوانیان کرد تا بێزاربوون. ئەم چاوەڕوانی و بێزارییەش بووە هۆی پێکدادانی هەردوو لەشکری خەلیفە و لەشکری سەرداری هەولێر و، هەندێ کوژراو و برینداریشی لێ کەوتەوە، ئەگەر پیاوەتی و ئاقڵی و هێوریی (جمال الدين قشتمر) نەبوایە ئەنجامێکی خراپتری لێ پەیدا دەبوو، ئەو نەیهێشت خوێنی زێتر بڕژێ. ئەوەبوو خۆی کرد بە دەوارەکەی (موزەففەرەددین گۆکبوری)دا، کەچی سەیری کرد، وا، خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکات، ئەوجا، هێوری کردەوە و هێنایەوە سەرخۆی و دەستی کرد بە گلەیی و سەرزەنشت، پاشان دڵی دایەوە و بەزمانی شیرین کەوتە ئامۆژگاری و ئاشتکردنەوەی. بەو جۆرە ئاگری شەڕەکەی کوژاندەوە و نەیهێشت بتەنێتەوە[1].

کاروان لە کەرخینیەوە بەرەو شارەزوور کەوتەڕێ و گەیشتە موغان[2]لە ڕۆژاوای شارەزوور کە مەترسیی مەگۆلی لەسەر بوو[3]چونکە مەگۆل گەیشتبوونە (سامیان)[4]کە گوندێکە لە گوندەکانی هەمەدان. لەشکری ئیسلام لە تینوێتیدا پەرێشان بوون، ئاویان پێ نەمابوو، هەندێکیش لە سەربازەکان لە بێ ئاویدا خنکان و مردن، سەرداری هەولێریش نەخۆشکەوت و لەپاکەوت و لەگەڵ کاروانیدا بڕی نەدەکرد، پیریش بوو، تەمەنی هەشتا ساڵ بوو. لەبەر ئەوە لە موغان لایان دا و وەستان. سەرداری هەولێر بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ هەولێر، داوای لە (جمال الدين قشتمر) کرد کە (شرف الدين علي) و میر (سعدالدين حسن ابن الحاجب علي)ی لەگەڵدا

(١) الحوادث الجامعة، ص ٢٨.

(٢) موغان، یان (موقان) وڵاتێکی ئاوەدان و شینایییە، گوندی زۆرە، لە ئازەربێجانە، تورکمان ئاژاڵی تێدا دەلەوەڕێنن.. معجم البلدان ٥/ ٢٢٥.

(٣) (ابن العبری) دەڵێت: مەگۆل شارەزووریان داگیر کرد. بنۆڕە: تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، ساڵی ٤٩، ص ٧٢٧.

(٤) (سامیان)، یان (سامین)، معجم البلدان ٣/ ١٧٨. گوندێکی هەمەدانە.

بنێرێ، تا، قەڵای (خفتیان) [1] یان ڕادەست بدات و، دوای مردنیشی، شاری هەولێر بگرنە دەست. (جمال الدین قشتمر) داواکەی بەجێ هێنا و قایل بوو بەو جۆرە (موزەففەرەددین گۆگبوری) لەگەڵ هەردوو نوێنەرەکەی خەلیفەدا گەیشتنە هەولێر.

(جمال الدین قشتمر)یش نەیویست لەوە زیاتر لەو ناوچە شاخاوییەدا چاوەڕوان بێت، لەبەر ئەوە، دووبارە، بەلەشکرەوە گەڕایەوە[2]بۆ کەرخینی. پێدەچێ ویستبێتی لە هەولێرەوە نزیک بێت و چاوەڕوانی مردنی (موزەففەرەددین گۆگبوری) بکات تا یەکسەر ئەمارەتەکەی بگرێتە دەست، بەڵام دوو نوێنەرەکەی خەلیفە کە لەگەڵ سەرداری هەولێر بوون، هەندەی نەبرد گەڕانەوە بۆ کەرخینی و، بە (جمال الدین قشتمر)یان گوت، (موزەففەرەددین گۆگبوری) تەندروستە و تا بڵێی باشە و هیچ نەخۆشییەکی نییە و، بەدرۆ خۆی نەخۆش خستبوو[3].

ئەگەر ئەو دوو نوێنەرەی خەلیفە ڕاستیان گوتبێ و درۆیان نەکردبێ، ئەوە، مانای وایە کە (موزەففەرەددین گۆگبوری) جامباز و درۆزن بووە و ویستوویەتی بە هەر بیانوویەك بێت، زوو بگەڕێتەوە بۆ هەولێر و لەمەیدانی شەڕ بەدوور بێت، وەلێ (کتێب وا نالێت) واتا ئەو زانیارییەی لەبارەی ئەو میرەوە فەراهەمە وەها نالێت. دوور نییە - وەکو باسیشمان کرد - پیری پێی کردبێ و بۆ هەولێر گەڕانەوەی بەچاکتر زانیبێ، یان دوای ئەم هەموو ماندووبوونە، کە گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر لەوێ حەواوەتەوە و، چاك بووەتەوە. ڕاستیشت دەوێ سەرداری هەولێر، بەڕاستی نەخۆش بوو، ئەوەبوو، بۆساڵی دووەم واتا لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز)دا کۆچی دوایی کرد.

لە لایەکی دیکەوە، دەتوانین بڵێین، دوو زەلامەکەی خەلیفە پەلەیان بوو، ئەوان بەنیاز بوون شارەکە بگرنە دەست و زوو وەریبگرن، بەڵام ئەو ئاواتەیان نەهاتە جێ، لەبەر ئەوە شارەکەیان بە شپرزەییەکی وەها جێ هێشت هەر دەتگوت دەرکراون،

---

(١) خفتیان، بنۆڕە لاپەڕەکانی دوای لاپەڕەی (٩٣)، پەراوێزی (٢).

(٢) الحوادث الجامعة، ٢٩.

(٣) م. ن. ص. ٣٠.

دیاره (موزەففەرەددین گۆکبوری) جوابی دابوون (سرحهما)[1] واتا بەڕێی خستبوون و لەکۆڵ خۆی کردبوونەوە، یانیش لە بەڵێنەکەی خۆی، بۆ خەلیفە لە ڕادەستدانی هەولێر پەشیمان بووەوە. هەرچی مەگۆلیشە، ئەوە، سەرچاوەکان تەکەزی لەسەر دەکەن کە لەم گەردش و لەشکرکێشییەدا هیچ شەڕێك لەنێوان ئەوان و هێزەکانی خەلیفەدا ڕووی نەدا. (جمال الدین قشتمر) خۆی و سەربازەکانی گەڕانەوە بۆ بەغدا[2] و، مەگۆلیش، لەکوێوە هاتبوون بۆ ئەوێ گەڕانەوە[3].

## ٤- پێوەندیی موزەففەرەددین گۆکبوری بە ( جلال الدین منکبرتی )ی دوا سوڵتانی خواریزمەوە:

پاش ئەوەی (موزەففەرەددین گۆکبوری)، پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ بەغدا پەیدا کرد و، بوو بە یەکێ لەو فەرمانداراانەی کە خەلیفە پشتی پێدەبەستێ، ئیدی فەرمانداریی لەشکرەکانی خەلیفەی دەکرد بۆ سەرکوتکردنی ناحەز و نەیاران، یان بۆ پاراستنی بەغدا لە مەترسی دەرەکی. (موزەففەرەددین گۆکبوری) - وەك پێشتر باسمان کرد - لەساڵی (٦١٢ك/ ١٢١٥ز)دا یاخیبوونەکەی (منكلي)ی سەرکوت کرد و، لەساڵی (٦١٧ك/ ١٢٢٠ز)یشدا، بۆ دەرکردنی مەگۆل لە ناوچەکە بەخۆی و لەشکرەوە گەیشتە داقوق.

دەوڵەتی خواریزمان[4]، کە لە هەرێمی خواریزم، لە (ماوراء النهر)[5] لەماوەی

---

(١) م. ن. ص.

(٢) م. ن. ص. ٣١.

(٣) الذهبي، العبر في خبر من عبر ٥/ ١١٣. دول الاسلام، جـ٢، ص ١٠٢. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣/ ١٣٢. الدياربكري، تأريخ الخميس في احوال أنفس نفيس ٢/ ٤١٤. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ٥/ ١٢٩.

(٤) بۆ زێده زانینی مێژووی ئەم دەوڵەتە بنۆڕە: نافع توفيق العبود، الدولة الخوارزمية، رسالة ماجستير مطبوعة بالرونيو لسنة ١٩٧١.

(٥) م. ن. ص، ١١ ـ ١٢.

نێوان (٤٩٠ - ٦٢٨ك/ ١٠٩٧ - ١٢٣٠ز)دا دامەزرا، هێزێك بوو لەو هێزانەی دوژمنایەتیی خەلیفەیان دەكرد چونكە دوای ساڵی (٥٩١ك/ ١١٩٥ز) ئیدی بەهۆی هەڵپە و پێ لێڕاكێشانی[1] خەلیفە (الناصرلدين الله)، پێوەندیی نێوان خەلافەتی عەبباسی و دەوڵەتی خواریزمان كەوتە لێژی و، سوڵتان (علاء الدين محمد)[2] ببوو بە دوژمنی كاڵە لەپێی ئەم خەلیفەیە و بۆ سەرنگونكردنی تێدەكۆشا[3]. ئەم خەلیفەیە، لەژێرەوە، پێوەندیی لەگەڵ مەگۆلاندا ساز دەدا[4]و، بەسەر ئەم سوڵتانەدا زاڵی دەكردن[5]. ئەم دوژمنایەتییە، لەدوای مردنی سوڵتان (علاء الدين محمد)یش و، تا ساڵی (٦١٧ك/ ١٢١٩ز)یش كە سوڵتان (جلال الدين منكبرتي)[6]ی كوڕی هاتە سەر تەخت هەر درێژەی كێشا. وەلێ سوڵتانی نوێ، هەندە نەحەوایەوە، هەر زوو، مەگۆل ڕاویاننا و بەرەو ڕۆژاوا هەڵات و، لەوێ لەتۆڵەی ئەو دوژمنایەتییەی كە خەلیفە دەرهەق بە باوكی كردبووی، كەوتە جموجووڵ لەدژی موڵكەكانی خەلیفە. هەرچی

---

(١) م. ن. ص، ١٢/ ١١١ و، ١٢/ ١١٧.

(٢) حكم علاء الدين محمد، الدولة الخوارزمية في الفترة بين ٥٩٦ ـ ٦١٧هـ/ ١١٩٩ ـ ١٢١٩ز.

(٣) نافع العبود، ص ٨٨ ـ ٩٠.

(٤) الكامل ١٢/ ٤٤٠. بنۆڕە: نافع العبود، لاپەڕەی (٩٥ ـ ١٠٥) كە گفتوگۆ لەسەر ڕاستی و ناڕاستیی ئەم تۆمەتە دەكات. هەروەها بنۆڕە: بدری محمد فهد، تأريخ العراق في العصر العباسي الاخير، رسالة دكتوراه من آداب الاسكندرية بمصر، ص ٦١ ـ ٦٣.

(٥) (خواند مير) دەڵێ: خەلیفە هەندێ لایەنی ئیسلامیی لەدژی دەوڵەتی خواریزمان گاڵ دەدا كە هێرش بكەنە سەریان، بەنموونە: دەوڵەتی (الغورية)ی بۆ ئەو مەبەستە هان دەدا كە شەڕ لەگەڵ خواریزماندا بكەن. بنۆڕە: كتێبەكەی (حبيب السير في اخبار افراد وبشر، جـ٢، ص ٦٤٥ ـ ٦٤٦. هەروەها (نافع العبود، ص ٩٢).

(٦) منكبرتي: ناوێتەیەكە لە دوو ناو: (منكو) واتا (ابدی) یان (إلهی)، (برتی): واتا (بەخشش)، لە (بیرماك)ی توركییەوە وەرگیراوە. ناوەكەش، ئەبێتە (عطاءالله) واتا: (خواداد) بە فارسی. بنۆڕە: الجويني، جهانكشای ٢/ ٢٨٩. یان (هبة السماء) بنۆڕە: پەراوێزی ڕەوشی سوڵتان جلال الدين منكبرتی (ص١٦)، دەشبینین (ياقوت الحموی) پیتی (ن) لەجیاتی (ت) دادەنێت و ناوەكە دەكات بە (منكبرنی)، بنۆڕە: معجم البلدان ١/ ١٢٩. ئەمەش بزانە كە (یاقوت) لە سەردەمی ئەو سوڵتانەدا ژیاوە.

خەلیفەیە، ئەوە، ئەویش خۆی بۆ لێدانی ئامادە دەکرد. بێگومان، شتێکی ئاساییە، هێرشێکی بەم جۆرەش بکرێتە سەر وڵاتی خەلیفە، ئەوە، سەرداری هەولێریش دەگرێتەوە چونکە سەرداری هەولێر دۆستایەتییەکی سخ و سفتی لەگەڵ خەلیفەدا هەبوو.

لەساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز)دا (جلال الدین منکبرتي) گەیشتە (تستر - توستر - شوشتر) [١] و بۆ ماوەی دوو مانگ گەمارۆی دا، بەڵام کۆیلەی خەلیفە، میر (مظفرالدین سنقر) ناسراو بە (شێوە شێر) بەری لە دوژمن گرت و شەڕێکی ئازایانەی لەگەڵدا کرد[٢]. بەڵام نەیتوانی، تا سەر، بەر لە سەربازانی ئەم سوڵتانە بگرێت چونکە ئەو سەربازانە هەر خەریکی تاڵان و چەپاوڵ بوون[٣]. هەروەها (جمال الدین قشتمر الناصري)ی سەرلەشکری خەلیفەش نەیتوانی هیچ بەرامبەر بەو سەربازانە بکات[٤].

وێڕای ئەو هەموو سەرکەوتنەی سوڵتانی خواریزمان بەسەر هێز و لایەنگرانی خەلیفەدا، وەلێ ویستی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە خەلیفە بگۆڕێت و لاپەڕەیەکی نوێی پێوەندیی دۆستانە لەگەڵ خەلیفەدا بکاتەوە، بەڵام بۆی نەچووە سەر، چونکە خەلیفە - ئەو دەمە - هێشتا لێی بەرق بوو، دڵی سارد نەدەبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا (جلال الدین منکبرتي) نەیدەویست پەلاماری بەغدا بدات، بایدایەوە و بەرەو باکوور کەوتە ڕێ[٥].

خەلیفە داوای لە (موزەففەرەددین گۆگبوری) کرد بکەوێتە خۆ و پەلاماری

---

(١) تستر: بە عەرەبی، (شوشتر)ە، گەورەترین شاری خۆزستانە/ معجم البلدان ٢/ ٢٩.

(٢) الکامل ١٢/ ٤٣٦. نصرت الله مشکوتی، "از سلاجقه تا صفویه"، ص ١٥٥.

(٣) الکامل م. ن. مشکوتی، از سلاجقه، ١٥٦. عباس اقبال، تأریخ اقبال، تأریخ مفصل ایران، ١/ ١١٥.

(٤) الجویني، جهانکشای ٢/ ١٥٥. عبدالحمید آیتي، تحریر تأریخ الوصاف ٢٣٨، الهمداني، جامع التواریخ ١/ ١٩٤.

(٥) الکامل ١٢/ ٤٢٧. مفرج الکروب ٤/ ١٤٤.

(جلال الدين منكبرتي) بدات، كاتێكیش (جلال الدين منكبرتي) بەم پیلانەی زانی، دەستوبرد بەخۆی و هێزەكانییەوە گەیشتە شاری داقوق و ڕێگای لە سەرداری هەولێر بڕی، بەڵام نەیتوانی بچێتە ناو شارەكەوە چونكە خەڵكی ناو شارەكە كەوتنە بەرەڤانیكردن و نەیانهێشت بچنە ناو شارەكەیانەوە. بەمەش سوڵتانی خواریزمان تووڕە بوو، فەرمانی دا گەمارۆی شارەكە بدەن، بەو جۆرە شەڕی شوورەی شار دەستی پێكرد و، بەرەڤانیكارانی شار سەركەوتنە سەر شوورەكان و دەستیانكرد بە شەڕی دژ بەهێرشهێنان و بە جنێودان، هەندێكیشیان ورەیان بەبەر جەنگاوەراندا دەكرد و غیرەتیان دەنانەبەر بۆ شەڕ و پاراستنی شارەكە، سوڵتان ئەمجارە بەتەواوەتی دای لە دڵی و لە ڕقان بەرچاوی تاریك بوو، كەوتە كوشتارێكی دڵڕەقانە و ورەپێبەردان و بە زۆرەملێ و بە كوتەك ناو شاری داگیر كرد[1].

مەبەستی خەلیفە ئەوەبوو ئەو دوژمنەی بە دوو هێزی گەورە گەمارۆ بدات، (موزەففەرەددین گۆكبوری) لە باكوورەوە و، (جمال الدين قشتمر)یش لە باشوورەوە كە هەردوولای لێ بگرن و ڕێگای دەربازبوونی لێ ببڕن[2]. (موزەففەرەددین گۆكبوری) بەنیاز بوو، لەپڕ پەلاماری سوڵتانی خواریزمیان بدات، بەڵام ئەو زووتر دەستی پێش خست، پێش ئەو كەوتە هێرش و، دەرفەتی لێ بڕی و لەشكرەكەی تێكشكاند و، لە مەیدانی شەڕەكەشدا سەربازەكانی گرتیان و بەدیلی بردیانە بەردەمی. بەڵام سوڵتان فەرمانی دا بەریدەن، سوڵتان ڕێزی لێ ناو داوایان لێ كرد بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەكەی خۆی، ئەوجا (موزەففەرەددین گۆكبوری)یش لە ڕەفتاری

---

(١) محمد بن احمد النسوي، سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، ص ١٩٣. الكامل ١٢/ ٤٢٧. الحموي، التأريخ المنصوري، ٣٠٦: دەشڵێت: (منكبرتی هەموو خەڵكی داقوقی كوشتن). سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/ ٦٣٤. مفرج الكروب ٤/ ١٤٥. أبو شامة، ذيل الروضتين ١٤٤. ابن العبري، الحموي، مخطوط (الروض المعطار في خبر الاقطار) المصور بالميكروفيلم ورقة ١٦١ب.

(٢) الجويني، جهانكشاى ١٢/ ١٥٣.

خۆی پەشیمان بووەوە[1]و، تەبایینامەیەكی لەگەڵیدا بەست و، بڕیاری دا لە قسەی سوڵتان دەرنەچێ و ئیتاعەتی بكات[2]، ئنجا گەڕایەوە بۆ هەولێر و، لە هەولێرەوە خەڵات و دیارییەكی[3]زۆری بۆ ئەم هاوپەیمانە نوێیەی نارد. پاشان سوڵتانی خواریزمان دوای ئەوەی خەڵكی ناوچەكانی سەرە ڕێگای هەموویان ملیان بۆ كەچ كرد ئنجا ڕووی لە چیاكان كرد و، بەرەو ئازەربێجان ملی ڕێگای گرت لە شینایی و لەوەڕگاكانی شارەزوور كە (عمادالدین زەنگی)ی زاوای (موزەففەرەددین گۆگبوری) حوكمی دەكرد، لای دا - وەكو پێشتریش باسمان كرد - (عماد الدین زەنگی) پێشتر، داوای تەخت و تەلاری موسڵی دەكرد و، خۆی بە گەورەی بنەماڵەی ئەتابەگایەتیی زەنگی دەزانی، ئەو بنەماڵەیەی كە (بدرالدین لؤلؤ) لە حوكمی خستبوو. (عمادالدین زەنگی) بە ئامانجی خۆی نەگەیشت و، ناچار بوو، لە ئەمارەتە تازەكەی، لە شارەزوور، كە (موزەففەرەددین گۆگبوری) بۆی دابڕیبوو، سەری كز بكا و بحەوێتەوە.

(عماد الدین زەنگی) لە ناچاری و لەبەر نالەباریی بارودۆخەكە خۆی كڕ كردبوو، لە داواكردنی موسڵ بێدەنگ ببوو، (موزەففەرەددین گۆگبوری)ی

---

(١) عبدالمحمد آیتي، تحریر تأریخ وصاف، ص ٣٣٨. رشید الدین فضل الله الهمداني، جامع التواریخ، ١/ ٣٩٤. نصرت الله مشكوتي (أز سلاجقة تا صفوية) ١٥٦.

(٢) نصرت الله مشكوتي، "أز سلاجقة تاصفوية"، ن. ص. السید الباز العریني، المغول، ١/ ١٦٨.

(٣) الحموي، التأریخ المنصوري، ص ٣٠٦. ابن العبري، تأریخ الدول السریاني، مجلة المشرق، ن. ص. عبدالحمید آیتي، تحریر تأریخ وصاف، ص ٣٣٨.... تەنیا (سبط ابن الجوزي) دەڵێت: سوڵتانی خواریزمان دوای داگیركردنی داقوق و فڕكردنی خەڵكەكەی، ئنجا بەرەو هەولێر كەوتەڕێ و، بەنیازبوو گەمارۆی بدات بەڵام (موزەقفەرقددین گۆگبوری) تەنگاوی كرد و نەیهێشت بەڵێنیشی پێ دا كە دۆستێتی، بنۆڕە: مرآة الزمان ٨/ ٦٦٩. بەڵام (الحمیدی) دەڵێت: گۆگبوری پارە و دیارییەكی زۆری نارد بۆ سوڵتان بۆ ئەوەی داقوق جێ بهێڵێت چونكە موڵكی خەلیفەیە و، بچێت بۆ ئازەربێجان ـ كە دوژمنەكەی لەوێیە ـ ئەویش بەقسەی كردووە، بنۆڕە: مخطوط (الروض المعطار في خبر الاقطار) ورقة ١٦١ ب.

خەزووریشی پشتی تێ کردبوو، بەڵام بۆ هەلێك دەگەڕا، پەلاماری موسڵ بدات و حوکمی (بدرالدين لؤلؤ)ی زۆردار سەروژێر بکات. خوا و ڕاستان، ئەو سوڵتانەش کە هاتە شارەزوور، بەهەڵی زانی و، بڕیاری دا ڕووی لێ بنێ و داوای کۆمەکی لێ بکات، کاتێ کە پێی گوت، سوڵتانی خواریزمان بەڵێنی خێری پێ دا[1]. نەخوازەلا داگیرکردنی موسڵیش، واتا (بدرالدين لؤلؤ) پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی و لەگەڵ (الملك الاشرف الايوبى)دا کە هەردووکیشیان دوژمنی سوڵتان (جلال الدين منكبرتى) هەبوو.

ئەم سوڵتانە هاوپەیمان بوو لەگەڵ (الملك عيسى)ی سەرداری دیمەشق. ئەو مەلیکەش هاوپەیمانی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بوو. سەرەتای سەروسەختی سوڵتانی خواریزمان لەگەڵ (الملك عيسى) لە ساڵی (٦١٩ك/ ١٢٢٢ز)ەوە دەستی پێکردبوو، واتا لەو کاتەوەی کە (الملك عيسى) بۆ هاوپەیمانێکی گەورە دەگەڕا بیکاتە پشت و پەنای خۆی لەدژی هەردوو براکەی خۆی (الملك الاشرف) و (الملك الكامل). بەڵام (الملك عيسى) نەیدەویست هاوپەیمانێتی لەگەڵ سوڵتان (جلال الدين منكبرتى)دا لەسەر حسابی خەلیفەدا ببەستێت هەر چەندە ئەم سوڵتانە خەلیفەی بە دەسکیسەی مەگۆلان تۆمەتبار کردبوو لەو نامەیەدا کە پێشتر بۆ سەرداری دیمەشقی ناردبوو[2].

پێوەندیی نێوان سەرداری دیمەشق و سوڵتان بەرە بەرە بەرەو چاکتر دەگۆڕا چونکە مەسڵەحەت و بەرژەوەندییان یەکی دەگرتەوە و ئاتاجی یەکتری بوون. نوێنەرانی سوڵتان (جلال الدين منكبرتى) لە تەلاری سەرداری دیمەشق پێشوازییەکی گەورە و گەرمیان لێ دەکرا[3]. پاشان خزمایەتی ژن و ژنخوازیشیان کەوتە نێوان و

---

(١) الحموي، التأريخ المنصوري، ص ٣٠٧.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/ ٦٣٤. أبو شامة، ذيل الروضتين، ص ١٤٤.

(٣) الحموي، التأريخ المنصوري، ص ٣١٤ ـ ٣١٥.

سوڵتان (جلال الدين منكبرتى) كیژی هاوپەیمانەكەی مارە كرد[١].

هەرچی پێوەندیی (موزەففەرەددین گۆكبوری)یە لەگەڵ سوڵتانی خواریزمان، ئەوە، تەنیا بەو نیازە بوو كە حاكمی موسڵی بۆ لەناو ببات. ئەم نیازە ببوو بە پێودانگی پێوەندییەكانی دەرەوەی لەگەڵ هەموو هێز و لایەنێكدا. ئەو بەو چاوە سەیری ئەم سوڵتانەی دەكرد كە هێزێكی تازەی بنبڕكردنی كێشەكەیە و، جێگای ئومێدە پشتی پێ ببەستێ و، ئەو و، بەخۆی و، بەسەرداری دیمەشق، بەرەیەكی بەهێز لە دژی (بدرالدين لؤلؤ) و (الملك الاشرف)ی هاوپەیمانی سازبدەن.

دووریش نییە (موزەففەرەددین گۆكبوری)، پێشتر، ئەم نیازەی هەر لەدڵدا بووبێ كاتێ كە بە فەرمانی خەلیفە، چوو بۆ شەڕی ئەم سوڵتانە، واتا، بە بەردێك دوو نیشانی شكاندبوو، یەكەم خەلیفەی ڕازی كرد كە بۆ شەڕی سوڵتان چووەتە داقوق، دووەمیش نیازی ئەوەبوو كە لەگەڵ سوڵتاندا دۆستایەتی پەیدا بكات، چونكە (موزەففەرەددین گۆكبوری) دەیزانی كە هەرچەندە لەگەڵ خەلیفەدا دۆستە، بەڵام خەلیفە لەبەر خاتری ئەو ناچێ (بدرالدين لؤلؤ) لەدەست خۆی بدات، كاریش بەم جۆرە بڕوات، (موزەففەرەددین گۆكبوری) ناتوانێت بەرامبەر بە دوژمنەكەی هیچ شتێك بكات. لەبەر ئەوە، نەدەبوو ئەو هەلە لەدەست خۆی بدات و، بەختی خۆی لەگەڵ ئەم سوڵتانەدا تاقی نەكاتەوە.

پێدەچێ ئەم یەكگرتنەوەیەی سیاسەتی (گۆكبوری و منكبرتی)یە وەهای لە (بدرالدين لؤلؤ) كردبێ كە سەرداری هەولێر بە پاشپیلانی خواریزمیان تۆمەتبار بكات و بۆ خەلیفە بنووسێت كە گوایا، ئەو سوڵتانی خواریزمانی هێناوە و ویستوویەتی بەسەر خەلیفەدا زاڵی بكات[٢].

هەرچەندیشە ئەو تۆمەتە درۆ و بێ بنەما بوو، چونكە تەنیا بۆ پڕوپاگەندە (بدرالدين لؤلؤ) لەسەری ڕاهاتبوو تا دوژمنی خۆی لەڕووی سیاسییەوە پێ لاواز

(١) مرآة الزمان، ٨/ ٦٦٩. اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ١/ ١٤٠. ابن واصل، مفرج الكروب، ٤/ ١٧٩.

(٢) ابن الأثير، رسائل ابن الأثير، ص ٧١.

بکات، بەڵام وەهای لە خەلیفەش کردبوو کە بەچاوێکی دی سەیری هەڵسوکەوتی (موزەففەرەددین گۆکبوری) بکات، تا، کار گەیشتە ئەوەی لە ساڵی (٦٢٤ك/ ١٢٢٧ز)دا خەلیفە (المستنصر بالله) نامەیەکی دڵنیایی بۆ (بدرالدین لؤلؤ) بنێرێ و دڵی بداتەوە و ورەی بە بەردا بکات و بەڵێنی ئەوەشی بداتێ کە بێ خەم بێت و هیچ مەترسییەکی لە سەرداری هەولێریش نەبێت[1].

ڕاستیشت دەوێ، (موزەففەرەددین گۆکبوری) کە لە شەڕەکەی داقوقدا بەرامبەر بەم سوڵتانە تێکشکا و، پاشان دۆستایەتیی لەگەڵیدا سازدا، هیچ خراپەیەکی بەرامبەر بە خەلیفە نەکرد. مەبەستی ئەو تەنیا ئەوەبوو هەموو لایەنێك تێبگەیەنێت کە لەدووی مەسڵەحەت و بەرژەوەندی ئەمارەتەکەی خۆی دەگەڕێت و، هەر لایەنێکیش بیەوێ پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵدا ببەستێ، دەبێ پێش هەموو شتێك ئەمە بزانێت کە ئەو دوژمنی (بدرالدین لؤلؤ)ە.

سا، بەهەر حاڵ، لایەنە ئیسلامەکان، لەم ناوچەیەدا ببوون بە دوو بەرەی دوژمن: بەرەی یەکەم خەلیفەی عەبباسی و (بدرالدین لؤلؤ) و (الملك الاشرف) و (الملك المظفر شهاب الدین غازي)ی سەرداری میافارقین بوو، بەرەی دووەمیش بریتی بوو لە سوڵتانی خواریزمان و (الملك عیسی)ی سەرداری دیمەشق و، (موزەففەرەددین گۆکبوری) و (عماد الدین زەنگی)ی سەرداری شارەزوور و، پاشانیش هەریەکە لە (الملك المسعود رکن الدین مودود کوڕی الملك الصالح ناصرالدین محمود کوڕی نورالدین محمد الأرتقي)ی[2] سەرداری ئامەد و (ناصرالدین أرتق)ی سەرداری ماردینیش[3] هاتنە

---

(١) الحموي، التأریخ المنصوري، ص ٢٢٤ ـ ٢٢٥.

(٢) (الملك الصالح ناصرالدین محمود ابن نورالدین محمد الارتقي)ی باوکیشی لەگەڵ سەرداری هەولێر چەندین جار پەیمانیان بەستووە. لەساڵی (٦١٩ك)دا مردووە: الکامل ١٢/ ٤١٣. (الملك المسعود) تا ساڵی (٦٢٩ك) حوکمی ئامەدی کردووە، پاش خۆی حوکم کەوتە دەست (الملك الکامل)، وفیات الاعیان، ٤/ ١٧٣، ط ١٩٤٨.

(٣) الکامل ١٢/ ٤٥٣. مفرج الکروب ٤/ ١٧٦. الغساني، العسجد المسبوك ٢٨٨.
Setton, V, II, P. ٦٧٣.

ڕیزی ئەم بەرەیەوە.

ڕاستیــشت دەویٚ دابەشــکردنی هێــز و لایەنــەکان بــەم دوو بەرەیــە، بــوو بــە ئەڵقەیەکی نوێی ململانیٚ و دوژمنایەتی لەنێوان ئیسلامەکاندا. ئەم دووبەرەکییەش لەکاتێکدا ڕووی دا کە ناوچەکە کەوتبووە بەر هێرشی خاچدروشمان لە لایەکەوە و، بەر هێرشی مەگۆلان لە لایەکی ترەوە، کە وەك ئاگریٚ لە پووشی بەردەی ئا وەها تەنیبوونەوە. لەهەمووشی سەیرتر ئەوەبوو کە هەندیٚ لەم لایەن و هێزانە، لە ڕقی هێزەکانی دی دەستیان کرد بە یاریدەدانی دوژمن. ئەوەبوو (الملك الکامل محمد) لە دژی براکەی خۆی کە سەرداری دیمەشق بوو، هەروەها لەدژی سەرداری هەولێر کە هاوپەیمانی خۆی بوو هەروەهاش لەدژی سوڵتانی خواریزمان، کەوتە کۆمەك و یاریدەدانی خاچدروشمان[1].

پێشتر، باسی چالاکی و جموجووڵی سەربازیی[2]ئەم لایەنە هاوپەیمانانەمان کرد، کە لەساڵی (٦٢٣ك/ ١٢٢٦ز)دا لەم لاو لەو لاوە هێرشیان دەکردە سەر وڵاتی دوژمنان، ئەوەبوو (موزەففەرەددین گۆگبوری) هێرشی کردە سەر موسڵ[3]، (الملك عیسی) هێرشی کردە سەر (حمص و حماە) [4]و (جلال الدین منکبرتی)یش هێرشی کردە سەر (خلاط) و تاڵانیشی کرد، بەڵام - هەر هەموویان - نەیانتوانی بگەنە ئامانجی خۆیان. (بدرالدین لؤلؤ) هانای بردە بەر (الملك الاشرف) و داوای لیٚ کرد کە خودی خۆی بچێت بۆلای سەرداری هەولێرو لە موسڵی دووربخاتەوە، ئەوەبوو (الملك الاشرف) لە (الرقە)وە، چووە سەر (حران) و بۆ (دنیسر) [5]، پاشان گەیشتە ماردین و وێرانی کرد، ئنجا (الملك عیسی)ی برای نامەی بۆ نووسی و داوای لێکرد کە ماردین

---

(١) مفرج الکروب ٤/ ٢٣٣ ـ ٢٣٤. ابوالفداء ٣/ ١٣٨. المقریزي ١/ ٢٢٢.

(٢) بنۆڕە، ص ١٤٥ ـ ١٥٠.

(٣) الکامل ١٢/ ٤٥٣ ـ ٤٥٤. ابن کثیر، البدایة والنهایة ١٣/ ١١٢. الغساني، العسجد المسبوك ٢٨٨.

(٤) الکامل ١٢/ ٤٥٤. ابن العدیم، زبدة الحلب ٣/ ١٩٧. مفرج الکروب ٤/ ١٧٦.
Setton, V, II, P ٧٠٠.

(٥) دنیسر: بنۆڕە لاپەڕەکانی دوای ١٤٩، پەراوێز (٢)

بـەجێ بهێڵێـت، تـا ئـەویش (حمـص و حمـاه) بـەجێ بهێڵـێ و (موزەففـەرەددین گۆگبوری)یش، موسڵ بەجێ بهێڵێت، ئەوجا، هەریەکەیان گەڕایەوە بۆ وڵاتـی خـۆی، دوای ئەوەی کە (موزەففەرەددین گۆگبـوری) هەنـدێ زەرەر و زیـانی لـە موسـڵ دا و، شاری ماردین و هەندێ شارۆچکەشی وێران کران.

ئەم هاوپەیمانییە زۆر درێژەی نەکێشا، لەبـەر جیاوازیی ئامـانج و مەسـڵەحەتی لایەنـەکانی، هـەر زوو پـای خـست و تـا سـەر بـڕی نـەکرد، لـەدوا دوای سـاڵی (٦٢٤ك/ ١٢٢٧ز)دا (الملـك عیـسی)یـشی بەسـەردا مـرد و داوودی کـوڕی جێگـای گرتـەوە. ئـەم کـوڕەش کـە بـە (الملـك الناصـر) نـاو دەبـرا، تەمـەنی لـە بیـست سـاڵ زیـاتر نـەبوو، نەشیدەتوانی، بە تەنیا مەملەکەتی دیمەشق هەڵسوورێنێ، لەبـەر ئـەوە هانـای بـردە لای (الملك الاشرف)ی مامی، مامیشی هەستا دیمەشقی خستە سەر وڵاتەکـەی خـۆی[1]. بەو جۆرە (موزەففەرەددین گۆگبـوری) ئـەو هاوپەیمانـە بـەهێزەی پـشتی پێـی قـایم بوو لەدەستی دا.

هەرچی (جلال الدین منکبرتی)یـشە، خـۆ، ئـەوە بەتـەنگ ئاسایش و ئاسوودەیی هـەولێرەوە، هـەر، نـەبوو، ئـەو بـەرەو بـاکوور ملـی نـا و، زۆرتـر بەتـەمای وڵاتـی گورج[2] و ئەرمەنستان بوو، سەرباری ئەوەش بەردەوام لەگەڵ مەگۆلاندا هەر لەشەڕدا بـوو تـا لەسـاڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣١ز)دا، بـە دەسـتی کوردێـك لـە گونـدێکی میافـارقین، لـە چیاکانی ئامەد[3] کوژرا.

---

(١) لكامل ١٢/ ٤٨٠. ابن خلكان ٤/ ١٧٣. ط ١٩٤٨. مفرج الكروب ٤/ ٢٨٨. المقريزي ١/ ٢٣٦.

(٢) گورج: یان جۆرجیا. پایتەختەکەی شاری تفلیسە، کەوتۆتە ئەوبەری چیای قۆقاز.

(٣) النسوي: سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، ص ٣٨١.

الذهبي، العبر، ٥/ ١١٤. (دول الاسلام) ١/ ١٠٢.

الـديار بكـري، تـأريخ الخمـيس في احـوال انفـس نفـيس، ٢/ ٤١٤، هـەواڵی کـوژرانی ئـەم سـوڵتانە نەگەیـشتە (ابـن الأثـیر) هەرچەندیـشە لـەدوی ئـەم هەواڵـە دەگـەڕا و، لـە نووسـینی مێـژوویش دەسـتی هـەڵگرتبوو. لـە (الکامـل ١٢/ ٥٠٤)دا دەڵێـت: تـا دوای سـاڵی (٦٢٨ك)یـش هـەواڵی (جـلال الـدین منکبرتـی) سـاغ نـەبووەوە و، تـا مـانگی سـەفەری سـاڵی (٦٢٩ك)یـش بەسەرچـوو، هـیچ سۆراخێکمان نەبیست.

**٥- پێوەندیی (موزەففەرەددین کۆکبوری) لەگەڵ میرانی دەوروبەردا:**

**أ – پێوەندیی لەگەڵ (علاوالدین قراسنقر)ی سەرداری مەراغە و غەزوکردنی ولاتی ئازەربێجان (٦٠٢ك/ ١٢٠٥ز):**

(موزەففەرەددین کۆکبوری) ویستی وەك میرەکانی دی ڕەفتار بکات و هەوڵی زێدەڕۆیی بدات و ولاتەکەی گەورەتر و فراوانتر بکات و، هەر هەلێکی بۆ ڕەخسا، بەشێك لە دەوروبەری خۆی، بۆ خۆی، دابڕێت.

لەساڵی (٦٠٢ك/ ١٢٠٥ز)دا (علاءالدین قراسنقر)ی سەرداری مەراغە کە لە ساڵی (٦٠٤ك/ ١٢٠٧ز) مردووە، داوای لێ کرد کە بەهەردووکیان ولاتی ئازەربێجانی دراوسێی ئەمارەتی هەولێر داگیر بکەن (غەزوی بکەن) بە بیانووی ئەوەی کە (أبو بکر ابن البهلوان)ی سەرداری ئازەربێجان کابرایەکی بێ ڕەوشتە و ئارەقخۆرە و، کاروباری ولاتەکەی پشتگوێ خستووە و داگیرکردنی ولاتەکەشی ئاسان بووە و، پێی گوت: ئەوەتا میرگەلی ولاتانی دراوسێی مرخیان لێ خۆش کردووە (تەماعیان لێ کردووە)و، بگرە، کۆیلەکانی خۆیشی ددانیان لێ تیژ کردووە، بەنموونە، ئەوەتا (شمس الدین آیتغمش) [١]ی کۆیلەی خۆی لێی یاخی بووە و چیاکان و شارەکانی هەمەدان و ئەسفەهان و (ڕەی)ی لێ داگیر کردووە[٢].

ئەم (علاءالدین قراسنقر)ەش، لەگەڵ (ابن البهلوان)ی سەرداری ئازەربێجاندا لەسەر (قەڵایەك) [٣]ململانێ کەوتبووە نێوانیان، لەبەر ئەوە ئازەربێجانی داگیر کرد. جگە لەوەش (ابن البهلوان) شەڕی لەگەڵ ئەو گورجانەدا نەکرد کە پەلاماری ولاتی ئیسلامنشینیان دابوو تا گەیشتبوونە (خلاط) و گەلێ موسوڵمانیان لەوێ کوشتبوو، ئافرەتیان بردبوو، کاولکارییەکی زۆریشیان کردبوو. سەربازەکان و خەڵکی ولاتەکە دژ بە (ابن البهلوان) شەڕی چاکیان کرد، کەچی ئەم کابرایە گوێی پێ نەدا و شەڕی

---

(١) آیتغمش: هاتووە، لەهەندێ سەرچاوەدا. بنۆڕە: (الراوندي)، راحة الصدور، لاپەڕەی ٥٤٨. ئەم ناوە تورکییە، مانای (بەچکەی مانگ) بە (ئای دۆغمش) دەردەبڕدرێت.

(٢) الکامل ١٢/ ٢٣٧.

(٣) م. ن. ص.

لەگەڵیان نەكرد، بەڵكو خۆیشی كرد بەخزمیان و كچی مەلیكەكەیانیشی بۆ خۆی مارە كرد[١].

هەڵكەوتنی ئەم هەلومەرجەش كارێكی وەهای كرد، كە (علاءالدین قراسنقر) داوا لە (موزەففەرەددین گۆكبوری) بكات كە پێكەوە شەڕ لە دژی سەرداری ئازەربێجان بەرپا بكەن و ولاتەكەی داگیر بكەن و، پێشی گوت كە ئیشەكە ئیشێكی ئاسانە و، سەركەوتنیشیان زامنە.

(موزەففەرەددین گۆكبوری) ئەم تەگبیرەی پێ خۆش هات و، بەلەشكرەوە گەیشتە مەراغە و لەگەڵ سەرداری مەراغەدا یەكیان گرت و، هەردووكیان ملیان نا لە تەورێز. (ابن البهلوان) لە نیازیان تێگەیشت و، بۆ كوشتاریان كەوتەخۆو، بەلام دەیزانی كە هێزی تەواوی نییە و، هەندێ لە میرەكانیشی لەگەڵیدا نەماون و، هیچی بۆ ناكرێت، وەك (ابن الأثیر)یش دەگێڕێتەوە، دەڵێت هەندێ لە میرەكانی (ابن البهلوان) خۆیان گەیاندە لای (علاءالدین قراسنقر) و ڕایانگەیاند كە ئامادەن بكەونە ریزی ئەو و، لە (ابن البهلوان) جیا ببنەوە ئەگەر ئەو بگاتە لایان[٢].

(ابن البهلوان) ناچار بوو نامە بنێرێ بۆ (شمس الدین آیدغمش)ی كۆنە كۆیلەكەی خۆی و هانای بۆ بەرێت. ئەویش لە مەترسیی دەستدرێژیی ئەو دوو هاوپەیمانە تێگەیشت و، هێزێكی وای نارد بۆ لای (ابن البهلوان) كە بتوانێت شەڕفرۆشان بداتە دواوە[٣]. وەلێ (دغمش) نامەیەكیشی نارد بۆ (موزەففەرەددین گۆكبوری) كە واز لەو نیازەی بێنێ و بگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی و، بەمەش داگیركردنی ئازەربێجان دەوەستێ و سەرناگرێت. ئەم نامەیەی بە شاندێكدا نارد، گەلێ قسەی ڕەق و هەڕەشەشی تێدابوو، نووسیبووی: ئێمە وەهامان بیستووە كە تۆ خاوەن خێر و خاوەن زانستت خۆش دەوێت و وامان دەزانی كە خۆیشت خاوەن خێر و بەدینی، بەلام وەها دەرنەچوویت، ئەوەتا ولاتی ئیسلام داگیر دەكەیت و تالانیان

(١) م. ن. ص. ١٣/ ٢٤٢. ابن كثیر، البدایة والنهایة، ١٣/ ٤٢.

(٢) الكامل ١٢/ ٢٣٧.

(٣) م. ن. ص. ابن الساعي، الجامع المختصر ٩/ ١٧٥.

دەکەیت و فیتنە و ئاژاوە دەنێیتەوە. ئەگەر وابیت بێ ئەفلیت، تۆ خاوەنی گوندێکیت[1]. بەلام ئێمە لە خوراسانەوە بیگرە تا (خلاط) و تا بەخودی هەولێریش دەگات، هی ئێمەیە، وابزانم لە مەبەستم تێگەیشتی. بۆ، تۆ نازانیت کۆیلە (مەمالیك)ی زۆرە؟ من یەکێکم لەو کۆیلانەی، ئەگەر لە هەر گوندێکەوە یەك نۆکەری ئازا[2] وەربگرێت یان لە هەر شارێکەوە دە زەلام کۆبکاتەوە، ئەوا، چەندین جار لە لەشکرەکەی تۆ زۆرتر دەبێت. وا باشترە بگەڕێیتەوە بۆ ولاتی خۆت، بۆیەکیشە ئەمەت پێدەڵێم تا سەرت سەلامەت بێت[3].

سەرداری هەولێر گوێی بەم هاشە و هەڕەشانە نەدا و، لەسەر پشتیوانیی (علاءالدین قراسنقر)ی هاوپەیمانی پێی داگرت (سووربوو). ئەوجا، (آیدغمش)یش بڕیاری دا دەست بخاتە ڕێگەی و، بەزۆر هێزی داگیرکاریی لەمێشك دەربکات و لەشکرێکی گەورەی نارده سەری، لە کێشی (موزەففەرەددین)دا نەبوو، نەیتوانی خۆی لەبەریدا ڕابگرێت، ناچار، هەلات و کەسیش بڕوای نەکرد ڕزگاری بووبێ[4]. هەر دەستوبرد بڕیاری دا خاکی ئازەربێجان بەجێ بێلێ و بگەڕێتەوە هەولێر. (علاءالدین قراسنقر) هەوڵی دا قەناعەتی پێ بکات و بمێنێتەوە و دنەی دەدا و وەی بەبەردا دەکرد و تەماعی ئەوەشی نایە پێش بیکات بە سەرلەشکر و، ترسیشی لەدڵ دەرکرد و پێی گوت: "میرەکانی ابن البهلوان بەڵێنیان داوە، وازی لێ بهێنن و، بێنە ڕیزی ئەمان". بەلام بێ هوودە بوو، چونکە (موزەففەرەددین گۆکبوری) مکوڕ بوو لەسەر گەڕانەوەی بۆ هەولێر، ئەوەبوو ڕچە و ڕێگای سەختی کەژ و کێو و

---

(١) مەبەستی لە گوند، ئەمارەتی هەولێرە. دەیەوێ لە بایەخی هێزەکانی موزەففەرەددین گۆکبوری داشکێنێ و گاڵتە بە توانستی بکات.

(٢) نۆکەری ئازا (شحنە): ئەو پیاوانەن کە توانستی زەبتی ولاتیان هەیە و خزمەتکاری سوڵتانن: ابن منظور، لسان العرب ١٣/ ٢٣٧. الفیروز ئابادی، تاج العروس ٩/ ٢٥١. بەمانای سەرۆکی پۆلیسیش هاتووە، (صاحب السحنة)شی پێدەڵێن، بنۆڕە پەراوێزی کتێبی (السلوك) جـ ١، ق١، ص ٣٥

(٣) الكامل ١٢/ ٢٣٧.

(٤) م. ن. ص. هەروەها: ابن الساعي، الجامع المختصر ٩/ ١٧٥.

گەلی و دەربەندی نالەباری لەترسی هێرشی (آیدغمش) گرتەبەر و بەرەو هەولێر كەوتەڕێ[١].

بەم جۆرە، ئەم كۆششی زێدەڕۆییەی سەرداری هەولێر بەشداریی تێدا كرد شكستی هێنا و نەچووە سەر. ئەو دەیویست بەختی خۆی تاقی بكاتەوە و بەشێك لە ئازەربێجانی دراوسێی دابڕێ و بیخاتە سەر ئەمارەتەكەی خۆی، بەڵام بۆی نەلوا و ئەم توانستەی بۆ نەڕەخسا. لەبەر ئەوە، بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە بۆ هەولێر. ناشزانین پێوەندیی سەرداری هەولێر لەگەڵ سەرداری مەراغە - كە دەستی كرا بەزاخا - گەیشت بە چی؟ بەتەنیا مانەوەی سەرداری مەراغە، لەو بارە نالەبارەدا بووە مایەی ئەوەی كە چەند بەشێك لە ئەمارەتەكەی لەدەست بچێت. هەر، كە سەرداری هەولێر گۆڕەپانی كوشتاری بەجێ هێشت، (ابوبكر ابن البهلوان) و (آیدغمش) هەلی تەنیایی و بێ پشتیوانیی (علاءالدین قراسنقر)یان بۆ ڕەخسا و بەسەریەوە نەچوون، راست ملیان نا لە مەراغە و گەمارۆیان دا و ناچاریان كرد ئەو قەڵایەی كە ناكۆكییەكەی لەسەر بوو بدات بە (ابوبكر ابن البهلوان)[٢].

## ب- پێوەندیی موزەففەرەددین كۆكبوری لەگەڵ ئەمارەتی قەفجاقیان (القفجاقیە):

ئەمارەتی ئەتابەگایەتیی هەولێر لەسەر ئەمارەتی هەزەبانی و ئەمارەتی قەفجاقی (قەپجاقی) كە دراوسێی هەولێر بوون دامەزرا[٣]. ئەمارەتی قەفجاقیان شارەزوور و كەرخینی (كەركوك)ی دەگرتەوە، كە ئەتابەگ (عمادالدین زەنگی) پێشتر داگیری كرد. راستت دەوێ، ئێمە لەبارەی پەیدابوونی ئەم ئەمارەتەوە هیچ نازانین، نە لەبارەی مێژووی سیاسی، نەلەبارەی جموجووڵی سەربازییەوە، هەروەها ناشزانین پێوەندیی بەكام لایەنانەوە هەبووە. تەنیا هەندەی لێ دەزانین كە بەر لە

---

(١) الكامل. ص. ن.

(٢) ن. م. ص. ابن خلدون، تأریخ العبر ٥/ ١٨٤.

(٣) مفرج الكروب ٢/ ١٦٤. الروضتین ٢/ ٦٠.

ساڵی (٥٢٦ك/ ١١٣١ز) هەبووە و، سوڵتانی سەلجووقی داگیری کردووە[١].

کاتێکیش ئەتابەگ (عمادالدین زەنگی) لەساڵی (٥٣٤ك/ ١١٣٤ز)دا ئەم ئەمارەتەی داگیر کرد، ئەوکات (قەفجاق[٢] کوڕی أرسلان تاش)ی تورکمان حوکمی دەکرد کە دوور و نزیکی تورکمان لەژێر دەسەڵاتی ئەودابوون و لە هەموو کەل و قوژبنێکەوە دەهاتن بۆ لای، لەبەر ئەوە ناوبانگی دایەوە و خەڵکی لە دەوری خڕ بوونەوە[٣]. ئەتابەگ زەنگییش ئەم ئەمارەتەی بۆیە داگیر کرد، تا لەو گەورەتر نەبێ و نەبێتە مایەی فیتنە و، مەترسی لەسەر سەلامەتیی ئەمارەتی نوێی موسڵ پەیدا نەکات، لەبەر ئەوە، وای بەچاك زانی هەتا زووە داگیری بکات باشترە تا کار لەکار نەترازاوە. سەردارەکانی سەر بە ئەتابەگ زەنگی دەیانزانی کە ئەم ئەمارەتە بەهێزە، لەبەر ئەوە ئەتابەگیان بە ئاگا هێنایەوە کە خۆی لە قەرەی نەدات و وازی لێ بێنێت، چونکە خەڵکێکی زۆر بەرەڤانیی لێ دەکەن، نەخاسمە ئەگەر میر قەفجاق زۆری بۆ هات (تەنگاو بوو)، ئەوا هانا دەباتە بەر سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی و گەر پێویست بکات ئەمارەتەکەشی دەداتێ. مانای وایە کە ئەمارەتی موسڵ دەبێتە دراوسێی موڵکەکانی ئەم سوڵتانە، ئەمەش مەترسیی زۆرە و نابێ بکرێت[٤]. بەڵام ئەتابەگ زەنگی لەسەر ڕای خۆی هەر سوور بوو کە قەڵاکانی ئەمارەتەکە داگیر بکات، لەبەر ئەوە لێی نەوەستا و لەشکری کردە سەر شارەزوور.

باسوخواسی جموجووڵی زەنگی گەیشتە میر قەفجاق کوڕی أرسلان تاش، کابراش کەوتە خۆ و لەشکرێکی زۆری خڕ کردەوە و ئەوەی چەکی پێ هەڵگیرابا، چەکداری دەکرد. هەندەی زەلام لەخۆ خڕ کردەوە، - ابن الأثیر گوتەنی - ئاسمانی پێ داپۆشین[٥]. لەشکری موسڵ گەیشتە سەریان و شەڕێکی گەرم ڕووی دا، هەندەی

(١) التأریخ الباهر، ٤٣.

(٢) ئەمارەتەکە بەناوی ئەم میرەوە ناونرا، خۆی ئەمارەتەکەی دامەزراند. هەروەهاش، ئەمارەتی (الظاهریة) و (السلجوقیة).. هتد بەناوی دامەزرێنەرەکانیانەوە ناونراون.

(٣) الباهر: ٥٧. الکامل ١١/ ٥٧.

(٤) الباهر، ص. ن.

(٥) الباهر، ٥٨.

نـەبرد ئەتابـەگ ڕاویـانی نـا و چـنگ لەسـەر شـان رایـان کـرد و، بـرا سـەر بـرا نەدەپەرژا و، باوك فرزەنـدی خـۆی نەدەناسـی. لەشکری موسڵ هـەتا شـارەزووریش نەوەسـتا و، شـارەزووری خـستە سـەر ئـەمارەتی موسـڵ[1]. پاشـان ئەتابـەگ بـۆ (زیـن الدین علی کچك)ی سەرلەشکری خۆی، هـەم دامەزرێنـەری ئەتابەگایـەتیی هـەولێری دابڕی.

بـەم تێکشکانە، مـیر قـەفجاق ناچـار چووە ڕیـزی لەشـکری زەنگییـەوە. خـۆی و کوڕەکانیـشی لەخزمـەتی ئەتابەگایـەتیی موسـڵدا، تـا ماوەیـەکی کـەمی دوای سـاڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٣ز) مانەوە، پاشان موسڵیان بەجێ هێشت[2]. ئەو مێژوو نووسەش کـە لـە موسـڵ دەژیـا، نـاڵێ بـۆ کـوێ چـوون و ڕوویـان لـەکوێ کـرد. بـەڵام بـە قـسەکانی (عمادالدین الکاتب الاصفهانی)دا دەردەکەوێ کە هەندێ لـە میرەکانی ئـەم ئەمارەتـە، چوونە ژێر ئاڵای سەڵاحەددینی ئەییوبییەوە و، دەڵێت: (عزالدین حسن بـن قفجـاق) خزمەتی دەوڵەتی سەڵاحەددینی کرد و، بوو بـە یـەکێك لەوانـەی کـە لـە شـوکرانەی دەرنـەدەچـوون و، لــە حورمــەتی بێبــەش نــەبوون[3]. تــا، جارێکیــان، ســوڵتان سـەڵاحەددینی ئـەییوبی داوای لـێ کـرد و، داوایـشی لـە جێگرەکـەی شارەزووریـشی کـرد و، هـەروەهاش لـە (زیـن الـدین یوسـف ینـالتگین)ی سـەرداری هـەولێریش کـە هـەموویان کۆببنـەوە و یاریـدەی بـدەن و، لـە شـەڕی خاچـدروشماندا ڕێگـای نیـشان بـدەن و، کۆمـەکی پـێ بکـەن[4]. ئەمـەش مانـای وایـە کـە ئـەمارەتی قـەفجاقیان بـە یـەکجاری لـەناو نەچـووە، وەلـێ گـرنگترین و قـایمترینی قـەڵاکانی، کـە قـەڵاکانی شارەزوور بوون لە دەستیان دەرچوون.

دوای گرتنی ئەم ئەمارەتە لە لایەن (عمادالـدین زەنگـی)یـەوە، وادیـارە، کراوەتـە

---

(١) م. ن. ص. الکامل ١١/ ٧٥ ـ ٧٦.

م. ن. ص. ٣٣١/١١.

(٢) م. ن. ص. ١٢/ ٧٦.

(٣) الفتح القسي، ط، لیدن ١٨٨٧، ص ٢٢٥.

(٤) م. ن. ص.

چەند بەشێكەوە، بەشێكیان خرایە سەر ئەمارەتی موسڵ و میرەكانی ئەم بەشە كەوتنە خزمەتی بنەماڵەی ئەتابەگی زەنگی[1]. (ابن الأثیر) خۆی ئەو باسە دەگێڕێتەوە بەڵام ناوی هیچ میرێك لە میرەكانی بنەماڵەی قەفجاقیی نەبردووە كە تا دوای ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٣ز)[2]یش لە تەلاری موسڵدا خزمەتیان دەكرد. بەشێكی تریان بەدەستی میرەكانی خۆیانەوە مایەوە (عزالدین حسن بن یعقوب بن قفجاق) كە چووە ژێر ئاڵای سەلاحەددینی ئەییوبییەوە[3] یەكێكە لەو میرانە. بەشی سێیەم بەپێی بڵاوكراوەكەی سەلاحەددینی ئەییوبی كە بە بڵاوكراوەكەی هەولێر بەناوبانگە خرایە سەر هەولێر. بەپێی ئەو بڵاوكراوەیە خاكی هەولێری تازە پێكهاتوو لە سەردەمی میری هەولێر (زین الدین یوسف ینالتگین)دا دیاركرا.

هەندێ لە مێژوونووسان ئاماژە دەدەن كە (موزەففەرەددین گۆكبوری) لەساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز)دا (میر عزالدین حسن بن یعقوب بن قفجاق)ی كە چووبووە ژێر ئاڵای خەلیفەی عەبباسی (الناصرلدین الله)وە، دەستگیر كرد. هۆی دەستگیركردنی ئەم میرە، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ داوای موڵكەكانی خۆی دەركردەوە كە خرابوونە سەر هەولێر - وەك پێشتریش باسمان كرد -. بە گرتنی ئەم میرە، خەلیفە ناڕەزایی خۆی لە (موزەففەرەددین گۆكبوری) - نێوانیشیان باش نەبوو - دەربڕی و، نامەیەكیشی كردە سەر سەلاحەددینی ئەییوبی، لە نامەكەدا ڕەفتاری ناشایستەی (موزەففەرەددین گۆكبوری) دەربارەی گرتنی (حسن بن یعقوب قەفجاق) ڕسوا كرد و، داوای دەكرد بەربدرێ و بگەڕێتەوە بۆ (كەرخینی)[4]. ئەمەش مانای وایە كە ئەم شارە - بەڕای خەلیفە - مەركەزی ئەم میرەیە و - خەلیفە ڕێگا نادات لە (حسن

---

(١) لكامل ١١/ ٧٦.

(٢) ص. ن.

(٣) الفتح القسی، ٢٣٥.

(٤) ابن شداد، النوادر السلطانیة، ١٩٨. كتاب الروضتین ٢/ ١٩٣٢.

ابن خلكان، ط/ بیروت ١٩٧٠، ٣/ ٤٥٨.

کوڕی قەفجاق) بەولاوە کەسی دیکەی لێ دانیشێ -[1].

بەپێی ئەو حیکایەتە، ئەم میرە، لەم ناوچەیەدا ببوو بە مایەفیتنە و ئاژاوەی دەگێڕا و کاروانی ڕووت دەکردەوە و، سەرێشە و کێشەی بۆ (موزەففەرەددین گۆگبوری)یش دەنایەوە، ئەمیش ناچار، دەمی شیرین کرد، تا هێنایە هەولێر و دەستگیری کرد[2]. کاتێکیش نامەبەرەکەی خەلیفە (الناصرلدین الله) گەیشتە لای سەڵاحەدینی ئەیوبی، سوڵتان وەڵامی خەلیفەی دایەوە کە گرتنی ئەو کابرایە بە تۆمەتی (الأفساد في الأرض)[3] بووە، واتا ڕووی لە هەرکوێ کردبێ زیانی پێگەیاندووە. ئیدی پاش ئەم ڕووداوە باس و خواسی ئەم میرە قەفجاقییە، بزرە و، چارەنووسی نازانین و، پێوەندیی نێوان هەولێر و پاشماوەی ئەم ئەمارەتە قەفجاقییە، بە چی گەیشت و نەگەیشت، بووە بەردی بن گۆم و نقومە.

### ج- پێوەندیی نێوان موزەففەرەددین گۆگبوری و مەلیکی ئەرتەقیان (حسام الدین یولق بن ایلغازی)ی سەرداری ماردین و مەلیکەکانی دیکەی دەوروبەر:

ئەم مەلیکە هاوزەمانی (موزەففەرەددین گۆگبوری) بووە. لە ماوەی نێوان (٥٨٠ - ٥٩٧ك/ ١١٨٤ - ١٢٠٠ز)دا، لەسەر وڵاتی ماردین حوکمڕان بووە. لەنێوان هەردوو لایاندا پێوەندییەکی پتەو و دۆستانەش هەبووە[4]، گەیشتە رادەیەك کە دراویش بەناوی ئەم مەلیکە ئارتقییەوە لێ درا[5]. ڕاستیشت دەوێ، سەرچاوەی زانینی ئەو

---

(١) ابن شداد، ص. ن.

(٢) ابن شداد، ص. ن. ابن خلکان، ص. ن. ابن واصل، ص. ن.

(٣) ابن شداد، ١٩٩. ابن واصل، ص. ن.

(٤) زامباور: معجم الأنساب والاسرات الحاکمة، ص ٣٤٥.

(٥) دەچێتەوە سەر (ارتق کوڕی آکسب) باپیرەی مەلیکەکانی ئەرتقییەکان، کە سەرداری قودس بووە و، لەساڵی (٤٨٤ك/ ١٠٩١ز)دا مردووە و، دوو کوڕی لەپاش بەجێماوە، یەکێکیان بەناوی (سلمان) "ت ٤٩٤ك/ ١١٠٠ز" ئەوی دی بەناوی (ایلغازی) کە دیاربکر و ماردین بەدەستیانەوە بووە: ابن خلکان، ط ١٩٦٨، ١/ ١٩١، حوکمی لقی ماردین تا ساڵی (٨١١ك/ ١٤٠٨ز) بەردەوام بوو، پاشان، شارەکە خرایە سەر حوکمی قراقۆینلو (بەرخەڕەش).. بنۆڕە: زامباور، ص ٣٤٥.

پێوەندییە، تەنیا دراوەکەیە. دراوێکی مس[1] لەوێ دۆزراوەتەوە وێنەی زەلامێکی لەسەرە، بە چیچکانەوە لەسەر تەخت (عرش) دانیشتووە (هەڵتووتاوە)، گۆچانێکی بەدەستی چەپییەوە گرتووە و، کڵاو زرێیەکی لەسەرناوە. لە پەراوێزی ئەم دراوەدا ناوی ئەم مەلیکە: (حسام الدین یولق) نووسراوە و، ناو و نازناوی سەلاحەددینی ئەییوبیی لەسەرە و، (گۆکبوری بن علی) یشی لەسەر نووسراوە.

مێژووی بنیاتنانی پێوەندیی نێوان (موزەففەرەددین گۆکبوری) و ئەم (حسام الدین یولق)ە نازانین، چونکە بەرواری لێدانی دراوە سەیرەکە نازانین و ناشزانین لەکوێ لێدراوە. جا ئەگەر، بەڕاستی لە هەولێر لێدرابێت، ئەوە مانای ئەوەیە کە لەماوەی نێوان سالی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)- کە مێژووی گەڕانەوەی (موزەففەرەددین گۆکبوری)یە بۆ هەولێر - و سالی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز)دا - کە مێژووی کۆچی دوایی سەلاحەددینی ئەییوبییە، لێدراوە.

بەلام (عباس العزاوي) دەلێت: (موزەففەرەددین گۆکبوری)، بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ هەولێر، لەو دەمەدا ئەم دراوەی لێداوە کە میری (حران)و (الرها)[2] بووە. (العزاوي) لێرەدا دەیەوێ (اسماعیل غالب) بەدرۆ بخاتەوە، لە کاتێکدا، ئەو (اسماعیل عارف)ە هیچی نەکردووە تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەم پارچە دراوەی لەگەل دراوەکانی ئێلی بکتگیندا داناوە و، گوتوویەتی جێگە و بەرواری لێدانی ئەم پارچە دراوە نادیارە[3].

هەرچی (الدکتور الحسینی)یە، ئەوە، ئەو، پارچە دراوەکەی لەگەل دراوگەلی ئەتابەگییەکەی هەولێردا داناوە[4]. ئەم ئالۆزی و تێکەل و پێکەلییەش لە پێوەندیی نێوان دوو لایەنەکەدا، لە بێدەنگیی سەرچاوەکان و، نادیاریی مێژووی لێدانی ئەو

---

(١) ئەم پارچە دراوە لە مۆزەخانەی (همایون) ـ لە ئەستەنبول ـ دانراوە بە ڕەنووسی (١٨٤).. بنۆڕە (اسماعیل غالب)، مسکوکات ترکمانیه فتالوغی، ص ١٤٠.

(٢) عباس العزاوی، تأریخ النقود العراقیة، ١٩٦.

(٣) اسماعیل غالب، ص. ن.

(٤) د. محمد باقرالحسیني، العملة الاسلامیة في العهد الاتابکي، ص ١٣٨.

پارچە دراوەوە پەیدا بووە.

خۆ ئەم مەلیکە دوایین مەلیك نییە کە (موزەففەرەددین گۆکبوری) پەیمانی لەگەڵدا بەستبێ و، ناویشی وەسەر دراو خستبێ، بەڵکو ئەو کارەی لەگەڵ (الملك الغالب عزالدین کیکاوس کوڕی کیخسرو کوڕی قلج ارسلان)ی (ت ٦١٦ك/ ١٢١٩ز) سەرداری وڵاتی ڕۆمیشدا کردووە. ئەمەش، ئەو مەلیکەیە کە سەرداری هەولێر لەگەڵ "ناصرالدین محمود کوڕی محمد قرا أرسلان"ی سەرداری ئامەد - ت ٦١٩ك/ ١٢٢٢ز-) و هەروەها لەگەڵ (ناصرالدین آرتق ارسلان)ی سەرداری ماردین ـ (٦٢١/١٢٢٤ز) [1]. هەرسێکیان پێکەوە چوونە ژێر تاعەتی بۆ ئەوەی لەدژی (الملك الاشرف موسى کوڕی الملك العادل الایوبی) و (بدرالدین لؤلؤ)ی سەرداری موسڵی هاوپەیمانی بووەستن، ئەوەبوو لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن کە دراو بەناوی (عزالدین کیکاوس)ی ناوبراوەوە لێبدەن، خوتبەشی بەناوەوە بخوێنرێتەوە[2]. بەڵام هیچ پارچەیەك لەم دراوە نەدۆزراوەتەوە.

---

(١) پێوەندییەکانی (موزەففەرەددین گۆکبوری) لەگەڵ ئەو مەلیکانەدا، لەبابەتی پێوەندییەکان لەگەڵ ئەمارەتی موسڵدا، پێشتر باس کرد.

(٢)الکامل ٢/ ٣٤٢. ١٢/ ٣٥٤.

# فەسڵی چوارەم

## ڕەوشتی موزەففەرەددین گۆگبوری و پێگەی لە مێژوودا

**یەک** : ڕەوشتی موزەففەرەددین گۆگبوری

خەسڵەتەکانی

**دوو** : ئاهەنگەکانی هەولێری لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام.

**سێ**: مردن و شاردنەوەی (سپاردنی) موزەففەرەددین گۆگبوری.

**چوار**: کۆتایی ئەتابەگایەتیی هەولێر و، لکاندنی ئەمارەتەکە بە مەملەکەتی خەلیفەی عەبباسییەوە

# فەسڵی چوارەم

# ڕەوشتی موزەففەرەددین گۆکبوری و پێگەی لە مێژوودا

## یەك: ڕەوشتی موزەففەرەددین گۆکبوری

### جێگە و مێژووی لەدایکبوونی:

(أبو سعید) [١] موزەففەرەددین گۆکبوری [٢]، کوڕی میر (زین الدین ابی الحسن علی کچك کوڕی بکتگین)، لە بیست و حەوتی مانگی موحەڕەم، ساڵی ٥٤٩ك ڕێکەوتی ١٣ی نیسانی ١١٥٤ز، لە قەڵای موسڵ [٣] لەدایك بووە. باوکی، دوای ماوەیەك ناردی بۆ هەولێر، تا لەژێر چاودێریی پەروەرشتکار (ئەتابەگ) (مجاهد الدین قایماز)دا، کە لەجیاتیی (لەبریی) (زین الدین علی کچك) حوکمی ئەم شارەی دەکرد، پەروەردە ببێت. (زین الدین علی کچك) خۆی، خاو و خێزان و سامان و دارایی لە هەولێر دانابوو [٤]. بەوەش (مجاهدالدین قایماز) بوو بە (ئەتابەگ) واتا بووە باوکێکی

---

(١) (ابن الشعار) لە دەستنووسی (عقود الجمان) و، (المنذري)، التکملة بالرونیو ٧/ ١٤٤٧ و، ابن خلكان ٣/ ٢٧٠ ئەو ناوەیان لێ ناوە.

(٢) گۆکبوری: لە دوو وشەی تورکی دروست بووە: (گۆگ): واتا (شین). (بوری): واتا (گورگ) بە زمانی کۆنی تورکی. بە هەردووکی دەبێتە: (شینە گورگ) بنۆڕە: ابن خلكان ٣/ ٢٧٧.
اسماعیل غالب، مسكوكات تورکمانیه قتالوغی، ص ١٤٢.

(٣) هەموو سەرچاوەکان وا دەڵێن، تەنیا (الذهبي) دەڵێ: لە قەڵاکەی هەولێر لەدایك بووە. بنۆڕە: مخطوط (تأریخ الاسلام) ورقة ١٨٣.

(٤) الکامل ١١/ ٣٣١. ابن العبري، تأریخ مختصر الدول، ص ٢١٢.

پەروەرشتکاری موزەففەرەددین گۆکبوری[1] و براکانی.

موزەففەرەددین گۆکبوری نازناوی زۆری هەبووە، هەندێکیان، مێژوو نووسان بۆ پێدا هەڵدان و ڕێز، لێیان ناوە، هەندێکیشیان نازناوی گەورەیی و شکۆدارییە پێی ناسراوە، یان خۆی لەسەر دراوی ئەمارەتەکەی و لەسەر جێگە و ئاسەواری دایناوە کە بنیادی ناوە، بەنموونە مێژوو نووسی هاوزەمانی ئەم میرە (العماد الكاتب الاصفهاني) کە لە زۆربەی شەڕەکانی خاچدروشماندا ئامادە بووە و، موزەففەرەددین گۆکبوریی لەو شەڕانەدا دیوە، بە (الاسد الغضنفر)[2] واتا بە (شێر) ناوی بردووە، هەروەها (ابن شداد)[3] و (المنذري)[4] نازناوی (الامير الاجل الكبير) واتا (میری ڕێزدار و گەورە) یان لێ ناوە. هەرچی (ابن خلكان) و (ابن سعيد)ە، ئەوە، ئەوان نازناوی (سوڵتان)[5] یان لێ ناوە، وەلێ (ابن الأثير)[6] و (ابن خلكان)[7] و کەسانی دی[8] نازناوی (الملك المعظم) واتا شای گەورەیان لێ ناوە. ئەم نازناوەی لە هەموو

---

(١) وفيات الاعيان ٣/ ٢٧١، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨١. العقد الثمين ٧/ ١٠١.

(٢) الفتح القسي، ط ١٨٨٧، ص ١٨٩.

(٣) النوادر السلطانية، ١٠٥.

(٤) التكملة، ط- بالرونيو، مجلد ٧، ص ١٤٤٧.

(٥) ابن خلكان ٦/ ٨٧. الغصون اليانعة، ص ٧٩.

(٦) الباهر، ١٨٥، ١٩٧، ٢٠٥.

(٧) وفيات الأعيان ٣/ ٢٧٠.

(٨) بنۆڕە: ابن الفوطي، تلخيص الآداب، ج/٥، ط/ لاهور، ص ٥٨٩.

الدواداري، الدرة المضيئة في اخبار الدولة الفاطمية، ط/ ١٩٦١، ص ٥٣٦.

الذهبي: مخطوط تأريخ الاسلام، ق٢، ورقة ١٨٠.

الفاسي المكي/ العقد الثمين في تأريخ البلد الأمين، جـ٧، ص ١٠٠.

ابن أبي عذيبة: مخطوط، انسان العيون، ص ٢٩٢.

محب الدين ابو الفضل محمد ابن الشحنة الحلبي: الدر المنتخب في تأريخ مملكة حلب، ص ١٠٦.

Cataloguede Monnaies, P. ١٤٤.

نازناوەکانی تری باوتر و بڵاوتر بووە - لەسەر دراوەکانیشی کە لە هەولێر لێی دەدا، نووسرابوو (ملك الامراء مظفر الدنيا والدين گۆگبری علي) واتا: (شای میران، رووسووری دنیا و قیامەت گۆگبوری علی) [١]. کەچی، لەسەر تاوێری بان قوتکەکەی [٢] کە بەرامبەر بە شاری مەککە نابوویەوە نووسیبووی: (الامير الاصفهسلار [٣] الكبير... حسام أمير المؤمنين) [٤]. بەڵام لەسەر گۆمە (کۆلە) ئاوەکەی کە لە ساڵی (٥٩٤ك/ ١١٩٨ز)دا لەبان عەرەفات دروستی کردبوو، نووسرابوو: "موزەففەرەددین ککبري بن صاحب أربل سيف أمير المؤمنين" [٥].

## خەسلەتەکانی:

موزەففەرەددین گۆگبۆری پیاوێکی رەوشتپاك و بەکەرەم بووە. هەند بەتەنگ کەشوفشی ئەمارەت و موڵکەوە نەبووە و، کەسێکی ئاسایی و خاکەڕا (متواضع) و کارساز و خێرخواز بووە و حەزی بە ئاوەدانکردنەوە بووە. (ابن خلكان) دەڵێت: لە خێر خوازیدا، شتی هەند سەیر و عاجباتی کردووە، نەبیستراوە کەسێکی دی کردبێتی، لە ژیانیدا، هیچ شتێکی هەندەی خێر و چاکە لەلا خۆشەویستتر نەبووە. هەموو سبەینانێك، نانێکی زۆری بۆ هەژاران ئامادە دەکردو، لە چەندین جێگە و

---

(١) اسماعيل غالب، مسكوكات تركمانية فتالوغي، ص ١٣٩.

(٢) (العلم) = (جێگەی بەرز)، یان (کێلەرێ)، یان (شەقڵ): لە بیابانەکاندا دەنرێتەوە بۆ ئەو کاروانەی ڕێگای بزر کردووە تا ڕێگاکەی خۆی پێ بدۆزێتەوە: ابن منظور، لسان العرب، دار صادر، ١٩٥٦، مجلد ١٢، ص ٤١٩.

(٣) الاصفهسلار، الاسفهسلار: بۆ ماناکەی بنۆڕە بابەتی (دیوان و خەزێنەی چەك).

وەرگێڕ: (بەکوردی و فارسیش دەکا: سوپاسالار، واتا: سەرلەشکر).

(٤) الفاسي المكي، العقد الثمين، ٧/ ١٠٠.

(٥) د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية والوظائف على الآثار العربية، القاهرة، ١٩٦٦، ٢/ ٦٦٢.

گەڕەکی هەولێردا بەسەریاندا دەیبەشییەوە[1]. جگە لەوەش، جل و بەرگی زستانە و هاوینەی بەسەر کەمدەرامەتەکاندا دابەش دەکرد و پارەشی پێدەدان. هەرکەسێکیش سەفەری کردبا، بە پێی پێداویست و دووریی ڕێگاکەی، خەرجی و ئەرك و مەسرەفی دەدایێ[2]. یەکێ بوو لە جوامێرە سەرومر و گەورەکان و، مەلیکێك بوو لە مەلیکە خاوەن شکۆ و شانەکان[3]. دەستی بەڕووی هیچ موحتاجێکەوە نەدەناو، کەسی نائومێد نەدەکرد، نەخاسمە فەقێ و مەلا و حەدیسخوان و. بگرە (شاعیرەکانیش) هەر چەندیشە هەند هاوسۆزیان نەبوو[4]. ئەو خەسڵەتانەی ئەو هەیبوون، بە دەگمەن لای کەسێکی دی جەم دەبوون[5].

کارێك لەو کارە خێرانەی دەیکرد، ئەوەبوو، ساڵی دوو جاران، شاندی بە پارەی زۆرەوە[6] دەنارد بۆ گوێ دەریاکان، بۆ شام بۆ کڕینەوە و ئازادکرنی دیلە ئیسلامەکان لە دەستی خاچدروشمان، هەندێکیشیان، دوای ئازاد بوونی، بۆ ژیان و گوزەران دەهاتنە هەولێر. بەڵام بەرلەوە، دەنێردران بۆ گوندی «بیت النار»[7] تا، لەوێ پێداویستی خۆیان وەربگرن و، جل و بەرگی شایان (شیاو) لەبەر بکەن، ئنجا بێنە ناو هەولێر[8]. ئەوانەشیان کە ولاتی خۆیان بە باشتر دەزانی، خەرجی ڕێگاو پێداویستیان بۆ دابین دەکراو دەچوونەوە[9].

---

(١) وفيات الاعيان ٢٧٢/٣. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨١. الفاسي المكي، العقد الثمين، ١٠٣/٧. ابن عذيبة، انسان العيون ٢٩٧. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ١٣٨/٥.

(٢) هەمان سەرچاوەگەل و لاپەڕەکان.. القزويني، آثار البلاد، ص ٢٩٠.

(٣) ابن كثير، البداية والنهاية ١٣٦/١٣.

(٤) وفيات الأعيان ٢٧٦/٣. آثار البلاد، ن. ص. العقد الثمين ١٠٦/٧. انسان العيون، ص ٣٠٢.

(٥)الفساني، العسجد المسبوك، ص ٣٣٠.

(٦) القزويني، آثار البلاد، ٢٩٠.

(٧) (بيت النار): گوندێکی گەورەی هەولێرە، بەلای موسڵدا: ياقوت، معجم البلدان، ٥٢٢/١.

(٨) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، جـ ٨، ص ٦٨٢.

(٩) وفيات الاعيان ٢٧٣/٣. العقد الثمين ١٠٥/٧. انسان العيون، ص ٢٩٧.
The Encycp of Islam, New Edition, V, I, P, ١١٦١.

(سبط ابن الجوزی) کە لەو سەردەمەدا ژیاوە و، سەری لە هەولێریش داوە[١]، دەڵێت: (پارەو سامانی ئەم ئەمارەتە، هەمووی کرا بەخێر و سەدەقە، تا موزەففەرەددین گۆگبوری هیچی نەما، ناچار خشڵ و مجەوهەراتی دەنارد بۆ دیمەشق کە لەوێ بیفرۆشن و، پارەکەی بکەن بە سەرانە و دیلەکانی لە خاچدروشمان پێ بکڕنەوە و ئازادیان بکەن)[٢]. چونکە خاچدروشمان بەبێ پارە و سەرانە دیلی بەرنەدەدا. دوای سەرژمێرییش، دەرکەوت کە (شەست هەزار دیلی پیاو و ژنی) بە پارە ئازاد کردووە[٣]. موزەففەرەددین گۆگبۆری، ساڵانە لە بوجەی ئەمارەتەکەی بڕی سەد هەزار دیناری بۆ ئەو کارە خێرە تەرخان دەکرد[٤]- بە قسەی ابن الجوزی ـ بەڵام (ابن شهبة) دەڵێت: ئەو بڕە پارەیە گەیشتە دووسەد هەزار دینار[٥].

سەرداری هەولێر، ساڵێ کاروانی حەجی بەڕێدەخست و، بۆ زیارەتکاران هەموو پێداویستییەکی ڕێگای دابین دەکرد. بە پێی قەرساندنی (ابن خلکان) هەموو ساڵێك (٥٠٠٠ ـ ٦٠٠٠)[٦] دیناری بۆ حەج و حاجییان خەرج دەکرد. بەڵام (سبط ابن الجوزي) بە (١٠٠٠٠) دە هەزار دیناری[٧] دەخەمڵێنێ و، ساڵێ (٣٠٠٠٠) سی هەزار دیناریشی لە حەرەمەیندا سەرف دەکرد[٨].

---

(١) مرآة الزمان، جـ ٨، ص ٦٨٣.

(٢) ن. م. ص. القزويني، آثار البلاد، ص ٢٩٠.

(٣) مرآة الزمان ٦٨٢/٨. ابن كثير، البداية والنهاية، ١٣٧/١٣.

(٤) مرآة الزمان. ص. ن.

(٥) ابن العماد الحنبلي لە (شذرات الذهب ١٤٠/٥)دا، لە زمان (ابن شهبە)وە گوتوویەتی.

(٦) وفيات الاعيان ٢٧٣/٣. هەروەهاش بنۆڕە: الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام، ورقة ١٨٢. ابن أبي عذيبة، انسان العيون، ص ٢٩٧.

(٧) مرآة الزمان، ص. ن.

(٨) ن. م. ص: ٦٨٣. ابن كثير، البداية والنهاية، ١٣٧/١٣. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ١٤٠/٥ نقلاً عن ابن شهبة في تأريخ الاسلام.

موزەففەرەددین گۆکبوری لە دەرەوەی ئەمارەتەکەشی پرۆژەگەلێکی خێرخوازیی بنیادناوە ـ لە شاری مەککە پرۆژەیەکی گەیاندنی ئاوی بۆ چیای عەرەفە سازداو، گۆماوەکانی چاك کردەوە و[١]، گەلێ بیری ئاوی لێ دا. هەردوو بیری (الزیادیة الکبری) و (الزیادیة الصغری) بە فەرمانی ئەو هەڵکەنران، بیری سێیەمیشی لێ دا، کە پێی دەڵێن (الشمردقیة) [٢]. لە زوور مەککەشەوە بیرێکی لە ساڵی ٦٠٤ك/١٢٠٧ز)دا[٣]ئاوەدان کردەوە، گوایا کاتی خۆی، (میمون بن الحضرمی)ی برای (العلاء بن الحضرمي) لەسەر رێگایەك لێیدابوو، بە رێگای (سبیل الست) [٤]بە ناوبانگ بوو. گەلێ بیری دیکەی لێ داو، هەندێکیشی چاك کردەوە، پاشان وشکیان کرد[٥].

چاکەیەکی تریشی ئەوەبوو، لەسەر خاکی عەرەفە، سێ قوتکە (أعلام)ی دروست کرد. مێژوو نووس (الفاسي المکی) دەڵێت دووانیانی دیوە، بەڵام سێیەمیان کە بە رووکاری (المغمس)ەکەدا[٦]نرابووەوە، ئەوەیان کەوتووە (رووخاوە). ئەم مێژوو نووسە، لەو جێگەیەدا گاشە بەردێکی دیتووە لەسەری نووسراوە: ((میر سوپا سالاری گەورە موزەففەرەددین کوڕی زین الدین سەرداری هەولێر، حسام أمیر المؤمنین

---

(١) مرآة الزمان ٦٨٢/٨. وفیات الاعیان ٢٧٣/٣. الفاسي المکي، العقد الثمین، ١٠٠/٧. حسن الباشا، الفنون الاسلامیة والوظائف علی الآثار العربیة ٦٦١/٢ — ٦٦٢.

(٢) الفاسي المکی، شفاء الغرام ٣٤٥/١.

(٣) العقد الثمین ١٠١/٧.

(٤) (الست): واتا (خانم): مەبەست خوشکی (الملك الناصر حسن)ی سەرداری میسرە. بنۆڕە: (العقد الثمین) پەراوێزی لاپەڕەی (١٠١).

(٥) شفاء الغرام ٣٤٥/١.

(٦) (المغمس) جێگایەکە لە لایەکی حەرەمەوە، مەیدانی ئەو فیلە بووە کە کاتی خۆی (ابرهة) هێنابووی. هەر لەم جێگەیەدا (ابو رغاڵ) نێژراوە. ئەم کابرایە خیانەتی لە قەومەکەی خۆی کرد و (أبرهة)ی خاوەنی فیلەکەی بردە سەر مەککە بۆ ئەوەی کەعبەی پێ بڕووخێنێ.. بنۆڕە: الأزرقی، اخبار مکة، جـ ١، ص ١٤٣.

فەرمانی دا ئەم سێ قوتکەیە لە نێوان کۆتایی زەویی عەرەفە و دۆڵی عەرەفەدا دروست بکرێت». بەرواری دروستکردنیشی نووسراوە: شەعبانی (ساڵی ٦٠٥ک/١٢٠٨ز) [1]. هەروەها دوو قوتکەی تریشی چاك کردووەتەوە کە پێشتر لە ساڵی (٦١٦ک/١٢١٩ز)دا[2] وەك شەقڵی (نیشانەی) سنووری دیوی مەککەی حەرەم دروست کرابوون.

(محمد کورد علي) لە نووسینەکانیدا جێگەو پێگەیەکی تایبەتی بە موزەففەرەددین گۆکبوری شایاندووە و بە یەکەم خێرخواز و چاکەکاری دادەنێ و دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوریی سەرداری هەولێر یێکێکە لە مەلیکە خێرخواز و کارسازەکان، ئیشی چاك و کاری خێری زۆری داهێناوە و، ئەو دەزگاو کارگانەی ئەو سازی دەدان، لە گەڵێ رووەوە، لە سەنعەتگاکانی رۆژاوای ئەمڕۆ دەچن[3].

موزەففەرەددین گۆکبوری لە شاری حەڵەب خانەقایەکی دروست کرد (بنیادنا)، بە خانەقای (الزينية) ناودار بوو، ئەم خانەقایەی لە سەرەکۆڵانی (القرن) دامەزراند کە بە کۆڵانی (درب السيد الحمزة) [4] ناودەبرا. پێدەچێ، هەر ئەو خانەقایە بێت کە

---

(١) الفاسي المكي، شفاء الغرام، جـ ١، ص ٣٠٢.

(٢) العقد الثمين ٧/١٠٠.

(٣) محمد كورد علي، الاسلام والحضارة، جـ ١، ص ٣٢٧.

(٤) بنۆڕە: (كامل بن حسين بن محمد البالي الشهيد بالغزي)، نهر الذهب في تأريخ حلب، جـ ٢، ص ٢٧١. ئەم مێژوونووسە دەڵێت: ئەم خانەقایەی موزەففەرەددین گۆکبوری دایمەزراند، (عمر الزميني) لە ساڵی (٧٩٦ک)دا چەندین باغ و بێستانی بۆ کرد بە (وەقف)، هەر لەبەر ئەوەشە کە ناویانناوە (الزينية).

هەروەها دەڵێت: ئەم خانەقایە زۆر ئاوەدان بوو، بەڵام ئێستا، دراوسێکانی داگیریان کردووە، دەرگاکەشی داخراوە و، هەر دیارنەماوە.

(ابن الشحنة)[١] باسی دەکات. لە ساڵی (٥٩٨ك/١٢٠٢ز)یشدا، لە دیمەشق مزگەوتێکی بۆ حەنبەلییەکان دروست کرد، کابرایەك بە ناوی (علي الفامي) بناغەکەی دارشت، بەڵام پرۆژەکە پارەی لێ براو تەواو نەکرا. موزەفەرەددین گۆکبوری، کە ئەمەی بیست، دەستبەجێ، بە (شجاع الدين الاربلي)ی پەردەوانەکەی خۆیدا، سێ هەزار دیناری نارد بۆ تەواوکردنی مزگەوتەکە و، بەو پارەیەش کە لێی زیادە، وەقفێکی پێ بکرێن[٢]. پاشان هەزار دیناری تری نارد، کە لە زێی (پردێ)وە ئاوی بۆ رابکێشن[٣]. لە موسڵیش خانوویەکی بۆ حەدیس دروست کرد، ناونرا (دار الحديث المظفرية)[٤].

خەسڵەتێکی دیکەی موزەفەرەددین گۆکبوری ئەوەیە کە پیاوێکی خاکەڕایی (متواضع) و بۆ داماوان بەسۆز بووە، (ئێمە پێمانوایە) رەوش و رەفتار و، سۆز و ساویلکەیی ئەم میرە لەوەوە پەیدا بووە کە لە بنەماڵەیەك و ژینگەیەکی ئایینیدا پەروەردە بووە، ئەوەتا، لە شارەکەی خۆیدا چوار خانەقای دامەزراندووە، بۆ هەژار و

---

(١) (ابن الشحنة) دەڵێت: موزەفەرەددین گۆکبوری، خانەقایەکی لە ناوچەی (السهيلة) دامەزراند. ئەو ناوچەیە، ئێستا پێیدەڵێن (سويقة حاتم) دەکەوێتە نزیك مزگەوتە گەورەکە.. بنۆڕە: ابن الشحنة، الدر المنتخب، ص ١٠٦.

(٢) عزالدين ابو عبدالله محمد بن علي ابراهيم ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة ((تأريخ دمشق، ص ٨٦. (دکتۆ حسن الباشا)یش دەڵێت: ئەم پرۆژەیە موزەفەرەددین گۆکبوری لە ساڵی (٥٩٩ك)دا دایمەزراند – وەك لە نووسینی سەر هەندێ ئاسەواردا دەردەکەوێت – لە دەقی دامەزراندنی ئەم مزگەوتەدا، هاتووە، دەڵێت: ((گۆکبوری بن علي بن بكتكين صاحب اربيل)) بنۆڕە: کتێبەکەی: (الفنون الاسلامية) ٦٦١/٢.

(٣) ابو شامة، ذيل الروضتين، ص ٣٩. مرآة الزمان ٥١٠/٨. الذهبي، مخطوط، تأريخ الاسلام، ق ١، جـ ١، ورقة (٧٣). ابن كثير، البداية والنهاية، ٧٢/١٣ و ١٣٦/١٣. النعيمي، الدارس في تأريخ المدارس ٤٣٦/٢.

ئەم مزگەوتە تا ئەمڕۆش لە دیمەشق لە (حي الاكراد) هەر ماوە بنۆڕە: پەراوێزی (١) لاپەڕەی ٨٦ لە (الاعلاق الخطيرة، للمحقق سامي الدهان).

(٤) ابو شامة، زيل الروضتين، ص ٩٠. الذهبي، العبر، ٨٩/٥ – ٩٠. شذرات الذهب ١٠٠/٥.

کوێر و دەستکورت و شەل و سەقەت[1] و داماوان، مانگانەش پێداویستی خۆراك و خواردنەوە و جل و بەرگ و شتی دیکەی بۆ دابین دەکردن و، حەفتەی دوو جاریش سەری لێدەدان و عەسرانی دوو شەموان و پێنج شەموانی بۆ ئەم سەردانە تەرخان کردبوو، یەك بە یەك پرسیاری باری گوزەرانیانی دەپرسی و هیچیانی نەدەبوارد و بە سنگفراوانیەوە گاڵتەی لە گەڵدا دەکردن و دڵی دەدانەوە. سەری لە بیمارستانەکەش دەدا کە خۆی لە هەولێر دایمەزراندبوو، هەواڵی نەخۆشەکانی دەپرسی و لە جێگە و پێخەف و خۆراکیان دڵنیا دەبوو، سەرباری ئەوانەش خانوویەکی گەورەی لە هەولێر بۆ حەوانەوەی میوانان لە فەقێ و مەلاو فەقیر و هەژاران کە دەهاتن بۆ هەولێر دروست کردبوو، لەوێ دەمانەوە و، دەخەوتن و خۆراکی نیوەڕۆژە و شێویان لەسەر بوجەی ئەمارەتی هەولێر سەرف دەکرا[2]. دەگێڕنەوە، دەڵێن: موزەففەرەددین گۆکبوری هەند خاکەڕا و خاکی بووە، جل و بەرگێ کە بۆ میر بشێ لەبەری نەکردووە و، تەنیا بەرگی زبری پۆشیوە کە نرخی لە پێنج پەنجایی (درهم) زێتر نەبووە، وێڕای ئەوەش کە جەستەی بەرگەی ئەو بەرگە زبر و دڕەی نەگرتووە. ڕۆژێکیان (ربیعە خاتون)ی هاوسەری پێیدەڵێت: کە بەرگێکی نەرم لەبەر بکات و جەستەی خۆی ئەوەندە ئازار نەدات. لەوەڵامدا دەڵێت: کامیان چاکترە و جەزای زیاترە، بەرگێك بایی دە پەنجایی لەبەر بکەم، یان جلێك بایی پێنج پەنجایی لەبەر بکەم و پێنج پەنجاییەکەی تری بدەم بە هەژارێك یان

---

(١) (الزمنی): واتا پاخستە و شەل و سەقەتان کە ناتوانن بڕۆن و ڕێ بکەن و کاربکەن.
بەڵام ناچارن: محمد مرتضی الزبیدي، تاج العروس، ٢٢٨/٩.

(٢) سبط ابن الجوزی، مرآة الزمان ٦٨٢/٨. وفیات الاعیان ٢٧٢/٣.
الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨١.
ابن أبی عذیبة، مخطوط. انسان العیون ٢٩٥ — ٢٩٦.
الفاسي المکی، العقد الثمین ١٠٣/٧.
ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ١٣٩/٥.

داماوێك[1]؟. ئەو، لەبەر خاتری خودا و بۆ رەزامەنـدیی خوا ئـەو جلە خـراپ و بـە ئالۆشـەی لەبـەر دەكـرد. موزەففـەرەددین گۆكبـوری پیـاوێكی بـێ فیـز و دڵنـەرم و بەرەحم بووە، خواردنێكی خۆشی بە تەنیا نەخواردووە، دەینارد چەند پیاوچاكێكی بانگ دەكرد پێكەوە دەیانخوارد. ئەو كاسە دراوسێتیشی دەكرد، بۆ پیرەژنێ یان پـیرە مێردێكی دراوسێی خۆی كاسەی پڕ خۆراكی دەنـارد و، جل و بـەرگ و[2] پێداویـستی دیكەشی بۆ دەناردن.

ئـەم پیـاوە لـەخوا ترسـە، ژیـان و گـوزەرانی كـەموزۆر لـە ژیـانی دەروێـش و دێوانەكان دەچوو، دەچوو بۆ لایان و، لە ئەڵقەو كۆڕی زیكردا[3] بەشـدار دەبـوو. ئـەو، بڕوای بە سۆفیگەری هـەبوو، یـەكێك لـەو شـێخانەی كـە رێـزی لێ دەنـا: (الـشیخ أبـو حامد احمـد الكرمـانی) بـوو، كـە بـە (أوحدالـدین) نـاوداربوو. ئـەم شـێخە سـەری لـە هـەولێر دا، كۆمـەڵێ دەروێـشی عەجـەمی لەگەڵدا بـوون، هـەموویان بوونـە میـوانی، پاشان هـەموویانی نـارد بـۆ حـەج[4]. هەنـدێ لـە مێژوونووسـانیش بـە حەدیـسخوانی دادەنێن. (أبو علي حنبل بن عبدالله الرصافي) و كەسانی دیكەش دەڵێن كـە دەمـی لـە حەدیسەوە داوە[5].

موزەففـەرەددین گۆكبـۆری هەنـد لـە خـواترس بـووە نەیهێـشتووە شـتی خـراپ

---

(١) مرآة الزمان، جـ ٨، ص ٦٨٢ – ٦٨٣. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣٧/١٣.

(د. طليمان) وەسفی سەرداری هەولێر دەكات و دەڵێت: ((ئەو میرە، پڕ بـە پێـستی مانـای سۆشـیال، سۆشیالیست بووە. كۆمەڵ و كۆمەڵگەكەیشی سوودێكی زۆریان لەو خەسڵەتەی پێگەیـشتووە))، بنۆڕە كتێبەكەی: (مظفرالدين كوكبری امير اربل، ص ٢٠١).

(٢) وفيات الاعيان ٢٧٥/٣. العقد الثمين ١٠٥/٧. انسان العيون ٣٠٢.

(٣) مرآة الزمان ٦٨١/٨. وفيات الاعيان ٢٧٣/٣.

(٤) ابن الشعار، مخطوط عقود الجمـان، جـ ٧. ترجمـة محمـد بـن أبـی الفخـر بـن احمـد ابـو حامـد الكرماني الصوفي.

(٥) المنذري، التكملة ١٤٤٨/٧ بالرونيو.

بهێنرێته ناو ئەمارەتەکەی[1]. (الغساني) دەڵێت ڕێگای بەکەس نەداوە مەی (الخمر) بۆ ناو وڵاتەکەی بهێنێ و، سووکایەتیی بە ئارەقخۆر دەکرد[2]. هەرچەندیشە مەملەکەتەکەی بچووك بوو، بەڵام خۆی لە هەموو مەلیکەکان بە ئایینتر و جوامێرتر و خێرخوازتر بوو[3]. لەبەر ئەوە، باسوخواسی خاکەڕایی و خێرخوازی و پیاو چاکیی ئەم میرە، لە دەرەوەی هەولێریش دەنگی دایەوە، بە نموونە: کاتێ لەگەڵ (علاءالدین)ی سەرداری وڵاتی مەراغە، بۆ داگیرکردنی ئازەربێجان پەیمانی بەست و بەرەو تەورێز کەوتنە ڕێ، لەو کاتەدا (آیدغمش)ی کۆیلەی (ابو بکر بن البهلوان)ی سەرداری ئازەربێجان نامەیەکی بۆ نارد و وەبیری هێنایەوە کە داگیرکردنی وڵاتانی خەڵك ڕەفتارێکە، بۆ ئەو ناشێ و بۆ ناوبانگی ئەو جوان نییە و، بۆی نووسیبوو: ئێمە بیستوومانە کە تۆ خاوەن زانست و مەلاو پیاوچاکانت خۆش دەوێت و خێر و چاکەیان لەگەڵدا دەکەیت و، وامانزانی کە بەخێر و بەئیمانیت[4].

لە بارەی بوێری و بەجەرگیی ئەو میرەوە، ئەوە بوو پێشتریش هەڵوێستی ئازایانە و جوامێرانەیمان باس کرد چ لەناو لەشکری ئەتابەگەکانی موسڵ و چ لە ریزەکانی لەشکری سەلاحەددینی ئەیوبیدا و چ لە فەرماندەی لەشکری ئەمارەتەکەی خۆیدا ـ (ابن خلکان) باسی هەڵوێست و پێگەی لە شەڕە گەورە و هاتونەهاتەکەی (حطین)دا دەکات و دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری لە جێگەی خەتەرناکی وادا خۆی ڕاگرت، کەسی دی لەوێدا، خۆی ڕانەدەگرت. ناوبانگیشی هەند بڵاوە، درێژەپێدانی ناوێت و، ئەگەر هیچی دیکەی نەکردبێ، ئەم قارەمانێتییەی (حطین)ی بەسە، لەو شەڕەدا لەشکری ئیسلام شکا، بەڵام کە دیتیان، وا، (تقي الدين

---

(١) وفيات الاعيان ٢٧٣/٣. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨١.

ابن ابي عذيبة، انسان العيون، ٢٩٧. الفاسي المكي، العقد الثمين ١٠٤/٧.

(٢) الغساني، العسجد المسبوك، ص ٣٣٠.

(٣) الذهبي، العبر ١٢٢/٥. شذرات الذهب ١٣٨/٥.

(٤) الكامل ٢٣٦/١٢ — ٢٣٧.

عمـر)ی بـرازای سـەلاحەددینی ئـەییوبی و موزەففـەرەددین گۆکبـوری هـەردووکیان پێشیان لە خاچدروشمان گرتووە و کۆڵیان نەداوە و قارەمانانە شەڕ دەکەن، ئەوانیش هەموویان گەڕانەوە بۆ ناو شـەڕەکەو خاچـدروشمانیان تێکـشکاند[1]. (القزوینـی)یـش دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری مەلیکێکی ئـازاو جوامێر و بەهیممـەت بـوو، گـەلێ کەتنی بە فـەرەنگ کـردووە، خـەڵك دەیگێڕنـەوە و باسـیان دەکـەن[2]. (المنـذري)یـش دەڵێـت: موزەففـەرەددین گۆکبـوری لـە کوشـتاری دوژمنـی سـەر کـەناراوەکانی (الـشافعي)دا، هەڵوێـستی ئازایانـەی دیـاربوو[3]. (ابـن الفـوطي)یـش باسـی ئازایـەتیی کردووە و دەڵێت: پیاوێکی ئازاو بـە هەڵمـەت بـوو، فـەرمانی دەرۆیـشت و، لـە گرتنـی ولاتاندا خێری لێ دەکەوتەوە[4].

(ابن خلکان) لـە جێگایـەکی تـردا دەڵێت: موزەففـەرەددین گۆکبـوری لـە شـەڕ و هەڵمـــەت و پـــەلاماردا، هـــەر بـــەردەوام بـــوو ـ هـــەر چەندیـــشە زۆر بـــوون ـ، نەشمانبیستووە لە هیچ هەڵمەتێکدا، شکابێت، ئەگەر باسی هـەموو چاکەکانی بکـەم، کتێبەکـەم دوورو درێـژ دەبێـت[5]. لام وایـە (ابـن خلکـان) لـەم پێداهەڵدانەیـدا پێـی لێڕاکێشاوە و زۆری ناوەتە سەر، ئەو باسی ئازایەتیی لە ڕادەبەدەری سەرداری ولاتێك دەکات کە خۆیشی خەڵکی ئەو ولاتەیە، موزەففەرەددین گۆکبـوری هـەموو جارێ لـە شەڕدا سەرنەکەوتووە، جارجـارەش شـکاوە، ئـەو هەرچـەندە لەبـەر (بـدرالـدین لؤلـؤ) هەڵنـەهاتووە بـەلام لـە هـەموو شـەڕەکانی موسـڵیدا سـەرنەکەوت. هـەروەهاش لـە هێرشـی سـەر ئازەربێجانـدا کـە لەگـەڵ (علاءالـدین قراسـنقر)ی سـەرداری مەراغـەدا پێکەوە دەستیان پێکرد، سەرنەکەوت، بەڵکو لەگەڵ ناوچەی شەڕەکەدا شکاو رایکـرد

(١) وفيات الاعيان ٢٧١/٣.

(٢) القزويني، آثار البلاد، ص ٢٩٠.

(٣) المنذري، التكملة، ١٤٤٧/٧ بالرونيو.

(٤) ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، جـ ٥، ص ٥٨٠.

(٥) وفيات الأعيان ٢٧٦/٣.

(هەڵات). موزەففەرەددین گۆگبوری، یەکەم راکردنی لە شەڕدا، ئەوەبووکە لە شەڕەکەی ساڵی (٥٧١ك/١١٨٤ز)دا لەبەر سەلاحەددینی[1] ئەیوبی هەڵات، ئەو شەڕەبوو کە موزەففەرەددین گۆگبوری فەرماندارییی قۆڵی راستی لەشکرەکەی (سیف الدین غازی)ی ئەتابەگی موسڵ دەکرد. (جلال الدین منکبرتی)ی سوڵتانی خواریزمانیش لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز)دا، لە شەڕدا راوی نا و گرتی. ئەو شەڕەبوو کە سەرداری هەولێر خۆی هەڵخڕاند و بە فیتی خەلیفەی بەغدا، دژ بەو سوڵتانە کەوتە شەڕ، بەڵام دوای ئەوەی بەدیل گیراو پەشیمان بووەوە، سوڵتان ئازادی کرد و ناردییەوە بۆ هەولێر.

مادامێکی باسی رەوش و رەوشتی موزەففەرەددین گۆگبوری دەکەین، دەبێ باسی خوێندەواری و پلەی رۆشنبیریشی بکەین. ئەم میرە سەودای زانستی حەدیس و مێژوو بوو، کتێبی (المسند في الحديث)ی[2] لە رێگای (أبو علي حنبل بن عبدالله الرصافي) و کەسانی دیکەوە خوێندبوو، بەڵکو باسی حەدیسیشی دەکرد[3].

هەوای زانستی مێژوویشی لە هزردا هەبوو، (ابن خلكان) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆگبوری هەندێ بابەتی مێژووی لەبەر بوو، زۆرجاران دەیگێڕایەوە[4]. بەڵام، بۆ شاعیران ئەو سۆزەی نەبوو، باسی نەدەکردن و، مەگەر بچوونایە بۆلای دەنا خەڵاتی نەدەکردن و هیچی پێنەدەدان[5].

لەگەڵ ئەم هەموو پێداهەڵدان و ستایشەیدا، هەندێ لە مێژوونووسان رەخنەی ترش و تاڵیان لێی گرتووە، (یاقوت الحموي) کە هاوچەرخی خۆی بووە و، دوو جاریش سەری لە هەولێر داوە و[6]، ستایشی کار و هەڵوێست و جوامێریی دەکات،

---

(١) ابن شداد، النوادر: ٥٢. البنداري، سنا البرق الشامي ٢٠٤/١.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٥٣٧/٨.

(٣) المنذري، التكملة، بالرونيو ١٤٤٨/٧.

(٤) وفيات الأعيان ٢٧٦/٣.

(٥) ن. م. ص.

(٦) لە ساڵی (٦١٣ و ٦١٧ك)دا بنۆڕە: وفيات الأعيان ١٧٨/٥ – ١٧٩.

پاشان دەڵێت: ((تەبیعەتی ئەم میرە جۆراوجۆرە و هیچی لە هیچی ناچێت، زوڵمی زۆرە و، بۆ مسکێن ـ الرعیة ـ دڵڕەقە، حەزی لە پارەی حەرامە))[1] پاشان دیسان بادەداتەوە و دەکەوێتەوە ستایشی و دەڵێت: ((بە هەرحاڵ، موزەففەرەددین گۆگبوری چاکەی لەسەر هەزاران هەیە، غەریبدۆستە و خێرخوازە و پارەی زۆریش دەنێرێت، دیلەکانی لە چنگ خاچدروشمان پێ ئازاد دەکات))، ئنجا دەڵێت: ((سەرداری هەولێر، لە هەڵویستی ڕاڕایی و هیچ لە هیچ نەچوونیدا، لەو کەسە دەچێت کە پارە، بە شێوەی ناڕەواو ناشەرعی خڕدەکاتەوە و دەیدات بە هەژار و کاری خێری پێدەکات)) ئنجا دەڵێت: لەو بارەیەوە، شاعیرێك دەڵێت:

کساعیة للخیر من کسب فرجها لك الویل، لا تزنی ولا تتصدقي[2]

واتا:

سەرپۆشێ، زێری بفرۆشێ و بیکا بەخێر، نەخێر
ئەنجامی هەر ئاگرە، نەبدات و، نەبیکا بە خێر

(ابن واصل)یش ڕای دەخاتە پاڵ (یاقوت الحموي)و، دەڵێت: موزەففەرەددین گۆگبوری مەلیکێکی بەڕێز و دیار و بەجەرگ و بە هەڵمەت بوو، هیممەتێکی بەرز و هەیبەتێکی گەورەی هەبوو... بەڵام بۆ پارەسەندن، سەری بەخۆیەوە نەبوو، زاڵم و بێ منەت بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، خێر و سەدەقەی بە زۆری بەردەوام بوو[3]. ڕای (أبو الفداء)یش، لە ڕای (یاقوت و، ابن واصل) دەچێت، کە دەڵێت: موزەففەرەددین

---

(١) یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٣٨.

(٢) م. ن. ص.

(٣) بنۆڕە: لاپەڕەی (٩) لە پێشەکییەکەی بەرگی چوارەم لە ((مفرج الکروب في اخبار بني ایوب))، ط ١٩٧٢ (محمد ربیع حسنین) لە وێنەیەکی نوسخە تەواوەکەی پاریسەوە وەریگرتووە، کە لە (دار الکتب المصریة، لە قاهیرە بە ڕەنووسی ٥٣١٩ دانراوە).

گۆگبوری مەلیکێکی ئازابوو، بەڵام بەزوڵم پارەی وەردەگرت[١]، دوای ئەوەش دەڵێت: ئاهەنگی لەدایکبوونی پێغەمبەری دەگێڕاو پارەیەکی زۆری بۆ خەرج دەکرد[٢]. (ابن الوردي)یش لە زمان (ابو الفداء)ەوە، هەر ئەو قسەیە دەکات و، هەروەك ئەوانی بۆدەچێ[٣].

ئێمەش، وای بۆدەچین کە تۆمەتی زوڵمکردن لە مسکێن و رەعیەت و، هەڵپەی کۆکردنەوەی پارە و پوول کە دراوەتە پاڵ سەرداری هەولێر، هەروا لە هیچەوە نەبووە، وەها زانراوە کە گەورە پیاوان و کاربەدەستانی ئەمارەتەکە ـ مەگەر بە دەگمەن ـ دەنا هیچیان لە سزای ئەو سەلامەت نەبوون. ئەوەبوو (ولي الدين ابا الثناء محمود بن محمد الحرانی)ی وەزیری حەپس کرد و[٤]، وەزیر (علي بن شماس) و[٥]، وەزیر (ابراهیم ابن علي بن أبي حرب الموصلي) و کوڕەکانیشی لە زیندان هاویشتن[٦]. هەروەها پەردەوان ( احمد بن السيد بن شعبان الاربلي)ی حەپس کرد و، دوای ئازادکردنی هەولێری بەجێهێشت[٧]. ( أسعد بن ابراهيم النشابی)ی بەرپرسی دیوانی ئینشاء و[٨]، (محمد)ی کوڕی (وەزیر ـ ولي الدين محمود الحرانی)ی بەرپرسی دیوانی شکاتی[٩] حەپس کرد و، (اسحق بن معالی بن شماس)ی برازای وەزیر

---

(١) ابو الفداء، المختصر في تأريخ البشر، ١٥٣/٣.

(٢) م. ص. ن.

(٣) تأريخ ابن الوردی، ذيل المختصر، ٢/ ٢٢٨. ياسين العمري الموصلي، ((غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام، ص ٨٠ — ٨١. محمد امين العمري، منهل الأولياء، ٣٣/٢.

(٤) ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان ١٨٧/٦.

(٥)ن. م. ترجمة (محمد)ی کوڕی (علي بن شماس) جـ/٧.

(٦) ن. م. ١/٤.

(٧) ابن خلكان ١٨٤/١ ط/بيروت.

(٨) ابن الشعار، جـ ١ سيرة اسعد بن ابراهيم.

(٩) ابن الشعار، جـ ٦ ورقة ١٨٧.

(علی بن شماس)ی حەپس کرد، کە لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز)دا لە زینداندا مرد[١]. نەك هەر ئەوانە، بەڵکو مستەوفی هەولێریش کە بە (المبارك ابن المستوفي) ناسراوە لە دەستبەسەریی بێبەش و سەلامەت نەبوو، ئەویشی گرت و فەرمانی دا مەچەکبەندی گرانی لە مەچەکان بکەن و، بۆ بەردانیشی داوای حەوت هەزار دیناری لێ کرد، (ابن المستوفي) ناچار هەندێکی قەرزکرد و هەندێکیشی لە داهاتی موڵکەکانی خۆی دابین کرد[٢]. (الحاجري)ی[٣]شاعیری ناسراوی هەولێریشی حەپس کرد. غەزەبی موزەففەرەددین گۆکبوری، خاوەن شەرع و مەلایانیشی گرتەوە. ئەوەبوو، مەلا (عزالدین ابي القاسم نصر بن عقیل نصر)ی برازای مەلا (أبي العباس الخضر الأربلي)یشی گرتەوە کە لە دوای مردنی مامی ناوبراوی ببوو بە بەرپرسی قوتابخانە عەقلییەکە و قوتابخانەکەی قەڵا، و ڕکی لەمیش گرت و لە هەولێریش دەری کرد، ئەمیش ناچار گواستییەوە بۆ موسڵ و، لەوێ مرد[٤].

لەوانەشەوە کە باسمان کردن، دەگەینە ئەوە، کە کەموزۆر وێنەیەکی تەواوی خەسڵەتەکانی ئەو میرە لە زەینـدا ومپـێش چاو بێنین. خەسڵەتی زوڵم و زیندانیکردن و رووتاندنەوە و دەستبەسەردا گرتنی موڵك و ماڵ و سامانی خەڵك، دەبنە دیوی ئەودیوی وێنەکەی ـ لێرەدا ماق خۆمانە بپرسین، ئەم پیاوە کە هەند خێر خواز و کارساز و لە خواترس و بە ئیمان بووە، ئایا، دەبێ بۆچی هەندەش دڵڕەق و زاڵم بووبێ؟ ئایا چ جۆرە کەسانێکی دەگرت و پارەوپوولی لێ دەسەندن و دەستی بەسەر موڵك و ماڵیاندا دەگرت؟.. دوورنییە ئەو کەسانە بەفۆرخکردنی زاد و خۆراکی خەڵك دەوڵەمەند بووبن، یان دەستی بەسەر ماڵ و ملکی هەندێ لە کاربەدەستەکانی خۆیدا گرتبێ کە پۆست و پێگەی وەزیفەکانیان بۆ گیرفانی خۆیان

---

(١)ابن الشعار، جـ ١ ورقة ٢٣٨.

(٢) ابن الشعار، جـ ٦ ترجمة المبارك ابن المستوفي.

(٣) ابن الشعار، جـ ٥. ابن خلكان ٢/١٧٠، ط ١٩٤٨.

(٤) وفيات الاعيان ٢/١١.

بەكارخستبێ، یان بەرتیلیان لە هاووڵاتیان وەگرتبێ. (الیونینی) چەند بەیتە شیعرێكی (أسعد بن ابراهیم بن حسن ـ أبو المجد الأربلی) مان، بۆ دێنێتەوە كە بەرپرسی نووسین (الانشاء) بووە لە دیوانی سەرداری هەولێر، لەم شیعرەیدا باسی ناپاكیی كارمەندە گەورەكان و، دیاردەی بەرتیل و گرفتاربوونی ئەو خەڵكە دەكات كە سەر لە دیوان و دایەرەكانی حكومەت دەدەن. (أبو المجد) كە خۆیشی لە گرتن و حەپسی سەلامەت نەبووە[1]، لەم بەیتانەیدا دەڵێت:

قد قسمنا الديوان خمسة اقسا... م، عليها لكل قــــولٍ دليلُ

ربّ حقّ فلا يطاع، ومنســــو... ب الى الظلم قوله مقبــولُ

ثم شخص كأنه الجرف في النح... و، فلا فاعــــل ولا مفعولُ

ومصــــرُ على التحيّف والظل... م، بعيد عن الصواب جهولِ

واخـو حاجــةٍ يمشي أحــــوا... لا لديه، إن جــاءه البرطيلُ

أتراهـــم لم يعلمــــوا ان كلا منهم عــن فعاله ســـؤل

واتا:

دیوانمان كرد بە پێنج بەشان هەر بەشەو، چاوساغێ لەسەر

هــەق بزرە، دەنگـــی نییە زوڵم كردوویە دەسـبەســـەر

كەسێ، خۆی تەنیا حەرفێكە نە موبتەدایــە و، نــە خەبەر

سـوورە لەسەر زوڵم و ستەم كەربابە، وێنەی جاشــەكــەر

هــــەژارێ، ئیشێكی هــەبێ ملی دەگرن وەك گورگ و مەڕ

كورنووش نەبا، بەرتیل نـەدا چنگ لەسەر شان، دەیكەنەدەر

گــوایا، ئــەمانــە، نــازانن كــار، وا بڕوا، ناچێتە ســــەر؟

---

(١) عقود الجمان، جـ ١، ترجمة أسعد بن ابراهيم.

کاتێکیش، وەزیر، گرووپی کارمەندانی دیوانی حساباتی هەولێری، لەسەر گزی و فزی دەستگیر کرد، ئەم بەیتانەی نووسی:

جمـــاعــة الديوانِ في | ليلة شــحط مظلمة
وقد غلّت أيدي الوز... | ير منهــم منتقمـــة
لا رحــــمَ الله الـذي | يرحـــمُ قوماً ظلمة

واتا:

وەزیر کەوتە وێزەی دیوان | کـارمـــەنــدانی بـــردە زیندان
زیندانێکی کـرو بێ دەنگ | ئەنگوست لە چاو و شەوەزەنگ
هـەرکەسێ بۆیان تێکەوێ | خــوایــە، خۆشی ڕێی تێکەوێ

(سبط ابن الجوزي) کە مێژوو نووسێکی هاوچەرخی موزەففەرەددین گۆکبوری بووە و، لە جێگایەکی دیکەدا تۆمەتباری دەکات کە بە دەستی ئەنقەست (زین الدین یوسف ینالتگین)ی[1] برای خۆی کوشتووە، وام پێباشە سەیرێکی نووسینەکانیشی بکەین و، بە وردی سەرنجی لێ بدەین کە چۆن چۆنی پاکانەشی بۆ دەکات و هەقی دەداتە دەست. ئەم مێژوو نووسە، هەقی دەداتە دەست و دەڵێت: «دەڵێن، ئەم کابرایە دەست بەسەر دیوان و دایەرەکانی خۆیدا دەگرێت و کارمەندەکانیان لە ڕەگەوە هەڵدەکێشێ. کێ دەڵێ، خیانەتی بە چاوی خۆی لێ نەدیون. دیارە، وای بە باشتر و خێرتر زانیوە کە ئەو پارەوپوولە، بۆ خێر و قوربانی سەرف بکرێت چاکترە»[2].
ئێمەیش دەڵێین: ئەگەر ڕەفتاری خراپ و دەستپیسیی هەندێ لە کارمەندانی دیوانی هەولێر و، ڕووتاندنەوە و چەوساندنەوەی خەڵك و خیانەتی وەزیفی ـ وەك (ابن الجوزي) دەڵێت ـ بووبێتە هۆی گرتن و حەپسکردن و دەرکردنی کارمەندان، بەڵام، خۆ، ئەم بیانووە، هەموو قوربانییەکانی دەستی سەرداری هەولێر ناگرێتەوە، واتا

(١) مرآة الزمان ٤٠٧/٨.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٨٣/٨.

کەسانی بێتاوانیشی دووچار کردووە. سا بەهەرحاڵ، ئەم میرە، حەزی لە زوڵم و ناهەقییش کردووە و، کەسیش ناتوانێ پاکانەی تەواوی بۆ بکات.

## دوو: ئاهەنگەکانی هەولێری لەدایکبوونی پێغەمبەر:

موزەففەرەددین گۆکبوری ـ وەك باسمان کرد ـ لەناو خەڵکەکەدا، وا، ناسراو بوو کە پیاوێکی زۆر ئایندۆستەو، دەست لە دامێنی دین بەرناداو، زۆریش رەسوولی (د. خ) خوای خۆش دەوێت. ئەم سۆز و خۆشەویستییەشی هەند لە دڵیدا رەگی داکوتابوو، بڕیاری دا هەموو ساڵێك یادی رۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د. خ) بە ئاهەنگێکی گەورە نوێ بکاتەوە بە جۆرێ کە لە هەولێر و هەموو ئەمارەتەکەیدا دەنگ بداتەوە. ئەم رۆژە، لە لای موسڵمانان رۆژێکی پیرۆزە، جەژنێکە، سەرداری هەولێر دایهێناو لە هەولێریشەوە بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەوە.

(ابن الشعار) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری شتێکی ئەوتۆی داهێنا، نە مەلیکەکانی ئێستاو نە خەلیفەکانی پێشتر نەیاندەزانی و نەیاندەکرد پیرۆزبایی و رێزلێگرتنی ئەم جەژنە حورمەتێك بوو لە پێغەمبەری[1] (د. خ) دەگرت. تەنیا، خۆی کردوویەتی، پێش ئەو کەس نەیکردبوو[2]. بە دووریشی نازانین، ئاهەنگی سەری ساڵی فەلەو دیانەکانی ناوچەکەو ئاهەنگی جەژنی قیامەتیان، موزەففەرەددینی خستبێتە سەر[3]هەوەسی داهێنانی ئەم جەژنەی.

---

(١) ابن الشعار، مخطوط ((عقود الجمان)) ٥/١٥٦.

(٢) ن. م. ص: ١٥٧. بنۆڕە گوتاری (هـ. فوش — H. Fuchs) لە:
The Encycl. Of Islam, art Mawlid< ١٩٣٦, V. III, P. ٤٢٠.

هەروەها: آدم میتز، الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري، جـ ٢، ص ٢١٨ — ٢١٩.

(٣) بنۆڕە: بزانە کلۆد کاهین لەبارەی ماددەی (بکتگین) چیی نووسیوە.
The Encycl. New Edition, ١٩٦٦, V, I, P. ١١٦١

لەوێدا دەڵێت: رەنگە ئەو ئاهەنگانە لە رقی ئاهەنگەکانی مەسیحیانی هەولێر بووبێت کە بەردەوامن لەسەری.

دوو مانگ بەر لە رۆژی ئاهەنگی مەولوود، موزەففەرەددین گۆکبوری هەموو شتێکی تەیار و ئامادە دەکرد و، وەپێش خەڵکەکە دەکەوت و لەگەڵ کارگەرەکاندا کەپر و گومەزگەلێکی زۆری لە تەختە دروست دەکرد و بەخێوەت (سرادق)ی گەورە گەورە بانی حەوشەو گۆڕەپانەکانی دەگرت و، چین چین دایدەمەزراند، جاری، وا، دەبوو دەگەیشتە بیست گومەز. جگە لەوانە، لە گۆڕەپانە گەورەکەی[1] نزیك قەڵا، دەوارگەلێکی زۆری بۆ ئەو میوانانەش هەڵدەدا کە لەوڵاتانی نزیکی، وەك بەغداو موسڵ و وڵاتی فارس و شنگال و (نصیبین) و جزیرەوە بەو بۆنەیەوە روویان لە هەولێر دەکرد و ئەو شاند و میوانانە، زۆرتر مەلا و سۆفی و وتارخوێن و وەعزبێژ و قورئانخوێن و مەولود خوێن و شاعیران بوون[2].

لەگەڵ سەرەتای مانگی سەفەردا، تیپەکانی مۆسیقا کە لە بن گومەزەکاندا ئامادەبوون، دەستیان دەکرد بە گۆرانی و مۆسیقا ژەنین و ئاهەنگیان سازدەدا، گروپێکی کۆتەڵباز و[3] پێڕێکی رابواردنی پاك و دەروێشانەش دەکەوتنە چالاکی و بزاڤ، خەڵکەکەش بە دەوریاندا تەماشایان دەکرد و رایاندەبوارد، بە درێژایی رۆژانی ئەو بەزمە ئیش و کاری خۆیان جێدەهێشت و بۆ سەر کار نەدەچوون، لەو

---

(١) ئەم گۆڕەپانە کەوتبووە نێوان قەیسەری و خانەقاو دەرگا گەورەکەی قەڵاوە. ئەوە قسەی (ابن خلکان)ە، ئنجا دەڵێت: گومەزەکان، بەریز، هەر لە دەرگای قەڵاوە دەیگرتەوە تا دەرگای خانەقا کە کەوتبووە تەنیشتی گۆڕەپانەکەوە: (وفیات الاعیان ٢/٢٧٥). مخطوط (عقود الجمان ٥/١٥٦).

(٢) ابن خلکان ٣/٢٧٣.

(٣) (ابراهیم حمادة) باسی هونەری کۆتەڵبازی (المخایلة) — (قەراگۆز) دەکات کە لە میسر هەبووە و، باسی ماوەی بڵاوبوونەوەشی لەو وڵاتەدا دەکات و دەڵێت: بەڵام کۆنترین باسوخواسی ئەم هونەرە، لە دەرەوەی میسر، ئەوەی موزەففەرەددین گۆکبوریی سەرداری هەولێرە کە هەموو ساڵێك ئاهەنگی مەولودی دەگێڕا. بنۆڕە: کتێبەکەی خۆی: (خیال الظل وتمثیلیات ابن دانیال، ص ٤٠).

دەشبینین (ابن الجوزي)یش باسی شتێکی وێنەی (خیال الظل) دەکات کە ساڵی ٥١٧ك، لە بەغدا، لە سەردەمی خەلیفە (المسترشد باللە) پیشان دەدرا. لە ئاهەنگە گەورەکانی تازەکردنەوە و چاککرنەوەی شوورەکانی شاری بەغدا کە حەوت شەو و حەوت رۆژ درێژەی کێشا، گومەزێکی گەورەیان دامەزراند پەیکەرگەلێکی عاجباتییان بەسەریەوە داتاشیبوو: بنۆڕە: (المنتظم) ٩/٢٤٥.

ئاهەنگانەدا بەشدارییان دەکرد[١].

موزەففەرەددین گۆکبوری، هەموو رۆژێك، دوای نوێژی عەسر، لە قەڵا دەهاتە خوار و سەیری ئەو یارییە خۆشانەی دەکرد و گوێی لە گۆرانییەکانیان دەگرت، بەشەویش دەچووە خانەقاو، لەوێ، گوێی لە مەولود دەگرت و، بۆ سبەینێ بەیانییەکەی، دوای نوێژی بەیانی، دەچوو بۆ راو و، پێش نوێژی نیوەرۆ دەگەڕایەوە و دەچووەوە سەر قەڵاکە. بە درێژایی مانگی سەفەر و سەرەتای مانگی (ربیع الأول) بەم جۆرەی دەبردەسەر تا شەوی مەولود، ئیدی لەو شەوەدا ئاهەنگەکە هەند گەرم دەبوو، دەهاتە جۆش، پاشان نوێژی مەغریبی، لە قەڵا دەکرد و، دادەبەزییەوە و، بە دەستە و دایەرەیەکی تایبەت و بێ وێنەوە، بەرەو خانەقا دەکەوتە ڕێ و بەکۆمەڵێ خەڵکی مۆم بەدەست دەورە دەدراو، دوو مۆم یان چوار مۆمی گەورەش[٢]، هەریەکەیان هێسترسوارێك رایدەگرت.

بۆ رۆژی مەولودەکەش، هەر لە بەیانی زووەوە، دیاری و خەڵاتی بوخچە پێچ (لە بوخچە پێچراو)، هەریەکە و بە دەستی دەروێشێکەوە (سۆفییەکەوە)، لە قەڵاوە، بەڕیز دادەبەزی و بەرەو خانەقا رێچکەیان دەبەست، لەوێ (واتا لە خانەقا) سەران و گەورە پیاوانی شارەکە گردببوونەوە (خڕببوونەوە) و، کورسییەك بۆ وەعزخوان، بە بەرزییەکەوە، دانرابوو، کەژاوەیەکی تەختەی بە پەنجەرەش دامەزرابوو، موزەففەرەددین گۆکبوری لە ناویدا دادەنیشت و، لە پەنجەرەکانەوە، بە هەموو لایەکدا دەیڕوانی و سەیری حەشاماتەکەی دەکرد و سەرپەرشتیی نمایشی سەربازیی دەکرد کە بەو بۆنەیەوە تا عەسرانێکی درەنگ بەردەوام دەبوو[٣].

---

(١) ابن خلكان ٣/٢٧٤.

(٢) (ابن خلكان) هەتا، لە هەولێر بوو، لەم ئاهەنگانەی شارەکەی خوێندا ئامادە دەبوو. لێرەدا، وەك کەسێ شاهیدی بدات، دەڵێت: ((لە ناو کۆڕی مۆم بەدەستاندا: دوو مۆم، یان چوار مۆم...- بە گومانم لە ژمارەیان...)): وفيات الأعيان ٣/٢٧٤.

(٣) ن. م. ص ٢٧٥.

بە كۆتایی ئەم ڕێورەسمەش، ئیدی هەموویان بەجارێ دەچوون بۆ نانخواردن، پاشان بۆ گوێگرتن لە وتارە گەورەكە، دووبارە كۆدەبوونەوە كە بە درێژایی ئەو شەوە، تا سپیدەی بەیان درێژەی دەكێشا[1]. ئەم وتارە، ئاسایی، بە باسی ڕەوشی پێغەمبەر دەستی پێدەكرد و، بە خوێندنەوەی چیرۆكی (المعراج)[2] تەواو دەبوو. (أبو الخطاب عمر بن الحسن)ی ناسراو بە (ابن دحية البلنسي)، لە ساڵی (٦٠٤ك/١٢٠٧ز)دا، كە لە هەولێر بوو، لەو دەمەدا كتێبێكی دانا، بە ناوی (كتاب التنوير في مولد السراج المنير) و، بە دیاری، پێشكەشی كرد بە سەرداری هەولێر موزەففەرەددین گۆكبوری، بۆ ئەوەی بەم بۆنەیەوە[3] دڵی خۆش بكات. (ابن دحية) كتێبەكەی خۆی لە بەردەمی سەرداری هەولێردا خوێندەوە، ئەمیش هەندەی پێ خۆش بوو هەزار دیناری خەڵات كرد[4].

مێژوونووسان بە درێژی باسی هەموو جۆرە خۆراكێكیان كردووە كە لەو ئاهەنگانەدا دەخرانە پێش خەڵك و، دەڵێن ئاژاڵێكی زۆر لە (مەڕ و گا و حوشتر، سەردەبڕدران، بە جۆرێكی ئەوتۆ كە لە وەسف بەدەرن[5]. دەڵێن لەسەر سفرە، سەد

---

(١) ابن خلكان ٣/ ٢٧٥. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٨١/٨.
H. H. Howorth, History of The Mongols, V. III, P. ١٣٢.

(٢) آدم ميتز، الحضارة الاسلامية ٢١٩/٢.

(٣) ابن خلكان ١٧٢/٣، ٢٧٥/٣. ابن الشعار، عقود الجمان ١٥٦/٥.

(ابن الشعار) دەڵێت: ((یەكێ بووم لەوانەی كە گوێم لێبوو كتێبەكە بۆ مەلیكی گەورە، موزەففەرەددین گۆكبوری دەخوێنرایەوە)) (ابن خلكان)یش دەڵێت: (لە — جمادي الآخرە —ی ساڵی (٦٢٦ك)دا، لە هەولێر، لە شەش ئەنجومەن و كۆبوونەوەدا گوێمان لەم كتێبە گرتووە: وفيات الاعيان ١٢٢/٣. واتا بەرلەوەی (ابن خلكان) لە هەولێر دەرچووبێت.

(٤) ابن خلكان ١٢٢/٣، ٢٧٥/٣. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣٧/١٣.
الفاسي المكي ١٠٥/٧، ومادة المولد.

(٥) ابن خلكان ٢٧٥/٣. The Encycl of Islam, ١٩٣٦, V. ١١١, P. ٤١٣٠

ئەسپی قشلمش)[(١)] دیتراوە، هەروەها، سفرەکە پێنج هەزار سەر ئاژاڵ و دە هەزار مریشکی برژاوی لەسەر بووە و، سەد هەزار سینی و، سی هەزار دەفری پڕ لە حەڵوای لەسەر ریزکراوە[(٢)]. رۆژی مەولود دوو سفرەی گەروە رادەخران، یەك لە گۆڕەپانەکە بۆ خەڵکی رەشۆکی (بۆ هەزاران ـ وەك ابن خلکان دەڵێت) نان و پێخۆرێکی زۆری لە ژمارە بەدەری لەسەر ریزدەکرا و[(٣)]. سفرەی دووەم، لە خانەقا بۆ حەشاماتەکەی ئەوێ رادەخرا[(٤)]. ئاهەنگەکانیش بە خەڵاتکردنی مەلاو وەعزخوان و قورئانخوێن و شاعیران کۆتایی دەهات، بە تایبەتیش خەڵاتکردنی ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی وڵاتەکەوە دەهاتن[(٥)]

بێکومان ئەم هەموو ئاهەنگانە، زۆر دەنیشتە سەر گەنجینەی ئەمارەتەکە، مێژوو نووسان دەڵێن، ئەرك و مەسرەفی ساڵانەی دەگەیشتە سێسەد هەزار دینار[(٦)]. دەبێ لەوەش ئاگادار بین کە زۆربەی ئەو مێژوونووسانە، خوویان پێوەگرتووە، لە باسی خەرج و پارەی زۆردا، زۆرتری دەهاونەسەر.

---

(١) لە (مرآة الزمان)دا، دەڵێ (مائة فرس قشلمیش)، ئێمەش مانای ئەم (قشلمیش)ە مان نەدۆزییەوە، رەنگە مەبەستی لە (قزلیش) بێت کە بە تورکی ئەکا: (سوورەوەکراو).

(٢) سبط ابن الجوزي ٦٨١/٨. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨٣.

ابن کثیر ١٣٧/١٣. الغساني، العسجد المسبوك، بالرونیو ٣٢٠.

(٣) ابن خلكان ٢٧٥/٣.

(٤) م. ن. ص.

(٥) م. ن. ص.

(٦) سبط ابن الجوزي ٦٨٣/٨. الذهبي، تأريخ الاسلام، ن.

دول الاسلام ١٠٣/٢.

## سـێ: مـردن و شـاردنەوەی (سـپاردنی) موزەففـەرەددین گۆکبۆری

سـەرداری هـەولێر موزەففـەرەددین گۆکبـۆری لـە رۆژی (١٨)ی رەمـەزانی سـاڵی (٦٣٠ك/حوزەیرانی ١٢٣٣ز) لە ماڵەکەی خۆیدا کە کەوتبووە دەوروبەری شار و، پێشتر خانووی میر (شهاب الدين قرطاى بن عبدالله) [1] بووە، کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان بـردە قـەڵاو، لـەوێ بـە ئەمانـەت بـەخاکیان سـپارد تـا وادەی حـەج، چـونکە پێـشتر رایسپاردبوو (وەسیەتی کردبوو) لەو گۆڕەدا بینێژن کە لە چیای عەرەفە، لـە مەککـە بۆخـۆی حـازری کردبـوو[2]. بـۆ سـاڵی نـوێ (٦٣١ك/١٢٣٤ز) کـە حاجیـان، بـۆ حـەج کەوتنەڕێ، قەبرەکەیان هەڵدایەوە و تەرمەکـەیان دەرهێنـاو لەگـەڵ خۆیـان بردیـان. بەڵام لەو رێگا بیابان و هاتونەهاتە، ئاویان لێ بڕاو ماندوو بوون و بڕسـتیان لێ بـڕاو، ئـەو سـاڵە حـەجیان بـۆ نـەکرا، ناچـار لـە رێگـەی شـاری (لینـە)وە[3] بـەخۆیان و بـە تەرمەکـەوە گەڕانـەوە و، بـە باشـتریان زانـی لـە سـەرە رێگـای بـەژانی (کوفـە)، لـە (نەجـەف) لـە نزیـك مەشـهەدی مـیری موسـوڵمانان (علـي بـن أبـي طالـب ـ خ. ل) بینێژن[4]. وەلێ، تەنیا (ابن العبري) گوتوویەتی گوایـا لـە مەککـە نێـژراوە[5]. هەرچی (الغساني)یە، ئەوە، ئەو دەڵێ: (یەکەم جار، لـە کوفـە ناشـتیان، پاشـان تابووتەکـەیان

(١) لە بارەی ئەم میرەوە، بنۆڕە: (دیوان و خزان السلاح).

(٢) ابن خلكان ٢٧٦/٣. الفاسي المكي، العقد الثمين ١٠٦/٧. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ١٤٠/٥.

(٣) (لینە): مەنزڵگەیەکە لەسەر رێگای حیجاز بە دیوی عیراقدا: ابن خلكان ٢٧٧/٣.

(٤) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٨٣/٨ — ابن خلكان ٢٧٦/٣. الذهبي، مخطوط، تـأريخ الاسلام، ق ٢، الجزء الاخير، ورقة ١٨٣ — ١٨٤. ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، ط، لاهور ٥٩٠/٥. ابن كثير، البداية والنهاية، ١٣٧/١٣.

ابن أبي عذيبة، انسان العيون، ٣٠٤. ابن العماد، شذرات الذهب ١٤٠/٥.

محمد امين العمري، منهل الأولياء، ١٠٤/٢.

(٥) ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ٢٤٩.

هەڵگرت و بردیان بۆ مەککە و لەوێ ناشتیان[1]. بە بڕوای ئێمەش هیچیان ڕاست ناکەن، چونکە ئەم دوو حەکایەتە، لەوە ناچن کە هەموو مێژوو نووسەکان لەسەری کۆکن و یەك دەنگن[2].

## چوار: کۆتایی ئەتابەگایەتیی هەولێر و لکاندنی ئەمارەتەکە بە مەملەکەتی خەلیفەی عەبباسییەوە، ١٧ی شەووالی ٦٣٠ك/٢٦ی تەمووزی ١٢٣٣ز:

ڕادەستدانی هەولێر بە خەلیفەی عەبباسیان، بەو دەستووره ئەنجام نەدرا کە سەرداری هەولێر بڕیاری دابوو کاتێ بەکوڵ و بە دڵ، چوو بۆ بەغدا، بۆ لای خەلیفە و کلیلەکانی لەگەڵ خۆی برد، بەو دەستوورەش ڕادەست نەدرا کە سەرداری هەولێر بە دوو نوێنەرەکەی خەلیفەی گوتبوو کاتێ هەردووکیان سەرداری هەولێریان تا ناوشاری هەولێر بەڕێ خست و لە هەولێر مانەوە. دوورنییە

(١) الغساني، العسجد المسبوك، بالرونيو: ٣٣٠.

(٢) هەرچی، ئەم دوو حیکایەتە، لە کۆی ڕای مێژوونووسانی دیکە جیاوازن، بەڵام لەوەدا، لەگەڵیاندا یەك دەگرنەوە کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە هەولێر نەنێژراوە، هەرچەندیشە لە هەولێر مردووە. مەزارگەیەك لەم شارەدا هەیە گومەزێکی بچکۆلەی گڵی لەسەرە و، کەوتووەتە سەر شەقامی لای سینەمای سەلاحەددین و نزیکە لە مەرکەزی پارێزگاکەو خەڵکی شارەکە ڕێزی لێ دەنێن و بە پیرۆزی تێدەگەن و، وەها دەزانن کە گۆیا گۆڕی (سوڵتان مظفر)ە زۆر ڕێی تێدەچێ کە گۆڕی باوکی بێت، واتا گۆڕی (زین الدين علي گچك)ی دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی هەولێر بێت. بەڵێ ئەو لە هەولێر مرد و لە هەولێریش نێژراوە، بنۆڕە: ابن الأثير، الباهر، ١٣٥. الكامل، ٣٣١/١١.- =ابن خلكان ٢٧٠/٣. أبوشامة، الروضتين ١٥٢/١. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق مجلد ٤٧: ١٩. ابن الفرات، مجلد/٤، ج ١، ص ١٤. ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٢٩٢.

ئەم گۆڕە، گۆڕی (زین الدین یوسف نیالتگین)یش نییە، ئەو لە شاری (الناصرة)ی فەلەستین مردووە. پێدەچی ناوبانگی موزەففەرەددین گۆکبۆری، لە هەولێر، لە ناوبانگی باوکی گەورەتر و بڵاوتربێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە خەڵك گۆڕی باوك بە گۆڕی کوڕەکەی دەزانن.

موزەففەرەددین گۆکبوری لە بڕیاری رادەستدانی هەولێر، بە خەلیفە، پاشگەز بووبێتەوە. پێشتر ئەوەشمان باس کرد کاتێ لە بەغدا گەڕایەوە و، پاشتر لەگەڵ لەشکری خەلیفەدا، لە (کەرخینی) مایەوە و لە ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣٢ز)دا بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەگۆلان لەوێ سەربازگەیان دامەزراند، لەو ماوەیەدا لەگەڵ سەربازەکانی خەلیفەدا نیگەرانی کەوتە نێوانیان و لێك تووڕەبوون و دەستیان دایە چەك و خوێنیان لە نێواندا رژا ـ دوور نییە داخی ئەو رووداوە ناخۆشە لە دڵی سەرداری هەولێردا مابووبێت، ئەو کاتێ هەردوو نوێنەرەکەی (جمال الدین قشتمر)ی سەرلەشکری خەلیفە: (شرف الدین علي ابن قشتمر) و (سعد الدین حسن بن الحاجب علي) لە هەولێرەوە بۆ بەغدا ـ بە دەرکردنێکی بە ئەدەبانە ـ گەڕاندەوە، ئەوە بێگومان، هەڵوێستێکی پێچەوانەی هەڵوێستی یەکەمی بوو کە زۆر بە گەرمی خۆی گەیاندە لای خەلیفە و کلیلەکانی بۆ برد، واتا لە هەڵوێستی دۆستانەی یەکەمی پەشیمان بوو، لە بڕیاری لکاندنی ئەمارەتی هەولێری، بە بەغداوە، پاشگەز ببووەوە.

ئەوەبوو، موزەففەرەددین گۆکبۆری (مجدالدین أسعد ابن ابراهیم بن حسن الشیباني الاربیلي)ی حەپس کرد، ئەمەش بەڵگەی ناکۆکیی نێوان سەرداری هەولێر و خەلیفە بوو. ئەم (مجدالدین أسعد)ە، لە ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز)وە[1]، نامەنووسی دیوانی سەرداری هەولێر بوو، پێگەو جێگەی لە ئەمارەتەکەدا تابڵێی بەرز و باڵا بوو، یەکە پیاوی تەلاری سەرداری هەولێر بوو کە لەگەڵ موزەففەرەددین گۆکبۆریدا سەردانی بەغدایان کرد. ئەم شاعیرە، لە بەردەمی خەلیفەدا شیعرێکی خوێندەوە، بە نموونە، ئەم دوو بەیتەی خوارەوەی لێ دەخەینە روو:

جلالة هيبة هذا المقام  تجبر عالـم علـم الكلام

(١) اليونيني، ذيل مرآة الزمان/١١١.

كأن المناجـي به قائماً يناجى النبيَّ عليه السلام[١]

واتا:

گەورە مامۆستای وشەو كەلامان لاڵە لە هـەیبـەت ئاڵاو مەقامان

مـن، وا، لەبەر تـۆ دەلاڵێمەوە رێك لە پێغەمبەر دەپاڕێمەوە!.

ئنجا، بەقسەی ئاسایی كەوتـە ستایشی خەلیفـە، دوای سـاڵێك لـەم میوانداریيـە، موزەففـەرەددین گۆكبـوری (مجدالـدین أسـعد)ی گـرت و لـە قەڵاكـەی كـەرخینی (كەركوك) حەپسی كرد، ئەو قەڵایـەش سەر بەهەولێر بـوو، لـەوێ مایـەوە تـا سـاڵی (٦٣٠ك/١٢٣٣ز) موزەففـەرەددین مـرد و، ئەمارەتەكەشـی بـە مەملەكـەتی خەلیفـەوە لكێنرا، ئەوجا، سەربازەكان (مجدالدين اسعد)یان، بـەردا و، چـوو بـۆ بەغـدا و، لـەوێ رێـز و حورمـەتێكی زۆری لێ گـیراو، چـەندین وەزیفـەی گـەورەی دوابـەدوای یـەك وەرگـرت[٢]. رەنگـە دەسـگیركردن و، پاشـان ئـازاد كردنـی ئـەم شـاعیرە و چـوونی بـۆ بەغـدا و، وەرگرتنـی گـەلێ پۆسـت و پلـەی گـەورە، پێوەنـدیی بـە هەڵوێـستی نـوێی هـەولێرەوە بەرامبـەر بـە بەغـدا، بووبێـت.. (د. مـصطفى جـواد) لـە زمـان (ابن العديم) و (ابن الكتبي)یەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (مجدالدين أسعد، هەر شتێكی تـازە لـە هـەولێر روویـدابا، دیـوانی خەلیفـەی لێ ئاگـادار دەكـرد). موزەففـەرەددین گۆكبوری پێی زانی و حەپسی كرد[٣]. ئەگەر ئـەم قـسەیە راسـت بێـت، ئـەوە، تەكەز لەسـەر بۆچـوونەكەی خۆمـان دەكاتـەوە كـە پێوەنـدیی نێـوان هـەولێر و بەغـدا كەوتبووە لێژی و بەرەو هەرەسهێنان دەچوو، ئەوەش ببووە هۆی تەنینەوەی ناكۆكی

(١) م. ن. ص.

(٢) م. ن.

(٣) بنۆڕە پەراوێزی كتێبەكەی (ابن الفوطي): (تلخيص مجمع الآداب) جـ ٤، ق ١، ص ٥٦١.

(د. مصطفى جواد) نـاوی كتێبەكـەی (ابـن العـديم)ی نـەگوتووە و، پێدەچـێ مەبەسـتی لـە كتێبـی (بغية الطلب في تأريخ حلب) بووبێت كە دەستنووسەو، لە كتێبخانـەی (احمـد الثالث)ە لـە ئەستەنبول. هەروەها لە كتێبەكەی (ابن شاكر الكتبي)یشدا، نییە، كە (مصطفى جواد) پـشتی پێدەبەستێ: بنۆڕە (فوات الوفيات، ١٧/١) ٠/ترجمة اسعد مجدالدين ابراهيم الاربلي.

و، هەروا بە ئاسانی، هەولێر، دوای مردنی خاوەنەکەی نەدەخرایە سەر بەغدا و رادەستی خەلیفە نەدەدرا. هەستان و راپەڕینی خەڵکی هەولێر دژ بە هێزی داگیرکاری خەلیفەی عەبباسیان، قوربانییەکی زۆری تێدا دراو، خوێنێکی زۆریشی لە هەردوولا تێدا ڕژا، ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە کە ئەمارەتی هەولێر ئامادە نەبوو سەر بۆ خەلیفەی بەغدا شۆڕ بکات و لەسەر بەرەقانێ بەردەوام بوو، تا راپەڕین و بەرخۆدانەکەی سەرکوت کراو، هەولێر داگیرکرایەوە.

موزەففەرەددین گۆگبۆری لە (١٨)ی رەمەزانی (٦٣٠/١٢٣٣ز)دا[١] گیانی لە دەست دا. دوای ئەو، هێزەکانی خەلیفە یەکسەر، بەرەو هەولێر کشان[٢]. خەلیفە هەندێ فەرماندار و میر و سەرپەرشتی بەسەر هێزەکانی خۆیەوە دانابوو، وەك: میر (أرغش الناصري الرومي) و (علاءالدين الدكز الناصري) و (ظهيرالدين ابي علي الحسن بن عبدالله). وا دیاربوو، خەلیفە دەیزانی کە ئەم لەشکرەی، لووتی بە بەرخۆدان و بەرەقانیی هەولێرییاندا دەتەقێتەوە، لەوەش دەترسا، کەسێکی دی دەستپێشخەری بکات و، هەولێر، بۆ خۆی دابڕێت.

لە قەڵای هەولێر، دوو کۆیلە (مملوكان)ی موزەففەرەددین گۆگبوری: (برنقش) و (خالص) کاربەدەست بوون، نامەیان بۆ هەریەکە لە خەلیفە و، (عمادالدين زەنگی)ی[٣] سەرداری شارەزوور ـ زاواکەی موزەففەرەددین گۆگبوری ـ و، مەلیکەکانی بنەماڵەی ئەییوبیان. ناردبوو، گوتبوویان: ئەمارەتی هەولێر، بۆ ئەو کەسەیە کە

---

(١) ابن خلكان ٣/٢٧٦.

(٢) الحوادث الجامعة: ٤٤. الغساني، العسجد المسبوك ٣٣١.

(٣) (سوادي الرويشدي) لە لاپەڕەی (١٥٠)ی کتێبەکەی خۆی (امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ)دا پشت بە قسەکانی (الذهبي) دەبەستێ و، دەڵێت: (عمادالدين زەنگی) هەردوو قەڵاکەی خۆی (العقر و، الشوش)ی لەو ساڵەدا: (٦٣٠ك) بە دەستەوە بووە، بەڵام ئەم مێژوونووسە، قسەی وای نەکردووە، بەڵکو وتوویەتی: ئەم دوو کۆیلەیە نامەیان بۆ (عمادالدين زەنگی) ناردووە، دنەی دەدەن کە بێت بۆ هەولێر و شارەکەی رادەست بدەن: مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة/١٨٠. (عمادالدين زەنگی)یش، دوازدە ساڵ بەرلەوەش، ئەو دوو قەڵایەی بەدەستەوە نەمابوو، بەڵکو، بە بریکاریی خەزووری حوکمی شارەزووری دەکرد و، تا دەوروبەری ساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٢ز)یش کە کۆچی دوایی کرد، شارەزووری هەر بەدەستەوە بوو — بە قسەی ابن خلكان — ٤/٢٩٦.

دەستپێشخەری بکات و زووتر بگاتە شارەکە[١]. ئەوەبوو، خەلیفە زووتر کەوتە خۆ و، لەشکری خۆی نارد. بەڵام ئەم دوو کۆیلەیە کە بەمەیان زانی هەڵوێستی خۆیان گۆڕی و، کەوتنە بەرەڤانی و بەرگری و، ناردیان لە دووی (عمادالدین زەنگی) کە زوو بکەوێتە خۆو بگاتە هەولێر و شارەکە وەربگرێت[٢]. ناردیشیانە سەر (الملك الصالح أیوب ابن الملك الكامل)ی سەرداری (حران) [٣]کە لەوکاتەدا[٤]، لە (ئامەد) بوو، ئەم بەرەو هەولێر لەشکری کەوتە ڕێ، لەولاشەوە، لە شنگالەوە، مەلیکی ئەیوبی (اسماعیل ابن الملك العادل) رووی لە هەولێر کرد. (سبط ابن الجوزي) دەڵێت: ئەم دوو مەلیکە ئەیوبییە کەوتنە کێبڕکێ و ململانێ، کە بۆ ئەوان جوان نەبوو[٥]. بەهەرحاڵ هیچیان نەیانتوانی فریای هەولێر بکەون. هەرچی (عمادالدین زەنگی)یە، ئەوە، نازانین، بەدەنگ نامەکەوە هات، یان نەهات، یان بەخۆیدا ڕانەدەپەڕموو، یان نەیدەویست بەربەرەکانێی خەلیفە بکات و بەگژ لەشکری خەلیفەدا بچێت، بەڵام، ئەم مرد، لەبەر ئەوە، لە لایەن ئەمەوە هیچ بە هیچ نەکرا[٦]. بە هەرحاڵ، لەشکری خەلیفە گەیشتە هەولێر و، لەگەڵ بەرگریکارانی خەڵکی هەولێردا دەستە و یەخە وەستان، بەڵام نەیانتوانی ورە بە خەڵکەکە بەربدەن و بەرگری تا دەهات گەرمتر دەبوو[٧]. ناچار داوای هێزی زیاتریان لە بەغدا کرد. خەلیفە هێزێکی دیکەشی بە فەرماندەیی (أبو الفضائل شرف الدین اقبال الشرابي) سەرلەشکری هێزی سوارەی

---

(١) الحوادث الجامعة، ص ٤٥.

(٢) الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ١٨٠.

(٣) ابن شداد، مخطوط ((الاعلاق الخطيرة)) ورقة (١/١٩).

(٤) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٦٨٣/٨.

(٥) ن. م. ص.

(٦) لێرەدا، دەبینین (ابن خلكان) – لە عادەت بەدەر – مانگی مردنی (عمادالدین زەنگی)ی نەنووسیوە و، ساڵی مردنەکەشی بەگومانەوە نووسیوە، ئەوەتا دەڵێت: (توفي في حدود سنة ٦٣٠هـ) واتا: (لە دەوروبەری ساڵی – ٦٣٠ك –دا مردووە): وفيات الاعيان ٢٩٦/٤.

(٧) ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، مجلد ٤٩ لسنة ١٩٥٥ ص ٧٣٩.

بەغدا، نارد. ئەم هێزە تازەیەش، لە (١٣ی شەووالی ٦٣٠ك/ تەموزی ١٢٣٣ز)دا[1] گەیشتە هەولێر و موقاوەمەتی خەڵکی هەولێریان، بۆ نەشکا. هەولێرییەکان دەرگاکانی شارەکەشیان قایمکارانە داخستبوو. دیسان داواکرا لە بەغدا کە هێزی تریان بۆ بنێرن، ئنجا هێزی سێیەمیش گەیشت کە (جمال الدین قشتمر) فەرمانداری بوو. ئەم (جمال الدین قشتمر)ە پلانێکی نوێی، بۆ گرتنی شارەکە داهێنا، ئەوەبوو، هێزەکانی بەسەر دەرگاکانی شارەکەدا دابەش کرد و، خۆیشی چادرەکەی بەرامبەر بە دەرگای (عین کاوا) [2]هەڵدا. کە گەورەترین دەرگای شارەکە بوو، سەربازێکی زۆریشی لێ خڕکردەوە، ئەوجا گەمارۆیەکی توندوتۆڵی بە دەوردا گێڕا و، کەوتەخۆ بۆ هێرش.

پاشان هاتەسەر ئەوەی نامەیان بۆ بنێرێت، ئنجا دەستی کرد بە هەڕەشەو بە تۆقاندن. لێرەدا، هەردوو کۆیلەکە داوایان لە (جمال الدین قشتمر) کرد مۆڵەتیان بدات تا لەگەڵ گەورە پیاوان و میرانی ئەمارەتەکەدا بکەونە را و تەگبیر ـ رەنگە مەبەستیشیان ئەوە بووبێت مەسەلەکە دوا بخەن، بەڵکو یەکێ لە دوو مەلیکە ئەیوبییەکان کە پێشتر نامەیان بۆ ناردبوون، بگاتە هانایان، ماوەی ئاگادار کردنەوەکە کۆتایی هات و، هانا، نەهات. ئنجا (جمال الدین قشتمر) ئینزارێکی ترسناکی پێراگەیاندن کە ئەگەر خۆبەدەستەوە نەدەن، خراپ بە چاوی خۆیان دەبینن، بەڵام ئەم ئینزارەشی، با، بردی و کەس گوێی پێنەدا[3]. ئیدی (جمال الدین) فەرمانی هێرشی بە گوژمی بۆ سەر شارەکە دەرکرد و، فەرمانی دا کە بەسەر شوورەکاندا بکەونە تیر باران و ئاگر بارانی بەرگریکاران. ئەم کوشتارەش دوو رۆژی

---

(١) الحوادث الجامعة، ص ٤٥.

(٢) (عین کاوا)، یان ئێستا بە (عەینکاوە) دەنووسرێت و، دانەری کتێبی (الحوادث الجامعة) بە (عمکاوا) ناوی دەبات: ص ٤٦، ئەو دەروازە گەورەیەیە کە هەتا ئەمڕۆش بەسەر ئەو گوندەدا دەڕوانێت کە چەند ساڵێکە بووەتە ناحیە و، لە باکووری شاری هەولێرە و سێ کیلۆمەتر دوورە.

(٣) الحوادث الجامعة: ٤٦.

بانەوبان یەك، خایان و، لە هەردوو لا، کوژراو و برینداریکی زۆر کەوتن. بۆ رۆژی سێیەم (١٧ی شەووالی ٦٣٠ك/٢٦ی تەمموزی ١٢٣٣ز) هێرش بە تەواوی گەرم بوو، (جمال الدین قشتمر)، خۆی، سەرپەرشتی هێرشەکەی دەکرد و، فەرمانی دا دەروازەکەی (عین کاوا) ئاگر بدەن و بیسووتێنن[1]. پاش ئەوە، چوو، سەر لە خەندەقەکەی دەوری شوورەکە بدات و، کەوتە گاڵدانی سەربازەکانی. (اقبال الشرابي)یش لەسەر بەرزاییەك وەستابوو، ئەویش دنەی سەربازەکانی دەدا بۆ کوشتار، پاشان جێگاکەی خۆی بەجێ هێشت و لەگەڵ (جمال الدین قشتمر)دا کەوتە پیلان و تەگبیر، بەڵام هەندەی نەبرد، هەواڵیان بۆهات کە شارەکە گیراوە و، خەڵکەکەی خۆیان بە دەستەوە داوە[2].

سەربازەکان کەوتنە ناوشار و، هەندێکیان دەستیانکرد بە تالانکردنی ماڵەکان[3]. (اقبال الشرابي) بە کۆتری نامەبەردا، مژدەی داگیرکردنی هەولێری گەیاندە بەغدا و، چاورۆشنیی لە خەلیفە کرد. بەغدا، بە کەیف و خۆشییەکی زۆرەوە، بۆ شایی و لۆغان کەوتە خۆو، تریەی تەپڵ و گرمەی دەهۆڵ، لە (باب النوبي)یەوە بەرزبووەوە و زیندانییەکان هەموو، ئازاد کران. ئنجا وەزیر بۆ پێشوازیکردنی لایەنگران و شاییگێران دانیشت[4]. شاعیران، وەك موویان بۆ هەڵکرووزێنی لە هەموو لایەکەوە بەسەر دیواندا دابارین و شیعری مامە حەمەیی و نووسینی چڵکاو

---

(١) ابن العبري، م. ن. ص.

(٢) الحوادث الجامعة ٤٧.

(٣) ابن العبري: ن. ص. الحوادث الجامعة: ن. ص. ئەو سەربازانەش بە (الاوباش) واتا هەرچی و پەرچی ناودەبات: الذهبي، مخطوط، تأريخ الاسلام، ورقة ١٨٠. مێژوونووسی هاوچەرخ (سبط ابن الجوزي)یش دەڵێت: سەربازانی خەلیفە هەولێریان بە زۆر داگیر کرد، نەدەبوو ئەو هەموو تالان و زوڵم و زۆرە بکەن: مرآة الزمان ٦٨٣/٨. بشنۆرە: الحموي، التأريخ المنصوري، ص ٤٥٣.

(٤) الحوادث الجامعة، ن. ص. بنۆرە (ابن الطقطقى)، الفخري في الآداب السلطانية، ٣٢. الغساني، العسجد المسبوك، بالرونيو، ص ٣٣١.

خۆری و چاوڕوونییان خوێندەوە. (أبو المعالي القاسم كورِی أبي الحديد المدائني، شیعرێکی خوێندەوە، لە شیعرەکەیدا، ئەمەشی گوت:

مايثبت الملك بين الخوف والخطر    حتى يُقام ويسقى من دم البشرِ
لكلّ شـــيء طريق يُستفاد بـــه    وليس للعز غير الصـــارم الذكرِ

واتاکەی:

حوکمی تەخـت و تەلاری خـۆت    نەخەیتە ژێر ترس و خەتەر
وەك ئـاو، وایـە، خـوێنی هەدەر    ئاوی دە بە خوێنی بەشــــەر!
شـمشێری رووت هــەڵنەکێشی    پێتنەبێ شـمشـێری (ذکـر)
تەخت و بەخت و موڵك و ماڵت    هەر زوو دەکەن ژێر و زەبەر

ئنجا دەڵێ:

ما فتح أربيل عن بخت لذي دعةٍ    ولا إتفاقاً كبعض النصـــر والظفر
لكنه كــــان قصد القادرين و اف    عال المطيعين عن قصدٍ وعن فكرٍ
فليسمع الأشعري اليــــوم لي فأنا    في فتح اربل لا الوي على القدرِ[1]

واتاکەی:

بەختی بێکاران، هەولێر ناسێنێ    هیچ رێکـەوتنێك زەفــەر ناهێنێ
هێرش و قودرەت زەفـەری هانی    ئەقڵ و ئیتاعەت، کارای، رەخسانی
دەبا (أشـــعري) گـوێ بتەکێنێ    خـەتـەری هـەولێر مــن ناترسێنێ

(عزالدين عبدالحميد المدائني)ی برای، کە دانەری کتێبی بەناوبانگی (شرح نهج البلاغه)یە (ت ٦٥٦ك/١٢٥٨ز)، ئەویش شیعرێکی هۆنییەوە و، رۆژی حەڤدەی شەووالی ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣٢ز)ی کە ئەکا رۆژی دامەزراندنی وەزیرەکە، لەگەڵ رۆژی حەڤدەی شەووالی ساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٣ز) کە ئەکا رۆژی ئەم داگیرگردنەی هەولێر، پێکەوە لە

---

(١) الحوادث الجامعة، ص. ن.

شیعرەکەیدا هێنایەوە و، رووی کردە وەزیر و گوتی:

| | |
|---|---|
| یا یوم سابع عشر شوال الذي | رزق السـعـادة اولاً واخـيرا |
| هنئت فيه بفتح اربل مثلما | هنئت فيه وقد جلست وزيرا[1] |

واتا:

| | |
|---|---|
| رۆژی حەڤدەمینی شـەووال | بووی بـە وەزیر هـاتم بۆلات |
| حەڤدەمینی ئەم شەووالەش | چاوت روون، هەولێرت خەڵات |

راستیـشت دەویٚ ئـەم پێـشوازییە گەرمـەی لـە داگیرکردنـی هـەولێر کـرا، ئـەوە دەردەخـات کـە ئـەم شـارە، بـۆ مەملەکـەتی خەلیفـە جێگایـەکی سـتراتیجی و لەشکرگێڕی[2]بووە. سەرباری ئەوەش، هەولێر وەك بارەگای شـارەزوور و[3]، دەروازەی ناوچە شاخاوییەکان بووە.

دەشبینین، مێژوونووس (ابن الطقطقی) پێگە و جێگەی هـەولێر بەکـەم دادەنـێ و بـە سـووك سـەیری دەکـات، گوایـا لەبـەر ئـەوەی کـە حـوکمی خەلیفـە «تـەنیا مەملەکەتی عیراقی» گرتبـووەوە[4]. ئـەم مێژوونووسە، بـە سووك سـەیری دەوڵـەتی عەبباسیان دەکاو دەڵێت: ئەم دەوڵەتە هەند لاواز و بـێ بایـەخ ببـوو، کـە بـۆ گرتنـی

(١) الحوادث الجامعة، ٤٨. الغساني، العسجد المسبوك، ن. ص.

(٢) الشبيبي، مؤرخ العراق ابن الفوطي، ١١١/٢، الهامش.

(٣) ابو الفداء، تقويم البلدان، ص ٤١٣. القلقشندي، صبح الاعشى، ١٦٦/٤.

(٤) ابن الطقطقي، الفخري ٣٢.

شارێکی[١]بچووك و شڕ و بێ بەها[٢]. لەبەر دەرگای خەلیفەدا دەکەوتنە شایی و چاو روونی و رازاندنەوەی بەغدا.

ئێمە، وای بۆدەچین کە ئەم مێژوونووسە، لە سووکهەڵسەنگاندنی هەولێردا زێتر پێی لێراکێشاوە. ئەو، دوو قۆناغی لێکجیاوازی هەولێری بەیەك چاو سەیر کردووە. هەولێری لە بەرایی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا (سەدەی چواردەمینی میلادیدا) کە شارێکی کاولۆك بووە، بە هەولێری چارەکی یەکەمی سەدەی حەوتەمینی کۆچی (سێزدەمینی میلادی) کە شارێکی رێك و رازاوە بووە، بەراورد کردووە. ئەم جۆرە بەراوردکردنە شتێکی نارەوایە و هەڵەیە، چونکە گرنگیی هەولێر، دوای ئەو ماوەیە، کەمی کردبوو، نەك تەنیا لەو ماوەیەدا کە (ابن الطقطقی) مێژووەکەی نووسیوە، بەڵکو لە دوای مردنی موزەففەرەددین گۆکبوریش کە یەکسەر شارەکە کاولکاری و کەمتەرخەمیی بەسەرداهات. ئەوەبوو لەشکری خەلیفە هەندێکیان لە شارەکە وێران کرد ـ وەك پێشتر باسمان کرد. پاش ئەوەش لە شەووالی ساڵی (٦٣٤ك/حوزەیرانی ١٢٣٧ز) مەگۆل هێرشیان کردە سەر شارەکە بە فەرمانداریی (جرماغون) و زیاتر کاولیان کرد، پاشان وەك هەناوی کەری گورگخواردوو بەجێیان هێشت و[٣]، ناو بیر و ناو ماڵەکانیان کرد بە گۆڕی خەڵکەکەی[٤]. دوا هێرشی مەگۆل بۆ سەر شارەکە لە ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز)دا بە فەرمانداریی (ئەرقیونویان) رووی دا کە نەیتوانی شارەکە داگیر بکات، لەبەر ئەوە سپاردی بە (بدرالدین لؤلؤ) ئەم، شوورەکەی رووخاندو[٥]،

(١) مەبەستی لە سەردەمی مەگۆلە ئێلخانییەکانە کە لە (٦٥٦ – ٧٣٦ك/١٢٥٨ – ١٣٣٥ز) درێژەی کێشا، کە (ابن الطقطقي) لە ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠٠ز) کتێبەکەی داناو، خۆشی لە ساڵی (٧٠٩ك – ١٣٠٩ز) یان دواتر، کۆچی دوایی کرد. (عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين ١٣٧).

(٢) ابن الطقطقي، ص. ن.

(٣) ابن أبي الحديد، شرح نهج البلاغة، جـ ٣، ص ٨١.

(٤) سبط ابن الجوزی، مرآة الزمان ٦٩٩/٨. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٢٩٦/٦.

(٥) رشیدالدین فضل الله الهمدانی، جامع التواریخ، مجلد (١) ص ٢٩٨ – ٢٩٩.

عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين ٢١٤/١.

دووبارە شارەکەی وێران کردەوە. بەم جۆرە، ئەو هەموو کاولکارییە بووە هۆی ئەوەی شارەکە بەرەبەرە کەم و بچووك ببێتەوە و ـ وەك ابن الطقطقى دەڵێت ـ بوو بە شارێکی کەم و بچووك و شڕ و بێ بەهاو، ئەو چالاکی و بزاڤ و بەهایەی جارانی کە کۆتری نامەبەر مژدەکەی گەیاندە بەغدا و، کردیان بە شایی و ئاهەنگ، نەماو بەسەرچوو.

دوای داگیرکردنی شارەکە، خەلیفە (المستنصر بالله) ناردی لە دووی میری بەسرە (أبا المظفر شمس الدين باتكين[1] بن عبدالله الرومي) و فەرمانی پێدا بچێت بۆ هەولێر و شارەکە وەربگرێت. (باتكين) بەرەو هەولێر کەوتە ڕێ و، لە (١٩)ی (ذى القعدە)ی ساڵی ٦٣٠ك/ئابی ١٢٣٣ز) گەیشتە هەولێر و، چوو بۆلای (شرف الدين اقبال الشرابي) کە چادرگاکەی لە دەرەوەی شوورەی هەولێر هەڵدابوو، شمشێر و ئەسپ و زیل و زەنگ و ئاڵاکەلی پێشکەش کرد[2]. پاشان سواربوو، لەگەڵ میرەکانی لەشکردا گەیشتە ناو مزگەوت و، لەوێ (ظهيرالدين الحسن بن عبدالله) فەرمانی خەلیفەی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە کە (شمس الدين باتكين)ی کردووە بە سەرداری هەولێر و بریکاری خۆیەتی. ئنجا سەرکەوتنە سەر قەڵاو، میری نوێ، لە (میرنشین) واتا لە خانووەکەی موزەففەرەددین گۆکبوری دابەزی و، (اقبال الشرابي) دەستی کرد بە دابەشکردنی دیاری و خەڵات بەسەر گەورە کارمەندانی پۆستە سەرەکییەکاندا کە بە بۆنەی ئەم ئاڵوگۆڕەی هەولێرەوە دامەزرابوون؛ (ظهيرالدين الحسن بن عبدالله) کە بە وەزیری میر باتكين دامەزرابوو خەڵات کرا و، (ظهيرالدين ابن المصطنع) کە بە سەرپەرشتی ئیش و کاری وەزیر دامەزرابوو خەڵات کراو، (جمال الدين ابن عسكر الانباري) کە بە سەرلەشکر دامەزرابوو، خۆی و یاریدەدەرەکەی خەڵات کران[3].

---

(١) لە: (الكامل)دا ٤٢٦/١٢ بە (ملتكين) و، لە (مرآة الزمان)دا ٦٩٩/٨ بە (بادگين) و، لە (النجوم الزاهرة)دا، ٢٩/٦ بە (ئيدكين) و، لە سەرچاوەکانی تردا بە (باتكين) ناوی هاتووە.

(٢) زیل و زەنگ (کوسات) لە پەراوێزی (٣) لە دوای لاپەڕەی (١١٥) شرۆڤە کراوە.

(٣) الحوادث الجامعة، ص ٤٩. الغساني، العسجد المسبوك ٣٣٢.

میر (باتکین) پیاوێکی بەتەمەنی دنیا دیدە و بە ئەزموون و بە ئاوەز و خۆش ئیدارە و خاکەڕا و بەڕێز بوو[١]. لە هەولێر، بە چەندین چاکسازی دەستی بەکار کرد، زۆربەی زەمانەتەکانی رەها کرد و، گومرگ و باجیشی هەڵگرت ـ چونکە ببوو بە عادەت، هەر رژێمێکی نوێ، تازە هاتبا، ئەو فرِوفێڵەی دەکرد ـ پاشان شوورەی شارەکەی چاك کردەوە، کە لە شەڕەکەی پێشتردا رمابوو، هەروەها کەوتە مشوور خواردنی خەندەقەکەش[٢]. ئەم میرە، لە جیاتی خەلیفە (المستنصر بالله) لەسەر حوکمی هەولێر مایەوە تا مەگۆلەکان لە شەووالی ساڵی (٦٣٤ك/حوزەیرانی ١٢٣٧ز)دا هێرشیان کردە سەر شارەکە. میر، بەرامبەریان وەستاو کەوتە کوشتار، بەڵام سوودی نەبوو، ئەوان زۆربوون و بەهێز بوون، بە شەڕ، چوونە ناو شارەکە و، چاك و خراپی شاریان بە خۆیان حەڵاڵ کرد و کەوتنە تاڵان و کوشت و بڕ، پاشان، ئەوەی بۆیان هەڵگیرا و سووك بوو، باریان کرد و بردیان[٣]. لەبەر ئەو رووداوە، میر باتکین شاری بەجێهێشت گەڕایەوە بۆ بەغداو، دەستی لە کاری حوکم و سیاسەت هەڵگرت و لە (٢٤)ی شەووالی (٦٤٠ك/١٢٤٣ز)دا، لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا مرد و لە گۆڕستانی (الشونیزی) [٤]نێژرا.

---

(١) العسجد، ص. ن.

(٢) ابن الساعي، الجامع المختصر ٧٦/٩ سەیری پەراوێزەکەی بکە.

(٣) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٩٩/٨. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٢٩٧/٦.

(٤) ابن الساعي م. ن. ص، وفيات الاعيان ١٧٢/٢. گۆڕستانی (شونیزی) مەشایخێکی زۆری لێ نێژراوە، لە رۆژاوای بەغدایە: ابن خلكان ٣٢٥/١: کەوتووەتە پشت گەڕەکی (التوثة)، لە نزیك رووباری (عیسى). پاشان ناونرا (مقابر قریش): ابن خلكان ١٠٣/٢، واتا گۆڕستانی ((الكاظمین)).

# دەروازەی دووەم

# (مێژووی شارستانێتی هەولێری ئەو سەردەمە)

## فەسلی یەکەم

**یەک**: پلانەکانی شاری هەولێر.

قەڵای هەولێر.

**دوو**: بینا و بارەگاکان، کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە هەولێر دایانیمەزراند.

أ- منارەی هەولێر ((منارەی چۆلی))

ب- دامودەزگای لەشساغی و کۆمەڵایەتی.

1- مارستان (نەخۆشخانە).

2- خانەقاکان.

3- داڵدەکان (الملاجیء).

**سێ**: سەرچاوەکانی گوزەرانی ئابووریی ئەمارەتی هەولێر.

# فەسلی یەکەم

## یەك : پلانەکانی شاری هەولێر

شاری هەولێر، لە سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا ـ نەخاسمە قەڵاکەی کە شارێك بوو، بۆخۆی ـ دەستی کرد بە گەورەبوون و فراژوبوون و بووژانەوەو، خەڵکەکەی بە جۆرێ زیادی کرد جێگایان نەدەبووەوە. لەبەر ئەوە گەشەسەندن و ئاوەدانی کەوتە پادەشتەکەی خوارەوە، بە تایبەتیش لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆکبوریدا[1] ئەو پادەشتە بوو بە شارێکی گەورەی پان و بەرین[2].

دیارە، گەورەبوونی شارەکە، بەر لە پەیدابوونی ئەمارەتێکی سەربەخۆی ئەتابەگایەتی دەستی پێکردبێت و پێش مردنی دامەزرێنەری ئەمارەتەکە (زین الدين علی کچك) کەوتبێت کە ئەو لە ساڵی (٥٦٣ك)دا مردووە. (ابن خلكان)، کە خۆی خەڵکی ئەم شارەیە، لە باسی مردنی ئەو ئەتابەگەدا دەڵێت: هەر لەم شارەداو، لەو گۆڕستانەدا کە بەوەوە ناسراوە، لە نزیك مزگەوتە کۆنەکەی ناو شارەکە بە خاك سپێردراوە[3]. کەواتە، هەر زوو، بەر لە مێژووی ئەتابەگایەتی، مزگەوتێکی (کۆن) لە پادەشتەکەی بەر قەڵادا هەبووە.

ئەم پادەشتە، چواردەوری قەڵای نەگرتبووەوە، قەڵاکە کەوتبووە لایەکی[4]، نەك

---

(١) (سترك): دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری، خۆی، بەشی خوارەوەی هەولێری دامەزراندووە. بنۆڕە: (دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، ٥٧١/١.

(٢) یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٣٨/١. بنۆڕە: (ابن خلكان)، وفيات الاعيان، ١٦٩/١ — أبوالفداء تقويم البلدان، ص ٤١٣. القلقشندي، صبح الاعشى ٣٦٦/٤

(٣) وفيات الاعيان ٢٠٧/٣.

(٤) یاقوت: م. ن. ص.

ناوەڕاستی، لەبەر ئەوە شوورەی شارەکە لە نیوەی قەڵاکەدا دەوەستا[١]. ئەمەش مانای وایە کە گەورەبوونی ئاوەدانی لە پادەشتەکەدا، بە هەموو لایەکدا نەکشاوە. بەڵام (یاقوت الحموي) کە دوو جار سەری لەم شارە داوەو، بە درێژی باسی ئەم شارە دەکات، روونی نەکردووەتەوە کە ئاوەدانبوونەکە، بەرەو کام، لا، کشاوە. لەبەر ئەوە، نەزانراوە، گەورەبوونی شارەکە رووی لە کام، لا، کردووە و، مەسەلەکە لێڵە و روون نییە و زانینی زەحمەتە.

گرنگترینی ئەم زەحمەتییەش، لەوەوە پەیدا بووە کە زۆربەی ئەو بیناو خانووانەی ئەو سەردەمە، وێران بووە و ئاسەوارەکانیشیان نەماوە کە بتوانین بەهۆیانەوە رێگای خۆمان بدۆزینەوە و بزانین شارەکە لە چ بارودۆخێکدا بووە. ئەم وێرانبوونەش بەهۆی خراپیی کەرەسەی خانووەکانەوە رووی داوە کە هەمووی لە قوڕ و خشتی کاڵ دروست کرابوون.

ئەگەر ئەو بیناو خانووانە، لە کەرەسەی قایمی، بەنموونە، وەك گەچ و قسڵ و خشتی سوور، وەك منارە (مطفری)یەکە دروست کرابان، بەرگەی باوباران و سەرماو گەرمایان دەگرت و وەك منارەکە دەمانەوە. ئەوەتا منارەکە ماوە، بەڵام مزگەوتەکەی تەخت بووە و نەماوە[٢].

هۆی دووەمی ئەم زەحمەتییە ئەوەیە، سەرچاوەکان باسی جێگای دامەزراندنی ئەو ساختمان و بینایانە ناکەن، ئەوکات، لەم شارەدا بنیادنراون، لەو سەردەمەدا قوتابخانە و حوجرە و مزگەوت و خانەقا و خانووی حەدیس و بارەگای ئەمارەت هەبووە بەڵام زۆربەیان جێگاکانیان نادیارن، لەبەر ئەوە، لێکۆڵینەوەی پلانەکانیان کارێکی ئاسان نییە. دەشتوانین بڵێین ئەگەر قەڵاکەی نەبوایە، شارەکە، نەك هەر بیناو پلانی بزر دەبوو، بگرە لە جێگای خۆیشی نەدەما. رەنگە شارەکە

---

(١) م. ن. ص.

(٢) نیبور: گەشتی نیبور بۆ عیراق لە سەدەی هەژدەمیندا (١٧٦٦)، لاپەڕەی ٩٠، وداد القزاز، وتار ((المنارة المظفرية في اربيل)) مجلة سومر، ١٦، ج ١، ٢ لسنة ١٩٦٥، ص ١٢٧.

بگوازرایەتەوە بۆ مەڵبەندێكی تر، چونكە نە رووباری هەیە و نە چیایەكی سەخت رێگای لێ بڕیوە. شاری هەولێر، بەخۆی و قەڵاكەیەوە كەوتووەتە ناوەڕاستی پادەشتێكی پان و بەرینەوە. ئەوەی هەولێری لە جێی خۆی هێشتووەتەوە، قەڵاكەیەتی. هەولێر، لەم جێگەیەدا بەهۆی قەڵاكەوە ماوەتەوە. بەردەوامبوونی ژیان و، بگرە، تەنانەت، مانەوەی ناوە كۆنەكەشی، لە سایەی قەڵاكەوەیە.

ئەمە، لە لایەك، لە لایەكی دیكەوە، دەڵێین، ئەگەر بتوانین لە رێگەی هەندێ ئاسەوارەوە بیدۆزینەوە كە بەرفراوانبوونی هەولێر لەكام قۆڵی قەڵاكەوە دەستی پێكردووەو، بەرەو كام، لا، كشاوە، ئەوە، لەو بارەشدا، جێگای ساختمان و بینایەكانی دیكەمان بۆ نادۆزرێتەوە و، سەرەنجام هەر زانیارییەكیشمان لە بارەی پلانەكانی ئاوەدانكردنەوەی هەولێری سەردەمی ئەتابەگایەتییەوە دەست بكەوێت، هەر كەموكورتەو لێڵ و شێواوە.

بەڵام هەندێ ئاسەوار هەیە، دەتوانین بە پاشماوەی ئەو سەردەمەی لە قەڵەم بدەین و بیكەینە بەڵگەی ئەوە كە فراوانبوونی ئاوەدانی لە پادەشتەكەدا بەرەو كام، لا، كشاوە. جێگای ئەو ئاسەوارەش، زۆرتر وەها نیشان دەدات كە فراوانبوونی پادەشتەكە روو لە باشووری قەڵاكە بووە. واتا، شوورەكە، كە نیوەی قەڵاكەی دەورەداوە، لە رۆژاوای قەڵاكەوە دەستی پێدەكردو، بە باشووری قەڵاكەدا دەڕۆیشت و لە رۆژهەڵاتی قەڵاكەدا دەكوژایەوە (تەواو دەبوو). واتا دەكەوتە بەرامبەر دەروازە سەرەكییەكە، كە هەتا ئێستاش بەسەر ئەم بەشەدا (بەشی باشوور)ی شارەكەدا دەڕوانێت. ئەمەش مانای وایە كە نیوەكەی باكووری قەڵاكە ـ بەرامبەر بە عەینكاوا[1] كەوتبووە دەرەوەی شوورەكە.

لە هەولێری ئێستادا، دوو ئاسەواری زەق هەنە، پێدەچێ كاتی خۆی لە ناو شوورەكەدا بووبن، دەشتوانین یێكێكیان بە سەرەتاو، ئەوی دیكەیان بە كۆتایی شوورەكە لە قەڵەم بدەین. یەك لەو دوو ئاسەوارە، ئەو گۆڕەیە ـ كە خەڵكی شارەكە،

---

(١) سەیری بابەتی باسی دوو دەروازەكەی قەڵا بكە.

بە خەیاڵ ـ بە گۆڕی ((سوڵتان مظفر))ی[1] تێدەگەن و دەکەوێتە رۆژاوای شارەکە، ئەم گۆڕە، هەبێ و نەبێ، گۆڕی (زین الدین علی کچك)ە کە، کەمێ لەمەوبەر باسی مردن و جێگای ناشتنیمان کرد، کەواتە لەم جێگەیەدا مزگەوتێکیش هەبووە[2]. (ابن خلکان)یش تەکەز لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم مزگەوتە لەناو شارەکەدا[3] بووە، واتا لەناو شوورەکەدا بووە، نەك لە دەرەوەی شوورەکە.

ئاسەواری زەقی دووەم، مزگەوتی (لەپە دەستەکەیە) [4]، کە (القزوینی) باسی دەکات و دەڵێت: (بەردێکی تێدایە، ئاسەواری لەپی ئادەمیزادێکی لەسەرە). خەڵکی هەولێر قسەو قسەڵۆکێکی زۆریان لە بارەی ئەم گۆڕەوە هەیە، بێگومان شتەکەش، شتێکی عاجباتی و سەیرە[5]. ئەم ئاسەوارە تا ئێستاش ماوە و دیارە، قسەو قسەڵۆکە سەیرو سەمەرەکانیشی، هەر، ماون. یەك لەو قسانە ئەوەیە کە ئیمامی (علی) خۆی، سەرپەرشتی ناشتنی ئەم شێخ (عبدالقادر)ەی کردووەو، بەردێکیشی لەسەر گۆڕەکەی داناوە و لەپی راستی خۆی پێداهێناوە و، ئاسەواری لەپی بەسەر بەردەکەوە

---

(١) سەیری بابەتی باسی مردن و ناشتنی موزەففەرەددین گۆگبوری بکەو، سەرنجی پەراوێزەکانی بدە.

(٢) ابن خلکان ٢٠٧/٣

(٣) م. ن. ص.

(٤) ئەم ئاسەوارە کەوتووەتە رۆژهەڵاتی قەڵا، بەرامبەر مزگەوتی شێخ ئەبو بەکری نەقشبەندی، لەسەر شەقامێکە؛ بەنزینخانە کۆنەکەشی لەسەر بوو. لەم مزگەوتە، تەنیا گۆڕێکی کۆن ماوەتەوە، لە ژوور سەرییەوە بەردێك دانراوە، ئاسەواری لەپی راستی ئادەمیزادێکی لەسەرە، گوایا، ئەوە گۆڕی (شێخ عبدالقادر) ناوێکە، ئێستا پێی دەڵێن (پەنجە عەلی).

(٥) القزویني، آثارالبلاد، ص ٢٩٠. الباکوي، تلخیص الآثار وعجائب الملك القهار، ص ٣٥. لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، ص ١٢٠. (سترك) بە هەڵەداچووە، کە مزگەوتەکەی رۆژاوای شارەکە، (مزگەوتی منارەی مظفریە)کەی بە مزگەوتی (مشهد الکف/لەپە دەستەکە) داناوە (دائرة المعارف الاسلامیة، ط/١٩٣٣، ٥٧٥/١).

ماوەتەوە[١].

هەر چەندە، ئەم قسەیە لە ئەفسانەیەکی بێ سەروبەر و نابەجێ بەولاوە هیچی دیکەی تێدانییە و، ئیمامی علی، قەت و قەت نەگەیشتووەتە هەولێر، بەڵام گرنگییەکەی، بۆ ئێمە، لەوەدایە کە مێژووی ئەم ئاسەوارە، دەچێتەوە سەر ئەو قۆناغەی کە باسی لێوەدەکەین، دوور نییە، لەوەش کۆنتر بێت. ئەم ئاسەوارە بێجگە لەوەش، سیما و پلان و رەنگرێژیی شارەکەمان بۆ روون دەکاتەوە.

کەسێکی زۆر بە ناوبانگ کە لەم مزگەوتەدا نێژراوە: (عبدالقادر أبو محمد بن قطب الدین أمیری بن بختیار بن الخل بن محمد بن داود)ە، کە بە ئەسڵ (ئەشنەهی)[٢]یە و، لە هەولێر لە دایك بووە و گەورە بووەو، لە ساڵی (٦٢١ك) [٣]دا مردووە. ئەم پیاوەیە (ابن الشعار) دەڵێت: لە رۆژهەڵاتی هەولێر، لە گۆڕستانی (لەپە دەستەکە) نێژراوە[٤]. ئەم (شێخ عبدالقادر)ە پیاوێکی زیرەك و ئەدەب دۆست و شاعیر بووە، بەڵام باوکی و (محمد)ی کوڕی، هەردووکیان حەدیسخوان بوون.

پاشکۆیەکی دیکەی شارەکە، کە دەکەوێتە لای رۆژهەڵاتی[٥] ناو شار، گۆڕستانی دەروێش ئەحمەدی زەرزاری بوو (ت ٥٩١ك) [٦]. مەلای شافیعی (أبو الفضل ألیاس ابن

---

(١) بە قسەی (خەلیفە توفیق مولود علی) (٧٠ ساڵە) کە بۆی گێڕاومەتەوە.

(٢) الاشنهي: واتا خەڵکی شاری (اشنة)، شارۆچکەیەکی سەربە ئازەربێجانە بەلای هەولێرەوە. (اشنة) دوو رۆژەرێ لە (ورمێ)وە دوورە و، پێنج رۆژەرێ لە هەولێرەوە دوورەو، دەکەوێتە نێوان ورمێ و هەولێرەوە، معجم البلدان ١/ ٢٠١.

(٣) ابن الشعار، مخطوط، عقود الجمان، ١٩/٤.

(٤) ن. م. ص. پێدەچێ (الشیخ عبدالقادر) کە بە مجێوری مەزارەکە دانراوە، خۆی لەو گۆڕەدا نێژرابێت و، هەر هەمان (عبدالقادر بن قطب الدین الاربیلي) بێت.

(٥) ابن الدبیثي، مخطوط التأریخ المذیل، مجلد/ ٢، ورقە ١٢٧. ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان،ج ١. ترجمة الیاس بن جامع.

(٦) لە جێگایەکی تردا باسی رەوشی ئەم دەروێشە دەکەین.

جامع الاربيلي) (ت ٦٠١ك) [١]، ئەویش، یەکێکە لەوانەی کە لەوێ نێژراون. وا دیارە، ئەم گۆڕستانە کەوتبووە دەرەوەی شوورەی شار. (ابن الدبیثی) دەڵێت: ئەو گۆڕستانە کەوتبووە دەرەوەی شارەکە[٢].

کشانی گۆڕەپانی شار بەرەو باشووری قەڵا، بەو منارەیەدا دەردەکەوێت کە (منارەی مظفریە)ی پێدەڵێن و، دەکەوێتە بەشی باشووری خۆراوای شارەکەوە[٣] هەرچی مەدرەسەی (العقیلیة)یە، کە لە گۆڕەپانەکەدا (پادەشتەکەدا) بوو، کە لەساڵی (٥٦٧ك)دا، مەلا (أبوالعباس الخضر بن عقیل)ی، بە تەنیا لە گومەزێکدا نێژرا[٤]. هیچ شتێك لە بارەی جێگەکەیەوە نازانین و، ناشزانین کوێ کەوتووە[٥]، چونکە هیچ ناونیشانێکمان لە لا نییە بمانباتە سەر جێگەکەی. بۆ دۆزینەوەی جێگای مەدرەسەی (المظفریة) و (المجاهدیة) و (دارالحدیث المظفریە)یش یان بۆ دۆزینەوەی جێگای گەلێ دامودەزگای دی کە موزەففەرەددین گۆگبوری دایمەزراندبوون، بۆ ئەوانەش، هیچ بەڵگەو شەقڵ و نیشانەیەکمان بەدەستەوە نییەو جێگاکانمان بۆ نادۆزرێتەوە.

پاشماوەو کەلاوەی هەندێ ـ گۆڕستان و خانەقا ـ یش هەنە، پێدەچێ، کەم و زۆر، هی، سەردەمی ئەتابەگیان بن، ئەمانەش هەر کەوتوونەتە بەشی بەرامبەر باشووری قەڵا. یەك لەوانە، گۆڕستان و مەزارگەی ئیمام (محمد) [٦]ەو، کەوتووەتە

---

(١) لە جێگایەکی تردا باسی رەوشی ئەم مەلایە دەکەین.

(٢) ابن الدبیثي .ن .. و. ابن الشعار، ن. م. و.

(٣) دوای کەمێك، نەختێ بەدرێژی باسی ئەم منارەیە دەکەین.

(٤) ابن خلکان ١١/٢، ط ١٩٤٨.

(٥) دکتۆر ناجی معرف دەڵێت: ئەم مەدرەسەیە کەوتبووە لای چەپی گۆڕەپانەکەی شاری هەولێر. بنوڕە کتێبەکەی: (علماء النظامیات ومدارس الشرق الاسلامي) ص ١٩٠.

(٦) نەمتوانی بزانم تەرمی ناو ئەم گۆڕە کێیە و ناسنامەی چییە، وەڵێ مجێوری گۆڕستانەکە — کە قسەکانی جێگەی بڕوا نییە — گوتی: یان ئیمام (محمد الحنفیە)یە، یان (محمد الغزالي)یە. بەڵام دکتۆر (احسان عباس) لە کتێبەکەی (ابن المستوفي): (تأریخ اربیل) جزمی دووەم،←

نێوان منارە مظفرییەکە و گۆڕستانێکەوە پێیدەڵێن گۆڕستانی (النبي عزیر) [١]. هەرچی خانەقاکەیە، ئەوە، دەکەوێتە لای چەپی دەروازە سەرەکییەکەی (باشووری) قەڵا. رەنگە، هەر هەمان خانەقا بێت کە (کمال الدین ابن الشعار)ی فەقێی (ابن المستوفي) باسی دەکات و دەڵێت: (ئەو خانەقایەیە کە دەکەوێتە دامێنی قەڵای [٢] پارێزراوەوە). هەرچی تەلاری سەڵتەنەتە، وادیارە، ئەویش، هەر لە گۆڕەپانەکەدا دامەزرابێت. (ابن خلکان) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری لە ماڵەکەی خۆیدا مرد، پاشان بردیان بۆ قەڵاو، لەوێ بە ئەمانەت ناشتیان [٣].

---

←وەرەقەی (١٩٦)ەوە وەری گرتووە، باسی رەوشی (عزالدین ابن رواحة الانصاري) دەکات کە کاتی خۆی هاتووەتە هەولێر، دەڵێت: ئەم (عزالدین ابن رواحة)یە، هاتە هەولێر و لە کۆڵانی لای منارەکە، لە تەکیەکەی (گۆشەکەی) (الشیخ محمد بن الحسین الکریدي) دادەنیشت: بنۆڕە: وفیات الاعیان، ط/١٩٧١ بیروت ٣٣٩/٧. پێدەچێ، ئەم شێخ (محمد)ە، هەر هەمان ئەو ئیمام (محمد)ە بێت کە گۆڕەکەی تەنیا چەند هەنگاوێك لە منارەکەوە دوورە، پێمانوایە مەبەست لە کۆڵانی منارەکە، کۆڵانی لای (منارەی مظفریە)کەیە. پێدەچێ (الشیخ محمد بن الحسین)یش لە هەمان گۆشەکەی خۆیدا نێژرابێت، ئەوسا، گۆڕەکە، دەکاتە گۆڕی شێخ (محمد).

(١) پارچە بەردێك لەسەر دەرگای مەزاری (النبي عزیز) هەیە، لەسەری نووسراوە: (هذا مقام حضرة عزیزالدین علیه السلام، عبدالفتاح ئەفەندیی کوڕی ابراهیم ئەفەندیی کەرکوکی، خوالێی خۆشبێت، چاکی کردووەتەوە).. لە ساڵی (١٣٠٤ك) چاك کراوەتەوە.

(٢) عقود الجمان، ج(٥)، ورقة ١٥٦، ئەم خانەقایە دەکەوێتە سەر شەقامە لاوەکییەکەی هاوشانی شەقامی سەڵاحەددین بەرامبەر بە یانەی فەرمانبەران، تا ئێستاش منارەیەکی کۆن ماوە، بە خانەقاکەوە نووساوە. وادیارە کەمێ دەستیان بەم منارەیەدا هێناوەتەوە و، چەندین جاریش خانەقاکە ئاوەدان کراوەتەوە. بەڵام سەرپەرشتەکانی نازانن مێژووی خانەقاکە چییە و چۆنە.. بەڵام مەلا شەریفێکیان تێدایە. دەڵێت: (مەولانا خالدی نەقشبەندی) دایمەزراندووە. من، وای بۆ دەچم، گۆکبوری ئەم جێگایەی بۆ بنیادنابێ و خانەقاکەی بەگەن کردبێ (هەڵبژاردبێ) چونکە دەکەوێتە پایانی ئەو جۆگە ئاوەوە کە لە دۆڵی بەستۆڕەوە هەڵبەستراوە. ناوی جۆگەکەش، لە باکووری شارەکە، لە گوندی (مورتکە)ی دامێنی دۆڵەکەوە هەڵدەقوڵێت و، لە ساڵی (١٩٤٧)دا دۆزراوەتەوە: بنۆڕە: طه باقر، المرشد، ص ٧. فؤاد جمیل، مقال (حدیاب... أربیلا، وعشار — اربیلا)، مجلة سومر، ج ٢٥، ١٩٦٩، ص ٢٢١. رەنگە، ئەم جۆگەیە، هەمان ئەو جۆگەیە بێت کە (أبو الفداء) باسی دەکاو، دەڵێت: بە ناو مزگەوتەکەدا دەڕوات: (تقویم البلدان، ص ٤١٣).

(٣) ابن خلکان، وفیات الاعیان ٢٧٦/٣.

(ابوالفداء)یش، لە باسی جۆگە ئاوەكانی ناوچەی هەولێردا دەڵێت: یەك، لەو دوو جۆگا ئاوانەی دێنە ناوشار، بەناو تەلاری سەڵتەنەتدا دەڕوات[1].

ئێمە، بەڕاستیی بۆچوونی خۆمان، وا دادەنێین كە ئاوەدانیی شارەكە زێتر بەرەو باشووری قەڵاكە كشاوە، بەوەش پشتئەستوورین كە قەیسەرییە كۆنەكەش، هەر كەوتووەتە باشووری قەڵاكەوە و، بەرامبەر دەروازە گەورەكەی باشووری قەڵاكە دروست كراوە، كە رەنگە، هەمان دەروازە كۆنە مێژوویینەكەی قەڵاكە بێت و، قەیسەرییەكەش (وەك یاقوت الحموي) [2]دەڵێت: هەمان ئەو قەیسەرییە بێت كە موزەفەرەددین گۆكبوری دایمەزراندووە، چونكە، زۆر دوورە، زۆریش زەحمەتە، بنیادی شارێكی كەمبزاڤ، جێگای دوو شتی گرنگ و گەورەی، وەك دەروازەكەی قەڵاو قەیسەرییەكەی تێدا بگۆڕدرێت، نەخاسمە، هەولێر، لە دوایین قۆناغەكانیدا دووبارە، بەهۆی كاولكاری و كەمتەرخەمییەوە، دواكەوت و ئەو ناووناوبانگەی نەمابوو.

ئاوەدانبوونی بەرەو باشووریش، بە منارە مظفرییەكەدا دەردەكەوێت كە لە قەڵاوە دوورە، تا، ئەم زووانەش هەر كەوتبووە چۆڵەوانی و، دانیشتووانی نەبووە و، خەڵكی هەولێر ناویاننابوو (منارەی چۆل) [3]. بەڵام، راستییەكەی ئەوەیە، ئەم ناوچەیە، كاتێك منارەكە دروست كرا، ناوچەیەكی ئاوەدان بووە، چونكە منارەكە لە

---

(١) ابو الفداء، تقویم البلدان، ص ٤١٣.

(٢) یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٣٧/١.

(٣) خەڵكی شارەكە، منارەی چۆڵی و، (چۆل منارەسی)یشی پێدەڵێن. واتا منارەی دوور لە شارو، دوور لە ئاوەدانی. كاتێك ئەم ناوەیان لێناوە كە شارەكە زۆر كەم بووەتەوە و، تەنیا، لە نزیك قەڵاكەوە ئاوەدانی ماوەتەوە. بۆیە منارەكەش دەوروبەری چۆڵ بووە و بەتەنیا ماوەتەوە. گەر سەرنجی بدەیتێ، وا دەزانی، هەر لە بنەڕەتەوە، لەو چۆڵاییە و دوور لە شار، دامەزراوە و، ئازاو بەجەرگ ئەو كەسە بوو كە بە شەو بیگاتێ، هەتا ئێستاش، باسوخواس و باوەڕی عاجباتی و داستانی پڕ و پووچمان لەبیرماوە كە لەبارەی ئەم منارەیەوە بۆ دانیشتوانی ئەم شارە، بە میرات ماونەتەوە.

مزگەوتێکدا[١] دروست کراوە و، بەم مزگەوتەشدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوکات، ئاوەدانیی شارەکە بەرەو ئەم ناوچەیە هاتووە و پەرەی سەندووە[٢].

ئەوەی بەرفراوانبوونی شارەکە دەسەلمێنێ، ئەو چەمەیە (دۆڵەیە) کە (ابن خلدون) باسی دەکات و دەڵێت: ناوەڕاستی شارەکەی دەبڕی و لە سەردەمی ئەتابەگەکاندا، گۆڕستانێکی[٣] لەسەر بوو. ئەو چەمە، تا ئەمڕۆش بە ناوەڕاستی هەولێردا دەڕوات ـ هەرچەندیشە لەم دواییەدا، هەولێر زۆر گەورە بووە -. ئەم مێژوو نووسە هەولێرییە، ئەو چەمەی، هەر بە کوردییەکەی خۆمان ناونابوو «بەست» و تا ئەمڕۆش کوردی شارەکە هەر (بەست)ی پێدەڵێن، واتا: چەم، شیو، دۆڵ. (ابن خلدون) دەڵێت: چەمێکی پانە، بە ناوەڕاستی هەولێردا دەڕوات و، لە بەهار و زستاندا، باراناو و سێلاوی پێدا دەڕوات و، پڕە لە بەردی (چیم)[٤] ـ واتا خڕکە بەردی رەق و سوواو -.

---

(١) رۆژانێ (ریچ) سەری دا لە هەولێر، پاشماوەی ئەم مزگەوتە هێشتا مابوو، گوتی: (مزگەوتەکە رووخاوە و وێرانە. بناغەکەی گەڕام و، داروپەردوویم پشکنی و خشتەکانیم دەرهێنا، بنۆڕە کتێبەکەی: (رحلة ريج الى العراق سنة ١٨٣٠، ص ٢٤٤).

(٢) ریچ، گەورەیی شاری هەولێر – بە پێی جێگەی منارەکەی – بە گەورەیی شاری بەغدای ساڵی ١٨٢٠ کە سەردانەکەی کردبوو، بەراورد دەکات و دەڵێت: وادیارە، هەولێر، پێشتر شارێکی زۆر گەورە بووە و، رەنگە بەقەدەر گەورەیی ئێستای بەغدا بووبێت. سەیری هەمان کتێبی بکە: ص. ن.

(٣) ابن خلکان ناوی ئەم گۆڕستانە ناڵێت. پێدەچێ مەبەستی لە گۆڕستانی (ئیمام ئەعجیل) بووبێت کە بەسەر چەمەکەدا دەڕوانێت و کەوتووەتە رۆژاوای باشووری شارەکەوە، یان مەبەستی لە گۆڕستانە گەورەکەی رۆژهەڵاتی باشووری شارەکە بووبێت کە دەکەوێتە پشت (یانەی فەرمانبەران)ی جاران، یان مەبەستی لە گۆڕستانێکی تر بووە کە نەماوە و لەگەڵ زەویدا تەخت بووە.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ٤/ ١٠٤. ط ١٩٣٨.

**قەڵای هەولێر:**

هەرچی قەڵاکەیە، ئەوە، کاتی خۆی شارێکی کۆك و تەواو بووە، بازاڕی هەبووە، خانووی زۆری لەسەر بووە و هەمووی ئاوەدان بووە، مزگەوتی هەبووە[1]. میر (سرفتگین الزيني)ی جێگری (زين الدين علي كجك) مەدرەسەیەکی لێ دروست کرد بۆ مەلا (الخضر أبی العباس بن نصر بن عقيل الاربيلی)، ناونرا (مدرسة القلعة). قەڵاکە، کرا بە بارەگای فەرمیی ئەمارەتەکەو، دیوانەکان و[2]، دایەرە و بەندیخانەشی[3]لەسەر دامەزرابوون.

قەڵا ـ لانی کەم ـ دوو دەروازەی هاوبەرامبەری هەبووە. یەکێکیان دەروازەی باشوورە کە ـ هەتا ئێستاش ـ دەڕوانێتە سەر مەیدانەکەی نێوان قەڵاکە و قەیسەرییەکەی موزەففەرەددین گۆگبوری دایمەزراندووە، واتا دەکەوێتە رووکاری باشووری قەڵاکەوە. دەروازەی دووەم، بەرامبەر عەینکاوەیە، کە دانەری کتێبی (الحوادث الجامعة) دەروازەی (عمکاوا)ی[4]پێ دەڵێت و، دەڵێت: (گەورەترینی دەرگاکانە)، ئەم قسەیەش، مانای وایە کە قەڵا، لە دوو دەروازەی پتر هەبووە.

قەڵا، سەخت و قایم بوو، داگیرکردنی زۆر زەحمەت بوو، بە کەندەکێکی قووڵیش دەورە درابوو[5]. ئەم سەختی و قایمکارییەش بەوەدا دەردەکەوێت کە مەگەر زۆر

---

(١) یاقوت، معجم البلدان ١٣٨/١.

(٢) (ابن الشعار) دەڵێ: بارەگای دیوانی خەمڵ (الارتفاع) لە قەڵا بوو: (عقود الجمان ١٢٢/٩). دانەری کتێبی (الحوادث الجامعة) دەڵێ تەلاری ئەمارەتەکەش، هەر لە قەڵا بووە: (ص ٤٨). تا ئێستاش گەڕەکی نزیك دەروازە سەرەکییەکەی قەڵا، پێی دەڵێن: (گەڕەکی سەرای).

(٣) ابن خلكان ١٧٠/٣.

(٤) الحوادث الجامعة، ص ٤٦.

(٥) یاقوت، معجم البلدان ١٣٨/١. ئاسەواری ئەم کەندەکە و، ئاسەواری شوورەی شارەکەش، تا ساڵی (١٨٢٠) کە ریچ هاتە هەولێر، هەر مابوون — ئەم گەڕۆکە واتا (ریچ) چادرەکەی لە نزیکیانەوە هەڵدا. بنۆڕە کتێبەکەی: (رحلة ریج الی العراق) ص ٢٤٤. (محمود احمد)یش کە پیاوێکی بەتەمەنی هەولێرییە/١٨٧٦، دەڵێت: بە دەرووری قەڵادا، کەندەکێك هەبووە، لە بانزینخانە کۆنەکەوە تا نزیك مەحکەمەی شەرعییەی ئێستای دەگرتەوە (درێژ بوو). ئاوەکەی پیس بوو، لە قەڵا و لە مزگەوتی خانەقاوە، بۆی دەهات.

بەزەحمەت، دەنا، ملی بۆ هیچ داگیرکارێك کەچ نەکردووە. رەنگە کۆنترین بەڵگەش، بۆ راستیی ئەم قسەیە، ئەو باس و خواسە بێت کە (ابن واصل) دەربارەی خۆڕاگریی ئەم قەڵایە لە رووی ئەتابەگ (عمادالدین زەنگی)ی دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی موسڵدا، دەیگێڕێتەوە، کە ئەومبوو لە ساڵی (٥٢٦ ك)دا، ئەم قەڵایەی گەمارۆ داو، بەنیاز بوو داگیری بکاو، بیخاتە سەر ئەمارەتەکەی خۆی[١]، پاشان، ناچاربوو، گەمارۆکەی لابدات، نەخاسمە کە بیستی، سوڵتان مەسعود لە مەراغەی ئازەربێجانەوە، بەرەو هەولێر کەوتووەتە رێ چونکە هەولێر بەشێك بوو لە موڵکەکانی ئەو سوڵتانە، بۆیە ئەتابەگ (عمادالدین زەنگی) لە هەولێر کشایەوە و، لەسەر (زێ) ئۆردوگای هەڵدا. ئیدی لەوێ مایەوە و هەولێری بۆ داگیر نەکرا و نەیتوانی بیخاتە سەر ئەمارەتی موسڵ تا ئەو کاتەی کە لەگەڵ ئەم سوڵتانە سەلجووقییەدا رێك کەوت و ((سوێندیان بۆ یەکدی خوارد و هەولێری رادەست درا))[٢].

(القزويني) باسی سەختیی قەلا دەکات و، دەڵێت: مەگۆلەکان هیچ قەلا و قایمکارێك، لەبەریاندا خۆی ڕانەگرت، بەلام قەلای هەولێر هەند سەخت بوو، نەیانتوانی بگەنە ناوی[٣]. (رشيد الدين فضل الله الهمداني)یش لە وەسفی قەلاکەدا دەڵێت: ((قەلایەکە، وێنەی نییە و، لە چواریەکە ئاوەدانەکەی دنیادا بێ نەزیرە))[٤]. ئەم سەختی و قایمییەی قەلایە، هەولێری خستە ریزی ئەو شارانەی کە دەڵێن بەریان لە مەگۆلان گرتووە، بەرگریکردنی بەدڵیش، دژ بە مەگۆل، لە هەندێ شار و کەمێ ناوچەی عیراقدا رووی دا، نەخاسمە لە بەری لای رۆژهەلاتی بەغدا و، شارەکانی هەولێر و (واسط) و، پاشانیش لە موسڵ[٥].

---

(١) (ابن واصل) دەیگێڕێتەوە: مفرج الكروب ٩٧/١.

(٢) ن. م. ص.

(٣) القزويني، آثار البلاد، ص ٢٩٠. الباكوي، تلخيص الآثار وعجائب الملك القهار، ص ٣٥.

(٤) جامع التواريخ، مجلد ٢، ج ١، ص ٢٩٨.

(٥) د. جعفر خصباك، العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص ٦٠.

ئەم قەڵایە، كە ڕۆڵی گرنگی لە پاراستنی هەولێر و ناوچەكەدا گێڕاوە، تەنیا لەبەرئەوە نەبووە كە قەڵایەكی سەخت و قایمە، نەخێر،... مەگۆل قەڵاگەلی ئەوتۆیان داگیر كرد ـ بەڕای خۆم ـ زۆر لەم قەڵایەی هەولێر كووڕتر و سەختتر بوون، بەنموونە... وەك (قلعة الموت) و قەڵای (گردكۆ) و قەڵای (میمون) لە قەڵا دڕ و كووڕەكانی ئیسماعیلییەكانی ناوچەی قوهستانی وڵاتی فارسن[1] كە هیچیان لەبەر هێرشی مەگۆلدا خۆی ڕانەگرت.. خۆڕاگرتنی قەڵای هەولێر، زۆرتر لەبەر ئەوە بوو كە مەگۆل هێزی گەورەیان بۆ داگیركردنی نەناردبوو، بەڵكو، هێزێكی كەمیان بۆ سووسەكردن ناردبوو، تا بزانن بارودۆخی ناوچەكە چۆنە و چ لایەكی بە هێزە و، كام لای كەلێنە، لەبەرئەوە، سەربازانی سەردەمی موزەففەرەددین گۆكبوری، زۆرتر و، گەلێ جاریش، بە بێ ئەوەی زەحمەتییەكی گەورە بكێشن، بەرگرییان دەكرد.

مەگۆل، كە لەم ناوچەیەدا، سەركەوتنی گەورەیان بەدەست نەدەهێنا، زۆرتر لەبەرئەوە بوو كە ڕێگای نێوان هەولێر و ئازەربێجان[2]، هەمووی چیاو هەڵەت و هەڵدێر بوو، ئەوان وڵاتی ئازەربێجانیان كردبوو بە بنكە و بارەگای خۆیان و، لەوێوە بەرەو هەولێر و شارەكانی تری ناوچەكە دەهاتن.

سەختیی قەڵای هەولێر ڕێگای لە لەشكری خەلیفەی بەغداش گرت، خەلیفە (المستنصر)، دوای ئەوەی موزەففەرەددین گۆكبوری لە ساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٣ز)دا مرد، ویستی ئەمارەتی هەولێر بخاتە سەر مەملەكەتەكەی خۆی، بەڵام لەشكری هەولێر بەگژیاندا چوونەوە و هەولێریان نەدا بەدەستەوە. ئەوەبوو، خەلیفە، دووەم جار و، سێیەم جاریش لەشكری گەورەتر و بەهێزتری ناردە سەر هەولێر و، ئەنجام، جەنگاوەرانی سەر قەڵاكە بڕستیان لێ بڕاو، هەولێریش گیرا و، بە بەغداوە[3] بەسترا.

---

(١) (هوارد CL. Huart) في دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣. مادة الاسماعيلية، مجلد ٢، ص ١٩٠.

(٢) الكامل ٣٧٨/١٢.

(٣) الحوادث الجامعة، ص ٤٦.

لە ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٧ز)یشدا، کە مەگۆڵ گەیشتنە هەولێر، جەنگاوەرانی هەولێر دیسان خۆیان لە قەڵاکە قایم کرد و، مەگۆل کەوتنە سووتاندن و وێرانکردنی ئاوەدانییەکانی پادەشتەکە و، تالان و چەپاوڵ و کوشت و بڕی خەڵکەکە و خەڵکێکی بێ شوماریان کوشت و، پاشان هەولێریان، بە بەتاڵی، وەك هەناوی کەری گورگخواردوو بەجێهێشت[1]، نەخاسمە هاتنی لەشکری خەلیفەشیان بیستبوو[2].

سەرلەشکری مەگۆل (أرقیونویان) لە ساڵی (٦٥٦ ك)دا کە دوا هێرشی مەگۆلی هێنایە سەر هەولێر، هەرچەندیشە گەمارۆیەکی بەهێزی شارەکەی دا، بەڵام لەبەر سەختی و کووریی قەڵاکە، شارەکەی بۆ داگیر نەکرا[3]. (أرقیونویان) چاری نەما، پێوەندیی کرد بە (بدرالدین لؤلؤ)ی سەرداری موسڵەوەو لەگەڵیدا کەوتە پلان و تەگبیر. (بدرالدین لؤلؤ)یش ئامۆژگاریی کرد کە گرتنی هەولێر دوا بخات بۆ وەرزی هاوین، چونکە، هاوینان، خەڵکی هەولێر، کە کوردن، هەموویان، لەبەر گەرمای هاوین شارەکە چۆڵ دەکەن و، روو لە کوێستانەکان دەکەن[4]. بەو پێیە (أرقیونویان) مەسەلەی داگیرکردنی هەولێری بۆ (بدرالدین لؤلؤ) بەجێهێشت، ئەویش، بەرە بەرە کەوتە رووخاندنی شوورەی شارەکە و، پاش ورە بەردانی خەڵکەکەی، ئەوجا داگیری کرد، هەندێ لە جەنگاوەرانی ناو شار، روویان لە کوێستانەکان کرد، نەخاسمە سەرلەشکری مەگۆل دەستی لە شارەکە هەڵگرتبوو. جەنگاوەرەکان لەوە دەترسان ئازووقەیان لێ ببڕێت و بەشیان نەکات و، وەکو گەمارۆکەی ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٧ز) ئاویشیان لێ ببڕێت[5].

بەڵام لەبارەی گەورەیی ئەم قەڵایەوە، یاقوت دەڵێت: قەڵاکە لەسەر گردێکی

---

(١) إبن أبي الحديد، شرح نهج البلاغة، جـ ٣، ص ٨١.

(٢) الحوادث الجامعة، ص ٩٩.

(٣) رشيدالدين فضل الله الهمداني، جامع التواريخ، مجلد ٢، ج ١، ص ٢٩٩.

(٤) جامع التواريخ، ن. ص، عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين ٢١٤/١.

(٥) الحوادث الجامعة، ص ٩٩.

گەورە و فراوان دامەزراوە و، وەکو قەڵاکەی حەڵەب وایە، پاشان دەڵێت: بەڵام قەڵای هەولێر گەورەتر و فراوانترە[1]. وەلێ (حمدالله المستوفي) دەڵێت: قەڵایەکی مەزن و گەورەیە[2]. (سترك)یش دەڵێت: ئەم قەڵایە گەڕۆکەکانی سەرسام کردووە و، ئەوەی روو لەم شارە بکات لە دووریی چەند سەعاتێکەوە دەیبینێت[3].

## دوو: بیناو بارەگاکان، کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە هەولێر دایمەزراندن:

### أ- منارەی هەولێر:

مادامێکی باسی پلان و رەنگرێژیی هەولێری سەردەمی ئەتابەگەکان دەکەین، دەبێ باسی منارەکەشی بکەین، چونکە منارەکەی زەقترین ئاسەواری شارەکەیە.

منارەکەی کەوتووەتە رۆژاوای باشووری شارەکەوە، نزیکەی یەك کیلۆمەتر لە قەڵاکە دوورە. هەر بەناوی موزەففەرەددین گۆکبورییەوە بە منارەی مظفریە، ناسراوەو[4]. پێدەچی لە سەردەمی حوکمی ئەودا، بۆ مزگەوتێ دروست کرابێت کە لەو جێگەیەدا هەبووە، چونکە بناغەی مزگەوتێك لەو جێگەیەدا دۆزرایەوە کە لە

---

(١) ياقوت، معجم البلدان ١٣٨/١.

(٢) حمدالله المستوفي القزويني، نزهة القلوب، المقالة الثالثة، ص ١٠٢.

(٣) م. سترك، دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، المترجمة الى العربية، مادة اربيل، ٥٧١/١.

(٤) وداد علي القزاز، مقال (المنارة المظفرية في اربيل)، مجلة سومر، مجلد ١٦ لسنة ١٩٦٠، ص ١٢٧. طه باقر وفؤاد سفر، المرشد الى مواطن الآثار والحضارة ط/١٩٦١، الرحلة الخامسة، ص ٦. كامل حسين، مقال (التنقيب حول المئذنة المظفرية في اربيل)، مجلة سومر، مجلد ١٨ لسنة ١٩٦٢، ص ٢٠٧. عباس العزاوي، مقال (امارة أربيل)، مجلة المجمع العلمي العربي، دمشق، مجلد ٢٢ لسنة ١٩٤٧، ص ١٤٤.

بەڵام (عبدالرزاق الهلالي) دەڵێت: رەنگە، ئەم منارەیە لە ئاسەوارەکانی (کوشییەکان) بێت(!) بنۆڕە کتێبەکەی خۆی: (معجم العراق)، ط/١٩٥٣، بغداد، ج ١، ص ٦٧.. الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ص ٦٦٠

منارەکە کۆنترە و، بڕواش، وایە کە لە چاخی ئەمەوییاندا، یان لە بەرایی حوکمی عەبباسییاندا دروست کرابێت[١]. پێدەچێ، دەمێ، (نیبور)، بەر لە دوو سەدە پێشتر، لە ساڵی (١٧٦٦ز)دا، کە سەری لە هەولێر دا، چاوی بە ئاسەواری ئەو مزگەوتە کەوتبێ، ئەو لە قسەکانیدا باسی دەکات و، دەڵێت لەم شارەدا، لە ئاسەواری مزگەوتێکی گەورە زێتر دوور لە قەڵاکەوە، لەناو کێڵگەکاندا، هیچ ئاسەوارێکی تر نابینرێت، ئەڵێت، ئەمەش یەکێکە لە ئیشەکانی موزەففەرەددین گۆکبوری[٢]. ئەم ئاسەوارە، لە ساڵی (١٨٢٠ز)یشدا، هەر مابوو کە (ریچ) سەری لە هەولێر دا، (ریچ) دەڵێت: مزگەوتەکەی کەلاوەیە، هەموو بناغەکانی گەڕام و، دارو پەردوو و خشتەکانیشیم دەرهێنا[٣].

ئەم منارەیە بە خشت و گەچ دروست کراوە، بەڵام بنکەکەی (بناغەکەی) بە شێوەی حەوتلا[٤] (مسبع) لە بەردی داتاشراوی ڕێکوپێك داڕێژراوە، دوو دەرگایشی تێدایە، هەر یەکەیان بەسەر پێپلیکانەیەکدا دەکرێتەوە و، بەجیا، بە شێوەی لوولپێچ بە دەوری ئەستوونێکی ئەستووردا، هەر لەناو جەرگەی منارەکەدا، بەرەو سەرەوە دەڕۆن[٥]. دوو کەس، لە هەمان کاتدا، پێکەوە، بێ ئەوەی چاویان لە یەکتری

---

(١) کامل حسين، مجلة سومر، ن. م. ص.

(٢) كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ص ٩٠.

(٣) ريچ، رحلة ريچ، ص ٢٤٤.

(٤) وەڵێ سەرچاوەکان بە هەشتلا (مثمن) دایدەنێن (طه باقر، المرشد ص ٦. وداد القزاز، سومر ١٢٧/١٦. پێدەچێ ئەوانەی کە دەستیان پێدا هێناوەتەوە، (چاکیان کردووەتەوە) دوو لای بەرامبەر ڕۆژاوای باکووریان درێژتر کردبێتەوە و، بەوەش لایەکەی نێوانیان کوێر بووەتەوە و، نەماوە. ئەمەش، بەوەدا دەردەکەوێ کە ئەم دوو لایە، لە لاکانی دیکەی درێژترن، هەریەکە لەم دوو لایە (١٦) پێ دەبێت، بەڵام پێنج لایەکەی دیکە لە (١٠) پێ کەمترن. هەرچەندە، (طه باقر) و (فؤاد سفر) باسی چاککردنەوە و بەهێزکردنی بنکەی منارەکە دەکەن، بەڵام ئەو کارە چۆن چۆنی کراوە، باسی ئەوە ناکەن.

(٥) طه باقر، المرشد، ص ٦.

بێت سەردەكەون، تا ئەگەنە قولەكەی یەكتری نابینن[١]. بەڵام بەهۆی باو بارانەوە لووتكەكەی بەرەبەرە رووتاوەتەوە و نەماوە.

ئەم منارەیە، ئەمڕۆ نزیكەی (٣٥) مەتر بەرزە و، باسی بەرزاییەكەی بە شێوەی جۆراوجۆر نووسراوە. (ریچ) و (طه باقر) و (فؤاد سفر) كەم و زۆر وەكو یەك بەرزاییەكەیان قەرساندووە. یەكەمیان، بە (١٢١) پێی، دادەنێ[٢] واتا نزیكەی (٣٦, ٣) مەتر. دووەمیان بە (٣٧)[٣] مەتری دادەنێت، واتا نزیكەی (١٢٣) پێ. كەچی (الهلالي) تەنیا، بە (٨٠) پێ[٤]دەیقەرسێنێ، واتا نزیكەی (٢٤) مەتر. بەڵام (سترك)، زۆری ناوەتە سەر و، دەڵێت دەگاتە (٥٠٣) پێ[٥]، واتا زێتر لە (١٥٠) مەتر، گوایا ئەم قەرساندنەی لە ریچەوە وەرگرتووە و، (ریچ)یش بەرزیی منارەكەی ـ وەك باسمان كرد ـ بە (١٢١) پێ قەرساندووە.

درێژیی هەریەكە لە پێنج لایەكەی نزیكەی (١٠) پێ[٦]دەبێت، واتا نزیكەی (٣) مەتر دەبێت، بەڵام درێژیی هەریەكە لە دوو لایەكەی دی كە درێژ كراونەتەوە نزیكەی (١٦) پێ واتا (٨ ,٤ مەتر) دەبێت.

سترك، وەسفی منارەكەی هەولێر دەكات، دەڵێت، منارەیەكی جوانە[٧]. بەڵام

---

(١) نیبور، رحلة نیبور، ص ٩٠.

(٢) ریچ، م. ن. ص.

(٣) طه باقر، م. ن. ص.

(٤) عبدالرزاق الهلالي، معجم العراق، ص ٦٨. الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ص ٦٦٠.

(٥) سترك، دائرة المعارف الاسلامية، المترجمة، ط ١٩٣٣، مادة اربيل، ٥٧٥/١.

(٦) ئەوانەی باسی درێژیی لایەكانی (اضلاع) منارەكەیان نووسیوە، رایان جیاوازە: بنۆڕە: ریچ، ن. م. ص. سترك: ن. م. ص. (W. R. H) حاكمی سیاسیی هەولێر زەمانی داگیركردنی عیراق. بنۆڕە كتێبەكەی: سنتان في كوردستان ١٩١٨ – ١٩٢٠ ز، ج ١، ص ١٤٩.

(٧) سترك، دائرة المعارف الاسلامية ٥٧٥/٥. هەروەهاش: دائرة المعارف البريطانية Encycl, Britannica. V. ١٢, P ٥٣٨.

(W. R. H) وەسفی دەکاو دەڵێت منارەیەکی نایابە[١]. نموونەی ئەم منارەیە لە وڵاتی جەزیرە، زۆرە، بەنموونە، منارەکەی داقوق و، منارەکەی شنگاڵ و[٢]، تا رادەیەکیش (منارە نوورییەکەی) موسڵ[٣]. لەوەش دەچێ لە سەردەمی ئەتابەگەکاندا، لە وەخت و ساتی نزیك بە یەكدا دروست کرابن.

## ب- دامودەزگای لەشساغی و کۆمەڵایەتی کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە هەولێر دایمەزراندبن:

زێتریش لە دام و دەزگای فێرکاری و زانستی دەچن. موزەففەرەددین گۆکبوری دام و دەزگای تەندروستی و کۆمەڵایەتیشی دامەزراند، کە سوودی گەورەی بە ناساغ و نەخۆشی خەتەرناك و، هەژار و کۆرپەی (مەلۆتکەی) فرێدراو و بێوەژنان دەگەیاند.

---

(١) W. R. H، م. ن. ص، ١٤٨.

(٢) ريچ، ن. م. ص. طه باقر، ن. م. ص. محمد هادي الدفتر. عبدالله حسن، كتاب العراق الشمالي ٢٧٩/١. وداد القزاز، مقال (المنارة المظفرية)، سومر، مجلد ١٦ لسنة ١٩٦٠، ص ١٣٧.

(٣) نوورییەکە: مەبەست لە ((نورالدين محمود الشهيد کوڕی ئەتا بەگ عمادالدين زەنگی))یە. (نورالدين محمود) حوکمی موسڵی بە دەستەوە بوو لە ساڵی ٥٦٦ ك تا ساڵی (٥٦٩ ك) و لەم ساڵەدا مرد.

**ئەمانەش، لەو دامودەزگایانەن:**

**١- مارستان - بیمارستان[1]، واتا (نەخۆشخانە):**

سەرداری هەولێر ئەم دەزگا لەشساغییەی دامەزراند و، سەرپەرشتانی بۆ هەڵسووڕاندنی كاروباری دانا[2]. وادیارە بیمارستانەكە چەند بەشێك بووە. (ابن الشعار) كە ساڵانێكی زۆر لە هەولێر ماوەتەوە، دەڵێت: (ابراهیم بن اسماعیل ابن محمد الحرانی) ناسراو بە (ابن النقیب/ ت ٦٢٢ك/١٢٢٥ز) (چاوڕێژ) بووە (واتا پزیشكی چاو) بووە و لەم بیمارستانەدا كاری كردووە[3]. (أبو أحمد یوسف بن جامع ابن احمد بن محمد الاربیلي) سەرپەرشتی كۆگای دەرمانەكان بووە. ئەم كابرایە سەری لە پزیشكی دەرچووە و لێی زانیوە و، چارەسەری گەڵێ نەخۆشی كردووە (لە ساڵی ٦١٥ك/١٢١٨ز)دا مردووە[4].

موزەففەرەددین گۆكبوری دەچووە ناو بیمارستانەكەوە و، سەری لە نەخۆشەكان دەداو، لێی دەپرسین، جێگایان، خەویان، خۆراكیان، حەز لە چی ئەكەن و پێداویستییان بە چییە[5].

**٢- خانەقاكان:**

موزەففەرەددین گۆكبوری چوار خانەقای لە هەولێر، بۆ كوێر و نەخۆش و دەردەداران كردەوەو، ئەوەش كە بۆ ژیان زەروور بێت بۆی دابین كردن[6]. هەر لە

---

(١) بیمارستان: وشەیەكی فارسییە، واتا (خانووی شفا). بنۆڕە: التبریزي (برهان قاطع)، ص ٢٢٤. د. محمد اسعد طلس، التربیة والتعلیم في الاسلام، ص ١١٦ — ١١٧.

(٢) ابن خلكان ٣/٢٧٢.

(٣) ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان، ج ١، ترجمة ابراهیم بن اسماعل بن محمد.

(٤) ن. م، ١٠/١٧٣.

(٥) ابن خلكان، ن. ص. ابن ابي عذیبة، مخطوط، انسان العیون، ٢٩٦. الغساني، العسجد المسبوك، بالرونیو، ورقة ٣٣٠.

(٦) ابن خلكان ٣/٢٧٢.

ئاو و خۆراك و پۆشاکەوە بیگرە تا دەگاتە هەموو خەرج و مەسرەفێکی تر. چاوساغ و، خزمەتکاریشی بۆ سەرپەرشتی و چاودێرییان دامەزراند، دوو جۆرە مووچەی، هەم بە کەلوپەل و هەم بەدراو (الجرايات والجوامك) بۆ بڕیبوونەوە[1]، بەوجۆرە، لە سواڵ و دەرۆزە و لاکۆڵانان رزگاری کردن. موزەففەرەددین گۆکبوری، هەموو رۆژانی دووشەممە و پێنج شەموان، سەری لە دانیشتووانی ئەو خانەقایانە دەداو، لە کاروباریانی دەپرسی و، یەك بەیەك، بەسەریاندا دەگەڕاو، گوێی لە باری گوزەران و نیاز و ڕازیان دەگرت و، سنگی خۆی بۆ فراوان دەکردن و گەمە و گەپی لەگەڵدا دەکردن و دڵیانی دەدایەوە[2]

٣- داڵدەکان (الملاجیء):

ئەم میرە، داڵدەیەکی بۆ هەژار و هەتیو و لانەوازان کردەوە، ئەوانەی کە بێ خاوەن بوون و، کەسیان نەبوو گوزەرانیان بدات و بەخێویان بکات. هەموویانی لەوێ خڕ کردەوە و، لە گەڕان و شەقام و کۆڵان و دەست پانکردنەوەی رزگار کردن و، کات و ساتی سەرلێدانیشیانی دیار کرد. مێژوونووسی هاوچەرخی موزەففەرەددین گۆکبوری (سبط ابن الجوزي) کە ئەو دەمە سەری لە هەولێر دابوو، دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری، هەموو سبەینانێك، زوو، سوار دەبوو، لەبەردەمی داڵدەکاندا دادەبەزی و، خۆی بە ژووردا دەکرد و، کچۆڵەیەکی بێ باوك و دایك و کەساسی لەخەو بەئاگا دەهانی و، لەسەر رانی خۆی دادەناو، لێی دەپرسی: ((حەزت لە چییە بخۆی، چیت پێ جوانە لەبەری بکەی)) هەرچییەکی ویستبا، بۆی دەهێنا[3]،

---

(١) سبط ابن الجوزي ٦٨٣/٨.

(٢) ابن خلكان، ن. ص. الغساني، العسجد المسبوك، ورقة (٣٣٠). الفاسي المكي، العقد الثمين ١٠٣/٧. ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٢٩٦. ابن العماد، شذرات الذهب ١٣٩/٥.

(٣) سبط ابن الجوزي، م. ن. ص.

ئنجا، بیری لە چارەنووسیان دەكردەوە و، كاتی شووكردنیان هاتبا، بەمێردی دەدان[1].

رەحم و سۆزی ئەم میرە، بێوەژنانیشی گرتەوە. بۆ ئەوانیش خانوویەكی تایبەتی كردەوە و، خزمەت و پێداویستی گوزەرانی بۆ دابین كردن[2]. بۆ كۆرپە و مەلۆتكەی فرێدراو و[3]. بێ خاوەنیش، هەر بەوجۆرە، داڵدەی دروست كرد و ژمارەیێ دایەنی بە سەرەوە خستە سەركار[4]. پێدەچێ، سەرداری هەولێر یەكەم حاكمی ئیسلام بووبێت ئەم جۆرە دامودەزگایانەی بە خەیاڵدا هاتبێت و[5]، دایمەزراندبن. لەبەر ئەوە دەتوانین ئیشەكانی بە ئیشی ئەو خاوەن حوكمانە بشوبهێنین كە ناویان بە چاكساز و خێرخواز و خزمەتگوزاری كۆمەڵایەتی و تەندروستی دەركردووە[6].

بێجگە لەو ئیشە خێرانە، میوانخانەیەكیشی بۆ حەوانەوەی شاند و ئەو میوانانە سەریان لە هەولێر دەدا، دامەزراند، بە تایبەتیش بۆ ئەو مەلاو حەدیسخوانانەی كە بە هەولێردا بەرەو وڵاتانی دەوروبەر تێدەپەڕین و بە درێژایی مانەوەشیان لە هەولێر، لەو میوانخانەیەدا خۆراكیان مفت و ئامادە بوو[7]. (سبط ابن الجوزي)

---

(١) سبط ابن الجوزي، م. ن. ص.

(٢) ابن خلكان ٢٧٢/٣. الذهبي، مخطوط "تأريخ الاسلام" الجزء الأخير، ق ٢، ورقة ١٨١. الفاسي المكي، العقد الثمين، ١٠٣/٧. ابن أبي عذيبة، انسان العيون ٢٩٦.

(٣) مەلۆتكەی فرێدراو: كۆرپەی شیرە خۆرەیە، لەبەر هەر هۆیەك بێت، خاوەنی لە قەراغ ڕێگایەك دایدەنێ و بەجێی دەهێڵێت، كەسانێك هەن (هەڵیدەگرنەوە) و بۆ خۆیان بە خێوی دەكەن، واتا دایك و باوكی نەناسراون: (تاج العروس ٢١٧/٥).

(٤) ابن خلكان، ص. ن. الذهبي، و. ن. الفاسي المكي (١٠٤/٧ ابن ابي عذيبة، ن. ص).

(٥) هوارث / Howorth, the Mongols, v, ١١١, P. ١٣٣

(٦) دكتۆر طلیمات ئەم ئیشانەی موزەففەرەددین گۆكبوری بە ئیشەكانی خەلیفەی ئەمەوییان (وليد بن عبدالملك) دەچوێنێ: بنۆڕە كتێبی (مظفرالدين كوكبرى أمير أربل) ص ٢١٠.

(٧) ابن خلكان ٢٧٢/٣. الذهبي، تأريخ الاسلام، ورقة ١٨١. الغساني، العسجد المسبوك، ورقة ٣٣٠.

دەڵێت: میر، ساڵانە، سەد هەزار دیناری[1] بۆ ئەم میوانخانەیە تەرخان دەکرد. ئەم بڕە پارەیەش ـ هەرچەندە نەگەیشتووەتە ئەو زۆرییە ـ بەڵام بەشێکە لە سێیەکی دەرامەتی ئەمارەتی هەولێر کە بۆ کاری چاکە و خێرخوازی، هەموو ساڵێ، تەرخانی دەکرد. ئەو مێژوو نووسە لە زمانی ئەم میرەوە، دەڵێت: ((کە هەولێرم وەرگرت، عەهدم کرد، دەرامەتی بکەم بە سێ بەش، بەشێ بۆ کاری خێر، بەشێ بۆ لەشکر و، بەشێ بۆ شەڕی ئەو دوژمنەی هێرشم دەکاتە سەر)) [2].

## سێ: سەرچاوەکانی گوزەرانی ئابووریی ئەمارەتی هەولێر:

ئەم ناوچەیە، هەر لە دێر زەمانەوە بە بەروبوومی کشتوکاڵ، نەخاسمە، بە دەغڵ و دان بەناوبانگ بووە[3]. ئومێدی گەورەی فەلاحەت و وەرزێرییش هەر، بە باران بووە، چونکە رووباری نییە و[4]، دێمە. لەبەر ئەوە، ئەگەر ساڵێك بارانی کەم بێت، ئەوە، دەبێتە وشکەساڵی و نەهاتی ـ هەر لەبەر ئەو بێ ئاوییەشە کە باغ و بێستانی لێ ناکرێ و زۆر کەمە، بەڵام خەڵکەکە بیر و کارێزیان لێ داوە[5]، کەم و زۆر باغ و بێستانی هەیە، لەو کارێزانە دوو جۆگە هەڵبەستراوە. (یاقوت الحموي) وەسفی ئەو جۆگە ئاوانە دەکات، دەڵێت: ئاوەکانیان وەك ئاوی دیجلە سووك

---

(١) سبط ابن الجوزي، ٦٨٣/٨ ابن العماد، شذرات الذهب ١٤٠/٥

لە کتێبی (تأريخ الاسلام)ەکەی (ابن قاضي شهبة)وە وەرگیراوە.

(٢) سبط ابن الجوزي ٦٨١/٨.

(٣) حمدالله مستوفي القزويني، نزهة القلوب، ص ١٠٢.

(٤) ياقوت الحموی، معجم البلدان، ١٣٨/١.

(٥) کارێز: واتا: جۆگە، لە ژێر رووی زەویدا هەڵدەکەندرێت و ئاوی پێدا دێت. بنۆڕە: ((برهان قاطع)) قاموس لغوي فارسی، ص ٨٧٢.

و سازگاره[١]. گەلێ جۆگە هەبوون، بەڵام دووانیان دەگەیشتنە ناو شاری هەولێر، یەکێکیان بۆ ناو مزگەوتەکە و، ئەوی دی بۆ ناو تەلاری سەڵتەنەت[٢].

گرنگترین بەروبوومی کشتوکاڵ، دوای دەغڵ و دان، لۆکە بوو. جوگرافیناسی فارسی بەناوبانگ (حمداللە مستوفي) باسی پەمووەکەی (لۆکەکەی) دەکات و دەڵێت: داهاتی ساڵانەی هەولێر، لەو پەمووە گەیشتە (بیست و دوو هەزار دینار) [٣]. بەڵام قەرساندنی ئەم داهاتە، پاشان، لە قۆناغێکدا، ئەنجام درا، وەك (ابن الطقطقي)[٤] دەڵێت، هەولێر، ببوو بە شارێکی پیسەکەی پچووك. بەڵام رەنێوهات (انتاج)ی میوە و فیقی، هەر چەندە بەروپشتی هەولێر باغ و بێستانی کەمە، وەڵێ لە ناوچە چیاکانی دەوروبەرەوە میوەی زۆری بۆ دەهات، بە تایبەتیش لە گوندی شەقلابان (واتا شەقلاوە) وە خۆ، ترێی نایابی شەقلاوە بەردەوام بەرێوە بوو بۆ بازارەکانی هەولێر[٥].

مێژوو نووس و شارانگەڕان باسی سامانی ئاژەڵی هەولێر ناکەن، هەر چەندیشە

---

(١) معجم البلدان، ص. ن.
ئاوی کارێزەکانی هەولێر، بەهۆی کاولکاریی زەمانەوە، ئێستا نەماوە و، کارێزەکان وشکیان کردووە. کەمتەرخەمی و گەندەڵیی سوڵتان، تەنیا دوو کارێزی هێشتەوە، یەکەمیان کارێزی موزەففەرەددین گۆکبورییە (وەك، محمد هادی الدفتر) و (عبداللە حسن) لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا (العراق الشمالي، ج ١، ص ٢٧٨) باسی دەکەن و، پێدەچێ مەبەستیان لە (ئاوی میری بێت کە چەند ساڵێکە وشك بووە. دووەمیان، ناوی کارێزی (موعەسکەر)ە کە بە (کارێزی سەعید ئاغا) ناسرابوو. بۆ زانیاریی زێتریش لەسەر وێرانکردنی جۆگە ئاوەکانی عیراق، بنۆڕە: الدکتۆر جعفر حسين خصباك، (العراق في عهد المغول الايلخانيين) ص ١٦٠ — ١٦١.

(٢) أبو الفداء، تقويم البلدان، ص ٤١٣. القلقشندي، صبح الاعشى، ٣٦٦/٤.

(٣) حمدالله مستوفي، نزهة القلوب، ص ١٠٢.

(٤) ابن الطقطقي، الفخري في الآداب السلطانية، ص ٣٢.

(٥) شەقلابان: واتا شەقلاوە: (ياقوت الحموي) وەسفی دەکات و دەڵێت: گوندێکی گەورەی جوانە، لەو چیا بەرز و سەوز پۆشەدا کە بەسەر هەولێردا دەڕوانێت، رەز و باخی زۆرە و پڕە لە بێستان و دێبەران. بەدرێژایی ساڵ ترێ و مێوژی رەزەکانی بەرێوەیە بۆ هەولێر و بەشی هەموویان دەکات. هەشت قۆناغ لە هەولێرەوە دوورە: معجم البلدان ٣٥٥/٢.

ئـاو و هـەواو بـاری سروشـتی خـاك و ئـاوی ناوچـەكە، لـەوەڕگای خۆڕسـكی زۆری رەخساندبوو، پیشەی شوانی و مەڕداری و راگرتنی ئاژەڵ، بـە تايبـەتيش مـەڕ و پـەز باو و بڵاو بوو.

لە بارەی بزاڤ و چالاكيی بازرگانييەوە، سەرچاوەكان دەڵێن كە بازرگـانی بـەهۆی ئـارامیی سياسـی و گرنگيـی پێگـە و جێگـەی هـەولێرەوە، بـە تايبـەتيش لـە چـاخی بووژانەوە و حوكمی موزەففەرەددين گۆگبۆريدا، رۆژ بە رۆژ گەشەی دەكرد و بەرەو چاكتر دەگۆڕا، كـە هـەولێر بازرگـانيی لەگـەڵ وڵاتـانی دووريـشدا دەكـرد و، شمـەك و كوتاڵی ئاهەنگ و رابواردنيشی بۆ دەهات. سەرچاوەكان دەڵێن: بـاوكی (موفـق الـدين بن محمد ابـن يوسـف) بازرگـانی دوڕ بـوو، لـە نێـوان هـەولێر و وڵاتـی (بـەحرەين)دا هەميشه لە هاتوچۆدا بوو، لە بەحرەين وەك بازرگانەكانی ديكە[1] دەمايەوە چاوەڕێی قوتخواردووەكـان (الغطاسـين)ی بـن ئـاوی دەكـرد، تـا دوڕيـان لێ بكڕێـت. (اليـونينی) دەڵێـت: (قاسـم بـن أبـی بكـر بـن القاسـم)ی بازرگـان بەسـيفەت (امـين الـدين)ی حەديسخوانی هەولێری، ناسـراو بـە (قورئـانخوێن) بـاوكی ئـەم قاسمـە يـەكێ بـوو لـە گـەورە بازرگانـەكان و سـەری لـە هـەولێر و وڵاتـی ميـسر و وڵاتـی عەجـەم دەدا و دەگەيـشتە خـواريزم[2]. ئەمـەش فراوانبـوونی ئاسـۆی بازرگـانيی هـەولێر لەگـەڵ هەندەراندا نيشان دەدات. (ياقوت الحموي)يش باسی كاروانی بازرگانی دەكـات كـە لـە هەولێرەوە بەرەو ئازەربێجان دەكەوتە رێ و، دەڵێت، بازرگانانی خاوەن ئەم كاروانـە، لە رێگا، لە شاری (تل هفتون) [3]لاياندەدا و باريان دەخست بۆ ئـەوەی پـشوو بـدەن و بحەوێنەوە، ئەم شارە كەوتبووە ناو چياكانەوە و، سەر بە هەولێر بوو. پاشان كـاروان

---

(١) ابن خلكان ١٠٣/٤. السيوطي، بغية الوعاة ٢٨٦/١ – ٢٨٧، نقلاً عن ابن المستوفي.

(٢) اليونيني، ذيل مرآة الزمان ١٣١/٤.

(٣) تل هفتون: شارۆچكەيەكی سەر بە هەولێرە، كەسێ لە هەولێرەوە بچێت بۆ ئازەربێجان، دووەم رۆژ دەگاتە ئەوێ. كەوتووەتە ناوچە شاخاوييەكان، چەمێكيشی پێـدا دەڕوات، (معجم البلـدان ٤٥/٢).

دەکەوتەوە ڕێ. وا دیارە خودی ئەم شارە، شارێکی بازرگانی بووە و ئاوەدان بووە. (یاقوت الحموي) کە چەندین جار هاتوچۆی ئەم شارەی کردووە، وەسفی بازاڕ و خێر و بێری ئەم شارەی کردووە[1].

(سترك)یش دەڵێت: ئەو ئاهەنگە گەورە و گرانەی کە هەموو ساڵێك موزەففەرەددین گۆکبوری بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە (د. خ) دەیگێڕا، بازاڕێکی بازرگانیی گەرم و گرنگیشی لەگەڵ خۆیدا دەڕەخسان[2]، ئەو بازاڕە هەند بەرفراوان و گەورە بوو، جێگای نەدەبووەوە، ناچاربوون، قەیسەرییەکەیان بۆ دامەزراند[3].

هەرچی، لایەنی پیشەسازی و سەنعەتکارییە، ئەوە، لەو بارەیەوە هیچ شتێکمان نییە باسی بکەین، تەنیا ئەوە نەبێ کە یاقوت الحموي بە (النصافی) ناوی دەبات کە گوایە لە شارۆچکەی (حزة)[4] دروست دەکرا گوایە کراسێکی ئافرەتانەیە لە دەزووی لۆکە تەون دەکرا و لە هەولێر برەوی هەبووە و باو بووە. لەوانەشە بەهۆی پەرەسەندنی ئاوەدانیشەوە کەرەسەی خانووی، وەك کەرپووچ و گەچ و قسڵ دروست کرابن، بەڵگەی ئەوەش لە منارەکەیدا دیارە[5].

---

(١) معجم البلدان ٢/٤٥.

(٢) م. سترك، دائرة المعارف الاسلامية ١/٥٧١.

(٣) ئەم قەیسەرییە هێشتا لەناو جەرگەی هەولێردا ماوە. چەند بازاڕێکە، کەوتووەتە ناویەك و، بانیان گیراوە، هەر بازاڕەی بۆ فرۆشتنی شمەکێك تەرخان کراوە. هەندێکیان رووخاند چونکە لەگەڵ پەرەسەندنی هەولێردا نەدەگونجا، یان لەبەر ئەوەی کۆن ببوو، مەترسی تەپینی لێ دەکرا.

(٤) معجم البلدان ٢/٢٥٦.

(٥) وداد القزاز، سومر مجلد ١٢٧/١٦. طەباقر، المرشد، ٦/٥.

# فەسلی دووەم

## باری رۆشنبیری و کلتووری لە هەولێری سەردەمی ئەتابەکیدا .

- دامودەزگا کلتوورییەکان.

یەک : مزگەوتەکان.

دوو: قوتابخانەکان.

سێ : خانەی حەدیس (دار الحديث).

چوار : خانەقاکان.

- ئەو زانا گەورانەی کە هاتوونەتە هەولێر.
- بنەماڵە زانستدۆستە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی هەولێر.

یەک : بنەماڵەی خەلەکان (خلكان).

دوو : بنەماڵەی (إبن المستوفي).

سێ : بنەماڵەی (إبن منعة).

# فەسلی دووەم

## باری رۆشنبیری و کلتووری لە هەولێری سەردەمی ئەتابەگیدا

بە پێچەوانەی زۆربەی ناوەندە ئیسلامییە هاوچەرخەکانی ئەو سەردەمە، بە نموونە، وەك موسڵ و حەڵەب و جێگاکانی دیکە، زانیاریمان لەبارەی دامودەزگای پەروەرشت و فێرکاری و کلتووریی هەولێری ئەو سەردەمە، کەمە. بەشی ئەوە ناکات ئەو بابەتەمان بۆ روون بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، توانیومانە هەندێ لایەنی ئەو دامودەزگایانە بدۆزینەوە. دەشهێنێ بڵێین، زاناکان، بە تایبەتیش مەلا و شەرعناس و حەدیسخوانان، لە لای موزەففەرەددین گۆکبوری برەویان هەبوو. ئەو (وەك ابن خلکان دەڵێ)[1] خەمی دەخواردن و چاودێری دەکردن و دەستی دەگرتن و نائومێدی نە دەکردن. دەگێڕنەوە، دەڵێن: (أبو خطاب عمر بن الحسن المعروف بابن دحية الاندلسي البلنسی) کاتێ کتێبی (التنوير في مولد السراج المنير)ی داناو، بۆی کرد بە دیاری[2]میر، هەزار دیناری خەڵات کرد، ئەمەش بەڵگەیەکە، کە ئەو میرە دنەی زانست و کلتووری داوە. یەکێ لە رۆژهەڵاتناسان دەڵێت، هەولێر لە سەردەمی ئەودا، قۆناغێکی دووری لە رێگای کلتووریدا بڕیبوو، کە پێشتر بەخۆیەوەی نەدیبوو[3]. (حسن الباشا)یش دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری لە دامەزراندنی

(١) ابن خلکان ٢٧٦/٣.

(٢) ن. م. ١٢٢/٣.

(٣) م. سترك، دائرة المعارف الاسلامية، طبعة ١٩٥٩ مطبعة الشعب، مادة اربيل.

قوتابخانە و فێرگادا یەکێك بووە لە سەرداره ناودارەکانی[1] ناوچەکە. ئەو دامودەزگا زانستییانەش کە لەم ئەمارەتەدا دامەزران ئەمانەن:

## دامودەزگا کلتوورییەکان

### یەك: مزگەوتەکان

مزگەوتی هەولێر، نە ژمارەیان دەزانین و، نەناویان دەزانین و نەش جێگاکانیان[2]. وەلێ (ابن خلكان) دەڵێ: (ابو منصور سرفتكين)ی جێگری (زين الدين علی كچك) مزگەوتی زۆری دروست کردووە، نەك هەر لە ناوەندی ئەمارەتەکە، بەڵکو لە گوندەکانی[3]. وەلێ ئەم مێژوو نووسە و ئەوانی دیکەش باسی هیچ مزگەوتێکیان نەکردووە لە سەردەمی میرەکانی دوای (سرفتكين) دروست کرابێت. باسی موزەففەرەددین گۆکبوریشیان نەکردووە کە مزگەوتی دروست کردبێت ـ هەرچەندیشە ئەم میرە ـ وەك، لەمەودوا دێینە سەری ـ دامودەزگایەکی زۆری فێرکاری و خێرخوازی دامەزراندووە. بە هەرحاڵ، ئەو منارە جوانەی ناوی موزەففەرەددین گۆکبوریی لێ نراوە، بیرۆکەیەکمان لەلا گەڵاڵە دەکات کە ئەم میرە، خەمخۆری مزگەوتان بووە و بایەخی بە مزگەوتان داوە. دیاریشە لە مێژووی ئیسلامدا، مزگەوت، چ پێش سەرهەڵدانی دامودەزگای سەربەخۆی فێرکاری و چ دوای پەیدابوونیان[4]، رۆڵی گرنگی لە بواری فێرکاریدا گێڕاوە و، لە گۆشەکانیدا ئەڵقەی وانە گوتنەوە ریزی دەبەست و، قورئانلەسنگ و ئەدەببێژان دادەنیشتن و، کۆمەڵێك قوتابی[5] لە دەوریان خڕ دەبوونەوە. (السيوطي) لە (ابن المستوفي)ی مێژوو

---

(١) د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية، ٢/١٠٥٩.

(٢) تەنیا ئەو مزگەوتە نەبێت کە بە دەوری منارەی (المظفرية)دا دروست کراوە.

(٣) ابن خلكان ٢/١٢.

(٤) The Encyiop of Islam art. Masjid. ١٩٣٦, V, ١١١

(٥) د. محمد اسعد طلس، التربية والتعليم في الاسلام، ص ١١٥.

د. احمد شلبي، تأريخ التربية الاسلامية، ص ١٧٦.

نووسی هەولێرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت، کە، مەلا (محمد بن الحسن بن علي بن الحسن الضرير النحوي المعروف بأبي الثناء ابن الارملة) لە ژوور خەڵکەکەوە لە ناو مزگەوتەکەدا دادەنیشت و قورئان و ڕێزمانی تێدا دەگوتەوە و، قوتابییەکی زۆری فێرکرد، سوودمەند بوون[1]. (ابن سعيد الاندلسي) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆگبوری، شێخ (جعفر بن هبة الله الكفر عزى الأربيلي)ی بە خوتبە خوێن (وتارخوێن)ی مزگەوتەکەی خۆی دامەزراند[2].

## دوو: قوتابخانەکان

**قوتابخانە (حوجرە):**

مزگەوتەکان بەشی پێداویستی فێرکاریی کۆمەڵگەکەی نەدەکرد، چونکە فێرخوازان بەرەبەرە زۆر دەبوون، لەبەر ئەوە قوتابخانە گەلی سەربەخۆیش[3] پەیدا بوون. ئەم قوتابخانانەی لە خوارەوە باسیان دەکەین، لەو ماوەیەدا پەیدابوون:

### ا- قوتابخانەی (عوقەیلی)

لە مێژووی ئیسلامەتیی ئەم شارەدا، یەکەم جار، قوتابخانەی گۆڕەپانەکە (الربض) پەیدابوو، قوتابخانەی (العقيلية) شی پێدەگوترا، بە ناوی مەلا (أبي العباس الخضر ابن نصر بن عقيل بن نصر العقيلي) کە، هەر لە هەولێر لە ساڵی (٤٧٨ك/ ١٠٨٥ز)دا لەدایك بووە. ئەم مەلایە ناودارترین مەلای ئەم شارە بووە و، یەکەم کەسیش بووە وانەی تێدا گوتبێتەوە[4]. سەرچاوەکان باسی بەرواری دامەزراندن و

---

(١) السيوطي، بغية الدعاة ٢/٢٧٧.

(٢) أبو الحسن ابن سعد الأندلسي، الغصون اليانعة في شعراء المائة السابقة ص ٧٨.

(٣) The Encycop of Islam art. Masjid. ١٩٣٦, V, ١١١

(٤) ابن خلكان ٢/١٠ — الصفدي، مخطوط (الوافي بالوفيات) ٨/١٨.

جێگای[1] دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە[2] ناکەن ـ راستتریش ئەوەیە کە لەماوەی پێش سەردەمی ئەتابەگەکاندا دوای لە بەغدا گەڕانەوەی مەلا (الخضر) دامەزرابێت، کە بەرلەوە، لە مەدرەسەی (النظامیة) لە بەغدا دەرسی دادەدا (دەگوتەوە)، پێدەچێ لە بەرایی سەدەی شەشەمینی کۆچیدا (سەرەتای سەدەی یازدەی لە دایکبووندا لە بەغدا گەڕابێتەوە بۆ هەولێر، ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێ کە مەلا (أبو الحسن علي بن محمد بن علي الطبری الشافعي) کە بە (الکیار الهراسي) ناوداره لە ساڵی (٥٠٤ك/١١١٠ز)دا[3] مردووه و، مەلا (ابو بکر محمد بن احمد بن الحسین بن عمر الشافعي)ی ناودار بە (ابن الشاشي) کە لە ساڵی (٥٠٧ك/١١١٣ز) دا مردووه، هەردووکیان، لەو مەدرەسەیەدا، لە بەغدا دەرسیان دادابێ. (ابن عساکر)یش کە هاوچەرخی ئەم مەلا (خضر)ە بووە دەڵێت: دوای ئەوەی لە بەغدا، بوو بە مەلای تەواو و (شەرعزان) ئەوجا گەڕایەوە بۆ هەولێر و، دەستی کرد بە وانەبێژی فەتوادان[4].

### ب- قوتابخانەی قەڵا:

(ابو منصور سرفتگین)ی بریکاری دامەزرێنەری ئەمارەتەکە، لە ساڵی (٥٣٣ك/ ١١٣٨ز)دا، قوتابخانەیەکی نوێی لە قەڵا دامەزراند، ناونرا قوتابخانەی قەڵا و، (الخضر بن نصر العقیلي) بۆ وانەگوتنەوە لەو قوتابخانەیەدا دامەزرا[5]. ئەم مەلایە، تا لە ساڵی (٥٦٧ك/١١٧٧ز)دا مرد، لەوێ بە دەرسدادان و فەتوادانەوە مشوول بوو. کۆمەڵێ

---

(١) ناجي معروف دەڵێت: ئەم مەدرەسەیە کەوتبووە بەشی راستی گۆڕەپانی شار. بنۆڕە کتێبەکەی: (علماء النظامیات ومدارس المشرق الاسلامي) ص ١٩٠.

(٢) ابن خلکان ٢/٤٥١.

(٣) ن. م. ٣/ ٢٥٧.

(٤) ابن عساکر، تهذیب ابن عساکر، جـ ٥، ص ١١٦.

(٥) ابن خلکان ٢/١٠، ط ١٩٤٨.

مەلای پێگەیاند، یەك لەوانە (ابو عمرو ضیاءالدین عثمان بن عیسی بن درباس الهذباني - ت ٦٠٢ك/١٢٠٥ز) خاوەنی کتێبی (الاستقصاء لمذاهب الفقهاء) بووە[١]کە لە مەزهەبی شافیعی و ئوسوڵی شەرعزانیدا لە هەموو مەلاکان زاناتر بووە[٢].

دووەم مەلای هەڵکەوتوو کە لە لای ئەو خوێندنی تەوا کردووە برازاکەی خۆیەتی، واتا (أبو القاسم عزالدین نصر بن عقیل ابن نصر)ە (ت ٦١٩ك/١٢٢٢ز) [٣]. هەروەها کەسانی دیکەشی پێگەیاندووە. دامەزراندنی قوتابخانەی قەڵا، قوتابخانەکەی (العقيلية)ی پەك نەخست، نەخێر.. وانە گوتنەوە لە هەردووکیاندا بەردەوام بوو. (ابن خلكان) دەڵێت: مەلا (أبا القاسم عزالدین نصر)ی ناوبراو، دوای مردنی (الخضر)ی[٤]مامی، لە هەردوو قوتابخانەکەدا وانەی گوتووەتەوە. (شرف الدین محمد ابن الفقيه عزالدين نصر)ی ناوبراویش دیسان، هەر لەم قوتابخانەیە خوێندوویەتی و، دەرسی (فقه) و (خلاف)ی لای باوکی خوێندووە، پاشان هەر لەم قوتابخانەیەدا[٥]جێگای باوکی گرتەوە و دەستی کرد بە وانە وتنەوە. هەروەها هەر لەم قوتابخانەیەدا (ابو البركات علم الدين محمد بن عبدالسلام بن محمد بن

---

(١) ئەم کتێبە شرۆڤەی کتێبی (المهذب)ە، کە ئیمام (ابي الحسن اسحق ابراهيم بن محمد الشيرازى) (ت ٤٧٦ ك/ ١٠٨٣ ز) لە فقهی شافعیدا داینـاوە، بنۆڕە: حاجى خليفة، كشف الظنون ١٩١٢/٢. اسماعيل البغدادي، هدية العارفين، ٦٥٤/١.

(٢) ابن خلكان ٤٠٧/٢ ط ١٩٤٨. السبكي، طبقات الشافعية، ط/الحسينية ١٤٣/٥. الاسنوي، طبقات الشافعية، ١٣٧/١. ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات الشافعية) ورقة (٢٠/أ). السيوطي، حسن المحاضرة ٤٠٨/١.

(٣) ابن خلكان ١٢/٢. الأسنوي ١٢١/١.

(٤) مەلا (الخضر) لە قوتابخانەکەی خۆی، لە گۆڕەپانەکە نێژراوە، واتا: بەشێك لەم قوتابخانەیە بووەتە گۆڕێك و گومەزێکی لەسەر دروست کراوە، خەڵك، بۆ تەبەرووك زیارەتیان دەکرد. (ابن خلكانیش) گەڵێ جار زیارەتی کردووە: وفيات الاعيان ١١/٢.

(٥) إبن الشعار، مخطوط (عقود الجمان ١٤٣/٦) ابن خلكان، وفيات الاعيان ١٢/٢. کورتە باسی ئەم مەلایە، لە کتێبی الصابونى دا هەیە: (تكملة اكمال الاكمال) ص ٢٦٢/٢٦٤.

عبدالعزیز بن هبة الله السنجاری) دەرسی خوێندووە، کە لە شنگاڵ، خوتبە هەر بەناوی باوك و باپیرییەوە خوێندراوەتەوە.. (علم الدین محمد) سەروسەختی لەگەڵ موزەففەرەددین گۆگبۆریدا پەیدا کردبوو، نێوانیان گەرم بوو، ببوو بە کارمەندێکی گەورەی نزیك بەخۆی و بڕوای پێدەکرد، تا وای لێ هات، بۆ راپەڕاندنی کاری تایبەتی خۆی دەینارد بۆ بەغدا. ئەم مەلا زانایە، پاش ماوەیەك هەولێری بەجێ هێشت و، چوو بۆ (ملطیە)و[١]، لەوێ بوو بەقازی و، هەرلەوێ لە ساڵی (٦١٩ك/ ١٢٢٢ز)دا کۆچی دوایی کرد[٢].

ج- قوتابخانەی (المجاهدیة):

(مجاهدالدین قایماز)ی بریکاری دووەمی میر (زین الدین علی کچك)، لە ماوەی دوازدە ساڵدا (٥٥٩ _ ٥٧١ك/١١٦٤ _ ١١٧٥ز) کە حوکمی لە هەولێردا رانیوە، هەندێ دامودەزگای دامەزراند، یەك لەوانە، ئەو قوتابخانەیەیە کە بەناوی خۆیەوە ناو نراوە، بەڵام ئێمە لەبارەی ئەم قوتابخانەیە و جێگای دامەزراندنیەوە هیچ شتێك نازانین، لەوە زیاتر کە (ابن خلکان) باسی دەکات و دەڵێت: (مجاهدالدین قایماز) ئەم قوتابخانەیە و (خانەقایەکیشی) دامەزراند و، وەقفێکی زۆریشی بۆ دابین کردن[٣]،دەشڵێن، مامی ئەم مێژوو نووسە، مەلا (عمر بن ابراهیم بن أبی بکر بن خلکان الاربیلی - ت ٦٠٩ك/ ١٢١٢ز) لەم قوتابخانەیەدا[٤] وانەی گوتووەتەوە.

---

(١) ملطیة: شارێکی بەناوبانگی وڵاتی رۆمە، لەسەر سنووری شامە — معجم البلدان ١٩٢/٥.

(٢) ابن الفوطی، مجمع الآداب، ق ١ جـ ٤ ص ٦٢٢/٦٢٣.

(٣) ابن خلکان، ٢٤٦/٣.

(٤) المنذری، التکملة ٣٥/٤. الاسنوي، طبقات الشافعیة ٤٩٥/١.

دکتۆر (ناجي معروف)، شێخ (محمد بن احمد بن عمر)ی ناسراو بە (ابن الظهیر الاربیلی)یش لەگەڵ ئەوانەدا دادەنێ کە لە قوتابخانەی (المجاهدیة)دا دەرسیان داداوە. بنۆڕە کتێبەکەی: (علماء النظامیات ومدارس المشرق الاسلامي) ص ١٩١/١٩٢. چونکە (السلامي) لە کتێبەکەی خۆیدا ، ←

وادیارە، میر (زین الدین یوسف ینالتگین هیچ قوتابخانەیەکی لە هەولێردا نەکردووەتەوە. پێدەچێ ئەو سێ قوتابخانەیەی بەر لەوەی لەسەر تەختی هەولێر دابنیشی، کرابوونەوە، بەشی شارەکەی کردبێ و پێویستی بە قوتابخانەی تر نەبووبێت.

**د- قوتابخانەی (مظفرية):**

ئەم قوتابخانەیە موزەففەرەددین گۆگبوری دایمەزراند. قوتابخانەیەکی گەورە بوو، لەسەر مەزەبی شافعی و حەنەفی وانەی تێدا دەگوترایەوە، بەڵام قوتابخانەکانی پێشتر باسمان کردن، تەنیا لەسەر یەك مەزەب دەرسی تێدا دەگوترایەوە. ئەم قوتابخانەیە، سەرداری هەولێر، خۆی، سەرپەرشتی دەکرد و، جاروباریش شەو، لەوێ دەمایەوە، نەخاسمە لە کاتێکدا ئاهەنگێکی ئایینیی لەو مزگەوتەدا بە دەنگی بەرز دەگێڕڕاو، پاشان بەڕیز لەسەر سفرە و خوان تێریان دەخوارد[1].

(ابن خلكان) لە ساڵی (٦٠٨ك/ ١٢١١ز)دا[2]، لەم قوتابخانەیەدا لەدایك بووە، کە

---

(←تأريخ علماء بغداد) دەڵێت: ئەم مەلایە لە قوتابخانەی (القيمازيه) وانەی گوتوومتەوە: (ص ١٧٦). ئەوەی- =ئەم تێکەڵوپێکەڵییەی لای دکتۆر دروست کردووە، یەکەم ناوی قوتابخانەکەیە و، دووەم ئەوەیە کە (ابن الظهير) هەولێرییە، لە کاتێکدا، مەبەست لە قوتابخانەی (القيمازية) ئەو قوتابخانەیەیە کە (صارم الدين قايماز النجمی) لە دیمەشق دایمەزراندووە: (اليونينى ٢/٣٨٦. النعيمي، الدارس في تأريخ المدارس ١/٥٧٢). (النعيمي) لە لاپەڕەی (٥٧٤)دا دەڵێت: (ابن الظهير) لەم قوتابخانەیەدا دەرسی گوتوومتەوە، پاشان لە ساڵی (٦٧٧ ك/١٢٧٨ ز)دا لە دیمەشق مردووە و، لە گۆڕستانی (الصوفية) نێژراوە، ئەم مەلایە، لە هەولێر، هیچ چالاکییەکی زانستیی نەبووە، ژیننامەی لە (اليونينى)دا هەیە: ذيل مرآة الزمان ٢/٣٨٦ — ٤٠٥. ابن شاكر الكتبي، فوات الوفيات ٢/٣٥٦ — ٣٥٧. الصفدي، الوافي ٢/١٢٣ — ١٣٧. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣/٢٨٢ — ٢٨٣. ابن الفرات، تأريخ ابن الفرات ٧/١٣٧ — ١٣٩.

(١)ابن خلكان ٢/٢٧٣، ط ١٩٤٨

(٢) ن. م، ٢/٩٢ سيرة زينب ام المؤيد الشعري

باوکی دەرسی تێدا گوتووەتەوە. باوکی (ابن خلكان) لە ساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز)دا مرد، تا ئەو ساڵەش، هەر لەو قوتابخانەیەدا وانەی دەگوتەوە[1]. پاش ئەم، ئنجا مەلا (احمد بن كمال الدين ابن منعة الاربيلی) ماوەی حەوت ساڵ دەرسی تێدا گوتەوە، تا لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) [2]باری کرد بۆ موسڵ و، لەوێ لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز)دا کۆچی دوایی کرد.

(ابو محمد احمد أبن عمر ابن احمد بن أبي شاكر الكفرعزی) لە شێخەکانی مەزەبی حەنەفی بووە لەم قوتابخانەیەدا. ئەم مەلایە لە هەولێر فقهی حەنەفیی خوێند و گوێی لە حەدیس گرت. پاشان لە قوتابخانەکەدا مەزەبی حەنەفیی بە دەرس گوتەوە و تا، ساڵی (٦٣٤ك/١٤٣٧ز)یش لەسەری بەردەوام بوو، کە مەگۆل شارەکەیان تالان کرد. ئەویش لەگەڵ ئەوانەی شارەکەیان بەجێ هێشت کەوتە ڕێ و لە شام گیرسایەوە[3]. (القرشی)یش، لە (ابن المستوفي)یەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: مەلای حەنەفی (أبا المظفر محمد بن ابي القاسم بن ابي شجاع الهمذاني) لە ساڵی (٦١١ك/١٢١٤ز)دا کە هات بۆ هەولێر، کوژرا[4]. پێدەچێ بەنیازی ئەوە هاتبێ لەم قوتابخانەیەدا دەرس بڵێتەوە.

مەلایەکی دیکەی مەزەبی حەنەفی کە هاتبێتە هەولێر، (أبو جعفر محمد ابن ابراهيم بن محمد علي بن عبدالعزيز الرازی) بووە. (عبدالقادر القرشي) لە (ابن المستوفي) دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئەم مەلایە چەندین جار هاتووەتە هەولێر[5]. لەسەر مەزەبی (ابي حنيفة) دەرسی دادەدا و کتێبێکی لەسەر فەرزەکان و کتێبێکیشی

---

(١) المنذري، التكملة لوفيات النقلة ٨٠/٤. ابن خلكان ٩٠/١. الاسنوي، طبقات الشافعية ٤٩٦/١.

(٢) وفيات الاعيان ٩٠/١.

(٣) ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) جـ١ ترجمة احمد بن عمر بن احمد الكفرعزی.

(٤) القرشی الحنفي المصری في (الجواهر المضية في طبقات الحنفية) ١١٢/٢. مەلا (ابي المظفر)یش ژیننامەکەی لە (المنذري)دا هەیە. التكملة ١٤١/٤.

(٥) القرشی، الجواهر المضية في طبقات الحنفية ٥/٢.

لەسەر (فقه) دانا و، کتێبێکی تریشی بە ناوی (النوري في مختصر القدوری)[١] هەیە، لە موسڵ گیرسایەوە و، لە ساڵی ٦١٤ك یان (٦١٥ك/١٢١٨ز) مرد.

زانایەکی دیکەی سەری لەم قوتابخانەیە دابێت (أم المؤید زینب بنت أبی القاسم عبدالرحمن ابن الحسن الجرجانی النیسابوری الصوفي المعروف بالشعری) بووە (ت ٦١٥ك/١٢١٨ز)[٢]. (ابن خلکان) ئەم ئافرەتە، بە زانا ناو دەبات، ئەم زانایە لە بن دەستی کۆمەڵێ زانادا دەرسی دەخوێند و، چ بە روایەت و چ بە ئیجازەت حەدیسی لێ وەرگرتن. ناودارترینی ئەو مامۆستایانەش (ابو القاسم محمود بن عمر الزمخشری) خاوەنی کتێبی (الکشاف في النحو) بوو. (ابن خلکان) دەڵێت، کە منداڵ بووە ئیجازەی لێ وەرگرتووە[٣]، وادیارە رۆژانێك بووە، کە ئەم ئافرەتە زانایە، لە قوتابخانەی (المظفریە) دەرسی گوتووەتەوە، کە (ابن خلکان)یش هەر لەو مزگەوتەدا لەدایك بووە[٤].

## سێ: خانەی حەدیس: (دار الحدیث):

موزەففەرەددین گۆکبوری دایمەزراند و، هەر بەناوی خۆیەوە بە (خانەی مظفریەی حەدیس)[٥] ناسرابوو. سەرچاوەکان هیچیان لە مەڕ جێگاکەیەوە نەگوتووە، بەڵکو (ابن خلکان) کە باسی هەموو دامودەزگاکانی موزەففەرەددین

---

(١) ن. ص. هەروەها: زین الدین بن قاسم قطلوبغا (تاج التراجم في طبقات الحنفیة) ص ٥٩.

(٢) ابن خلکان ٩٢/٢.

(٣) کاتێ (ام المؤید) سەری دا لە هەولێر، (ابن خلکان) دوو ساڵان بوو کە ئیجازەکەی لێ وەرگرت. ئەوکات دامودەستور، وەها بوو، ئیجازە بە منداڵانی بنەماڵە زانستییەکان دەدرا بۆ دنەدان و دەم شیرینکردن و — وەك دکتۆر احمد شلبی لە کتێبی (تأریخ التربیة الاسلامیة) ط ٢، ص ٢٨٨ دا دەڵێت: بە ئومێدی ئەوەی کە سەرکەون.

(٤) ابن خلکان، ن. ص. (أم المؤید).

(٥) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ١٠ ورقة ٨٠.

گوگبوری دەکات، کەچی باسی خانەی حەدیس ناکات، بەڵام بە بۆنەیەکی ترەوە، گوتوویەتی: خانەی حەدیس هەیە[١].

بەڵام لەبارەی بزاڤ و چالاکیی زانستیی خانەی حەدیس و، ئەو شێخانەی (قورئان لەبەرانەی) کە دەرسیان تێدا گوتووەتەوە، ئەوە، (المنذری و الذهبي) دەڵێن کە (أبا الخير بدل بن أبي المعمر بن اسماعيل التبريزی) شێخایەتی خانەی حەدیسی گرتە دەست و، بە دەستیەوە مایەوە، تا ساڵی (٦٣٤ك١٢٣٧ز) کە مەگۆل هەولێریان تالان کرد، ئەوجا شێخی تەورێزی هەولێری بەجێ هێشت و، چوو بۆ حەڵەب و، لەوێ باقیمەنی تەمەنی تەواو کرد و لە ساڵی (٦٣٦ك/١٢٣٩ز)دا[٢] کۆچی دوایی کرد. (ابن الفوطی)یش دەڵێت: (قوام الدين أبانصر يونس بن محمد بن عبدالعزيز الأردبيلي[٣] الفقيه) هاتە هەولێر، قورئانی تێدا خوێند و، لە شێخانی خانەی حەدیسەوە گوێی لە حەدیس دەگرت[٤]. (ابن قاضي شهبة)یش، لە (ابن الدبيثي)یەوە وەردەگرێ و دەڵێت: (کاتێ لە هەولێر بووە، چاوی بە (أبا عبدالله محمد بن أبي الوفاء احمد بن أبي طاهر العدوی النحوي الموصلي) کەوتووە، لەم شارەدا دادەنیشت و لە خانەی حەدیس وانەی ڕێزمانی دەگوتەوە[٥]. زانا (اثيرالدين المفضل الأبهري)یش کە لە ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز)دا سەری لە هەولێر داوە و، لە خانەی حەدیس دابەزیوە و (ابن خلكان) لای ئەو دەرسی خوێندووە.

---

(١) ابن خلكان ٣٩٧/٤: واتا بە بۆنەی هاتنی (اثير الدين الفضل) لەساڵی (٦٢٥ك)دا بۆ هەولێر و، دابەزینی لە خانەی حەدیس.

(٢) المنذري، التكملة، ط، بالرونيو، مجلد ٨ ص: ٢٦٠٦ -٢٦٠٩. الذهبي، العبر، ١٤٩/٥.

(٣) اردبيل، بەناوبانگترین شاری ئازەربێجانە، شارێکی زۆر گەورەیە لە پادەشتێکی فراواندا، ياقوت، معجم البلدان ١٤٥/١.

(؟) ابن الفوطي، مجمع الآداب، جـ ٤، ق ٤، ص ٨٧٩.

(٤) ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات النحاة واللغويين، ق ١، ورقه ١٣١.

(٥) ابن خلكان ٣٩٧/٤.

## چوار: خانەقاکان:

لە باسی دامودەزگا خێرخوازی و کۆمەڵایەتییەکاندا، کە موزەففەرەددین گۆگبوری لە هەولێر دایمەزراندبوون، باسی هەر چوار خانەقاکەشمان کرد. لە بارەی رۆڵی فێرکارییەوە، زانیاریمان لەسەر ئەم خانەقایانە زۆر کەمە، بەڵام هەندێ لەم خانەقایانە رۆڵی کلتووری و رۆشنبیرییان[1] دەگێڕا، بەتایبەت لە بواری خوێندنی ئایینی بەنموونە، وەك لە لێکدانەوە (تفسیر) و حەدیسدا، چونکە خانەقاکان جێگای پەرستش بوون و پیاوچاکان و دەروێش و سۆفییان[2] لەوێ هەمیشە سەرگەرمی پەرستش بوون.

(ابن الفوطی) دەڵێت: (قطب الدین بدل بن خلیل الاربیلي الصوفي)ی گەورە شێخانی هەولێر بەرپرسی خانەقای (الجنینة) بوو کە موزەففەرەددین گۆگبوری دایمەزراند[3]. وەلێ هیچ کەسێ باسی چالاکیی کلتووریی نە ئەم خانەقایە و نە ئەو خانەقایەشی نەکردووە کە میر (مجاهدالدین قایماز) لە رۆژانێکدا دایمەزراند کاتێ بە بریکاری (زین الدین علی کچك) حوکمی هەولێری دەگێڕا.

دامودەزگای زەق و بەرچاوی کلتووریی هەولێر لە قۆناغی بووژانەوەیدا، ئەم خانەقایانە بوون، هەر بەوانەشەوە هەولێر ببوو بە مەڵبەندێکی کلتووری لە سەدەی ناوینی ئیسلامدا، بەڵگەش ئەوەیە کە خەڵکێکی زۆر، بۆ خوێندن و بۆ وانە گوتنەوە روویان لە هەولێر دەکرد و، هەندێکیشیان تا مردن، لە هەولێر دەگیرسانەوە و نەدەگەڕانەوە. (عبدالرزاق الحصان) دەڵێت: (هەولێر ببوو بە کانییەکی سازگار،

---

(١) بنۆڕە: رۆڵی فێرکاری و پەروەردە کە خانەقاکان لە ئیسلامدا گێڕاویانە: الدکتور محمد اسعد طلس، التربیة و التعلیم في الاسلام، ص ١١٠ — ١١٢، لە ژێر عینوانی (مؤسسات أخری للتعلیم).

(٢) (ابن الخلف التبریزی) دەڵێت: خانەقا، ئەو خانەیەیە کە شێخ و سۆفییان پەرستشی لێ دەکەن و، وەختی خۆیانی تێدا بەسەر دەبەن.. بنۆڕە (برهان قاطع) ص ٤١٦، هەروەها (تاج العروس) ٣٤٠/٦.

(٣) ابن الفوطي، تلخیص مجمع الآداب، أ، ب، ج ٤، ق ٤، ص ٦٢٣.

خەڵك بۆی دەهاتن، ئاوی زانستیان لێ دەخواردەوە، لەبەر ئەوە قوتابیانی زانست لە رۆژهەڵات و رۆژاواوە[١] دەیهاتنێ).

ئەم جۆرە تێکەڵبوونە زانستییەش لە نێوان زانایانی هەولێر و زانایانی میوانی هەولێردا، دەبوو ئاستی زانست لە شارەکەدا بەرزتر بکاتەوە. (عباس العزاوي) دەڵێت: (سەردەمی موزەففەرەددین گۆکبوری، بووە سەردەمی پەیمانبەستنی زانستی لە نێوان وڵاتانی ئیسلام و ئەمارەتی هەولێردا، لەبەر ئەوە، پێگەوجێگە و رێزی ئەمارەتەکە بەرزتر بووەوە و ناوبانگێکی پیرۆزیشی پەیدا کرد) [٢]. نەخاسمە هەندێ لەوانەش کە بۆ هەولێر هاتبوون کەڵە پیاوی زانست بوون و، زۆر ناودار بوون.

جا، بەر لەوەی باسی ئەو میوانانەی هەولێر بکەین، دەبێ بزانین کە هەولێر، بە تایبەتیش لە ئاهەنگەکانی لەدایکبوونی پێغەمبەردا (د. خ) هەموو ساڵێك دەبووە جێگای کۆڕ بەستنی مەلا و قورئانخوان و شاعیر و ئامۆژگار و سۆفی و دەروێشان و، گفتوگۆیان لەسەر کاروباری فقهی و زانستی دەکرد. ئەوانە لە وڵاتانی جۆر بە جۆری ئیسلامەوە، بە نموونە، لە بەغدا و موسڵ و نصیبین و وڵاتی عەجەم و جێگایانی ترەوە[٣]. دەهاتن.

زۆربەی ئەوانەی بۆ هەولێر، بە مەبەستی تەدریس یان بۆ بیستنی حەدیس دەهاتن، سەر بە مەزهەبی شافیعی بوون، لەوانەی کە لە قوتابخانە نیزامییە پەرش و بڵاوەکاندا[٤]، بە تایبەتیش لە بەغدادا خوێندبوویان.. خۆی، لە سەرەتادا، ئەم

---

(١) عبدالرزاق الحصان، نظرة عابرة في شمال العراق، ص ٥٨.

(٢) عباس العزاوي، مقال (آل بكتكين.. امارة اربيل في عهدهم) لە گۆڤاری (المجمع العلمي العربي). دمشق، مجلد/٢٢ ص ١٣٩.

(٣) ابن خلكان ٣/٢٧٢.

(٤) لە بارەی قوتابخانە نیزامییەکانەوە کە ئەوکات لە جیهانی ئیسلامدا زۆر بوون، بنۆڕە: السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ط ١٩٦٦، ٤/٣١٣ — ٣١٤.

قوتابخانانە بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ئەم ئیمامە[١] کرابوونەوە. تەنیا قوتابخانەی موزەففەرەددین نەبێ کە هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفیشی تیادا دەخوێندرا، دەنا، هەرسێ قوتابخانەکەی دی بۆ خوێندنی مەزهەبی شافیعی تەرخان کرابوون[٢].

لە کۆتاییشدا دەڵێین: ئێمە نازانین، ئەوانەی هاتوونەتە هەولێر، تا ماوەی چەند لەم شارەدا ماونەتەوە و، چ بەرو بوومێکی زانستیشیان لەپاش بەجێ ماوە، نەماوە، ئەوەش نازانین، ناشزانین ئەرك و فرمانی زانستیی هەندێکیان چی بووە و، چی نەبووە، لەبەر ئەوە بەکورتی باسی هەندێکیان دەکەین و، ئەوانی دی پشتگوێ دەخەین و، باسی ئەوتۆیان لامان نییە، تا بیکەین:

- **ئەو زانا گەورانەی کە هاتوونەتە هەولێر:**

لەپێش هەموویانەوە باسی (ابو الخطاب عمر بن الحسن بن علي البلنسی) ناسراو بە (ابن دحیە) دەکەین. ئەم زانایە لە وڵاتی ئەندەلوسەوە هاتووە و، گەلێ وڵاتان گەڕاوە، تا لە ساڵی (٦٠٤ك/١٢٢٧ز)دا گەیوەتە هەولێر. لە هەولێر کتێبێکی بە ناوی (كتاب التنوير في مولد السراج المنير) داناو، بە دیاری، پێشکەشی موزەففەرەددین گۆکبوریی کرد، چونکە دەیبینی کە خولیای ئاهەنگێڕانی یادەوەریی لەدایکبوونی پێغەمبەرە (د. خ)، میریش هەزار دیناری خەڵات کرد[٣]. (ابن دحیە) لە ساڵی

(١) ابن الجوزي، المنتظم ٦٦/٩.

(٢) ابن خلكان ٢٧٢/٣.

(٣) ابن خلکان ١٢٢/٣. لە بارەی گەیشتنیشی بۆ ناو هەولێر، بنوڕە: (ن. م. ٢٧٥/٣). هەروەها: اليونيني، ذيل مرآة الزمان ٤٢٢/٢. المكي الفاسي، العقد الثمين ١٠٥/٧. ابن أبي عذيبة، ٣٠٢.

(ابن دحية) کە گەورە زانایان بوو، هەروەها یەکێ بوو لە پیاوانی حەدیس و ڕێزمان و زمانزانی و شیعر و مێژوو. کتێبێکی هەیە بەناوی (النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس) کتێبێکی تریشی بەناوی (المطرب من اشعار اهل المغرب) هەیە. چەندین کتێبی دیکەشی هەیە، بنوڕە: العزاوی، التعريف بالمؤرخين، ص ٦٠. باسی (سبط ابن الجوزی)یشی کردووە، ٦٩٨/٨. ابن كثير ١٤٤/١٣. الذهبي، تذكرة الحفاظ، ١٤٢٠. السيوطي، حسن المحاضرة، ط ١٩٦٧، ٢٥١/١.

(٦٣٣ك/١٢٣٥ز)دا، لە قاهیرە گیانی لە دەست داو، لە لا پاڵی چیای (المقطم) بەخاکیان سپارد.

دیسان لە ئەندەلوسەوە، لە شاری (طلیطلة)وە، شاعیرێکی جووی خۆ بە عەرەبکردوو (یحیی بن سلیمان ابن شاؤول) هاتە هەولێر[١]. هەروەها (ابوبکر محي الدین محمد بن محمد ابن ابراهیم بن الحسین بن سراقة الانصاری الاندلسي الشاطبي)یش هاتە هەولێر. ئەم (ابوبکر)ە حەدیسخوێنێکی بەناوبانگ بوو، سەرەتا، رووی لە وڵاتی رۆژهەڵات کرد، سەری دا لە بەغدا و، چاوی بە حەدیسخوانان کەوت، پاشان لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا هاتە هەولێر و بۆ (أبي الخیر بدل التبریزي)ی خوێندەوە[٢]. پاشان هەولێری بەجێ هێشت و چوو بۆ حەڵەب و، لەوێ شێخایەتیی خانەی حەدیسی گرتە ئەستۆ، ئنجا لە حەڵەبیش نەما و، چوو بۆ میسر و، بوو بە بەرپرسی خانەی حەدیسی (الکاطیە) لە قاهیرە، (الشاطبي) شاعیریش بوو، شاعیرێکی ناسك بێژ و، لێزان لە شیعر و لە مانای شیعر[٣].

(الفقیە الشافعي الفاسي الفتح بن موسی ابن حماد بن علي بن ابراهیم بن اسماعیل الاموي) ئەمیش لە ئەندەلوسەوە هاتە هەولێر، زانایەکی ئوسوڵی و شارەزای رێزمان و زانستی تەرازووی شیعر و زانستی پەند و ئەستەق و مەنتیق بوو. کتێبی (المفصل في النحو)ی (ابو القسم الزمخشري) بە شیعر داڕشتووەتەوە. (ابن الشعار) ئەم زانایەی لە هەولێر چاو پێکەوتووە و دەڵێت: (ابو القاسم فلك الدین عبدالرحمن بن هبة الله بن علي المصري)ی لەگەڵدا بوو، کە دیارە ئەویش هاتووەتە هەولێر[٤]. هەروەها لە میسرەوە، شاعیر (ابو الفتح نصرالله بن یوسف الکنانی)یش بۆ هەولێر

---

(١) ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) جـ ٩، ژیننامەی یحیی بن سلیمان بن شاؤول.

(٢) الیونیني، ذیل مرآة الزمان ٣٠٥/٢. الصفدی، الوافي، ط ١٩٦٢/٢، ٢٠٨/١.

(٣) الیونیني، م. ن. ص، ٣٠٦. الصفدي، م. ن. ص.

(٤) ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) ٢٥٥/٥ — ٢٥٦.

هاتووە و، ماوەتەوە و، لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز)دا هەر لە هەولێر مردووە[١]. هەروەها (أبو عبدالله محمد ابن علي بن عبدالله بن عمر الانصاري الاسكندرانی)یش لە ساڵی ٦٢١ك/١٢٢٤ز)دا سەری لە هەولێر داوە[٢].

لە (واسط)یشەوە شاعیر (ابو المظفر جمال الدين عبدالرحمن بن محمد) ناسراو بە (ابن السنينيرة)ش هاتووەتە هەولێر، ئەم شاعیرە لە گەورە شاعیرانی هاوچاخی خۆی بووە. ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز) لە قوتابخانەی (المظفرية) دابەزیوە، واتا بەرلەوەی (ابن خلكان) لە هەولێر دەربچێ، چونكە، ئەوەتا دەڵێت: (ئێمە هێشتا لە هەولێر بووین... كە ئەو گەیشتە لامان و... لای ئێمە لە قوتابخانەی (المظفرية) دابەزی)[٣]. ئەم شاعیرە، كە دادەنیشت بۆ وانە گوتنەوە، هەرچی ئەدەبدۆست هەیە، لە دەوری خڕ دەبوونەوە، بە دەرس و پێداچوونەوە و قسەی خۆشەوە دەیانبردە سەر[٤].

لەو ئەدیبە ناسراوانەی هاتوونەتە هەولێر و ماوەیەكی زۆری لێ ماونەتەوە، شاعیر (أبو البركات كمال الدين المبارك بن أبی بكر بن حمدان)ی ناسراو بە (ابن الشعار الموصلی)یە كە كتێبی (عقود الجمان في شعراء الزمان)ی داناوە[٥]. ئەم شاعیرە، ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز) گەیشتە هەولێر ـ ئەوەشی لە گەڵ جێگەی ئەو كتێبەیدا باس كردووە[٦]. كە گەیشتە هەولێریش یەكسەر، چوو بۆ ماڵی مستوفی هەولێر، مێژوو

---

(١) ن. م. جـ ٩، سيرة نصر الله بن يوسف.

(٢) ن. م، جـ ٧ سيرة محمد بن علي بن عبدالله بن عمر.

(٣) ابن خلكان ٢١٥/١ ط ١٩٦٨.

(٤) م. ن. ص.

(٥) عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين، ٧٥، (العزاوي) بە هەڵە، بە (عقد الجمان) ناوی دەبات. كتێبەكە دە جڵدی گەورەیە، جڵدی دووەم و هەشتەمی كەمە، باقیمەنی جڵدەكانی دیكەی، ها لە كتێبخانەی سلێمانی لە ئەستەمبوڵ، لە گەنجینەی كتێبەكانی (أسعد افندی) لە ژێر رەقەمی (٢٣٢٣) تا ٢٣٣٠ دانراوە.

(٦) ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان)، جـ ٦. باسی ابي البركات المبارك ابن المستوفي.

نووس موبارەك (ابن المستوفي)[١]. لەم شارەدا چەندین ساڵ مایەوە، دەڵێن لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا لەگەڵ شاعیری بەغدادی (یعقوب بن نصر بن یعقوب الدارقزی)[٢] کە ئەویش بۆ هەولێر هاتبوو کۆبووەوە[٣]. (ابن خلکان)ی هاوچەرخی دەڵێت: (ابن الشعار) لە ساڵی (٦٢٨ك/١٢٣١ز)دا، لە خزمەتی (ابن المستوفي) دا بووە و[٤]، تا دوای ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣٢ز)یش هەر لە خزمەتیدا ماوەتەوە[٥]. بەڵام نازانین کەی، لە هەولێر دەرچووە، پێدەچێ لەگەڵ (ابن المستوفي)دا، پێکەوە، هەولێریان بەجێ هێشتبێ[٦]. کاتێکیش دەستی بە گەڕان کرد لە نێوان شارەکانی ناوچەکەدا، بەتایبەتیش لە نێوان بەغدا و موسڵ و حەڵەبدا، لە ساڵی (٦٥٤ك/١٢٥٦ز)دا لە حەڵەب کۆچی دوایی کرد.

ئەدیبی بەناوبانگ (ابو الفتح ضیاءالدین نصرالله بن أبي الکرم محمد بن محمد بن عبدالکریم الشیبانی الجزري) ناسراو بە (ابن الاثیر) [٧]کە، ئەکا، برای مێژوو

---

(١) و. ن. م.

(٢) الدارقزی: دارقز بەناوبانگترین گەڕەکی بەغدایە، کەوتووەتە بەری لای رۆژئاوای شارەکە (ئەو سەردەمە).

(٣) بنۆڕە: (ابن الشعار، ن. م. ١٠/٩٨).

(٤) ابن خلکان ٤/١٥٠، ط ١٩٧١.

(٥) ابن الشعار، عقود الجمان، ١٠/١٧٢.

(٦) الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ١/٣٣. الغساني، العسجد المسبوك/بالرونیو ٥٢٨ – ٥٢٩. (ابن الفوطي)یش لە (تلخیص مجمع الآداب) جـ ٤، ق ٣ ص ٥٧٣دا دەڵێت: (ابن الشعار): کتێبێکی دیکەی بەناوی (تحفة الکبراء) هەیە و، (تحفة الوزراء)یشی پێدەڵێت (بنۆڕە: ن. م. ص ١). هەرچی (الیونیني)یە، ئەوە، ئەو، ناوی کتێبێکی دیکەی (ابن الشعار) دێنی کە کتێبی (قلائد الفرائد)ە... بنۆڕە: (ذیل مرآة الزمان ١/٣٣٤).

(٧) (ضیاءالدین نصرالله) قورئانلەبەر و حەدیسخوان و زمانزان بوو، شیعرێکی زۆریشی لەبەر بوو. سەرباری ئەو هەموو نامە پڕ مانایانەی کە نووسیبوونی، کتێبی: (الوشي المرقوم في حل المنظوم) و کتێبی: (المثل السائر في ادب الکاتب والشاعر) و (المعانی المخترعة في صناعة الانشاء) و کتێبی (الجامع الکبیر في صناعة المنظوم من الکلام والمنثور)یشی دانابوون: بنۆڕە کتێبی (رسائل ابن الأثیر) کە (أنیس المقدسي) ساغی کردووەتەوە.

نووس (عزالدين علي)ی خاوەنی (الكامل في التأريخ) ئەویش سەری لە هەولێر داوە. (ابن خلكان) دبێژێ: (ابن المستوفي) لە کتێبی (تأريخ أربل)ەکەی خۆیدا، باسی (ضياءالدين ابن الاثير)ی کردووە و، گەلێکی بە شان و باڵدا هەڵداوەو، دەڵێت، لە ساڵی (٦٢١ك/١٢٢٤ز)دا[1] سەری لە هەولێریش داوە. ئێمە باسی ئەم سەردانەمان کردووە و، ئەو خاڵاتانەش کە موزەففەرەددین گۆکبوری پێی داوە، کە باڵندەیەکی بازیشی لەگەڵدا بووە و (ابن الاثير)یش، لە سپاس و پێزانیندا، کردوویەتی بە نامەیەك و ناردوویەتی بۆ سەرداری هەولێر[2]. بەڵام نازانین چەند لە هەولێر ماوەتەوە و بزاڤ و چالاکیی کلتووریی چی بووە..

(ابن الاثير) لە ساڵی ٦٣٧/ك١٢٣٩ز)دا، لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و، لە گۆڕستانەکانی قوڕەیش، لە بەری رۆژاوای[3] بەغدا، بە خاکیان سپارد.

مێژوونووس (ابو المظفر شمس الدين يوسف قزاوغلي)[4] ناسراو بە (سبط ابن الجوزي)ی دانەری کتێبی «مرآة الزمان» کە لە ساڵی (٦٥٤ك/١٢٥٦ز)دا کۆچی دوایی کردووە[5]، ئەویش یەکێك بووە لەوانەی لە ساڵی (٦٠٠ك/١٢٠٣ز)دا سەری لە هەولێر داوە. لەو کتێبەیدا لە باسی رووداوەکانی ئەو ساڵەدا، دەڵێت: یەکەم سەفەری بووە لە

(١) ابن خلكان ٣٢/٥.

(٢) بنۆڕە: بابەتی / زانستی ئەمارەتی هەولێر.

(٣) واتا لە گۆڕستانی (کاظمین). (ابی الفتح ضياءالدين نصرالله) ژیاننامەی هەیە لە: ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٩ سيرة نصرالله بن ابي الكرم المنذري، التكملة، بالرونيو ١٦٤٢/٨. الصابوني، تكملة اكمال الاكمال، ص ٤ — ٥. ژیاننامەیەکی دوور و درێژیشی لە پێشەکیی کتێبەکەیدا (الجامع الكبير في صناعة المنظوم من الكلام والمنثور) هەیە. تحقيق د. مصطفى جواد وجميل سعيد، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٥٦، ص ٥ — ٤٠.

(٤) قزاوغلي: وشەیەکی تورکییە، کوڕی کچ (کچەزا) (السبط).

(٥) ابن خلكان ١٤٣/٣. ط/بيروت، تەرجەمەی ژیانیشی لە (تاج التراجم في طبقات الحنفية)دا هەیە، ص ٨٣.

بەغداوە بۆ شام، گەیشتووەتە شاری داقوق و لەوێ دابەزیوە و لەگەڵ خوتبەخوانی داقوقدا کۆبووەتەوە، پاشان بەرەو هەولێر ڕۆیشتووە و گەیشتووەتە ئەم شارە و ماوەیەك ماوەتەوە و، شێخ (محي الدين الساقاني) [1] ـ کە وەك ئەو باسی دەکا ـ شێخێکی بە ئاوەز و دەمڕاست و ڕێکوپێك بووە، کەسێك بووە لەو کەسانەی کە لەگەڵیان کۆبووەتەوە و، گوایا شێخی (الساقاني) هەندێ شیعریشی بۆ خوێندووەتەوە[2].

(أبو البشائر اسحق بن هبة الله بن صديق بن محمود)ی قازیی شاری (خلاط)یش لە هەولێر گیرسایەوە، ئەم مەلایە شافیعی و زانایەکی ئوسوڵی و، وەعزخوان و شاعیریش بوو، لە زانستی ئوسوڵدا چەندین کتێبی هەیە، وەڵێ ـ ئەویش وەك زۆرێك لەوانەی بەیەکجارەکی یان بە میوانی ـ هاتوونەتە هەولێر، نازانین لەم شارەدا، چالاکیی کلتووریی چ بووە و چ نەبووە. هەندەی دەزانین، لەم شارەدا ماوەتەوە و لە ساڵی (٦١٦ك/١٢١٩ز)دا گیانی سپاردووە، وا، چەند بەیتێکیش لە شیعرەکانی دەخەینە پێش چاو:

| | |
|---|---|
| وقفتُ وربع العامرية دائر | ودمعي ووجدي سابقٌ متواترُ |
| وقفتُ وذكراها تجدّد لوعتي | وأبكي كما تبكى الغوادي البواكرُ |
| واذكرُ أياما مضيت ولياليا | واظهر فيها ما تجن الضمائر[3] |

واتاکەی:

| | |
|---|---|
| وەستام، کە ڕوانیم، چۆڵە هەواران | دایدا، لە دیدەم فرمێسك وەك باران |
| هێنایەوە سوێ یاد و یادگار | گریام وەك پەریی ناسکی کردگار |
| خەو و خەیاڵی چەرخانی گەردوون | خنکان لە سینەم، تازە، بەسەرچوون. |

(١) ژیاننامەی ئەم شێخەمان نەدۆزییەوە.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٥١٦/٨. (أبو شامة) لە لاپەڕەی (٤٨)ی (ذيل الروضتين)دا لەمی وەرگرتووە.

(٣) اليونيني، ذيل مرآة الزمان ٤٠٢/٢.

(أبو الثناء محمود بن الحسن بن علي بن الحسن النحوي)یش کە مەلایەکی حافز (کوێر) بوو، بە (إبن الارملة) دەناسرا، ئەویش لە هەولێر گیرسایەوە. ئەو لە تەمەنی لاوێتییدا، لە خۆراسانەوە چووبوو بۆ موسڵ و، لەوێ قورئانی لەبەر کرد و لە لای (سعید ابن الدهان المبارك /ت ٥٦٩ك/١١٧٣ز) وانەی ئەدەبی خوێند و تیایدا قاڵ بوو. پاشان گەیشتە هەولێر و، لەم شارەدا گیرسایەوە و[1]، بوو بە مەلای مزگەوت و، دەرسی قورئان و رێزمانی بە خەڵك دەدا[2]، گەلێ کەسی فێرکرد و سوودیان لێی بینی، بەڵام شیعرەکانی ئەو شیعرە نەبوون (پیاو بڵێ.. ئامین)، شیعری، بە تەواوەتی نەدەزانی دابنێ[3]. لە ساڵی (٦٠٦ك/١٠٢٩ز)دا لە هەولێر مرد.

شێخ (ابو الخیر بدل بن أبی المعمر بن اسماعیل التبریزی المحدث الرحال)یش سەری لە هەولێر داوە و، شێخایەتیی خانەی حەدیسی (المظفریة)ی گرتووەتە دەست. پێشتریش لە نیسابور و لە عیراق و لە میسریش حەدیسی خوێندووە، پاشان هاتووەتە هەولێر و تا ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٧ز) کە مەگۆل هەولێریان تالان کرد، لەم شارەدا جێگیر ببوو، ئیدی هەولێری بەجێ هێشت و، چوو بۆ حەڵەب. لەوێ لە ساڵی (٦٣٦ك/١٢٣٩ز)دا کۆچی دوایی کرد[4].

مەلایەکی گەورەی تری حەدیسخوان، کە هەولێری کردبێتە دوا نیشتمان ئەوە، شێخ (عبداللطیف بن عبدالقاهر بن عبدالله بن محمد السهروردي)ی ئامۆزای شێخ

---

(١) ابن الساعي، الجامع المختصر ٢٩٣/٩ — ٢٩٤.

(٢) السیوطي، بغیة الوعاة ٢٧٦/٢ — ٢٧٧.

(٣) م. ن. ص ٢٧٧.

(٤) المنذري، التکملة بالرونیو ٢٦٠٨/٨ — ٢٦٠٩. وله ترجمة في / الذهبي، العبر ١٤٩/٥. وفي (تذکرة الحفاظ) بذکر سنة وفاته، انظر (ص ١٤٢٩) ومثله یفعل ابن تغری بردی في (النجوم الزاهرة) ٣١٤/٦ وله ترجمة ایضاً في (شذرات الذهب) ١٨٠/٥.

(عمر السهروردي) بوو، کە ئەمیش هەروەك ئەو سەری لە هەولێر داوە[1]. شێخ (عبداللطيف)، بۆ بیستنی حەدیس، وڵاتان گەڕاوە و، سەری لە خۆراسان و (ماوراء النهر)یش داوە، ئنجا گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا، پاشان چووە بۆ شام، چووەتە ریزی لەشکری (الملك الناصر) سەڵاحەددینی ئەیووبییەوە. سەڵاحەددینیش هەر شارێکی کەناراوەکانی گرتبا، لەوێ بە قازی دایدەنا، بەڵام هەندی نەخایان، گەڕایەوە بۆ بەغدا، پاشان بۆ هەولێر، لە هەولێریش مایەوە تا ساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز) کۆچی دوایی کرد[2]. چالاکیی گرنگی ئەم شێخە لەم شارەدا بریتی بوو لە گێڕانەوەی حەدیس. یەکێ لەوانەی حەدیسیان لە هەولێر، لای ئەم زانایە خوێندووە: (الشيخ ابوبكر محمد ابن عبدالغني بن ابي بكر بن شجاع بن أبي نصر بن عبدالله الحنبلي) ناسراو بە (ابن نقطة) (معين الدين البغدادي المحدث الكبير) بووە (ت ٦٢٩ك/١٢٣٢ز) [3]. (ابن المستوفي) باسی بۆ هەولێر هاتن و گوێ لە حەدیس گرتنی ئەم زاتەی کردووە و،

---

(١) شێخ (عمر السهروردي) لە لایەن دیوانی خەلیفایەتییەوە هاتووەتە هەولێر، کاتێ کۆڕی حەدیسی تێدا گێڕاوە، (ابن خلكان) منداڵ بووە، ئەوەتا دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە منداڵ بووم، بۆم رێنەکەوت ببینم (وفيات الاعيان ٤٤٦/٣ ط ١٩٧٢). لە بارەی بۆ هەولێر هاتنی (الشيخ عمر)ەوە، بنۆڕە: القزويني، آثار البلاد، ص ٤٣٩. ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٥ز) کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی (الوردية) بەخاك سپێردراوە: بنۆڕە: (الحوادث الجامعة، ٧٤). واتا لە گۆڕستانی (الشيخ عمر) لە بەغدا، کە گۆڕستانێکی ناودارە.

(٢) المنذري، التكملة، ٦٦/٤ — ٦٧، ١٣٩٢/٧ بالرونيو. السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ط ١٩٧١ جـ ٨ ص ٣١٢. لە بارەی بۆ هەولێر هاتنیشییەوە، بنۆڕە: (ابن رجب) لە کتێبی (الذيل على طبقات الحنابلة)، جـ ٢، ص ١٨٢.

(٣) (ابن نقطة) شێخێکی بەناوبانگی حەدیس بوو. بەزۆری گوێی لێ دەگرت و دەینووسییەوە و، هەمیشە بەدوایدا وێڵ بوو. زۆری لەسەر نووسی و زۆری دەربارەی گوت، بە هەردوو جلدەکەی کتێبی (الاكمال)ی (ابی نصر بن ماكولا)شدا گەیشت، کتێبێکیشی لەسەر (الانساب) هەیە و، کتێبی (التقييد بمعرفة رواة السنن والمسانيد)یشی داناوە: بنۆڕە: ابن خلكان ٣٩٢/٤، ط بيروت ١٩٧١.

زۆریشی بە شانوباڵدا هەڵداوە[1]. (ابن رجب الحنبلي) دەڵێت: (ابن نقطة) لە هەولێر حەدیسی لە لای شێخ (عبداللطیف بن عبدالقادر السهروردي) [2]خوێندووە. شێخ (ابو المعالي ساعد بن علی بن عمر بن محمد بن علي البغدادي) کە مەلایەکی وەعز بێژ و حەدیسخوانی بەغدا بووە، ئەویش لە هەولێردا دایکوتاوە و ماوەتەوە و لە لای شێخ (عبداللطیف بن عبدالقادر السهروردي) و زانایانی دیکەش خوێندوویەتی و شەرع فێر بووە.

شێخ (صاعد) لە ساڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز)دا هاتووەتە هەولێر و لە میرانی هەولێر قبوڵی وەرگرتووە و[3]، بڕیاری دا لە هەولێر بمێنێتەوە و بەجێی نەهێڵێ. ئەوەبوو لەم شارەدا دەستی کرد بە وەعزدادان و خوێندنەوەی حەدیس[4].

(المنذري) دەڵێت: لە ڕێگەی نامەو نامەکارییەوە (المراسلة) ئیجازەی لەو وەرگرتووە، زۆرجاران شێخ (صاعد) نامەی بۆ ناردووە، نامەیەکیان، ئەوەبوو کە لە ساڵی (٦٠٨ك/١٢١١ز) [5]بۆی نارد.

(ابن الدبیثي)یش، کە ئەمیش[6] بە سەردان هاتووەتە هەولێر، دەڵێت: لە لای (أبو

---

(١) ابن خلكان، ن. م. ص. بنۆڕە ئەوەش کە (بشار عواد معروف) لە پەراوێزی کتێبی (التكملة)کەی (المنذري)دا، ٦٦/٤ – ٦٧ نووسیویەتی کە لە کتێبی (التقیید)ی (ابن نقطة) – ورقة ١٦٤ وەری گرتووە.

(٢) ابن رجب، الذيل على طبقات الحنابلة، ١٨٢/٢. ابن العماد، شذرات الذهب ١٣٣/٥. ولأبن نقطة ترجمة في المنذري، التكملة، بالرونيو ١٣٩٢/٧. الذهبي، العبر ١١٧/٥. تذكرة الحفاظ ١٤١٢/٤ – ١٤١٤. الصفدي. الوافي، ٢٦٧/٢ – ٢٦٨.

(٣) کاتێ هاتە هەولێر، (مجاهدالدين قايماز) سەردار بوو لە هەولێر، بەڵام ئەم، پاشان چوو بۆ موسڵ. (زين الدين يوسف نيالتگين) جێگای گرتەوە، ئەمیش لە ساڵی (٥٨٦ك)دا مرد و، پاش ئەمیش موزەففەرەددین گۆکبوری حوکمی گرتە دەست، بەو جۆرە، ئەم مەلایە بە حوکمی هەر سێ میرەکەدا ڕاگەیشت.

(٤) المنذري، التكملة، بالرونيو، ١٣٠٨/٧.

(٥) م. ن. ص.

(٦) ابن خلكان ٢٨/٤، ط ١٩٤٨. الذهبي، تذكرة الحفاظ ١٤١٦/٤.

المعالي صاعد) لە هەولێر[١]، خوێندوویەتی. ئەم حەدیسخوانە بەغدایيە لە ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز)دا، دوای بەسەربردنی پەنجاوپێنج ساڵ لە هەولێر، هەر لە هەولێر كۆچی دوایی كرد و، لە ماڵەكەی خۆیدا نێژرا[٢].

(ابو جعفر محمد ابن هبة الله ابن مكرم بن عبدالله الصوفي) (ت ٦٢١ك/١٢٢٥ز) یەكێك بووە لە حەدیسخوانە گەورەكان و سەری لە هەولێر داوە، لەسەر حەدیسی (البخاري) دەرسی خەڵكی داداوە. ابن خلكان و[٣] (ابو العباس مجدالدين احمد بن علي ابن غالب الأربيلي النحوي الحنبلي) [٤] یش لێی دەگێڕنەوە. هەروەها، شێخ (ابو علي حنبل ابن عبدالله بن فرج بن سعادة البغدادي الرصافي المكبر) هاتووەتە هەولێر. ئەم شێخە لە گوێگرانی (المسند)ەكەی ئیمام (احمد بن حنبل) بووە، بە گێڕانەوەی حەدیس بەناوبانگ بووە و، لە بەغداو لە دیمەشق و موسڵیش[٥] باسی حەدیسی كردووە. كە گەیشتە هەولێر دەستی بە گێڕانەوەی (المسند) كرد و، خەڵكانێكی زۆر گوێیان لێی ڕادەگرت، یەك لەوانە موزەففەرەددین گۆكبوری، خۆی، بوو[٦]، هەروەها (ابو عبدالله بهاءالدين محمد ابن ابراهيم ابن خلكان) كە ئەكا، باوكی ڕەوشنووسی ناودار[٧]، ئەویش گوێی لێ ڕادەگرت. (ابو علي البغدادي) ماوەیەك لە هەولێر مایەوە،

---

(١) الذهبي، المختصر المحتاج ١١٤/٢.

(٢) المنذري ١٣٠٧/٧. الذهبي، م. ن. ص.

(٣) ابن خلكان، ٣٩٢/٢. الذهبي، المختصر المحتاج ١٥٨/١.

(٤) ابن رجب، الذيل على طبقات الحنابلة، ط ١٩٥٢، ٢٦٨/٢. ابن العماد، شذرات الذهب ٢٨٨/٥. (ابو العباس مجدالدين) لە ساڵی (٦٥٧ك/١٢٥٩ز)دا مردووە.

(٥) المنذري، التكملة، ١٩٥/٣.

(٦) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٥٣٧/٨. ابو شامة، ذيل الروضتين، ص ٦٢.

(٧) المنذري، التكملة، ٨١/٤. وله ترجمة في: (ابن الاثير)، الكامل ٣٧٨/١٢. ابن الساعي، الجامع المختصر، ٢٤٥/٩ — ٢٤٦. الذهبي، العبر ١٠/٥. والمختصر المحتاج ٥٤/٢. ابن تغرى بردي، النجوم الزاهرة، ١٩٥/٦.

پاشان گەڕایەوە بۆ بەغدا و، لەوێ لە ساڵی (٦٠٤ك/١٢٠٧ز)دا کۆچی دوایی کرد. گەورە حەدیسخوانی گەڕۆك (ابو عبدالله زكي الدين محمد بن يوسف بن محمد بن ابي يداس الاشبيلي) ناسراو بە (البرزالي)[1]، ئەمیش هەولێری دیوە و، لە ساڵی (٦٣٦ك/١٢٣٨ز)دا مردووە. (أبو حفص عمر بن أبي بكر محمد بن معمر بن يحيى إبن حسان المعروف بابن طبرزد) کە حەدیسخوانێکی بەناوبانگی خەڵکی بەغدا بووە و لە ساڵی (٦٠٧ك/١٢١٠ز)دا مردووە، ئەویش لە هەولێر حەدیسی داداوە و خەڵکی گوێیان لێی گرتووە، یەك لەوانەی کە گوێیان لێی گرتووە (ابو عبدالله بهاءالدين محمد)ی باوکی (ابن خلكان)ی[2]مێژوونووسە، هەروەهاش (أبو حفص نجم الدين عمر)ی مامی (ابن خلكان)ە[3]. تەنیاش، ئەم حەدیسخوانە سەرچاوە بەرزەکانی حەدیسی ناوزەد کردووە[4].

---

(١) برزالة: ئێلێکە لە بەربەر، بنۆڕە: (الذهبي، العبر ١٥١/٥ الهامش) ئەم (البرزالي)یە گەلێ وڵاتی ئیسلام گەڕاوە، بە نموونە: دیمەشق و مەککە و نیسابوور و هەمەدان و ئەسفەهان و، مەرو و هەولێر و موسڵ و حەڕان و قاهیرەشی دیوە. فەرهەنگێکی گەورەشی بەنووسین و لەبەر گرتنەوە داناوە. گوێی لە گەلێ کەس گرتووە و، گەلێ کەسیش لێی دەگێڕنەوە، یەك لەوانە (عمر بن يعقوب الاربيلي)یە (ت ٦٧٣ك/١٢٧٣ز) کورتە باسێکی لە (المنذري، التكملة، بالرونيو ١٦١٩/٨ — ١٦٢٠)دا هەیە. الصفدي، الوافي ٧٥٢/٥. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة ٣١٦/٦. ابن العماد، شذرات الذهب ١٨٢/٥.

(٢) المنذري، التكملة ٨١/٤.

(٣) ابن الاثير، الكامل ٢٩٥/١٢. ابن خلكان، ط بيروت ١٩٧١، ٤٥٣/٣.

(٤) ن. م ٣٥/٤.

(ابن طبرزد گەلێ وڵاتان گەڕاوە و بەگێڕانەوەی حەدیس سوودی بە خەڵکەکەی گەیاندووە، وەك (ابن خلكان)یش باسی دەکات — دەڵێت عەرد و ئاسمانی بە حەدیس و ئیجازە لێکداوە؛ (ن. م. ص). ئەم مەلایە، لە ناوەندە ئیسلامییە بەناوبانگەکانی بەغدا و، موسڵ و هەولێر و حەڕان و، حەڵەب و دیمەشقدا، حەدیسی خەڵکی داداوە، پاشان گەڕایەوە بەغدا و، لەوێ کۆچی دوایی کرد. نزیکە هەشتاو سێ شێخ حەدیسیان لە لای خوێندووە. لە گەلێ کتێبدا باسی کراوە، بە تایبەتیش: (سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان. ٥٣٧/٨. المنذري، التكملة ٣٣٤/٢ — ٣٣٥. الذهبي، العبر ٢٤/٥. الصفدي، الوافي ٢٥٣/٥.

(ابو السعادات بهاءالدين اسعد بن يحيى ابن موسى بن منصور السلمي السنجاری) کە مەلاو شاعیرێکی باش بووە، ئەمیش جاروبار سەری لەم شارە داوە، دوا سەردانیشی لە ساڵی (٦٠٤ك/١٢٠٧ز)دا[1] بووە و، لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز)دا لە شنگاڵ کۆچی دوایی کردووە.

زانایانی رێزمانیش، زۆریان، سەردانی هەولێریان کردووە، یەك لەوانە: (أبو حفص مجدالدين عمر بن احمد بن أبي بكر بن احمد بن مهران العراقي) کە مەلایەکی کوێر بووە رێزمانزانێکی بلیمەت بووە[2]. زانستی لە لای (مكي ابن ريان الماكسيني) (ت ٦٠٩ك/١٢١٢ز) تەواو کردووە کە ئەویش هاتووەتە هەولێر و، لە نێوان (ابي حفص مجدالدين عمر) و (محمود ابن الارملة)دا رووبەڕووبوونەوەیەکی رێزمانزانی لە هەولێر رێکخرا، (ابن الارملة) لە هەولێر جێگیر ببوو، پاشان لە ساڵی (٦٠٦ك/١٢٠٩ز)دا، هەر لەم شارەدا، مرد. (الذهبی) دەڵێت: (ابو حفص) لە سەردەمی خۆیدا زاناترین مەلا بووە لە رێزماندا. رێزمان و زانستی عەرووز و ئەدەب و شیعری بە پوختی زانیوە و، زۆریش زیرەك بووە، کۆمەڵێ زمانزان و رێزمانزانی پێگەیاندووە. لە ساڵی (٦١٣ك/١٢١٦ز)دا، مردووە[3].

هەروەها، رێزمانزان (أبو نزار الحسن بن أبي الحسن صافي بن عبدالله بن نزار بن

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان ٢٥٤/١. ابن خلكان، ط ١٩٦٨ بيروت ٢١٤/١. لەوێدا دەڵێت: (السنجاري) لە بەغدا و موسڵ فقهی خوێندووە و، قەزاوەتی شاری (دنیسر – قوج حصار -)ی لە دەست بووە، شاعیرێکی چاکیش بووە. (ابن خلكان) دەڵێت: لە کتێبخانەکەی (التربة الاشرفية بدمشق) دیوانێکی ئەم مەلا شاعیرەی دیوە، مەجەلەدێکی گەورەیە. (السنجاري) ژیاننامەیەکی کورتی لە (السبكي)دا هەیە: طبقات الشافعية، ط الحسينية ٥٠/٥. الاسنوي، طبقات الشافعية ٦٦/٢.

(٢) السيوطي، بغية الوعاة، ٢١٦/٢، لە (ابن المستوفي وەری گرتووە).

(٣) السيوطي، م، ن، ٢١٦/٢.

أبي الحسن النحوي) بە نازناوی (ملك النحاة) [1] هاتووەتە هەولێر، بەڵام، ئەو، لە بەرایی حوكمی ئەتابەگەکاندا هاتبووە هەولێر و، لە ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٢ز)دا، لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا، مرد.

لەو رێزمانزانانەی کە ماوەیەکی زۆر لە هەولێردا ماونەتەوە و کتێبیان داناوە (ابو الحسن فخرالدين علي بن بگمش بن مزان بن عبدالله التركي البغدادى)یە کە قورئانخوێنێکی لێزان بووە. وانەی ئەدەب و رێزمانی زۆر بە وەستایانە دەگوتەوە و کتێبێکیشی لە عیلمی عەرووزدا دانا. پاشان هەندێ لە وڵاتان گەڕاو، لە شام لەگەڵ (تاج الدين الكندى)دا، (ت ٦١٣ك/١٢١٦ز) [2]، بۆ ماوەیەك مایەوە. لە بارەی هاتنیشی بۆ هەولێر، (السيوطي) لە کتێبی (تأريخ اربل)ەکەی (المستوفي)یەوە وەری گرتووە و، دەڵێت: چەندین جار هاتووە بۆ هەولێر و، ماوەیەکیش ماوەتەوە و، وانەی رێزمان و ئەدەبی وتووەتەوە و کتێبیشی داناوە[3]. وەلێ (السيوطى) ناڵێت ئەم رێزمانزانە چ کتێبێکی لە هەولێر داناوە و، قوتابیەکانی کێ بوونە و، ماوەی چەند لە هەولێر ماوەتەوە بەرلەوەی بچێت بۆ دیمەشق. ئەو زانایە لە دیمەشق، لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا مردووە[4].

یەکێکی دی لە رێزمانزانانی ئەو سەردەمە کە هاتووەتە هەولێر، (أبو الحزم

---

(١) ابن خلكان، وفيات الأعيان ٩٣/٢، ط بيروت نقلاً عن ابن المستوفي، باسی ئەم رێزمانزانە لە (التهذيب)ەکەی (ابن عساكر)دا هاتووە، ١٦٦/٤. هەروەها لە: ياقوت الحموي، معجم الادباء، ط ١٩٢٧، ٧٤/٣ — ٨١. القفطي، انباء الرواة، ٣٠٥/١ — ٣١٠. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٢٩٥/٨ — ٢٩٦. السبكي، طبقات الشافعية، ٢١٠/٤ — ٢١١. ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات النحاة واللغويين) في المكتبة المركزية ق ٢ ورقة ٥٧٣. السيوطي، بغية الوعاة ٥٠٤/١.

(٢) لە (بغية الوعاة)ەکەی (السيوطي)دا، باسی (تاج الدين الكندي) لە: ٥٧٠/١ — ٥٧٣دا دەبینیت.

(٣) السيوطي، م. ن. ١٥٢/٢.

(٤) م. ن. ص.

صائن الدين مكي بن ريان بن شبه بن صالح الماكسيني[١]الموصلي) بووه، (ابن المستوفي) له (تأريخ أربل)ەكەی خۆیدا باسی كردووه و دەڵێت: (كان جامع فنون الأدب وحجة كلام العرب) واتا هەموو جۆره هونەرێكی ئەدەبی زانیوه و لە زمانی عەرەبیشدا بلیمەتێك بووه بۆ خۆی.. هەروەها لە گێڕانەوەشدا دەوڵەمەند بووه[٢].

ئەم ڕێزمانزانانە لە هەولێردا تا ماوەیەك مایەوه و لەگەڵ قوتابیانی زمان و ڕێزماندا دۆستایەتیی پەیدا كرد، ژمارەیەك لە ڕێزمانزانانی هەولێر سوودمەندی دەستی ئەون، یەك لەو قوتابیانەی مێژوو نووس و ئەدیبی ناسراو بە (ابن المستوفي)یە[٣]. لە لایەكی دیكەوه، (أبو الحزم صائن الدين مكي) لە بابەتە زەحمەتەكانی ڕێزماندا پرسی بە گەوره ڕێزمانزانانی ئەم شاره دەكرد، یەك لەوانەش: (موفق الدين محمد بن يوسف الاربيلي) [٤] بووه. (ابو الحزم) لە دوادوای ژیانی لە موسڵ مایەوه، تا لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز)دا كۆچی دوایی كرد[٥].

---

(١) ماكسين: شارۆچكەیەكی سەر بە جەزیرەیە لەسەر ڕووباری خابور: ابن خلكان ٣٦٧/٤ ياقوت، معجم البلدان ٤٣/٥.

(٢) ابن خلكان ٣٦٥/٤.

(٣) م. ن. ص.

(٤) م. ن، ١٠٢/٤.

(٥) ابن الاثير، الكامل ٢٥٨/١٢. ابن خلكان ٣٦٧/٤. السيوطي ٢٩٩/٢. (ابي الحزم صائن الدين مكى بن ريان) لە كتێبگەلی ئەم زاتانەدا باسی كراوه: ياقوت الحموی، معجم الادباء ١٧٦/٧ — ١٧٧. القفطي، انباء الرواة ٣٢٠/٣ المنذري، التكملة ١٨٠/٢ — ١٨٣. الصفدي، نكث الهميان ٢٩٦. ابن الجزري، غاية النهاية في طبقات القراء ٣٠٩/٢ وغيرهم. (مكي بن ريان) لە زانستی قورئان و ئەدەبیشدا چالاك بووه. پاشان چووه بەغدا و، لەوێ لەگەڵ ئیمامانی ئەدەبدا، وەك قوتابی ئەدەبی دەخوێند، پاشان چوو بۆ موصڵ بوو بە سەردەستەی سوودبەخشان. خەڵك زۆری لێ فێربوون و ناو و ناوبانگی وڵاتەكەی گرتەوه، چ لە حەدیس و چ لە ڕێزمان و چ لە زماندا. (ابن الاثير)ی هاوزەمەنی دەڵێ: لە زەمانی خۆیدا، وێنەی نەبووه: ابن الاثير، الكامل ٢٥٨/١٢.

- **بنەماڵە زانستدۆستە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی هەولێر:**

لە سایەی دامەزراندنی ئەم هەموو دامودەزگا فێرکارییە و، سەردانی ئەو هەموو کەڵە زانایانە لە هەولێر، بنەماڵەیەکی زانستدۆستی زۆر لەم شارەدا سەریان هەڵدا و رۆشنبیرێکی زۆری بە کلتوور دەوڵەمەندیان تێدا هەڵکەوت، بە نموونە، وەك: بنەماڵەی (ابن خلكان) و (ابن المستوفي) و (ابن منعه) و بنەماڵەی شێخ (الخضر بن نصر) و بنەماڵەی دیکەش کە ماڵەکانیان ببوون بە بنکەی کۆڕ بەستن و کۆبوونەوەی زانا و زانستدۆستان. بە نموونە (المنذري) کە قوتابییەکی (ابن المستوفي) بووە باسی ماڵە مامۆستاکەی دەکات، دەڵێت: ماڵەکەی ببوو بە بنکەی پیاوچاکان و غەریبان[1] لەو زانایانەی کە دەهاتنە ئەم شارە. (اليونيني)یش باسی کۆبوونەوەی شەوێکمان لە ماڵی (ابن المستوفي) بۆ دەکات، کە (أبو مجدالدين أسعد بن أبراهيم)ی ئینشانووسی سەرداری هەولێر، پڕی یەك لەگەن بەهیە و سێو و میوەی بە کوڕێکی جواندا بۆ ناردبوون بۆ ئەو ماڵە، بەو بۆنەیەوە، کردیان بە شەڕە شیعر، شاعیری هەولێریش، ناسراو بە (الحاجري) لە گەڵیاندا بوو، یەکەم دەردوو، شیعرێکی بۆ هات، هەندێ تەشبیهاتی جوانیشی تێدا بوو، گوتی:

| | |
|---|---|
| اهـدى لنـا المجد تفاحـاً واحمره | من خد من حمل التفـاح مسـترق |
| وللسـفرجـل مـن أعلاه رائحـة | يضـوع منهـا لمهديـه ثني عبـق |
| فظللت أعجب من حالين كيف حوى | وصف الغلام ووصف السيد الطبق[2] |

واتاکەی:

لەگەن پڕبوو لە بەهیە و سێوی لاسوور
لەپڕ، بۆن و بەرامەی کەوتە نێو ژوور

---

(١) المنذري، التكملة لوفيات النقلة، بالرونيو، جـ ٨ ورقة ١٦٢٨.

(٢) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ١١٣/١.

(مەجد) ناردی، بەهیممەت بۆ مەلایان
هەتا دوور بێ، لە رەفتار و، بەڵایان
بە جوانێکا، هەناردی، گەش وەکو نوور
بەنووری تەلعەتی، رایماڵی دەیجوور

ئەوانەی باسمان کردن، لایەنی کلتووری و رۆشنبیریی، ئەو سەردەمەی هەولێرمان بۆ روون دەکەنەوە، کە شارەکەیان کردبوو بە مەڵبەندێکی گەشی خوێندەواری و، چەندین مەلای شاعیر و حەدیسخوان و قورئانلەبەر و رێزمانزان و ئەدیبی تێدا هەڵکەوت. بەڵام ژمارەیەکی زۆریان شارەکەیان بەجێ هێشت و، روویان لە هەندەران کرد.

راستیشت دەوێ، ئەوەی کە لای ئەمانە لە برەو دابوو تەنیا زانستە سەرزارەکی (العلوم النقلية)ی وتووێژی بەنموونە وەك (زانستی ئایینی و ئەدەبی و زمانزانی... هتد) بوون. هەرچی زانستی ئەقڵی (الدراسات العقلية)ی، بە نموونە، وەك (بیرکاری و پزیشکی و کیمیاو... هتد) ئەوە، هەر لە ئارادا نەبووە ـ هەروەهاش، زانستی گەردوون و فەلسەفەش، کە ئەویش هیچی لێ پەیدانەبوو، هەر هەمووی بێ خاوەن بوونە و کەس خۆی لە قەرەی نەداوە، بەنموونە، (موفق الدين بن محمد بن يوسف بن محمد بن قائد الاربيلي) ماوەیەکی زۆر کەم، خووی دایە شیکردنەوەی (ئیقلیدس)[1] و بەشێك لە (المجسطي)[2]، بەڵام هەر زوو بێزای و لێی بێزار بوو،

(١) ئیقلیدس: وشەیەکی یۆنانییە، ئەسڵەکەی (کلید)ە، کراوە بە عەرەبی و، بووە بە ئیقلیدس، واتا (کلیل). بنۆڕە (تاج العروس) ٤٧٢/٢. هەرچی حاجی خەلیفەیە، ئەوە، ئەو، دەڵێت: ئەم وشەیە لە دوو برگە پێکهاتووە، یەکەمیان (ئیقلی) واتا (کلیل)، دووەمیان (دس) واتا: (هەند، بڕ) و، وشەکەش بە گشتی دەبێتە (بڕی ئەندازە). بنۆڕە (کشف الظنون ١٣٧/١).

(٢) المجسطي: ئەکا زانینی گەردوون — زانستی گەردوون، یان لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵەی خۆر. بنۆڕە (الموسوعة العربية الميسرة، ص ١٦٤٨. خاوەنی (کشف الظنون ١٥٩٤/٢)یش دەڵێت: مانای (زانینی پەیکەر)ە، زانستی پەیکەر، لەو رێسایانە دەکۆڵێتەوە کە بە بەڵگەی تەواو، دۆخی گەردوون و پێگەی زەمین دەسەلێنن.

گەڕایەوە سەر ئەدەب و ڕێزمان و، خۆی بۆ تەرخان کرد[١].

هەموو، ئەوانەش کە دەهاتنە هەولێر، هەر لەسەر ئەو بەزم و ڕێسایە ڕەفتاریان دەکرد و، توخنی زانستی جەڕەباندن نەدەکەوتن، کەمێکیان نەبێ، بەنموونە، وەك (مهذب الدين ابن الحاجب الدمشقي) [٢]، ئەم زانایە، زانستی پزیشکیی دەخوێند و، بیرکاری بە دروستی دەزانی و، سەری لە ئەندازەش دەردەچوو، پاشان چوو بۆ هەولێر و، لەوێ چاوی کەوت بە (ابو شجاع فخرالدين محمد بن علي بن شعيب المعروف بابن الدهان المحاسب البغدادي/ت ٥٩٠ك/١١٩٤ز) [٣] کە ئەویش لە هەولێر بووە[٤]. ئیدی لەگەڵ ئەودا، خەریکی فێربوونی (زێ)یەکە (الزيج) [٥] بوو، کە (ابن الدهان الحاسب) دروستی کردبوو، تا بە تەواوی فێری خوێندنەوەی بوو، پاشان بە دەسخەتی خۆی نووسییەوە و گەڕایەوە بۆ دیمەشق[٦].

سەرچاوەکان لەوەزیاتر باسی هیچ چالاکییەکی (ابن الدهان المحاسب)

---

(١) السيوطي، بغية الوعاة ٢٨٦/١. لە جێگایەکی تردا باسی ئەم ڕێزمانزانانەش دەکەین.

(٢) بەرواری مردنیمان نەدۆزییەوە، بەڵام (ابو اصيبعة) دەڵێت: (مهذب الدين) هەر خزمەتی سەڵاحەددینی ئەییوبیی کردووە، لە ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣)شدا سەڵاحەددین مردووە و، ئەویش چووەتە (حماة) و، لەوێ پاش دوو ساڵ مردووە: (عيون الانباء ٢٩٩/٣)، واتا لە ساڵی (٥٩١ك)دا مردووە.

(٣) تەنیا (ابوشامة) دەڵێت: ئەم (ابو شجاع)ە لە ساڵی (٥٩٢ك)دا مردووە، بنۆڕە: (ذيل الروضتين، ص٩). بەڵام (ابن تغرى بردى) جارێك دەڵێت لە ساڵی (٥٩٠ك)دا مردووە: (النجوم الزاهرة ١٣٦/١)، جارێکیش دەڵێت: لە ساڵی (٥٩٢ك)دا مردووە: (م. ن. ١٣٩/٦).

(٤) ابن أبي اصيبعة ٢٩٨/٣.

(٥) الزيج: زێ: حسابێکی تایبەتە، ڕەوگەی ئەستێرە گەڕۆکەکان لە ساڵێکدا نیشان دەدات، بە فارسی پێی دەڵێن (زە) واتا (زێ) پاشان کراوە بە عەرەبی و بووەتە (زيج): سەیری پەراوێزی کتێبەکەی (عمادالدين الاصفهاني) بکە: (خريدة القصر وجريدة العصر) — القسم العراقي — الجزء الثاني، تحقيق محمد بهجة الأثري، مطبعة المجمع العلمي العراقي ١٩٦٤، ص ٣١٤.

(٦) ابن ابي اصيبعة ٢٩٨/٣.

ناکەن کە لە مەیدانی زانستیدا، لە هەولێر نواندبێتی. دەڵێن سەرباری ئەوەی کە لە مەسەلە بیرکارییەکاندا دەستی باڵای هەبووە، حەدیسخوانیش بووە و، کتێبێکیشی بە ناوی (غریب الحدیث) بە شازدە جلْد نووسیوە و[1]، کتێبی لەسەر ماددەی مێژوویش[2] داناوە و، کتێبی زۆری دیکەشی هەیە[3].

لە زانایان، شێخ (ابو عمر اثیرالدین المفضل ابن المفضل الابهري)یش لە ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز)دا سەری لە هەولێر داوە، ئەمەیە کە (ابن خلكان) وەسفی دەکات و دەڵێت: خاوەنی (التعليقة في الخلاف والزيج والتصانيف المشهوره)یە[4]. ئەم شێخە لە خانەی حەدیسی (المظفرية) میوان بووە. (ابن خلكان) یەکێك بووە لە قوتابییەکانی و لە دەرسەکانیدا ئامادە دەبوو[5]. (القزويني)یش دەڵێت: ئەم شێخە، لە زانستی ئەندازەدا وێنەی نەبوو[6].

---

(١) ابن خلكان ١٠٥/٤. (ابن ابي اصيبعة) دەڵێت: دە جلْدە، ٢٩٨/٢.

(٢) ابن خلكان، م. ن.

(٣) ابن ابي اصيبعة، ص. ن. باسی (ابن دهان) لە (القفطي)دا هاتووە، انباء الرواة، ١٩١/٣ — ١٩٣. المنذري، التكملة ٣٩٧/١ — ٣٩٨. ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، ق ٤، جـ/٣٤٧. الذهبي، العبر ٢٧٤/٤ — ٢٧٥. الصفدي، الوافي ٤/ ١٦٤ — ١٦٥.

(٤)ابن خلكان ٢٩٧/٤.

(٥)م. ن. ص.

(٦)القزويني، آثار البلاد، ص ٤٦٣.

- **بنەماڵە زانستدۆستە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی هەولێر:**

## یەک: بنەماڵەی (خلکان)

ناودارترین بنەماڵە و، کەڵە زانا لەم ئەمارەتەدا هەڵکەوتبن، بنەماڵەی (ابن خلکان)ە[١].

ئەم بنەماڵەیە، گەلێ مەلاو قازی و مامۆستای لێ کەوتووەتەوە، لە هەموویان گرنگتر، لە هەولێر، مەلا (ابو عبدالله محمد بهاءالدین ابن ابراهیم ابن أبي بکر بن خلکان الاربیلی)ی[٢] باوکی مێژوونووسی ناسراو بە (القاضي شمس الدین احمد)

---

(١) زۆربەی مێژوونووسان دەڵێن: باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە (خلکان)ی ناوبووە، واتا: (ابن خلکان)ی رەوشنووس بەچوار پشت دەچێتەوە سەر ئەو. بنەماڵەکە بە نەسڵ خەڵکی گوندێکن، پاشان ناوی بنەماڵەکە بەسەر گوندەکەشدا براوە. دکتور (احسان عباس) بەرگی دووەمی/ ورقەی (٢٧٣) کتێبی (تأریخ اربل)ی (ابن المستوفي) خوێندووەتەوە کە (سامي الصقار) لە ئنگلستانەوە بۆی ناردبوو، دەڵێت: (ابن المستوفي) هیچ گومانی تێدا نەهێشتووە و دەڵێت (خلکان) ناوی گوندەکەیە و، بە ناوی بنەماڵەکەوە ناونراوە، بنۆڕە مقدمة (وفیات الاعیان) ط ١٩٧١، جـ ٧، ص ١٧. ئەم گوندە، چەند ساڵێکە کراوە بە ناحیە و سەر بە قەزای رانیەیە لە پارێزگای سلێمانی. بنۆڕە وتارەکەی (ناجي عباس، بەزمانی کوردی، بە سەردێڕی (لاپەڕەیەکی زێڕین لە مێژووی هەولێر) گۆڤاری گەلاوێژ (١ – ٢) ساڵی سێیەم /١٩٤٢ لاپەڕەی (١٣). لەو وتارەدا ئاماژە بە جێگەی گوندەکە دەکات.

(٢) ئەم بنەماڵەیە کوردە، بنۆڕە: (ابن الشعار: مخطوط، عقود الجمان، جـ ١، ترجمة احمد بن عبدالرحمن... ابن خلکان ابن عم المؤرخ. ابن الصابوني، تکملة اکمال الاکمال، ص ٢٣١. (کمال الدین ابو الفتح موسی ابن احمد)ی کوڕی (ابن خلکان)ی مێژوونووس، کاتێ لە کتێبی (المختار)ەکەی خۆیدا کە کورتەی ژیاننامە ناودارەکانی ناو کتێبی (وفیات الاعیان)ی تێدا نووسیوەتەوە، باسی باوکی دەکات و، دەڵێت: (باوکی باسی خۆی بۆ کردووە و پێی گوتووە کە ئێڵەکەیان کوردە – پاشان دەڵێت کە گوتوویەتی (محمد بن ابراهیم) دەچێتەوە سەر (ابن مالك بن جعفر بن یحیی بن خالد البرمکي). بنۆڕە پێشەکیی کتێبی (وفیات الاعیان) ط/١٩٧١ جـ ٤ صفحة (ط) (ناشزانین ئەم بنەماڵەیە، چۆنی دەچنەوە سەر رەسەنی کورد و، دەشچنەوە سەر بەرمەکییەکان). هەروەها بنۆڕە: الحسیني، مخطوط (صلة التکملة) ١١٦/٢. هەندێ سەرچاوەش هەیە، رەسەنی ئەم بنەماڵەیە تەنیا دەبەنەوە سەر بەرمەکییەکان و باسی کورد ناکەن، وەك: (الیونیني، ذیل مرآة الزمان ١٤٩/٤). الصفدي، الوافي بالوفیات ٢٠٨/٧. السبکي، طبقات الشافعیة، ط/الحسینیة ١٤/٥. طاش زادە کبری، مفتاح السعادة ٢٥٦/١. النعیمي، الدارس في تأریخ المدارس ١٩٢/١. وغیرها.

خاوەنی کتێبی (وفیات الأعیان) بووە _ لە دەوروبەری ساڵی (٥٥٧ك/١١٦٢ز)دا[١]، لە شاری هەولێر لەدایك بووە. هەر لەم شارەشدا گەورە بووە، پاشان چووە بۆ وڵاتی شام و میسر و حیجاز و عیراق، بەدووی حەدیسدا عەوداڵ بووە، شەریعەتی لەسەر مەزەبی شافیعی لە موسڵ تەواو کرد، ئنجا دووبارە، بۆ خوێندنی زیاتر چووەوە بۆ بەغدا و، لەوێ لە مەدرەسەی (النظامیة)، زانستی خوێندووە و، هەر لەو قوتابخانەیەشدا بە (معید) دامەزراوە[٢]. لە لای شێخ (یحیی ابن علي بن فضلان - ت ٥٩٥ك/١١٩٩ز) و لە لای شێخ (یعیش بن صدقة بن الفراتی) (ت ٥٩٣ك/١١٩٦ز) گوێگر بووە. هەروەها لە لای (أبي الفرج عبدالمنعم بن عبدالوهاب بن کلیب (ت ٥٩٦ك/١٢٠٠ز)و، لە لای (أبو القاسم یحیی بن اسعد ابن بوش (ت ٥٩٣ك/١١٩٦ز) دەرسی خوێندووە، ئنجا لە بەغداوە، دووبارە چووەتەوە بۆ موسڵ و، لە موسڵ چوارده ساڵ ماوەتەوە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر و، لە هەولێریش، لای (ابو علي حنبل بن عبدالله بن فرج الرصافي المکبر) (ت ٦٠٤ك/١٢٠٧ز) گوێی لە حەدیس گرتووە. هەروەها، لە لای (أبي حفص عمر بن طبرزد ت ٦٠٧ك/١٢١٠ز) و (أبو القاسم عبدالله ابن عبدالغني بن محمد) و، (أبو الفرج محمد بن عبدالرحمن بن أبي العز الواسطي) [٣] گوێی لە حەدیس راگرتووە.

شان و شەوکەتی مەلا (بهاءالدین محمد ابن خلکان) لە شارەکەی خۆیدا، زیاتر بڕەوی سەند و، لە فەتوادا ئاماژەی پێ دەدرا و، لە لای سەرداری هەولێر موزەففەرەددین گۆکبوری پلەو پێگەی دیاری وەرگرت و لە قوتابخانەی (المظفریة) بە وانەوان (دەرسبێژ) دایمەزراند. ئیدی لەم قوتابخانەیەدا بەردەوام دەرسی دەگوتەوە، تا لە ساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز)دا[٤] کۆچی دوایی کرد.

---

(١) المنذري، التکملة ٨٠/٤ — ٨١. الاسنوي، طبقات الشافعیة ٤٩٦/١.

(٢) الأسنوي، م. ن. ص.

(٣) المنذري، التکملة ٨١/٤.

(٤) م. ن. ص: ٨٠. الأسنوی، طبقات الشافعیة ٤٩٦/١.

یەکێکی دی لە رۆڵە هەڵکەوتووەکانی ئەم بنەماڵەیە، مەلا (نجم الدین أبو حفص عمر ابن ابراهیم بن أبی بکر بن خلکان)ی برای مەلای ناوبراو و مامی (ابن خلکان)ی مێژوونووس بوو. ئەم مەلایە فێری فقهی مەزەبی شافیعی بوو، لە هەولێریش لە لای (أبو حفص عمر بن طبرزد) گوێی لە حەدیس دەگرت. پاشان چوو بۆ مەککە و لەوێش، حەدیسی لە لای (أبو عبدالله محمد ابن اسماعیل بن أبي الصیف) دەخوێند. (ابوالفرج یحیی بن محمود الثقفي) و (عبدالمنعم ابن عبدالوهاب بن کلیب) و مامۆستایانی دیکەش ئیجازەیان داوەتێ. لە تەنیشت (حەرەمی شەریف)یشەوە، چەند ساڵێك حەدیسخوان بووە و تێیدا سەرگەرم بووە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خۆی و، لە قوتابخانەی (المجاهدیة)دا[1] کە (مجاهدالدین قایماز) دایمەزراندبوو دەرسی گوتووەتەوە و، بەردەوام بووە لەسەری، تا لە رەمەزانی (٦٠٩ك/١٢١٢ز)دا کۆچی دوایی کرد. بە قسەی (المنذري)یش[2]، لە گۆڕستانە گشتییەکەدا نێژراوە. بەو جۆرەی باسمان کرد، هەردوو برای خەڵەکانی (بهاءالدین محمد) و (نجم الدین عمر)، لە هەولێر، لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆگبوریدا، هەریەکە و لە قوتابخانەیەکی ئەم شارەدا دەرسی داداوە.

بەڵام براکەی دیکەیان، مەلا (رکن الدین أبو یحیی الحسین بن ابراهیم بن أبي بکر ابن خلکان) لە مەزەبی دەزانی و، لە لای (أبو الفرج یحیی بن محمود الثقفي) حەدیسی خوێندووە و، خۆیشی، لە هەولێر، حەدیسی[3] بۆ خەڵك خوێندووەتەوە و ـ بە قسەی (الصفدي)یش[4]ـ لە چەند قوتابخانەیەکی هەولێردا وانەی گوتووەتەوە

---

(١) المنذري، التكملة، ٣٥/٤.

(٢) م. ن. ص، ژیاننامەشی لە: (السبكی، طبقات الشافعیة الکبری، ط/الحسینیة ١٣٠/٥. الأسنوي، طبقات الشافعیة (٤٩٥/١)دا هەیە.

(٣) الصفدي، مخطوط، الوافي بالوفیات، جـ ١١، ورقة ٥٦. الاسنوي، طبقات الشافعیة ٤٩٥/١.

(٤) الصفدي، م. ن. و.

و، هەر لەم شارەدا لە (ذي القعدة‌ی ٦٢٣ك/١٢٢٦ز)دا کۆچی دوایی کردووە.

بێجگە لە برایانی خەلەکانی[1]، هەر لەم بنەماڵەیەدا کەسێکی تریش بە ناوی (ظهيرالدين الجنيد بن عيسى بن ابراهيم بن أبي بكر بن خلكان) کە هەر لە هەولێر، لە ساڵی (٥٩٣ك/١١٩٧ز)دا. لە دایك بووە، هەڵکەوت. ئەمیش هەر هەواداری حەدیس بوو، لە ساڵی (٦٦٥ك/١٢٦٧ز) لە دیمەشق گیانی سپارد و، لە لاپاڵی کێوی (قاسيون)[2] نێژرا. هەروەها، (القاضي ابو بكر شبلي بن الجنيد بن ابراهيم)یش، هەر لەم بنەماڵەیەدا کەوتە بەرچاو. ئەمیش لە ساڵی (٥٧٦ك/١١٨٠ز)دا، لە هەولێر لە دایك بووە. ئەم کەوتە وڵاتی میسر و، لەوێ قەزاوەتی شاری (أخميم)ی لە (صعيد)ی وڵاتی میسر گرتە دەست و، هەر لەو شارە لە ساڵی (٦٥٣ك/١٢٥٥ز)دا مرد[3].

(أبو عبدالله بهاءالدين محمد بن محمد بن ابراهيم ابن بكر بن خلكان)ی برای (شمس الدين احمد ـ ابن خلكان -)یش، لە هەولێر لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز)دا، لە دایك بووە و، پێگەیشتووە و کەوتووەتە بەرچاو. ئەمیش، هەر لە هەوادارانی حەدیس بووە و، - وەك (الصفدى)یش باسی دەکات ـ (لە هەموو خەسڵەتەکانیدا، وێنەی نەبووە. ئەم، بوو بە قازیی شاری بعلبك و، هەر لەو شارەدا، لە ساڵی (٦٨٣ك/١٢٨٤ز)دا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی دەرویش (عبدالله اليونيني) شاردیانەوە[4].

---

(١) لە کەمی، دوو برای دیکەیان هەبووە: (عیسی) و (عبدالرحمن).

(٢) اليونيني، ذيل مرآة الزمان ٣٦٥/٢. احمد بن محمد بن عبدالرحمن الحسيني، مخطوط: (صلة التكملة لوفيات النقلة)، مجلد ٢ ورقة ٥٦، مجلد ٢ ورقة ٥٦.

(٣) ابن الصابوني، تكملة إكمال الاكمال، ص ٢٣١ — ٢٣٢. السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ط الحسينية ٥٧/٥. الحسيني، مخطوط صلة الحسني مجلد ٢، ورقة ١١٦.

(٤) الصفدي، الوافي بالوفيات، ط ١٩٦٢، جـ ١ ص ٢٠٣ — ٢٠٤.

(جرجي زيدان) دەڵێت: کتێبێك لە کتێبخانەی ئۆکسفورد هەیە بە ناوی: (التأريخ الاكبر في طبقات العلماء واخبارهم) گوایا کتێبی (بهاءالدين محمد بن محمد بن خلكانە کە لە (٦٨٣ك)دا مردووە، بنۆڕە کتێبی (تأريخ آداب اللغة العربية) جـ ٣، ١٧٤. بەڵام هیچ کەسێك، نەخاسمە (الصفدي) کە ئاماژەی بە کورتە باسێکی ژیانی کردووە — ناوی ئەو کتێبەی نەهێناوە.

راستیـــشت دەوێ، لـــەناو ڕۆڵـــەکانی بنەماڵـــەی خەلەکانیـــدا لـــە هـــەموویان هەڵکەوتووتر و ناودارتر و بەرچاوتر، ڕەوشتنووسی ناسـراو (شمس الـدین احمـد بـن محمد بن ابـراهیم)ی خـاوەنی کتێبـی (وفیـات الاعیـان وأنبـاء ابنـاء الزمـان مما ثبت بالنقـل أو الـسماع أو اثبتـهُ العیـان)ە، کـە ـ وەك، خـۆی قـسەی بـۆ (کمـال الـدین ابـن الشعار)[1] کردووە ـ، لـە هـەولێر لـەدایك بـووە، یـان خـۆی لـە کتێبەکەیـدا دەڵێـت: لـە سـاڵی (٦٠٨ك/١٢١١ز)دا لـە هـەولێر لـە نـاو قوتابخانەکـەی سـوڵتان (الملـك المعظـم موزەففەرەددین ابن زین الـدین)دا[2] لەدایك بووە... لـە سـاڵی (٦٨١ك/١٢٨١ز)دا، کۆچی دوایی کردووە.

لەم شارەدا گەورە بووە و، لەم شارەدا خوێندوویەتی و (صحیح البخاري)یـشی لـە لای (أبو جعفـر محمـد بـن عبـدالله بـن المکـرم الـصوفي) (ت ٦٢١ك/١٢٢٤ز) خوێنـدووە و گوێی لێ گرتـووە، ئیجازەشـی لـە (المؤیـد الطوسـي) و (عبـالعزیز الهـروي) و (أم المؤیـد بنت الشعري زینب بنـت عبـدالرحمن (ت ٦١٥/١٢١٨ز) [3] وەرگرتـووە و، (الخـلاف)یـشی لەسەر دەسـتی شـێخ (أبـو عمـر أثیرالـدین الفـضل بـن الفـضل الابهـري) خـاوەنی ئـەو کتێبە بەناوبانگانەدا خوێندووە، کە (ابن خلکان) وەهای وەسف کـردووە. ئـەم شـێخە لە ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٩ز)دا سەری لە هەولێر داوە[4].

(ابن خلکان)، لە نێوان هەولێر و موسڵدا دە جار زیـاتر هـاتووە و چـووە[5] پاشـان، لە ڕەمەزانی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا، بە یەکجاری هەولێری بەجێ هێشت، کە چەنـدین جـار لە کتێبەکەیدا ئەو باسە دەڵێتەوە، واتا بەر لەوەی تەمەنی بیست ساڵان تـەواو بکـات

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ١، ترجمة احمد بن محمد ابراهیم ابن خلکان.

(٢) وفیات الاعیان ٢/٩٢، ط ١٩٤٨.

(٣) ئەم ئافرەتە زانایە، کە لە ساڵی (٦١٠ك)دا، گەیشتە هـەولێر و، لـە (المدرسـة المظفریـة) میـوان بوو، ئیجازەی دا بە (ابن خلکان)ی مێژوونووس: (وفیات الأعیان ٢/٩٢). هەرچەندیشە، ئەوکات (ابن خلکان) تەمەنی لە دوو ساڵان زیاتر نەبوو. ئەوەبوو، باسمان کرد.

(٤) م. ن، ٤/٣٩٧.

(٥) م. ن، ٥/٢٦.

لەم شارە دەرچووە و، چووەتە حەڵەب، حەڵەبیش، ئەو دەمە (الملك الظاهر غیاث الدین)ی کوڕی سەلاحەددینی ئەییوبی حوکمی تێدا دەکرد، لەبەر ئەوە ببوو بە قیبلەی هزرمەندان و نزرگەی مەلایان[1]، دیارە ئەمیش هەروا سەرەڕۆیانە رووی لەم شارە نەکردووە، نەخاسمە باوکیشی پێوەندییەکی دۆستانەی گەرمی لەگەڵ (أبو المحاسن بهاءالدین یوسف)ی قازیی حەڵەبدا هەبوو، کە بە (ابن شداد)ی... خاوەنی کتێبی (النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة) [2] ناسراو بوو. وادیارە (ابن خلکان) لەسەر رەزامەندیی موزەففەرەددین گۆکبوری هەولێری بەجێ هێشتووە، بەو نامەیەدا، دیارە بە (ابن خلکان)دا ناردوویەتی بۆ قازییەکەی حەڵەب و داوای لێ کردووە کە ئاگای لەم مەلا هەرزەکارە بێ و چاودێریی بکات. (ابن خلکان) دەڵێت: «سوڵتانی وڵاتەکەمان، (الملك المعظم موزەففەرەددین گۆکبوری) نامەیەکی پڕ مانای بۆمان نووسی بۆ قازی (ابی المحاسن یوسف ابن شداد) نووسیبووی: تۆ خۆت دەزانیت کە ئەم دوو کوڕە[3] چییان پێویستە، هەردووکیان کوڕی برام و کوڕی براتن، ئیدی پێویست ناکات هیچی دیکەت پێ ڕاسپێرم» [4]. لەبەر ئەوە (قازی) بەڕێزەوە پێشوازیی لێ کرد و، هەموو شتێکی بۆ دەستەبەر کرد و، لە مەدرەسەکەی خۆی دایکرد (دایبەزاند). بە دەرچوونی (ابن خلکان)یش، لە هەولێر، ئەستێرەی کلتووری و ڕۆشنبیری ئەم بنەماڵەیە لە ئاسمانی هەولێر، ئاوابوو[5].

---

(١) م. ن، ٨٧/٦.

(٢) م. ن. ص.

(٣) برایەکیشی لەگەڵ خۆی بردبوو، پێدەچێ (بهاءالدین محمد)ی ناوبراو بووبێت.

(٤) ابن خلکان ٨٧/٦.

(٥) وا، باشترە، لێرەدا لەسەر باسی رەوشی (ابن خلکان) لەوە زیاتر نەڕۆین، تەنیا ئەوەندە دەڵێین کە پاشتر حەڵەبیشی بەجێ هێشت و، لە دوا دوای ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٨ز)دا گەیشتە قاهیرە: (وفیات الاعیان ٩٧/٦). پاشان چەندین جار لە نێوان قاهیرە و دیمەشقدا دەهات و دەچوو، دواجار لە دیمەشق گیرسایەوە و بوو بە قازیی شارەکە، پاشان بوو بە مەلای وانە بێژ، تا لە کۆتایی رەجەبی (٦٨١ك/١٢٨١ز)دا کۆچی دوایی کرد و، لە دامێنی چیای قاسیوندا، سپاردیان. مێژوو نووسێکی زۆر، -ڕەوش و رەوشتیان تۆمار کرد، ئەمانەش هەندێکیانن: ابن الشعار،←

## دوو: بنەماڵەی (ابن المستوفی)

هەر لەو سەردەمەدا، کەڵە زانایەکی دی، لە هەولێر، بەناوی (أبو البرکات المبارك المنعوت بشرف الدين ابن المستوفي الاربيلي) کە هەم ئەدیب و، هەم مێژوو نووسیش بوو، ناوبانگی دەرکرد. ئەم مێژوو نووسە ئەدیبە لە مانگی شەووالی (٥٦٤ك/١١٦٩ز)دا[1]، لە قەڵاکەی هەولێر لەدایك بوو، هەر لەم شارە پەروەردە بوو، لە قوتابخانەکانیدا خوێندی. (ابن المستوفي) وەك باسمان کرد لە بنەماڵەیەکی رەسەنی رۆشنبیر بوو، بەر لە سەردەمی ئەتابەگیان، باوکی و باپیریشی کارمەندی کۆکردنەوەی داهاتی ئەمارەتەکە بوون. (ابو الحسن صفي الدين علي المبارك)ی مامیشی، کتێبی (نصيحة الملوك)ی ئیمام (أبي حامد محمد الغزالي)ی (ت ٥٠٥ك/ ١١١١ز)ی لە زمانی فارسییەوە کرد بە عەرەبی[2].

(ابو البرکات المبارك) خوێندەواری و کلتووری چڕوپڕی جۆراوجۆری بە دەست هێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی مێژوو نووسی هەولێر بوو، ناوبانگی زیاتر دەنگی دایەوە، کتێبێکی بەناوی (نباهة البلد الخامل ومن ورد عليه من الاماثل)[3] دانا کە (تأريخ

---

←مخطوط (عقود الجمان) جـ ١ سيرة (احمد بن محمد بن ابراهيم ابن خلكان). اليونيني، ذيل مرآة الزمان ١٤٩/٤ — ١٦٥. الصفدي، الوافي بالوفيات ٣٠٨/٧. اليافعي، مرآة الجنان ٤/ ١٩٣ — ١٩٧. النعيمي، الدارس في تأريخ المدارس ١٩١/١ - ١٩٣. طاش كبرى زاده، مفتاح السعادة ٢٥٦/١ — ٢٥٧. السخاوي، الاعلان بالتوبيخ، ١٥٢. السيوطي، حسن المحاضرة ٥٥٥/١. ابن طولون، قضاة دمشق، ٧٦. والدراسة القيمة التي كتبها عنه الدكتور احسان عباس في مقدمة (جـ ٧) من وفيات الاعيان، ط بيروت ١٩٧١.

(١) المنذري، التكملة، بالرونيو ١٦٢٨/٨. ابن خلكان ٢٩٨/٣. ابن أبي عذيبة، انسان العيون، ص ٣٠٩. السيوطي، بغية الوعاة، ٢/ ٢٧٢.

(٢) ابن خلكان ٢٩٨/٣.

(٣) وەك (ابن الشعار) گوتوویەتی: م. ن. بەڵام (الصفدي) ناوی ئەم کتێبەی کردووە بە (نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل) بنۆڕە: (الوافي بالوفيات ٢٨٦/١). حاجی خەلیفەش، لە (کشف الظنون في أسامي الكتب والفنون)دا هەروەها دەڵێت.. مجلد ٢، ص ١٩٢٣. هەرچی (اسماعيل البغدادي)یە، ناوی کتێبەکە بەم شێوەیە دەبات: (نباهة البلد الحافل بما ورد من الاماثل في تأريخ اربل) بنۆڕە (هدية العارفين)، مجلد ٢ ص ٣، لەوانەیە (الصفدي) راست بێ.

أربيل)یشی، پێ دەڵێن. ئەم کتێبە چوار سەد جڵد بوو[١]، بە سەرچاوەی کتێبی (عقود الجمان في شعراء هذا الزمان)ی (ابن الشعار الموصلي) لە قەڵەم دەدرێت و بوومتە سەرچاوەیەکی گرنگی (وفيات الاعيان)ەکەی (ابن خلدون)یش کە بەدەمی خۆی باسی کردووە[٢]. بەڵام ناوی کتێبەکە ناڵێت و، تەنیا بەناوی (تأريخ أربل) ئاماژەی پێدەدات. (الحصان)یش، ئەو کتێبە، بە کتێبی (تأريخ بغداد)ەکەی (ابن

---

(١) ابن خلكان ٢٩٤/٣. السيوطي، بغية الوعاة ٢٧٢/٢. طاش كبرى زاده، مفتاح السعادة ٢٦٩/١. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ١٨٧/٥. الخوانساري، روضات الجنات ٦٥٧. (السخاوي) دەڵێت: ئەم کتێبە پێنج جڵدە: بنۆڕە کتێبەکەی: (الاعلان بالتوبيخ لمن ذم التأريخ). (فرانز روزنثال) لە کتێبەکەی خۆیدا: (علم التأريخ عند المسلمين) – کە لە (السخاوي) و (طاش کبری زادە)وە، وەری گرتووە – دەڵێت: ژمارەی جڵدەکانی کتێبەکەی (ابن المستوفي) چوار جلدە. بنۆڕە لاپەڕە (٧٧٣) لە کتێبەکەی.

(٢) ابن خلكان ٢٩٤/٣.

هەتا ئێستا کتێبەکەی (ابن المستوفي) لەسەر (تأريخ اربل) بە (بزر) دادەنرێت لەگەڵ کتێبە بزربووەکانی تردا، تەنیا جزمی یەکەم نەبێت کە بەر لە چەند ساڵێك لە لەندەن دۆزرایەوە، ئەویش پرۆفیسۆر (ئاربری) ئاشکرای کرد. ئەم کتێبە باسی رەوش و رەوشتی حەدیسخوان و دەروێش و سۆفی و ئەوانەی لە ئەوروپا و لە جێگایانی دیکەی جیهانی ئیسلام و ئەندەلوسەوە هاتوونەتە هەولێر، تێدایە. کتێبەکە (٢٣٢) وەرەقەیە. ئەو کەسەی لەبەری گرتووەتەوە لە ساڵی (٦٤١ك/١٢٤٣ز)دا تەواوی کردووە، واتا دوای چوار ساڵ لە مردنی (ابن المستوفي)، بنۆڕە بڵاوکراوەی (اخبار التراث العربي) کە پەیمانگای دەستنووسەکانی سەر بە کۆمکاری عەرەبی لە قاهیرە دەری دەکات: - العدد/٣٢ لسنة ١٩٧٢ ص ٣ – (سامی الصقار)ی باڵیۆزی پێشتری عیراق لە یوگوسلافیا، پێش زیاتر لە سێ ساڵ دەستی کردووە بە ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە کە بەشێکە لە نامەی دکتۆراکەی لە زانکۆی کمبردج لە ئنگلستان لەسەر ماددەی (ابن المستوفي)، وەهاش چاوەڕوان دەکرا لە نیوەی ساڵی ١٩٧٣ تەواوی بکات.

(٣) عبدالرزاق الحصان، نظرة عابرة في شمال العراق، ١٩٤٠ ص ٥٨. بە قسەکانی (الحصان)دا دەردەکەوێت کە ئەم کتێبەی (ابن المستوفي)ی نەدیوە. ئەو، پێدەچێ، بەڕاستی ناونیشانی کتێبەکەی هەڵدابێ، بەڵام خەیاڵ و خەمڵە، نەیدیوە.

الخطیب البغدادي) و، بە كتێبی (تأریخ دمشق)ەكەی، (ابن العساكر) دەچوێنێت[١]، چونكە (ابن المستوفي) لاپەڕەكانی كتێبەكەی ـ بە چەشنی خاوەنی ئەو دوو كتێبەی باسمان كرد ـ بۆ باسی ڕەوشی هەولێرییە ناسراوەكان و باسی ئەوانەش كە هاتوونەتە ئەم شارە، تەرخان كردووە. دەشگێڕنەوە، دەڵێن: (سلیمان ابن عبدالله بن أبي الحسن الزنجانی) كتێبەكەی (ابن المستوفي)ی كورت كردووەتەوە[٢].

لە بواری ئەدەب و زمانیشدا، (أبو البركات) كتێبی (النظام في شرح شعر المتنبي وأبي تمام)ی بە دە جڵد داناوە، هەروەها كتێبی (اثبات المحصل في نسبة أبيات المفصل)[٣] بە دوو جڵد داناوە، باسی ئەو بەیتانەی تێدا دەكات كە (الزمخشری)[٤] لە كتێبی (المفصل في النحو)ەكەی خۆیدا بە بەڵگە و سەرچاوەی داناون. (ابن المستوفي) كتێبێكی دیكەی بەناوی (سر الصنیعة) و كتێبێكی تریشی بەناوی (أباقماش) داناوە، گەلێ قسەی شۆخی و گاڵتە و گەپ و ئەدەبی تێدا كۆ كردووەتەوە[٥]. زیاتریش لەم

(١) عبدالرزاق الحصان، نظرة عابرة في شمال العراق، ١٩٤٠ ص ٥٨. بە قسەكانی (الحصان)دا دەردەكەوێت كە ئەم كتێبەی (ابن المستوفي)ی نەدیوە. ئەو، پێدەچێ، بەڕاستی ناونیشانی كتێبەكەی هەڵدابێ، بەڵام خەیاڵ و خەملە، نەیدیوە.

(٢) السخاوی، الاعلان بالتوبيخ، ص ١٢١.

(٣) (قطلوبغا) دەڵێت: (الحسن بن محمد بن الحسن بن حیدر) كە لە ساڵی (٦٥٠ك/١٢٥٠ز) لە بەغدا مردووە كتێبی (شرح ابيات المفصل)ی هەبووە، بنۆڕە: (تاج التراجم في طبقات الحنفية) ص ٢٤.

(٤)الزمخشری: (ابو القاسم محمود بن عمر بن محمد بن عمر الخوارزمي)یە، كەڵە زمانەوان و ڕێزمانزانی سەردەمی خۆیەتی، كتێبی (الكشاف) و (المحاجات في المسائل النحوية) و(الفائق) و (أساس البلاغة) و (المفصل في النحو) و دەیەها كتێبی دیكەشی داناوە (ت ٥٣٨ك/١١٤٤ز)، بنۆڕە: (وفيات الاعيان ٢٥٤/٤، ط ١٩٤٨).

(٥) ابن خلكان ٢٩٤/٣. اليافعي، مرآة الجنان ٩٥/٤ — ٩٦. ابن أبي عذيبة، انسان العيون ٣١٠. السيوطي، بغية الوعاة ٢٧٢/٢. ابن العماد، شذرات الذهب ١٨٧/٥. الخوانساري، روضات الجنات، ص ٦٥٧. لە قاهیرەش، لە دار الكتب المصرية، دوو وێنەی دەستنووسی جزمی یەكەمی كتێبی: (النظام في شرح المتنبي وابي تمام) هەیە، كە لە شەرحی شیعرە دالییەكاندا كۆتایی دێت، ٣٨٦ لەوحەی تێدایە، بنۆڕە كتێبی (فهرست المخطوطات)، فؤاد سيد، مطبعة دار الكتب، القاهرة ١٩٦٢، ص ٦٩.

(٥) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ترجمة ابي البركات المبارك.

کتێبانەی، قوتابیەکەی ناوی چەند کتێبێکی دیکەش دەڵێت کە داینـاون وەك: (الممتـع المزمن) و کتێبی (الخیـل) و، (جـامع الاوراق) و (قناعـة النـاصر وکفایـة المحاضـر) کـە پڕن لە شیعری جوانی هەڵبژاردە، هەروەها کتێبی (مشارق الأنوار ومطالع العـذار) [١]. جگـە لـەم کتێبانـە، دیـوانێکی شیعریـشی هەیـە، شـیعری جـوانی تێدایـە[٢]. ئـەم دوو بەیتە: بە نموونە:

| | |
|---|---|
| یارب قد عظمت جنایة عینه | وعتـا بمـا أبداه مـن أنواره |
| فاشف السقام المستكن بطرفـه | واستر محاسن وجهه بعذاره |

واتا:

| | |
|---|---|
| تیری غـەمزەی بێژە هەند کاریگـەرە | خەنجەرە، تیغە، چـەقۆیـە، نـەشتـەرە |
| دەردە دارە، خوایە چاری کەی، بەسە | جوانی چی؟ دایپۆشە ڕووی ئەم بێفەڕە |

کاتێکیش شارانگەڕی بەناوبانگ (یاقوت الحموي) هاتە هەولێر، چەند چامەیەکی بە دەستی خۆی بۆ نووسی، ئەمەی خوارەوەش یەك لەو چامانەیە کە (یاقوت) باسـی دەکات:

| | |
|---|---|
| تذكّرنيك الريح مـرّت عليلةً | على الروض مطلولا وقد وضح الفجرُ |
| وما بعدت دار، ولاشط منزلُ | إذا نحـن أدنتنا الأمـانـــي والذكر[٣] |

واتا:

دەمە دەمی بەیانی بوو سـرەوەی شـەماڵی خۆشمروور
بەســـەر مێــرگ و مێرغــوزارا هێنـــای لـــە دوور

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ترجمة ابي البركات المبارك.

(٢) المنذري، التكملة، بالرونيو، ١٦٢٨/٨. ابـن خلكـان، ٢٩٤/٣، ط ١٩٤٨. الـذهبي، العـبر، ١٥٦/٥. ابـن أبـي عذيبة، انسان العيون، ٣١٠.

(٣) ياقوت، معجم البلدان، ١/ ١٣٨.

شـــنەی تـــەڕ و، پـــڕ ئـــاونگ و بـــۆنی چـــنوور
دوو دڵ یـــــەك بـــــن، بـــــێ منـــــەت بـــــن
نـــــەماڵ دووره، نـــــە مەنزڵگـــــە بـــــێ ســـــنووره
رێ تەختانـــــــــە، بـــــــــێ خـــــــــوار و ژوور
ئاســـــــانە، رێگـــــــای بـــــــێ قـــــــسوور.

هەروا ئەم شیعره ناسکەش، نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

| | |
|---|---|
| ومعانقي حلو الشمائل أهيَفٌ | جمعت ملاحة كل شيء فيه |
| يختال معتدلاً فان عبث الصبا | بقوامه متعرضاً يثنيه |
| نشوان تهجم بي عليه صبابتي | ويردني ورعي فاستحييه |
| علقت يدي بعذاره و بخده | هذا أقبله وذا أجنيه |
| لو لم تخالط زفرتي أنفاسه | كانت تنم بنا إلى واشيه |
| حسَدَ الصباح الليل لما ضمنا | غيضاً ففرق بيننا داعيه[1] |

واتا:

لـــــە ئـــــامێزه، روحـــــی ســـــووکە، قـــــەد باریکـــــە
ســـــیمای زێبایـــــە، بـــــەبێ ئـــــەو، رۆژی رووونـــــاکم تاریکـــــە
باڵا بەرزه، قیت و قنجە، بێ منەتە، کاتێ دێ و دەچی بە لەنجە لەسەر پەنجە
کـــــە دەیبینـــــم کەللـــــەم مەســـــتە، ئـــــاورم بـــــەردەبی لـــــە جەســـــتە
بـــــەڵام شـــــەرم و تەقیـــــە و حـــــەیا، کـــــەم فرســـــەتن
بـــــێ مـــــرومەتن. وەکـــــو شمـــــری شـــــووم نەگبـــــەتن... هتـــــد

چنگم گیرکرد، هەم لە قژی، هەم لە کوڵمی، ئەمم ماچ کرد، ئەوم رنی، هەناسەمان تێکەڵ نەبا، تا بەیانی، هەموو عالەم پێی دەزانی بەیانی هات،

(١) ابن خلكان، ٢٩٥/٣.

لەداخی شەو، هەردووکمان دابڕاین لەخەو.

کەسانێ کە باسوخواسی (ابن المستوفي)یان نووسیوە، هەموویان تەکەز لەسەر توانستی ئەدەبی و پێگەی زانستیی دەکەن، المنذري ـ کە خۆی، ئیجازەی حەدیسدادانی لێ وەرگرتووە ـ دەڵێت: پیاوێکی چاك و زۆر لەبەر و، خۆشگوفتار و خەتخۆش بووە، ماڵەکەشی ببوو بە کۆڕی پیاو چاکان و غەریبان، (بە شێخی بەڕێزی کوڕی شێخی بەڕێز) ناوی دەبات[1]. (ابن خلکان)یش باسی ئاکار و، سەروسەختی لەگەڵ ئەدەب و ئەدیباندا دەکات و دەڵێت: سەرۆکێکی زۆر بە قەدر و بەحورمەت بوو، زۆر خاکەڕا بوو (متواضع)، چاوتێر و خواردەبوو، نانبدە بوو، هەر پیاو چاك و زانایەك بگەیشتابایە هەولێر، زوو سەری لێ دەداو، هەرچی شایانی بوایە، بۆی دەبرد، هەرچی حەزی لێبایە بۆی ئامادە دەکرد، بە تایبەتیش بۆ ئەدەبدۆستان، چونکە ئەدەبدۆستان لە لای ئەو بەبرەو بوون[2]. دەربارەی کلتوور و رۆشنبیریی ئەم ئەدیبە (ابن خلکان) دەڵێت: فەزڵ و چاکەی زۆر و پڕی هەبوو، چەندین هونەری دەزانی، وەکو، حەدیس و زانستەکانی حەدیس و، مامۆستایانی حەدیس و، ناوەکانیان و، هەرچی پێوەندیی بە حەدیسەوە هەبوو، ئەو، دەیزانی، بگرە، بۆخۆی ئیمامی حەدیس بوو. سەرباری ئەوەش لە هەموو هونەرەکانی ئەدەب و زمان و زانستی عەرووز و، بەیان و شیعریشدا بەهرەمەند بووە[3]. هەرچی (یاقوت الحموي) هاوزەمەنێتی کە سەری داوە لە هەولێر و، چاوی بەو ئەدیبە کەوتووە، ئەوە، ئەو دەڵێت: ئەدیبێکی راستەقینەو لە ئەدەبدا قووڵبین بووە، ئەدەبدۆستانی خۆشویستووە و، ئەوانی لەبەرتر راگرتووە و، حەدیسی زۆری لە

(١) المنذري، التكملة، ط بالرونيو ١٦٢٨/٨. الذهبي، العبر، ١٥٥/٥.

(٢) ابن خلكان ٢٩٤/٣. اليافعي، مرآة الجنان ٩٦/٤.

ابن أبي عذيبة، مخطوط (انسان العيون)، ٣١٠.

(٣) ن. م. ص.

میوانانی هەولێر بیستووە[١].

(ابن المستوفي) گەلێ، لە مامۆستایانی حەدیس و ئەدەب و رێزمان دەرسیان داداوە، یەك لە مامۆستاكانی (شێخ): (أبو عبدالله موفق الدین محمد بن یوسف البحراني الأربیلي) بووە كە لە ساڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ز)دا مردووە[٢]. لەم شێخەوە فێری ئەدەب و شیعر بووە. (ابو الحرم مكي ابن ریان بن شبە بن صالح الماكسینی) كە ئەدیب و رێزمانزانێكی ناودار و ناسراو بووە و لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٧ز)دا مردووە، ئەوە، ئەو لە موسل[٣]. دەرسی پێگوتووە. یەكێكی تر، لەو شێخانەی دەرسیان داداوە: (أبو حفص موفق الدین عمر أبن بكر محمد بن معمر البغدادي الدارقزی)ی[٤] حەدیسزان بووە كە لە ساڵی (٦٠٧ك/١٢١٠ز)دا لە بەغدا مردووە. ئەم (أبو حفص)ە سەری لە وڵاتی شام و جزیرە و هەولێریش دابوو. هەروەها (الفرضي محمد بن محمد بن أبي حنیفة البغدادي)یش مامۆستای بووە. (الصفدي) دەڵێت: (أبن المستوفي) بە دەسخەتی خۆی نووسیویە كە ئەم (الفرضي البغدادیە) ئەدەبی فێركردووە، ئەم پیاوە شاعیریش بووە، ماوەیەك لە هەولێر ماوەتەوە، پاشان چووە بۆ شاری ئەسكەندەرییە لە میسر و، لەوێ، لەناو كەشتییەكدا لە ساڵی (٦٠٢ك/١٢٠٥ز)دا[٥] بن ئاو كەوتووە و مردووە.

بێجگە لەوانەی باسمان كردن، (ابن المستوفي) شێخی دیكەشی هەبوون[٦].

(ابن المستوفي) لە سەردەمی ئەتابەگیاندا وەزارەتی هەولێری گرتووەتە دەست[٧]

---

(١) یاقوت الحموي، معجم البلدان ١٣٨/١.

(٢) المنذري، التكملة، بالرونیو، ١٦٢٨/٨. ابن خلكان ١٠٢/٤.

(٣) ابن خلكان ٣٩٥/٤.

(٤) (دار القز): گەڕەكێكە لە بەغدا، ابن خلكان ١٢٤/٣.

(٥) الصفدي، الوافي جـ ١، ص ١٤٣ — ١٤٤. باسی ژیانی لە: مخطوط (عقود الجمان)، جڵدی (٦) بە سەردێری ژیانی (محمد بن محمد بن ابي حنیفە) هەیە.

(٦) المنذري، التكملة ١٦٢٨/٨.

(٧) سەیری بابەتی وەزارەت بكە.

بەڵام دوای ئەوەی کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە ساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٣ز)دا کۆچی دوایی کرد، ئەویش وازی لە وەزارەت هێناو، دەستی لەسیاسەتیش بەردا. کاتێکیش دوای مردنی سەرداری هەولێر، لەشکری (المستنصر) هەولێری داگیر کرد و، میر (شمس الدین باتگین بن عبدالله الرومي) حوکمی هەولێری گرتە دەست، ئەم، دەستبەجێ ناردی لە دووی (ابن المستوفي) و داوای لێ کرد تێهەڵبچێتەوە و وەزارەتی هەولێر بگرێتەوە دەست و، بشبێت بە جێگری خۆی لە کاروباری دیواندا و مووچەیەکی گەورەشی بۆ ببڕێتەوە، بەڵام (ابن المستوفي) ـ بە قسەی ابن الشعار ـ تووڕە بوو، داواکەی قبوڵ نەکرد، بە بیانووی ئەوەی کە توانای ئیشی نەماوە و، پیربووە و[1]، دەیەوێت لە ماڵ دەرنەچێ و بحەوێتەوە.

کاتێکیش، مەگۆلان لە ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٧ز)دا کەوتنە تاڵان و چەپاوڵی هەولێر (ابن المستوفي) لەگەڵ یاخیبوانی دیکەدا، لە قەڵا خۆی قایم کردبوو، کە دۆخەکەش هێور بووەوە و، ترسەکە رەوییەوە، (بدرالدين لؤلؤ)ی سەرداری موسڵ، حوشترو هێستری بۆ نارد کە ماڵەکەی بار بکات بچێت بۆ لای، بەم جۆرە، (ابن المستوفي) هەولێری بەجێ هێشت و بەرەو موسڵ کەوتەڕێ، لە موسڵ (بدرالدين لؤلؤ) پێشوازییەکی گەرمی کرد و رێزو حورمەتی لێ ناو، لە خانوویەکدا باری خست و دابەزی کە تایبەت بۆ ئەو[2] ئامادە کرابوو. (ابن المستوفي) باقیمەنی ژیانی لە موسڵ بەسەربرد و، لە ساڵی (٦٣٧ك/١٢٣٩ز)دا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (السابلة) لە دەرەوەی دەروازەی (الجصاصة) بە خاکیان سپارد[3]

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان جـ ٦ (کورتە باسی – أبي البركات المبارك-)

(٢) م. ن.

(٣) ابن خلكان ٢٩٨/٢، ط ١٩٤٨.

(باب الجصاصين): دەروازەی سنجاریشی پێدەڵێن، کۆنترین دەروازەی شوورەی موسڵە، دەکەوێتە رۆژاوای شارەکە: (سوادي عبد محمد الرويشدي، إمارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ص ٢٧٢.

## سێ: بنەماڵەی (إبن منعە):

لە ماڵباتە زانستدۆستە ناسراوەکانی تری هەولێر بنەماڵەی (ابن منعة)یە، کە ناوبانگیان لە زانست و وانە گوتنەوەدا، نەك تەنیا لە هەولێر ـ کە شاری خۆیانە ـ و نەك تەنیا لە موسڵیش کە بنەو بنکەی خۆیان بووە، بەڵکو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا دەنگی دابووەوە. بەڵام ئەم ناوبانگە، وەختێ دەنگی دایەوە کە بنەماڵەکە لە هەولێر دەرچوون و بە جێیان هێشت، لەبەر ئەوە، بە کورتی ئاماژەیان پێدەدەین، تەنیاش ئەو لایەنەیان نەبێت کە پێوەندیی بە مێژووی کلتووری هەولێرەوە هەبووە.

یەکەم ناوداری ئەم ماڵباتە: (رضي الدين يونس بن محمد بن منعة بن سعد ابن عاصم الأربيلي)یە، کە ئەکا، باوکی هەردوو شێخی گەورە: (أبي حامد عمادالدين محمد) و (أبو الفتح كمال الدين موسى). (رضي الدين يونس) لە ساڵی (٥٠٨ك/١١١٤ز)دا لە هەولێر لەدایك بووە و، هەر لە هەولێریش پەروەردە و گەورە بووە، پاشان چووەتە موسڵ و ئنجا بەغداو، لەوێ لە قوتابخانەی (النظامية) دەرسی داوە و، دوایی دیسان گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ و، هەر لە هەمان مزگەوتدا کە پاشان بە ناوی خۆیەوە دەناسرا، وانە گوتنەوەی پێ سپێردرا و، لە لایەن (زين الدين علی كچك)ی بریکاری ئەتابەگی موسڵ و (دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی هەولێر) ڕێزو حورمەتی زۆری لێ گیرا. ئیدی لەسەر ئەرك و فرمانی خۆی بەردەوام بوو، تا لە ساڵی (٥٧٦ك ـ ١١٨٠ز)دا کۆچی دوایی کرد[١].

بەڵام دوو کوڕەکەی، ئەوە، گەورەکەیان: (أبو حامد عمادالدين محمد) لە ساڵی (٥٣٥ك/١١٤٠ز)دا، لە قەڵای هەولێر، لەناو خانوویەکی بچووکدا لەدایك بووە. بەڵام ئەمیش وەکو باوکی و وەکو زۆربەی ماڵباتی (ابن منعة) تا لە هەولێر دەرنەچوو، دەنگی نەدایەوە و، تا نەبوو بە گەورە شەرعزانی زەمانی خۆی کەس پێی نەزانی.

---

(١) ابن خلكان ٢٥٢/٦. الاسنوبي، طبقات الشافعية ٥٦٩/٢.

(إبن خلكان) دەڵێت: (عمادالدين محمد) ئیمامی مەزهەبزان و ئوصول و خلاف بووە. کتێبگەلێکی زۆری لە مەزهەبزانیدا داناوە، یەك لەوانە، کتێبی (المحيط في الجمع بين المهذب والوسيط)ە، هەروەها کتێبی (الوجيز)ەکەی (حامد محمد الغزالي)یشی (ت ٥٠٥ك/١١١١ز) شەرح کردووە و، لە (جدل و عقيدة وخلاف)یشدا کتێبی هەیەو، بوو، بە خوتبەخوێنی مزگەوتی (المجاهدي) لە موسڵ و لە مەدرەسەکانی (النورية و العزية و، الزينية و النفيسية و العلائية)ی موسڵدا دەرسی گوتووەتەوە، بووەتە قازیی موسڵ[1]. (إبن الاثير) دەڵێت: (ئەوانەی، لەگەڵ ـ عمادالدين محمد ـ لە موسڵدا ژیاون، دەزانن کە زانای وەك ئەو نەبووە و، سەرۆکایەتیی شافیعییەکانیش کەوتە دەست ئەو) [2] شێخ (عمادالدين محمد) پاشان گەڕایەوە بۆ هەولێر، بەڵام نازانین چەند لە هەولێر مایەوە و، بۆ چ ئەرك و فرمانێك هاتبووەوە. هەر هەندە دەزانین کە (ابن خلكان) دەڵێت: رۆژێکیان چووە ناو ئەو ماڵەی کە تێیدا لە قەڵا، لەدایك بووە و، بەم بەیتەی شوبهاند:

«بلادٌ بها نيطت عليَّ تمائمي واولُ ارض مسَّ جلدي ترابها» [3]

واتا: (وڵاتی خۆمە کە چاوەزاریان بە شان و باڵمدا هەڵواسی، یەکەم خاکیشە کە پێستی لەشم لێی کەوتبێ کاتێ لە داوێنی دایکمەوە کەوتوومەتە سەری).

پاشان گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ و، لەوێ لە ساڵی (٦٠٨ك/١٢١١ز)دا مردووە[4]. بەڵام

---

(١) ابن خلكان ٣٨٥/٣.

(٢) ابن الاثير، الكامل ١٢/ ٢٩٨. ابن خلكان ٣٨٦/٤.

(٣) ئەم بەیتە شیعرە، شیعری (رقاع بن قيس الاسدي)یە: إبن منظور، لسان العرب ٤١٨/٧.

(٤) ن. م. ص. کورتەی ژیانی ئەم شەرعناسە (مەلایە) لەم سەرچاوانەدا هاتووە: سبط إبن الجوزي، مرآة الزمان ٥٥٨/٨ — ٥٥٩. المنذري، التكملة ٣٦٨/٣. ابو شامة، ذيل الروضتين، ص ٨٠. الذهبي، العبر، ٢٨/٥. المختصر المحتاج اليه ١٦٢/١. إبن الوردي، تأريخ ابن الوردي ١٨٧/٢. الصفدي ٢٩٢/٥. إبن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات الشافعية، ورقة ٢١ — ٢٢).

کوڕی دووەمی شێخ (رضي الدين يونس) ئەوە، (أبو الفتح كمال الدين موسى)یە. ئەم (کمال الدينە) لە هەموو رۆڵەکانی بنەماڵەکە زیاتر دەنگی دایەوە، بنۆڕە: (قدري طوقان ٤٠٧) کە هزرمەندێك و زانایەکی بیرکاری و گەردوونە لە مێژووی ئیسلامدا، بەڵام ئەم مەسنەتەی لە دەرەوەی هەولێر پەیدا کردووە، لەبەر ئەوە، لەگەڵ ئەم شارەدا هیچ پێوەندییەکی راستەوخۆی کلتووریی نییە. ئەم لە موسڵ، لەساڵی (٥٥١ك/١١٥٦ز)دا لەدایك بووە، هەر لەم شارەشدا لە ساڵی (٦٣٩ك/١٢٤١ز)دا مردووە و لە گۆڕستانی بنەماڵەکەی خۆیدا، لای گۆڕی (غسان) لە دەرەوەی (دەروازەی عیراق) نێژراوە[1]. لە بارەی پێگە و جێگەی ئەم زانایەوە، ئەوەندەی بەسە کە (ابن أبي أصيبعة) دەڵێت: (کەڵە زانای زەمانی خۆی و سەردەستەی هەڵکەوتوانی هاوتەمەنانی خۆی بووە) [2]. ئەو زانستەی ئەم کۆی کردووەتەوە، کەس کۆی نەکردووەتەوە. دەشڵێن بیست و چوار زانست و هونەری بە باشی زانیوە و، (ابن خلكان) هەمووی، یەکەیەکە ژماردووە[3]. دیاریشە باوکی (ابن خلكان) لەگەڵ (كمال الدين موسى)دا دۆستایەتییەکی پتەویان لە نێواندا هەبووە[4]. ئەم مێژوونووسە زۆر جاران لە هەولێرەوە هاتووەتە لای بۆ موسڵ. (ابن خلكان) لە رەمەزانی ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا کە بە رێوە بوو بچێت بۆ حەڵەب دیسان لەگەڵیدا یەکیان گرتەوە، بەڵام دەرفەتی ئەوەی بۆ نەرەخسا، شتێك لە زانستەکەی وەربگرێت[5] لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بە پێشەنگی زانستی دەزانی و هەر خۆشی دەویست و رێزی لێ دەگرت، هەندەی بە دڵدا چووبوو، کە لە ساڵی (٦٥١ك/١٢٥٣ز)دا نۆبەرەیەکیان (البكر) بوو، بەناوی ئەوەوە

---

(١) ابن خلكان ٤٠١/٤.

(٢) ابن ابي اصيبعة، عيون الانباء في طبقات الاطباء جـ ٦، ف ٢ ص ٣٣٧. (القزويني)یش لە (آثار البلاد)ەکەیدا، هەر وەها دەڵێت: ص ٤٦٣.

(٣) إبن خلكان ٢٩٧/٤.

(٤) م. ن. ص، ٢٩٦.

(٥) م. ن. ص.

ناوی نا[١] (کمال الدین موسی). پێدەچێ (أبو الفضل شرف الدین موسی احمد)ی کوڕی (الشیخ کمال الدین موسی) لەڕووی مێژووی کلتوور و ڕۆشنبیریی هەولێرەوە، بەناوبانگترینی زانایانی ماڵباتی (إبن منعة)ی هەولێری بووبێت. ئەم لە هەولێر، لە قوتابخانەی (المظفرية)دا، بۆ گوتنەوەی وانەکان، جێگای شەرعزان (بهاءالدين محمد بن إبراهيم)ی باوکی (إبن خلكان)ی مێژوونووسی گرتەوە کە لە ساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز)دا مرد. (إبن خلكان)ی مێژوونووس کە هێشتا منداڵ بوو، لە وانەکانی مەلا (شرف الدين احمد)دا، ئامادە دەبوو، دەڵێت: کە، نەیبیستووە هیچ کەسێك وەکو ئەو مەلایە دەرس بڵێتەوە[٢]. تا ساڵی (٦١٦ك/١٢٢٠ز)یش، لە هەولێردا، هەر دەرسی دەگوتەوە، ئنجا چوو بۆ موسڵ، لەوێ ئەرکی وانە و دەرسیان، لە قوتابخانەی (القاهرية)دا پێ سپارد، تا لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز)دا کۆچی دوایی کرد.

(شرف الدين احمد) ئیمامێکی گەورە بوو، کتێبی (التنبيه في فروع الشافعية)ی شێخ (أبو اسحاق ابراهيم ابن علي الشيرازي) (ت ٤٧٦ك/١٠٨٣ز)ی شەرح کردووە. ئەم کتێبە گرنگترین کتێب بووە، تا ئەو کاتە، لە زانستی شەرعی شافعیدا نووسرابوو، کتێبێك بوو، زۆر بە برەو، هەمیشە لەناو زانایاندا دەستاودەس دەکراو

---

(١) وەك (ابن خلكان) ئەوەی لە کتێبەکەی خۆیدا، باس کردووە. بنۆڕە: (وفيات الأعيان) ط/بيروت ١٩٧٠ جـ ٥ ص ٣١٧. دەڵێن ئەم کوڕە: (كمال الدين موسى ابن خلكان) کە گەورە بوو، کتێبەکەی باوکی کورت کردەوە و ناوی نا (المختار من وفيات الاعيان) و لە ساڵی ٧١٧ك/١٣١٧ز)دا ئەویش – وەك (العسقلاني) لە کتێبی (الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة) ١٤٢/٥ ئاماژەی پێدەدا – کۆچی دوایی کردووە.

باسی کورتەی ژیانی شێخ (كمال الدين موسى ابن منعة) لەم سەرچاوانەدا ئاماژەی پێدراوە: (المنذري، التكملة ١٦٩٣/٨. الحوادث الجامعة ١٤٩. الذهبي، العبر، ١٦٣/٥. السبكي، طبقات الشافعية ١٥٨/٥ – ١٦٢. اليافعي، مرآة الجنان، ١٠١/٤ – ١٠٣. سەیری ئەو ژیاننامە دوور و درێژەشی بکە کە (قدری طوقان) لە (تراث العرب العلمي في الرياضيات والفلك)دا، ٣٤٤ – ٣٤٨، نووسیویەتی.

(٢) إبن خلكان ٩٠/١.

بەرنەدەکەوت[1]. (شرف الدين أحمد) لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا کە لە هەولێر مایەوە، دەستی کرد بە نووسینەوەی شرۆڤەی ئەم کتێبە. کتێبەکەی ئیمام (أبي حامد الغزالي)یشی، واتا کتێبی (إحياء علوم الدين)یشی لە دوو کورتکراوەی قەبارە جیاوازدا کورت کردەوە. (ابن خلكان) ئەم شەرعزانە بە (پیاو چاکی جیهان[2]) وەسف دەکات. وا دیارە سوودی کلتووریی زۆر بە خەڵکی هەولێر بەخشیوە.

زانایەکی دی کە جێگەی بەرچاوی لە مێژووی کلتووری هەولێردا هەبووبێت، (أبو العباس الخضر بن نصر بن عقيل بن نصر الأربيلي الفقيه الشافعي) بووە، لە ساڵی (٤٧٨ك/١٠٨٥ز)دا لە هەولێر لەدایك بووە[3]. گەورە بوو، هەولێری بەجێ هێشت و رووی لە بەغدا کرد، لەوێ لەلای (الكيا الهراسي) (ت ٥٠٤ك/١١١٠ز) [4] کەوتە دەرسخوێندن و، هەروەهاش لە لای (ابن الشاشي ت ٥٠٧ك/١١١٣ز) [5]. پاشان گەڕایەوە بۆ نیشتمانی خۆی و، خووی دایە وانە گوتنەوە. ئەوەبوو، (أبو منصور سرفتگين الزيني)ی بریکاری (زين الدين علي كجك) قوتابخانەکەی قەڵای لە ساڵی (٥٣٣ك/١١٣٨ز)دا بۆ بنیاد نا و، (أبو العباس الخضر) یەکەم کەس بوو کە دەرسی تێدا گوتەوە، (دەرسی مەزهەب و فەرزەکان و الخلاف)ی[6] دادەدا. لەبەر ئەوە پلەی لە

---

(١) حاجی خەلیفە، كشف الظنون ٤٨٩/١.

(٢) ابن خلكان ٩١/١. ئەم زاتانەش لە کتێبەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بە (شرف الدين) داوە: المنذري، التكملة ١٢٣٦/٦. الذهبي، العبر، ٨٨/٥. الصفدي، الوافي ٢٠٢/٨. اليافعي، مرآة الجنان ٥٠/٤ — ٥٢. السبكي، طبقات الشافعية الكبرى ١٧/٥. الأسنوى، طبقات الشافعية، ٥٧٢/٢ — ٥٧٣. ابن كثير، البداية والنهاية ١١١/١٣ — ١١٢.

(٣) إبن عساكر، التأريخ الكبير (تهذيب ابن عساكر) ١٦٦/٥.

إبن خلكان ١١/٢، ط ١٩٤٨.

(٤) إبن خلكان ٤٤٨/٢، ط ١٩٤٨.

(٥) ن. م. ٣٥٦/٣.

(٦) ابن عساكر، م. ن. ص.

ئەمارەتەکەدا دای لە بەرزی و، خەڵکێکی زۆری هەولێر و جێگایانی دیکەش سوودیان لێی بینی.

(أبو العباس الخضر) گەلێ کتێبی لەسەر تەفسیر و زانستی شەرع و بابەتی تر دانا، کتێبێکیشی هەبوو، بیست و شەش وتاری (خوتبەی) پێغەمبەری (د.خ) تێدا نووسیبوو کە لە سەرچاوە بەرز و راستەقینەکانەوە وەرگیرابوون. تا ماوەیەك هەولێری بەجێ هێشت و، لە دەرەوەی شاری دیمەشق، لە ئەشکەوتێکی چیای (الربوة)دا[1] خەڵوەی گرت و دابڕا، پاشان گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز)دا کۆچی دوایی کرد و، لە مەدرەسە کۆنەکەی خۆیدا، کە هەر بەناوی خۆیەوە ناونرابوو (مدرسة العقيلية). لە ژێر گومەزێکی بچووکدا، لە گۆڕەپانەکەی هەولێر بە خاکیان سپارد[2].

بە مردنی (أبو العباس الخضر)، (أبو القاسم عزالدين نصر ابن عقيل بن نصر)ی برازای لە گوتنەوەی وانەکاندا، جێگای گرتەوە، کە لە ژێر دەستی مامیدا دەرسی خوێندبوو. ئەم (عزالدين نصر)ە، چوو بۆ بەغدا و، لەوێ لە قوتابخانەی (النظامية)دا خوێندی، پاشان گەڕایەوە بۆ هەولێر و، دەستی کردەوە بە وانە گوتنەوە و، مایەوە تا دەوروبەری ساڵی (٦٠٢ك/١٢٠٥ز) [3]، ئیدی لەو ماوەیەدا موزەففەرەددین گۆکبوری، لێی نیگەران بوو، لە هەولێر دەری کرد و، ناچار چوو بۆ موسڵ، برادەرێکی شاعیری هەبوو بە ناوی (أبو الدر ياقوت الرومي - ت

---

(١) ابن خلكان ص. ن.

(٢) إبن خلكان ١١/٢. ئەم شەرعزانە، باسی کورتەی ژیانی، لەم سەرچاوانەدا هەیە: السبكي، طبقات الشافعية ٢١٨/٤. الأسنوي، طبقات الشافعية ١١٨/١. الصفدي، مخطوط الوافي بالوفيات ١٨/٨. ابن كثير، البداية والنهاية ٢٨٧/١٢.

(٣) ابن خلكان، وەها دەڵێت: بنۆڕە (وفيات الاعيان) ١١/٢، ط ١٩٤٨. بەڵام (الاسنوي) دەڵێت: تا دوای ساڵی (٦٠٠ك/١٢٠٣ز)یش، لە هەولێر، هەر بە فەتواو دەرسەوە خەریك بووە: بنۆڕە (طبقات الشافعية) ١٢١/١.

٦٢٢ك/١٢٢٥ز)[١] لە بەغداوە ئەم شیعرەی نووسی و بۆی نارد:

| | |
|---|---|
| ايا ابن عقيل لا تخف سطوة العدا | وإن ظهرت ما أضمرت من عنادها |
| واقصتكَ يوما عـــن بلادك فتية | رات فيك فضلاً لم يكن في بلادها |
| كذا عــادة الغربان تكره أن تـرى | بياض البزاة الشهب دون سوادها |

واتا:

| | |
|---|---|
| دوژمن باکینــەی لە دڵ دەربێنێ | مەترسە هەر خۆی شکست ئەهێنێ |
| ئەمڕۆ کە تۆیان لە وڵات دەرکرد | شەرەف هی تۆیە، نامەردییان کرد |
| قەلە ڕەش رقی لە سپی و گەشە | رقی لە پیاوی وەك تـۆ سەرکەشە |

مەبەستی لەوانەیە کە لە لای سەرداری هـەولێر بۆیـان تێـچاندووە و، دڵیـان لێـی ڕەش کردووە[٢].

کـاتێکیش (أبـو القاسـم) گەیـشتە موسـڵ، (نورالـدين أرسـلان شـاه)ی ئـەتا بـەگی موسڵ بەخێرهاتنی کـرد و، ئـەوەی بـاش بێـت بـۆی کـرد و پێداویـستی بـۆ فەراهـەم کرد[٣]. ئنجا لە هەوارگەی (ابن الشهرزوري) لە دەرەوەی شار دانیشت و لەوێ مایەوە، تا لەساڵی (٦١٩ك/١٢٢٢ز)دا گیانی سپارد[٤].

(ابو القاسم عزالدين نصر) کوڕێکی هەبوو بە ناوی (شرف الدين محمـد) لـە ژێـر دەستی خۆیدا دەیخوێند و، هەر لەخۆی دەرسی ئوسـوڵ و خـلاف و زانـستی شـەرعی وەرگرت و، لە لای مـەلا (عمادالـدين بـن يـونس بـن منعـة)ی نـاوبراویش ـ کـە ئـەکا، خاڵۆزای ـ دەیخوێند، هـەروەها، لـە لای (أبـو الحـرم مكـي ابـن ريـان الماكـسيني)یـش[٥]

---

(١) لە (وفيات الاعيان)یشدا، ژیاننامەی هەیە، ١٧٣/٥ — ١٧٧، ط ١٩٤٨.

(٢) إبن خلكان ١١/٢.

(٣) ن. م. ص: ١٢. الأسنوي ١٣١/١.

(٤) نفس المصدرين. لەم سەرچاوانەشدا، باسی هاتووە: السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ١٦٣/٥. ابـن العماد، شذرات الذهب ٨٦/٥.

(٥) إبن خلكان، ص. ن.

(ت ٦٠٣ك/١٢٠٦ز) دەرسی خوێندووە و، لە هۆنینەوەی شیعریشدا، نەخوازەڵا لە شیعری (الدوبيت) [1] (واتا لە چوارخشتەکیدا) دەستی باڵای هەبووە. لە جیاتی باوکیشی، کردیان بە مەلای (مدرسة العقيلية). پاشان، لە هەولێر باری کرد و، لە ئامەد گیرسایەوە و، پاش ماوەیەکیش چوو بۆ وڵاتی شام و، لەوێشەوە بۆ میسر. ئنجا گەڕایەوە بۆ هەولێر و، لەنێوان هەولێر و موسڵدا دەهات و دەچوو. وادیارە ئەم جۆرە ژیانەشی بەدڵ نەبووە، لەبەر ئەوە، هەستا، رووی لە دیمەشق کرد و، لەوێ لە لای سەرداری دیمەشق (الملك الأشرف الأيوبي موسى ابن الملك العادل) گیرسایەوە و، خووی دایە ژیانی سەربازی و، بەرگی سەربازیی پۆشی [2]. لە ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ز)دا کۆچی دوایی کرد و، لە گۆڕستانی سۆفییاندا بەخاکیان سپارد [3].

شێخ (أبو العباس احمد بن عثمان بن أبي علي بن مهدی الكوردی الزرزاری)یش یەکێك بوو لەو حەدیسخوانانەی لە هەولێردا کەوتنە بەرچاو. ئەم شێخە بە هەموو شارەکانی ئیسلامدا دەگەڕاو بە دووی حەدیسدا وێڵ بوو. چوو بۆ بەغدا، لەوێ، لە لای (أبو الفضل احمد بن طاهر الميهني) و، (أبي الكرم المبارك بن الحسن الشهرزوري) و مامۆستایانی دیکەدا، گوێی لە حەدیس را دەگرت. ئنجا، چوو بۆ (أصفهان) گوێی لە (أبو القسم هبة الله بن محمد بن حنة العدل) را دەگرت. لەوێشەوە، چوو بۆ شاری هەرات و، گوێی بۆ، حەدیسخوان (أبو الوقت عبدالاول بن عيسى بن شعيب الصوفي) شل دەکرد [4]. هەروەهاش، سەری لە خۆراسان و لە کرمانیش داوە [5]. ئنجا گەڕایەوە بۆ هەولێر و، دەستی کرد بە وتنەوەی حەدیس و،

---

(١) (الدوبيت) = دوو بەیتی – بە کوردیی خۆمان پێی دەڵێین (شیعری چوارینە - چوارخشتەکی).

(٢) ابن الشعار، عقود الجمان ١٤٣/٦.

(٣) ابن خلكان ١٢/٢.

(٤) ابن الدبيثي الواسطي (ت ٦٣٧ هـ/١٢٣٩ز) مخطوط ((التأريخ المذيل بە على تأريخ بغداد، لابي سعد السمعاني، نسخة مصورة بالفوتستات، مجلد ٢، ورقة (٦٠). المنذری، التكملة ٤٣٦/١.

(٥) ابن الدبيثي، م. ن. و.

چەند جارانیش هاتوچۆی موسڵی دەکرد. سەرەنجام لە هەولێر بە تەواوەتی گیرسایەوە و، لە ساڵی (٥٩١ك/١١٩٥ز)دا[1]، هەر لەم شارە، سەری نایەوە و، لە دەرەوەی شار، بەلای ڕۆژهەڵاتی شاردا بە خاك سپێردرا و، پاشان گەڵێ مردووی دیکەش لە دەوروبەری گۆڕەکەی نێژران و، بوو بە گۆڕستانێکی گەورە و، بە ناوی ئەم حەدیسخوانەوە ناونرا گۆڕستانی (الزاهد احمد الزرزاري). کاتێکیش، (ابن الدبيثي) سەری لە هەولێر دابوو، گوتی: (گوێم لێ بوو کۆمەڵێ لە خەڵکی هەولێر و موسڵ ستایش و باسی پیاوچاکییان دەکرد) [2].

حەدیسخوانێکی تر بە ناوی (أبو الفضل ألياس بن جامع بن علي الأربيلي) کە لە ساڵی (٥٥١ك/١١٥٦ز)دا لەدایك بووە، ئەویش حەدیسخوانێکی دیار و ناسراو بووە. کە تەمەنی لە بیست و یەك ساڵ ترازا، بۆ زیاتر فێربوونی حەدیس، هەولێری بەجێ هێشت و، ڕووی لە بەغدا کرد، لەوێ، لە (المدرسة النظامية) خۆی بۆ خوێندنی حەدیس و زانستی شەرع تەرخان کرد و[3]، گوێی لە حەدیسی زۆر دەگرت و، سوودی لەم زاتانە بینی: (فخر النساء شهدة بنت أحمد الأبرى (ت ٥٧٤ك/١١٧٨ز)و، (الأسعد بن يلدرك الجبريلى (ت ٥٧٤ك/١١٧٨ز) [4] و، (شافع بن صالح بن شافع بن حاتم الجبلي البغدادي) (ت ٥٧٥ك/١١٧٩ز)و[5]، (عبدالله بن محمد بن جرير بن أبي الحسن القريشي) (ت ٥٨٢ك/١١٨٦ز)و[6]، مامۆستایانی زۆری دیکەش[7]. تا بووە شەرعزانێکی

---

(١) هەمان دوو سەرچاوە و، دوو لاپەڕەکە.

(٢) ابن الدبيثي، ن. و.

(٣) ن. م ٢، ورقة (١٣٧). ابن الشعار، عقود الجمان، ترجمة ألياس بن جامع، جـ (١)، لە (ابن المستوفي)یەوە، وەرگیراوە.

المختصر المحتاج ٢٥١/١.

(٤) ابن الدبيثي، م. ن. و. المنذري، التكملة ٩٤/٣.

(٥) الذهبي، المختصر المحتاج ١٠٢/٢.

(٦) ن. م، ١٥٧/٢.

(٧) المنذري، التكملة ٩٥/٣.

حەدیسخوانی پڕ هیممەت و فرە نووس (كثير الكتابة) و فرەزان[1]. پاشان گەڕایەوە بۆ هەولێر و دەستی کرد بە وانە گوتنەوە و گێڕانەوەی حەدیس و دۆزینەوەی مەتەڵ و دانانی قسەی نەستەف (يخرج التخاريج) و، حەدیسێکی زۆری کۆکردەوە و، تەنیا هەر ئەویش بوو کە شەرتوشرووتی زۆری لەسەر دادەنا «واتا بەند و بەستی زۆری (ضوابط) بۆ دڵنیایی، لەسەر حەدیسەکان دادەنا» و، خەڵکێکی زۆری شارەکە و میوانانیش گوێیان لێی ڕادەگرت[2].

وادیارە ئەم شەرعزانە (مەلایە) هەوای زانینی مێژوویشی کەوتبووە سەر و، کتێبی لەسەر مێژوویش دادەنا و[3]، دەستی شیعریشی هەبوو، ئەوەتا، لە شیعرێکیدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ومستعذبَ التعذيبَ جوراً بصدّه | امالك في شــــرع المحبّة زاجرُ |
| هنيئاً لك القلب الذي قد وقفته | على ذكر ايامى وانت مســـافرُ |
| فلا فارق الحـزنُ المبرحُ خاطري | لبُعدك حتى يجمع الشملَ قادرُ |
| فــان متّ فالتسليمُ مني عليكم | يعاودكـم ما كبّر الله ذاكــرُ[4] |

واتا:

| | |
|---|---|
| بۆچی پێتخۆشە دەردی کاری کەی | شــــەرعی دڵداری، نادیاری کــــەی |
| دڵەی کۆڵەوار، تــۆ گیرۆدەت کرد | پڕ کەدەرت کرد، خۆت سەفەرت کرد |
| خـــەم و خەیاڵی ڕێگاکەی دووری | کوانێ دەلیلێ، بێنێ ســـەبـــووری؟ |
| کە مردم، ســـڵاو لە هەموو یاران | هەتا بانگی هەق مابێ وەك جـــاران |

---

(١) إبن الدبيثي، التأريخ المذيل: و. ن.

(٢) ن. م. و، ابن الساعي، الجامع المختصر ١٦٥/٩. ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ١ ترجمة الياس بن جامع المنذري، التكملة ٩٥/٣. الذهبي، المختصر المحتاج ٢٦٠/١. الاسنوي، طبقات الشافعية ١٢٦/١.

(٣) إبن كثير، م. ن. ص.

(٤) إبن الساعي، الجامع المختصر ١٦٥/٩. إبن كثير، م. ن. ص.

(ابـو الفـضل أليـاس) لـە سـاڵی (٦٠١ك/١٢٠٤ز)دا کۆچـی دوایـی کـرد و، لـە بەشـی ڕۆژهەڵاتی دەرەوەی[1] شار، لە نزیـك گۆڕسـتانی (الزاهـد احمـد الـزرزاری) بـە خاکیـان سپارد.

لە بواری شەرعزانی و ڕێزمانیشدا، باسی (أبو سعید محمد بن علي بن عبدالله بن احمد بن جابر الجاوانی[2] الأربلي الحلي) دەکەین:

(الـسیوطي) لـە کتێبـی (تـأريخ أربـل)ەکـەی (إبـن الـمستوفي)یـەوە، وەردەگرێـت و دەڵێـت: (أبـو سـعید) ئیمـامێکی زانـا بـوو لـە ڕێزمـان و شەرعیـشدا، کتێبـی زۆریـشی داناوە[3]. دوای ئەوەی لە ژێر دەستی (علي الحريـری)دا[4](مقامـات)ی خوێنـد، هەسـتا کتێبێکی بـەناوی (شـرح المقامـات)، دانـا. کتێبـی (الـذخيرة لأهـل البـصيرة) و، (البيـان لـشرح الكلمـات) و، (المنـتظم في سـلوك الأدوات)يـشی دانـا. لـەم کتێبـەی دوایینیانـدا، ئەوەی لـە ڕێزمانـدا، زەحمـەت و کێشەی مانـای تێـدا بێـت، هـەمووی بـاس کـردووە. کتێبی (عيون الشعر) و (الفرق بين الراء والغين)يشی داناوە[5].

(أبو سعید) ماوەیەکی زۆر لە هەولێر دادەنیشت، پاشان ڕووی کردە وڵاتی فارس، دیـسان دوای ماوەیــەك گەڕایــەوە بـۆ هــەولێر و، لــە ســاڵی (٥٦١ك/١١٦٥ز)دا، واتــا لــە سەردەمی حوکمی (مجاهدالـدين قايمـاز) لـە (خفتيـان) مـرد و، تەرمەکـەیان بـرد بـۆ

---

(١) إبن الدبيثي، التأريخ المذيل، و. ن. ابن الشعار، عقود الجمان، و. ن.

(٢) سەر بە ئێڵی کوردی جاوانییانـە، کـە شـاری (حلة)یـان کـردووە بـە نـشینەی خۆیـان. سـەیری وتارەکەی دکتۆر (مصطفى جواد) بکە، کە لە گۆڤاری (المجمع العلمي العراقي)دا بـە ناونیـشانی (جاوان القبيلة الكوردية المنسية) نووسیویەتی: مجلد ٤ جـ ١ ساڵی ١٩٥٦، ص ٨٤ — ١٢١.

(٣) السيوطي، بغية الوعاة ١/١٨٢.

(٤) (القاسم بن علي بن محمد بن عثمـان الحريـري البصری)یـە، خـاوەنی ئـەو مەقامانەیـە کـە بـە ناوی خۆیەوە بەناوبانگە (ت ٥١٦ك/١١٢٢ز). ابن خلكان ٣/٢٢٧ — ٢٣١.

(٥) الصفدي، الوافي ٤/١٥٥. الأسنوي، طبقات الشافعية ١/٣٦٧. الخوانساري، روضات الجنات ٥٠٤.

(البوازيج) و[1]، لەوێ ناشتیان. ئەم دوو بەیتەش، نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

دعاني من ملامكما دعاني
فداعي الحب للبلوى دعاني
أجاب له الفؤاد ونوم عيني
وسارا في الرفاق وودعاني[2]

واتا:

گلەو، داوایی و، بەلاو، بەدسازی
جەم بوون بە بۆنەی دڵ و دڵخوازی
سۆمای چاو و، دڵ، بەبێ جیاوازی
دووی یاران کەوتن دوای دۆعاخوازی

لەو سەردەمەدا، ئەدیبگەلێکی زۆر هاتنە کایەوە. هەندێکیان گەیشتنە پلەیەکی بەرز، بە تایبەتیش لە هۆنینەوەی شیعردا، بگرە، زۆریش لەوانەی لە بواری دیکەدا کاریان دەکرد، شیعریشیان دادەنا، کە ئەوەبوو باسی هەندێکیانمان کرد. لێرەشدا، باسی سەردەفتەرەکانی ئەو شاعیرانە دەکەین کە لە هەولێردا هەڵکەوتوون:

(أبو يحيى حسام الدين عيسى بن سنجر بن بهرام بن خمارتگين ابن طاشتكين الحاجري الأربلي) ئەگەر سەردەفتەری هەموو شاعیرەکانی هەولێر نەبووبێت، یەکێک بووە لە شاعیرە گەورەکان، بە تایبەتیش لە شیعری دڵداریدا، بەوە ناسرابوو کە شیعر و مەقامی مەووال و چوار خشتەکیی دەنووسی[3]. ئەم سێ جۆرە شیعرەش لە

---

(١) السيوطي، ص. ن.

البوازيج: شارۆچکەیەکی نزیك بە تکریتە، دەکەوێتە سەر ڕێژگەی زابی خواروو، لەوێ دەڕژێتە دیجلەوە، سەر بە موسڵە: (ياقوت الحموي) معجم البلدان ٥٠٣/١.

(٢) الصفدي، ص. ن.

(٣) الدوبيت: چوارینە (چوارخشتەکی): خۆی، دوو بەیتە، لەبەر ئەوە، فارسەکان (دوو بەیت)ی پێدەڵێن، بەڵام هەندێ کەس بە چوار (شطر) واتا بە چوار (نیوە بەیت)ی دەزانن. لەبەر ئەوە بە (چوارینە)یان ناو ناوە. بنۆڕە: براون (تأريخ الادب في ايران من الفردوسي الى الشيرازي) ص ٤٨. سەیری (نظرية الفن المتجدد)ەکەی (عزالدين الامين)یش، لاپەڕەی ١١ بکە.

دیوانەکەیدا هەیە[1]. (إبن خلكان) دەڵێت: (الحاجري) هەموو ئەم شێوە شیعرانەی وەها بە چاکیی زانیوە، وێنەی نەبووە. جگە لەوە، بە ئاهەنگی (کان وکان)یش واتا (هەبوو، نەبوو) [2] شیعری گوتووە. (إبن تغري بردي)یش دەڵێت (الحاجري) ئەدیبێکی قسە خۆش و ڕەوانبێژ بووە و، شیعرەکانیشی ناسك و هاوئاهەنگ بوونە[3]. بەڵام (کمال الدین ابن الشعار)ی هاوچاخی، دەڵێت: (الحاجري) شاعیرێکی ڕەسەن بووە و، شیعرەکانی تام و کامێکی خۆشی هەیە[4]. دوو دیوانی دیکەی بە ناوی (مسارح الغزلان الحاجرية) [5] و (نزهة الناظر وشرح الخاطر)یشی[6] هەیە. (إبن

---

(١) (إبن خلكان) کە باسی ئەم دیوانە دەکات، دەڵێت: دیوانێکی بە ناوبانگی شیعرە و، بە دەست خەڵکەوە، زۆر بەرچاو دەکەوێت: (وفيات الاعيان) ١٧٠/٣. بنۆڕە (النجوم الزاهرة) ٢٩٠/٦. لە کتێبخانەکەی مۆزەخانەی عیراق لە بەغدا، دانەیەك دیوانی بچووك هەیە، دیوانی ئەم شاعیرەیە، بەڵام بەرواری چاپکردنی لەسەر نەنووسراوە و، هەموو شیعرەکانیشی تێدا نییە و، کراوە بە حەوت دەروازە، (عمر بن محمد بن عمر الحسيني الدمشقي) شیعرەکانی کۆکردووەتەوە و لە چاپی داوە. (جرجي زيدان)یش دەڵێت: دیوانی (الحاجري) ساڵی (١٣٠٥ك/١٨٨٧ز) لە میسر لە چاپ دراوە، بنۆڕە: (تأريخ آداب اللغة العربية) ٢٥/٣. القس سليمان الصائغ، تأريخ الموصل ١٠٧/٢. (اسماعيل البغدادي)یش ئەم دیوانەی ناو ناوە ((بلبل الغرام الكاشف عن لثام الانسجام)). بنۆڕە: هدية العارفين ٨٠٩/١.

(٢) (کان وکان) وەك (هەبوو، نەبوو)ی کوردی، دیارە جۆرە شیعرێکی میللی بووە، لە سەرەتادا لە چیرۆك و خەیاڵکردی پڕو پوچدا هاتووە و، ناونراوە: (کان وکان) بنۆڕە: د. احسان عباس في (وفيات الاعيان) ط بيروت، جـ ٣، ص ٥٠١/الهامش

(٣)النجوم الزاهرة ٢٩٠/٦.

(٤) مخطوط (عقود الجمان) ٢٤٠/٥.

(٥) وەك (جرجي زيدان) لە (تأريخ آداب اللغة العربية) ٢٥/٣ گوتوویەتی. هەروەها دەڵێت: ئەم دیوانە، دەستنووسە و، ئێستا لە (المكتب الهندي)یە لە لەندەن. القس سليمان الصائغ، تأريخ الموصل ١٠٧/٢. خيرالدين الزركلي، الاعلام (قاموس تراجم) ط ٢، جـ ٥، ص ٢٨٧.

(٦) وەك (الزركلي) لە (الأعلام)دا، ن. ص، گوتوویەتی (دەستنووسە). (أحمد بن محمد ابن علي الأنصاري اليمني) لە کتێبی (حديقة الافراح)دا، هەندێ شیعری دیکەی باس کردووە، ئەو سەرچاوانە باسیان نەکردووە. بنۆڕە: ص ١٥٠ — ١٥٢.

خلکان) کە لە هەولێر بوو، بەر لەوەی هەولێر لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز)دا بەجێ بهێڵێ، دۆستایەتییەکی گەرمی لەگەڵ (الحاجري)دا هەبووە، دەڵێت: (هەڤاڵ و برادەرم بوو) [1]. بە بێ (هەڤاڵ و برادەریش) ناوی نابات و لە هەر جێگایەکدا ناوی هێنابێت، گوتوویەتی: (الحسام عیسی... الحاجریی برادەرم) [2]. گەلێکیشی لە شیعرەکانی باس کردووە، بە نموونە، ئەم بەیتانەی لەسەر دووریی یار داناوە:

| | |
|---|---|
| ولما التقينا ومرّ الزمان | رأى دمعَ عيني دماً في المآقي |
| فقال: وعهدي به لؤلؤاً | يجري عقيقاً وهذا التلاقي |
| فقلت: حبيبي لا تعجبن | جعلت فدى لك ميتاً وباقي |
| فتلك اوائل دمع الوداع | وهذا أواخر دمع الفراق [3] |

واتا:

فرمێسکی یەکەم وەك تەرزە پڕ بوو
بۆ، بوو بە یاقوت، تەرزە بزر بوو؟
وتی: سەرسامم، ئەوجا بۆ وابوو
کە دیتی چاوم، خوێنی تێزابوو
وتم: گیانەکەم، دۆش دامەمێنە
زیندوو، یان مردوو، روحم بستێنە.
یەکەم، بەرایی ماڵاواییە
دووەم، پاشماوەیماڵجودابیە.

---

(١) إبن خلكان ٣/١٦٩.

(٢) م. ن. ٦/٥٠.

(٣) إبن خلكان، ٦/٥٠.

(الحاجري) لە وەسفی (خاڵ)یشدا شیعری زۆرە، بە نموونە:

| | |
|---|---|
| يا برق هـــل ربّة الخالين ذاكرة | بعد البعــاد لنـــــا عهداً وميثاقا |
| وا وحشـــتـــاً لديار دون كاظمة | كـل الفضـاء لعين بعدهـم ضــاقـا |
| قالت: فتنت بنا وجداً. فقلت لها | كم قد فتنت _ رعاك الله _ عشاقا[1]؟ |

واتا:

| | |
|---|---|
| هەوری بانی سەر، دوو خاڵی گۆنای | بڵێی، پـەیمانی لا بـووبێ بـەخـەو |
| چەند چۆڵە دنیا، بێ هەوارگەی ئەو | ڕۆژی ڕووناكم لێ بـووە بـە شـەو |
| وتی: دووریی تۆ، خوێنی منی ڕشت | وتم، خۆت خۆش بی، چەند عاشقت كوشت؟ |

موزەففەرەددین گۆكبوری ئەم شاعیرەی گرت و لەزینـدانی هاویشت، نـازانین بۆچی، پێدەچێ لەبەر ئەوە بووبێ كە هەنـدێ شیعری لـە بـارەی نێربازییـەوە نووسیبوو، دیارە ئەو شاعیرە، بەوەش ناسراوبوو[٢]. ئەو ڕەفتارەش بە شیعرە قافییەكەیدا، دیارە، كە شەوێكیان لە مەنزڵگەكەی (إبن المستوفي)دا هەروا، لەبەر گوتبووی[٣]. نەخاسمە موزەففەرەددینیش. هەند خۆشیی بە شاعیران نە دەهات[٤]. دوای گرتنیشی، لە قەڵا سەختەكەی (خفتیان)ی هاویشت. كابرا، لە زینـدانیشدا كۆمەڵێ شیعری نووسی، زەهراوی سكاڵاو ئەشكەنجەی لێ دەچۆڕا، لە شیعرێكیش لەو شیعرانەی، ئەم بەیتانە، بە نموونە، دەنووسین:

قيدٌ أكابدهُ وسجن ضيّق
ياربّ شاب من الهموم المفرق

---

(١) ديوان الحاجري، ص ٢٢. ئەو بەیتانەش لە وەسفی (خاڵ) لە كتێبی (بهاءالدین علي ابو الحسن الاربلی) بە ناونیشانی (رسالة الطيف)دا ببینیت. ل: ٦٦.

(٢) جرجي زيدان، تأريخ آداب اللغة العربية ٢٥/٣.

(٣) اليونيني، ذيل مرآة الزمان ١١٣/١. ئەوەبوو، باسی ئەم بەیتانەمان كرد.

(٤) ابن خلكان ٢٧٦/٣.

يا برق إن جئت الديار بأربل
وعلا عليك من التداني رونقُ
بلّغ تحيةَ نازحٍ حسراته
أبداً بأذيال الصبا تتعلقُ[1]

واتا:

مەچەك لە دارم، زيندانم تەنگە
لا جانگ سپی بوو لەم شەوەزەنگە
هەورەکەی هەولێر، هەوری بانی سەر
هەوری بلووری و سپیی بێ کەدەر
بیبە سڵاو و، حەسرەتی دووری
بڵێ، نەیماوە شەرم و حوزووری

جگە لەوانە، شیعری زۆری دیکەشی هەیە.

کابرا، ماوەیەك لەو بەندیخانەیە مایەوە. پاشان، موزەففەرەددین گۆکبۆری گواستییەوە بۆ بەندیخانەی قەڵای هەولێر، دوای ماوەیەکی کەم ئازادی کرد و، بەرە بەرە لەخۆی نزیك کردەوە، مەلای شاعیریش، وەك نە بای دیبێ و نە باران، بەرگی دەروێشیی پۆشی و[2]، ریشی لێ بەردایەوە، گوایا، رووی کردووەتە خواو، بەتەمایە، سەرداری هەولێر، لێی رازی بێت. چونکە موزەففەرەددین هەوای سۆفیایەتی لە کەللەی گەرم بوو[3]. پێدەچێ گۆڕینی جلوبەرگ لەو سەردەمەدا، بگرە تا ئەمڕۆش، کەم و زۆر بۆ خۆڵ لەچاو کردن و، گوزەرانی باشتر بووبێت. بەهەر حاڵ، بەم بەرگە نوێیەوە، سەر و سەختی دۆستانەی لەگەڵ تەلار و قەڵەمڕەوی سەرداری هەولێردا پتەو کرد و، هەند هۆگری بوو، کە ئیدی دوای مردنی موزەففەرەددین گۆکبۆری

---

(١) ديوان الحاجري، ص ٧١. شذرات الذهب ١٥٧/٥.
(٢) ابن خلكان ١٧٠/٣.
(٣) م. ن، ٢٧٦،٣/٣ص

نەیتوانی لە شارەکەدا بمێنێتەوە، ناچار، هەولێری بەجێ هێشت، بەڵام هەندەی نەبرد، هەولێر کەوتە ژێر حوکمی خەلیفەی بەغدا و، (الأمير شمس الدين أبو الفضائل باتكين)، بە بریکاری خەلیفە، لەسەر هەولێر دانراو، مەلای شاعیریش گەڕایەوە بۆ هەولێر!![1].

وەلێ (الحاجري) زۆر نەژیا، کابرایەکی نادیار، شەوێك لە شەوان، هەڵمەتی بۆ برد و، وەبەر چەقۆی دا، بەڵام بەر لەوەی بمرێ، کە هێشتا لە سەرەمەرگدا بوو، دوا شیعری نووسی و ناردی بۆ (الأمير باتكين) و، ئەمەش چەند بەیتێکە لەو شیعرە:

| | |
|---|---|
| اشـــكوك يا ملك البسيطة حالةً | لم تبق رعباً فــيّ عضوا ساكنا |
| إن تستبح ابلي لقيطة معشــــر | ممن أؤمل غير حاشـك مازنا[2] |
| ومن العجائب كيف يمشي خائفا[3] | مَن كان في حرم الخلافة آمنا[4] |

واتا:

پاشــای زەمانـــە، مـــن شـــکاتم هـــەس
بڕیـــا، پـــەلوپۆم، کـــەس پێمـــا نـــەڕەس
ناکەســـان، بێـــت و، ریـــشەکێش نەکـــەی

(١) ابن خلكان ١٧١/٣.

(٢) ئاماژە بەم بەیتە شیعرە دەدات:

((لو كنت من مازن لم تستبح إبلي          بنو اللقيطة من ذهل بن شيبانا)).

(٣) لە بەیتی سێیەمی عەرەبییەکەدا دەڵێ: (كيف يمشي خائفا) مەبەستی لەوەیە، بڵێ: (حوکم ئێستا حوکمی خەلیفەیە، چۆن دەبێ خەڵك بەترسەوە بەڕێگای خۆیاندا بڕۆن؟ بەڵام لە چاپی (١٩٧٠)ی (وفيات الاعيان) لە جیاتی (يمشي) نووسراوە (يمسى) لەم بارەدا دەبێت بە (چۆن دەبێ خەڵك بەشەو دڵنیانەبن؟ بەڵام شیعرە کوردییەکە (زرە شیعرە) هەر هەندەمان بۆ هاتووەتەوە. ببوورن "وەرگێڕ"

(٤) ابن خلكان ١٧١/٣. بەڵام لە (عقود الجمان)دا فەرقی هەیە، چونکە (ابن الشعار): (كيف يمشي)ی کردووە بە: (كيف يصبح) واتا (بەڕۆژ)، بەهەرحاڵ لە مەبەستی شیعرەکە ناگۆڕێت.

نــە (مــازن) نەکــەس ناهێنــێ نەفــەس
ســـایەی خەلیفـــەش کـــەس نـــەپارێزێ
هــیچ کەســێ بــڕوای نامێنــێ بەکــەس

کوشتنی ئەم شاعیرە، لە شەووالی ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٥ز)دا رووی دا. (الحاجري) لە گۆڕستانی مەیداندا[١] نێژرا، تەمەنیشی نەگەیشتبووە پەنجا[٢].

(الحاجري) بە رەسەن هەولێرییە و لە هەولێر لەدایك بووە هەر لە هەولێریش پەروەردە بووە[٣]. بنەماڵەکەشی ماوەیەکی دوور و درێژ بوو هەر لەم شارە نیشتەجێ بوون. (ابن خلكان) لەم سۆنگەیەوە کە لە (إبن المستوفي)ی دەگێڕێتەوە، دەڵێت ـ لە هەولێر گەڕەکێك هەیە پێی دەڵێن (قرية جبريل) [٤] گوایا بە ناوی (جبريل)ی[٥] باپیرەی (الحاجري)یەوە ناونرا بوو. هەرچی نازناوی (الحاجري)یە، ئەوە، دەچێتەوە سەر (حاجر) کە شارۆچکەیەکی بچووك بووە لە حیجاز و تەنیا کەلاوەکانی مایەوە، لەبەر ئەوەشە کە ئەم شاعیرە پێوەی دەنازێ و لە شیعرەکانیدا هەر دەیڵێ و دەیڵێتەوە، تا لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە و، بۆی بوو بە نازناو[٦].
ئەوەتا، خۆیشی لەم شیعرەیدا دەڵێت:

---

(١) مەبەست لەم گۆڕستانە، ئەوەی پشت (یانەی فەرمانبەرانی) ئێستایە، چونکە (ابن خلكان) دەڵێت: (مەیدانەکە کەوتبووە تەنیشت خانەقاکەی نزیك دەروازەی قەڵا: بنۆڕە: وفيات الاعيان ٢٧٤/٣.

(٢) إبن خلكان ١٧١/٣. (عبدالله الجبوري) مێژووی مردنی (الحاجری) بە هەڵە، کردووە بە (٦٣٤ك). سەیری (رسالة الطيف) جـ ١ ص ٦٦/الهامش، کە کتێبی (بهاءالدين علي بن عيسى الأربلی)یە و، (عبدالله الجبوری) تەحقیقی کردووە.

(٣) إبن خلكان ١٧٢/٣.

(٤) نەیگوتووە ئەم گەڕەکەی هەولێر، کام لای شار کەوتووە.

(٥) إبن خلكان، ص. ن.

(٦) م. ن. ص.

لوكنت كفيت من هواك البينا   مابات يحاكى دمع عيني عينا
لولاك لما ذكـــرت نجداً بفمي   من أينَ أنا وحاجر من أينا[١]

واتا:

رازی بـــام، بـــە دوور، گیـــانی بـــەگیانی
فرمێـــسكی چـــاوم نـــەدەبووە كـــانی
(نەجد)ی كاول بوو، لـەكوێ، مـن لـەكوێ؟
تـــۆ نـــەبای (حـــاجر) كـــێ پێـــی دەزانـــی

(أبو عبدالله موفق الدين محمد بن يوسف بن محمد بن قائد الأربيلى)ی شاعیر و بیرکار و رێزمانزانیش، زانایەكی ناسراوی هەولێرییە لە بواری هزری (ئەدەب و زانستدا). مێژوو نووسان بە زمانزان و شاعیرێكی شكۆداری دادەنێن، لە زانستی عەرووز و قافیەدا بێ وێنە بووە و، لە رەخنەی شیعردا زۆر وەستا بووە و، لە هەموو كەسێ باشتر شیعری چاكی لە خراپ جیا كردووەتەوە[٢]. دیوانێكی شیعری نایابی هەبووە و، نامەیەكی چاكیشی لە ئەدەبدا نووسیوە[٣]. لەوانەش، زیاتر، لە زانستی، زانا پێشینەكاندا كاری كردووە، بە نموونە، بە شیكردنەوەی (ئیقلیدس) و[٤] بەشێك لە (المجسطي)[٥] خۆی خەریك كردووە، (هەرچەندیشە ئەم زانستەی بەلاوە خۆش

---

(١) م. ن. ص. ژیاننامەی (الحاجري) لەم سەرچاوانەشدا هەیە: (إبن كثير، البداية والنهاية، ١٤٤/١٣، دەڵێت لە ساڵی (٦٣٢ك)دا مردووە). الغساني، العسجد المسبوك ٣٤٩. شمس الدين سامى، قاموس الاعلام (تركي) ١٩٠٤/٣.

(٢) إبن خلكان ١٠٢/٤. أبو الفداء، المختصر ٧٧/٣. السيوطي، بغية الوعاة ٢٨٦/١.

(٣) إبن خلكان، ص. ن.

(٤) پێشتر باسمان كردووە.

(٥) پێشتر باسمان كردووە.

نەبووە)[١]. ئەو، زۆرتر خۆی بۆ زانستی ڕێزمان تەرخان کردبوو، تا گەیشتە ئاواتی خۆی.

(ابن المستوفي)[٢] کە قوتابیی ئەو بووە: دەڵێت: لە زانستی ڕێزماندا. ببوو بە نیشانەیەکی بەرز، ئەو، خۆی لە لای ئەم شاعیرە فێری زانستی شیعر بووە[٣].

(ابن خلكان) دەڵێت: ڕێزمانزانی ناودار شێخ (أبو الحرم مكى الماكسيني) ئەگەر لە ڕێزماندا تووشی کێشەیەکی ئاڵۆز بباو سەری لێ دەرنەکردبا، دەیبردە لای (موفق الدين محمد)[٤] هەرچەندیشە ئەم ڕێزمانزانە هەولێرییە لەلای کەس ڕێزمانی نەخوێندبوو، بەڵکو هەر لەخۆیەوە هەموو گرێ کوێرەیەکی ئەم زانستەی بە زەین و زیرەکیی خۆی دەکردەوە[٥]. ئەوەبوو، (عمر بن محمد بن علي بن ابی نصر)ی ناسراو بە (ابن الشحنة)ی موسڵی (ت ٦٠٦ك/١٢٠٩ز) کە یەکێك بوو لە ڕێزمانزانە ناودارەکان، کاتێ، بۆ ماوەیەك هاتە هەولێر[٦]، لەگەڵ (موفق الدين محمد) ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی لە زانستی ڕێزماندا ئەنجام دا و، دانی پێدانا کە لەو زانستەدا دەستباڵایە[٧].

(موفق الدين محمد) ڕۆیشت بۆ شارەزوور و، ماوەیەك مایەوە، لە لای کابرایەکی کوێر بەناوی (رافع) وانەی ڕێزمانی دەخوێند، پاشان چوو بۆ دیمەشق و، لەوێ شیعرێکی بەسەر سەلاحەددینی ئەیوبیدا هەڵدا. پاشان بەنیازی خوێندن ڕووی لە

---

(١) السيوطي، م. ن. ص.

(٢) م. ن. ص. (لە – ابن المستوفي – وەرگیراوە).

(٣) ابن خلكان، ص. ن. ابن قاضي شهبة، مخطوط مصور (طبقات النحات واللغويين) ق ١، ورقة ١٣٣.

(٤) ابن خلكان. ص. ن.

(٥) السيوطي، ص. ن.

(٦) لەبارەی هاتنی ئەم ڕێزمانزانەوە بۆ هەولێر، بنۆڕە: السيوطي، بغية الوعاة، ٢٢٤/٢ (لە – ابن المستوفي وەرگیراوە).

(٧) م. ن. ٢٨٦/١.

بەغدا کرد، بەڵام کەسی بە شایان نەزانی بیکات بە مامۆستای خۆی و دەرسی لەلا بخوێنێ، لەبەر ئەوە هەر پارەیەکی کە پێی بوو لە فێربوونی عود لێداندا بەختی کرد و، زۆر زوو فێری بوو. لەبەر ئەوەش کە زاناو رەوشتبەرزیش بوو[1]، خەڵکێکی زۆر لە دەوری خڕبوونەوە و، هەڤاڵ و برادەری زۆری پەیدا کرد.

(موفق الدین محمد) لە وڵاتی بەحرەین لەدایك بووە، باوکی جاروبار سەری لەو وڵاتە دەدا و، بە خێزانەوە لەوێ دەمایەوە، چاوەڕێی دەکرد دوڕ، لە قووتخواردوانی[2](الغطاسین) بن دەریا بکرێت. پاشان هاتنە هەولێر و[3] لەم شارەدا چاوی کرایەوە و پەروەردە کرا.

ئەمانەی خوارەوەش، چەند بەیتێکن لە شیعرەکانی، کە بە شان و باڵی میر (زین الدین یوسف ینالتگین)ی سەرداری هەولێردا هەڵیداوە:

رب دار بالفضا طال بلاها　　عكف الركب عليها فبكاها

درست إلا بقايا أسطر　　سمح الدهر بها ثم محاها

كان لي فيها زمان وانقضى　　فسقى الله زماني وسقاها

كنت مشغوفا بكم إذ كنتم　　شجرا لايبلغ الطير ذراها[4]

واتا:

خانوو، لەو هەردە بەرەڵا مابێ

هەوارگەی چۆڵە، گریەم بۆ دێنێ

کاول بێ و، ریزێ دیواری مابێ

گەردوون، ئەو ریزەش لەبن دەردێنێ

---

(١) م. ن. ص.

(٢) ابن خلكان ١٠٣/٤. أبو الفداء، المختصر ٧٧/٣. السيوطي، ص. ن. ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات النحات واللغويين)، ورقة ١٣٣.

(٣) ابن خلكان والسيوطي، ص. ن.

(٤) لە (المختصر ٧٧/٣)ی (أبو الفداء): لە جیاتی هەرد و دەشت، نووسراوە (حما) واتا (داڵدە)

سـەر زەمانـێ بـوو، دڵ ئاسـوودە بـوو
ئاسـوودەیی، کـەی، بـۆ کـەس دەمێنـێ؟
بـە ئاواتـەوەم بێمـەوە لاتـان
تـا نوخـشەی بـاران، مـژدەم بـۆ دێنـێ

ئنجا دەڵێت:

ان زين الدين اولانى يدا لم تدع لي رغبة فيما سواها[1]

واتاکەی:

دەستی (زیـن الـدین) بـەخێر بمێنـێ
هەزار دەستی تـر، ژەنـگ هەڵدەهێنێ

لە شیعرێکی دیکەیدا، سەر هەڵدەبڕێ و چاوی بە مانگ دەکەوێ، بەسیمای (زین الدین)ی بەراورد دەکات و دەڵێت:

تقابلتما فاستجمع الحسن كله فمن نظر يرنو ومن نظر يغضي
هـلالان هـذا للظلام يزيله سـنان وهذا للمظالم في الارض[2]

واتا:

هـیلالی مـانگ و بـەدری شـێوەی تـۆ
ئـەویان شـەوق ئـەدا، ئـەمیان وەکو تـۆ
ئـەو تـاریکیی شـەو گـەش ئەکاتـەوە
ئـەم زوڵمـی زەمـین، رەش ئەکاتـەوە

(موفق الدين محمد)، ئیسقای گرت (تووشی سیل بوو). لە ساڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ز)دا،

---

(١) ابن خلكان ص. ن. أبو الفداء، ص. ن.

(٢) السيوطي م. ن. ص ٢٨٧.

لە هەولێر گیانی سپارد و، لە گۆڕستانی (البست)[1]، ناشتیان، کە کەس و کاریشی هەر لەوێ نێژرابوون.

شاعیرێکی دیکەی هەولێر (أبو العز شمس الدين يوسف بن نفيس بن ابي الفضل ابن السعود بن أبي الفضل بن أبي طاهر بن أبي يعلى)یە، کە بە (شەیتانی شام) ناسراوە. لە ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)دا لە هەولێر لەدایك بووە، هەر لە هەولێریش گەورە بووە و، بووە بە شاعیرێکی ئەوتۆ، هەر شیعرێکی ویستبا دەیتوانی بە هەوەسی خۆی بیهۆنێتەوە. لە سەرەتادا، کە دەستی پێکرد، شیعرەکانی لاواز و بێ خێر و پڕوپووچ بوون و، زۆرتر بۆ پێکەنین و گاڵتە و گەپ[2] دایدەنان، لەبەر ئەوە لەناو خەڵك، وەك شاعیرێکی بێ شەرم دەهاتە بەرچاو و، لەگەڵ کەسانی بێ پەرواو بێ ئابڕوودا هۆگر بوو. (شمس الدين) بەرگی سەربازیی دەپۆشی و، پرچی بەسەر شان و ملیدا بەردەدایەوە و، شمشێرێکی بە کەمەردا شۆڕ دەکردەوە و، سەڵتەی درێژی لەبەر دەکرد[3].

ئەم شاعیرە، هەولێری بەجێهێشت و، بە شاراندا دەگەڕاو، بە شان و باڵی شا و میرانیدا هەڵدەدا، خەڵاتی لێیان وەردەگرت، پاشان لە موسڵ گیرسایەوە و لەناو خەڵکی موسڵدا دەنگی دایەوە، تا گەیشتە (بدرالدين لؤلؤ) و لە کۆڕی خواردنەوە و شەرابیدا بەشدار دەبوو[4].

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعری شەراب و دڵداریی ئەم شاعیرە:

وربّ حانـة خمّار حلفت بها      ألا عكفت على جــــام ولا كاس

---

(١) ابن خلكان ١٠٤/٤. تەرجەمەی ژیانی (موفق الدين محمد)، لەم سەرچاوانەشدا هەیە: الصفدي ٢٥١/٥. ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٢٢٣ — ٢٢٦. ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ٢٨٤/٤.

(٢) ابن الشعار، عقود الجمان ٢٦٤/١٠ (أ).

(٣) م. ن. ورقة ٢٦٥ (أ).

(٤) م. ن. ورقة ٢٦٤ (أ).

حتى يقوم لنا ساق لواحظه مرضى، وفي خدّه سطر من الآسى[1]

واتا:

مـن لـە مەیخانـە، شـەرتم کـردووە
کاس ناخۆمـەوە گەر بـە جام نـەبێ
لـە کەسـم نـاوێ خـان و مـان نـەبێ
نیـشانەی گـازێ لـە گۆنـای نـەبێ

(بن خلكان) هەندێ شیعری ئەم شاعیرەی باس کردووە کە بۆ مەرگی (المبارك ابـن المستوفي)[2] دەلاوێتـەوە. (ابـن الـشعار الموصـلي)یـش گـەلێك لـە شـیعرەکانی هێناوەتەوە، ئەو شیعرەشی تێدایە کە بە شان و باڵی سوپاسالاری هەولێر (أبـو شـجاع رکن الدین احمد بن قرطایا بن عبدالله الأربلي)دا هەڵدەڵێ[3].

ئـەم شـاعیرە لـە سـاڵی (٦٣٨ك/١٢٤٠ز)دا، لـە موسـڵ مـرد و، لـە گۆڕسـتانی (الجصاصة)[4] کە دەکەوێتە بەشی ڕۆژاوای شارەکەلە زەویی (البرزان)[5] دا نێژرا.

قافیێتی (واتا هەقی خۆیەتی) لێرەدا، ئاماژە بـە هەنـدێ شاعیری فەلـە و دیـان و مەسـیحیش بـدەین کـە بـە زمـانی سـریانی شـیعریان نووسـیوە و لـەم شـارەدا هەڵکەوتوون. بووژانەوەی هەولێر، لەو قۆناغەیدا گەڵ لایەنی دیکەی لەگەڵ خۆیـدا بووژانەوە: ناوچەی هەولێر، چ لە پادەشتەکانی دەوروبەری شار چ لـە چیاکانی دوور لە شاردا، کۆمەڵگەلێکی مەسیحیی نیشتەجێن. لـە پێـنج سـەدەی پێشەوەی مێـژووی ئیسلامـدا، ناوچەی هەولێر بەگشتی پووکابووەوە و تاریکستانێ بـوو بۆخـۆی، لەبـەر

---

(١) م. ن. ورقة ٢٦٥.

(٢) ابن خلكان ٢٩٨/٣.

(٣) ابن الشعار، ورقة ٢٦٧.

(٤) ن. م. (٢٦٤). ابن خلكان، ص. ن.

(٥) ابن الشعار، و. ن.

ئـەوە، مەسـیحییەکانیش هـیچ ڕۆڵێکیـان دیـار نـەبوو. بـەڵام دوای ئـەوە، شـارەکە بەرەبـەرە بـەئاگا هـات و، خـوێنی چـالاکی بـە دەمارەکانیـدا کەوتـە گـەڕ و مەسیحییەکانیـشی بـەئاگا هێنایـەوە[1] کـە لەگـەڵ کـوردی ڕەسـەنی شـارەکەدا، زۆرینەیـەکی تـەواوی هـەولێریان پێـك دەهێنـا[2]. بـەو وریابوونەوەیـەش، هەنـدێ ئەدیب و شاعیری فەلەش پەیدا بوون، بە نموونە:

## (گۆرگیس وەردا)ی شاعیری ئارامیی ((مەسیحی)) هەولێر:

نەزانراوە کەی لەدایك بووە و کەی مردووە. بەڵام پێدەچێ، لە دوادوای سەدەی شەشـەمی کۆچیدا، واتـا (سـەدەی دوازدەمـی لەدایکبوونـدا) لـە هـەولێر لـەدایك بووبێت[3]. ئـەوەش، بـە شـیعرە چوارینەکانیدا دەردەکـەوێت کـە باسـی ڕووداوەکانی ماوەی نێوان (٦٢١ و ٦٢٢ك/١٢٢٤ و ١٢٢٥ز) دەکات و، بەو شیعرانەشدا، دیارە، کـە باسـی بە چاودیتەی[4] کارەساتی هێرشـی مـەگۆل بـۆ سـەر جزیـرە و عـیراق (بـین النهـرین) دەکات.

ئـەم شـاعیرە دیـوان شـیعرێکی گـەورەی[5] هەیـە، باسـی گـەڵێ ڕووداو و کارەسـاتی

---

(١) توما أسقف المرج، كتاب (الرؤساء) ص ١١٠/هامش (٢).

(٢) م. ستريك، دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، ٥٧٤/١.

(ابن حوقل) کاتێ باسی شاری (کفر عزي) دەکات کە لە زەوی و زاری هەولێردا بـووە، دەڵێت: ئـەم زەوییە نشینەی فەلەیە و، هەموو دەوروبەری کوردە. بنۆڕە: (صورة الارض) ص ١٩٦.

(٣) القس سليمان الصائغ، مقال (گورگيس وردا الاربيلي)، شاعر العذراء، مجلة (النجم) الموصلية، العدد (٩) لسنة ١٩٣٧، ص ٣٣١. ونفس الكاتب في كتابه (تأريخ الموصل) ١١١/٢.

(٤) مجلة (النجم) ص. ن.

(٥) لەسەر ئەم دیوانە، گەڵێ نوسخەی دەستنووس گیراوەتـەوە، لـە کتێبخانـەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا هەنە: بنۆڕە: القس سليمان الصائغ، (تأريخ الموصل) ص. ن. وروفايل بابو اسحاق، تأريخ نصارى العراق، ص ٩٤.

ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمان (هزیغ)، ئەم دیوانە و تەرجەمە ئەڵمانییەکەشی، لـە شـاری لایبـسگ، لـە سـاڵی (١٩٠٤)دا بە چاپ گەیاندووە، الصائغ م. ن. ص.

تێدایە، یەك لەو ڕووداوانەش، گەمارۆکەی ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٧ز)ە کە مەگۆل بەدەوری شاری هەولێردا گێڕای. لەو شیعرەدا وەسفی ئەو ڕەفتارە دڕندانە و بەربەرییانە دەکات کە سەربازانی مەگۆل، دەمی گەمارۆکە، لە دژی دانیشتووانی شارەکە[1] نواندیان.

گۆرگیس وەردا، بە شاعیری (عذراء) بەناوبانگە و، هیچ کەسێ هەندەی ئەو (مریم العذراء)ی خۆش نەویستووە، چوارینەکانی ناو دیوانەکەی هەمووی ستایش و پێداهەڵدانی ئەوە. شیعری وەهای بەسەردا هەڵداوە، هیچ شاعیرێك نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژاواش بەسەر زمانیدا نەهاتووە[2]. عاشقانی شیعری گۆرگیس بە ڕۆحسووك و فێنك مەشرەبی لە قەڵەم دەدەن و، دەڵێن: قسە لەڕوویەکی حازر بەدەست و زیرەك و زمانپاراوە. جگە لەوە، دیوانەکەشی پڕە لە جوانکاریی زمانەوانی و وشەو وتەی پڕ ماناو ناسکوێژی، بەوەش میراتێکی دەوڵەمەندی بۆ زمانی ئارامی بەجێهێشت[3]. بەڵام ئەوەی ئیشەکەی وەبەر گلەیی و ڕەخنە داوە ئەوەیە کە زاراوەیەکی زۆری یۆنانیی لە شیعرەکانیدا بەکار هێناوە. وەهاش دەردەکەوێ ئەم دیاردەیە لەو سەردەمەدا، لە ناو ئەدیباندا باو و بڵاو بووە[4]. گۆرگیسی شاعیر، کتێبێکی گەورەشی بەناوی (جنة النعیم) هەبووە، خوێندنەوە جۆراو جۆرەکانی کتێبی پیرۆزی (ئینجیل)ی تێدا لێکداوەتەوە[5].

شاعیرێکی دیکەی مەسیحی بەناوی (خمیس ابن قرداحی) یان (خامیس القرداحی) پەیدا بوو، کە قوتابیی گۆرگیس وەردای هەولێری بوو[6]. ئەویش، وەکو

---

(١) بابو اسحاق، م. ن. ص.

(٢) الصائغ، مجلة (النجم ص ٣٢٢. وتأريخ الموصل ١١١/٢.

(٣) مجلة (النجم) ص ٣٢١.

(٤) القس، تأريخ الموصل، م. ن.

(٥) بطرس نصري، ذخيرة الاذهان ٢٣/٢.

(٦) القس، م. ن. م.

ماموٚستاکەی نە بەرواری لە دایکبوون و نە بەرواری مردنی زانراوە، بەلام ئەوەندە دەزانین کە لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمینی کۆچیدا (سیازدەمینی لە دایکبووندا)[١] بەرچاو کەوتووە. ئەم شاعیرە، بەشیعرێکیدا دەردەکەوێ کە کورە ئاسنگەر بووە، ئەوەتا، لەو شیعرەیدا دەڵێت:

(سەیرەکە لەوەدایە، باوکم ئاسنگەر بوو، بوو بە جوڵا، نە مەکۆی هەبوو نە سەکۆ، نە شاڵ). وشەی (قرداحی)یش بە مانای (ئاسنگەر) [٢] هاتووە. ئەم شاعیرە لە ئەدەبی ئارامیدا قاڵ بوو، شیعرەکانیشی خەسڵەتی رەوانی و ئاسانی و هەماهەنگییان پێوە دیارە و[٣] پڕن لە رەوانبێژی و مانای پیرۆز و بەرز، بە جۆرێ کە لەلای خەڵکێکی زۆر بە شای شاعیرانی سریان لەقەڵەم دەدرا، تا، هەندێکیان دەیانگوت:ماڵی (خمیس) ئاوەدان بێت،... تەنیا، یەك شیعری بەسە، چونکە تەنیا (یەك) شیعری ئەم شاعیرە، لە (هەموو) شیعری شاعیرێکی تر جوانتر و ناسکترە[٤]. (خمیس)، وەستای ئەدیبانی سەردەمی خۆی بووە و، زانای زمان و ئیمامی شیعر بووە، شیعرەکانی، وەك ئاوی کانی، هەڵدەقوڵان[٥].

ئەم شاعیرە، دیوانێکی شیعری هەیە، پڕە لە شیعری هەمەجۆر و هەمە مەبەستی ئایینی و کەهەنۆتی و پەند و خۆشەویستی و دڵداری و شەراب و سەرخۆشی و بەهار و هێوری و بێدەنگی و[٦] دەروونی و تۆبە و دەمتێژەندن (الهجو).

گەلێ سەرزەنشتی خەڵکی هەولێریشی کردووە و دەمی تێ ژەندوونە. بۆ، دڵداری

---

(١) م. ن. ص، روفائیل بابو إسحاق، ص ٩٤.

(٢) القس، ن. م. ص ١١١ — ١١٢.

(٣) م. ن. ص ١١٣.

(٤) بطرس نصری، ن. م. ص ٢٤. القس، ص. ن.

(٥) بابو اسحاق، ص. ن.

(٦) بطرس نصري، ص. ن. ص.

و سەردوولکەش شیعری گوتووە[١]. ئەم دیوانەی، چەندین وێنەی دەستنووسی لەبەر گیراوەتەوە و، بەسەر کتێبخانەکانی رۆژهەڵات و رۆژاوادا دابەش کراون[٢]. جگە لەمانە سی بەیتی دیکەی لەسەر نهێنیی زیندوو بوونەوەی ئەو دنیاو لەسەر حەزرەتی مریەم و پیرۆزگەلی تر هەیە و، نزیکەی حەفتا دۆعایشی بۆ رۆژانی یەك شەموان و جەژنەکان داناوە کە بخوێنرێنەوە. هەروەها نزیکەی سی گۆرانییشی لەسەر شەراب و دڵداری هۆنیوەتەوە. شیعرێکی دوور و درێژیشی بەناونیشانی ((کاروباری کەهەنۆت و کەماڵی ئادابی دەروون، بۆ ئەوانەی کە هەمیشە بەدوای پەند و ئامۆژگاریدا وێڵن)) هەیە. مێژوو نووسی بەناوبانگ (ابن العبري) باسی ئەم مەسەلانەی کردووە، وەڵێ ئەم شاعیرە هەولێرییە باسەکەی دەوڵەمەندتر کردووە و، بۆ هەر جووتە بەیتێ، دوو بەیتی تری زیاد کردووە، بەبێ ئەوەی دەق و مانای بشێوێنێ[٣]، بەڵام ئەوەی ناشیرینی کردووە، ئەوەیە کە ئەمیش، وەك شاعیرە مەسیحییەکەی پێشتر، زاراوەی یۆنانیی[٤] زۆری بەکار هێناوە.

لێرەدا، کە، کۆتایی بە بەشی کلتوور دەهێنین، پێویستە باسی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بکەین، ئەوەیە، کە هیچ بەروبوومێکی بە کوردی نووسراومان نەدی، ئەم زمانەی کە هەتا ئێستاش زمانی خەڵکی ناوچەکەیە. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زمانی عەرەبی، تەنیا زمانی ئایین و ئیدارەی قۆرخ نەکردووە، بەڵکو، زمانی کلتوور و (ئەدەب و زانستیشی) تاساندووە و، کوردی رۆشنبیر و زانا، هەموو بەروبوومێکی هزری و فیکریی خۆیان بە عەرەبی نووسیوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە (یاقوت الحموي) دەڵێ: نشینەی هەولێر کوردن، بەڵام خۆیان کردووە بە عەرەب[٥].

---

(١) القس، تأريخ الموصل ٢/١١٢. بابو اسحاق، م. ن.

(٢) هەمان دوو سەرچاوە و لاپەڕەکان.

(٣) بطرس نصري، ص. ن.

(٤) القس، م. ن. ص.

(٥) ياقوت، معجم البلدان ١/ ١٣٨.

# فەسلی سێیەم

**یەک : سیستەمی هەلسووڕاندن و دارایی و دادوەریی ئەمارەتی هەولێر.**

ا- میری هەولێر و دەسەلاتەکانی.
ب- وەزارەت.
ج- پەردەدارەکان (الحجابة):
د- دیوانی قەڵەم (نووسین).
هـ- وەزیفەی مۆرکردن (الطغراء)
و- وەزیفەی کوێخایەتی (الاستدارية)
ز- باجگریی (الاستيفاء)
ح- دیوانی خاروبار (الأهراء)
گ- دیوانی خەمڵ (قەرساندن)
ی- دادوەری (قەزاوەت)
ك- دیوانی پرسینەوەی شکات (النظر في المظالم)
ل- سەرکاری (الحسبة)

**دوو** : ا- سیستەمی لەشکرسازیی ئەمارەتی هەولێر.
ب- ئالای ئەمارەتی هەولێر
ج- دیوان و جبەخانەی چەك.

**سێ : دراو و سیستەمی دراوی ئەمارەتی هەولێر.**

# فەسلی سێیەم

## یەك : سیستەمی هەڵسووڕاندن و دارایی و دادەوەریی ئەمارەتی هەولێر:

هەولێر، بەر لە قۆناغی حوكمی ئەتابەگیان، كە ببوو بە پایتەختی ئەمارەتی هەزەبانیان و، كاتێكیش بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی سەلجووقیان[1] [1]، بێ سیستەم نەبووە. ئەم دەوڵەتەش سیستەمی نا مەركەزیی لە هەڵسووڕاندنی كاروباری خۆیدا پێڕۆ دەكرد، واتا پەیدابوونی رێكخراوی محەللی (هەرێمەكان) لەم بارەدا شتێكی ئاسایی بوو.

لە ماوەی بەر لە ساڵی (٥١٥ك/١١٢١ز)، لە هەولێر وەزیفەی وەزیری پەیدا بوو، لەو ساڵەدا (العمید فخر الكتاب أبو اسماعیل الحسین بن علي) ناسراو بە (الطغرائي)[2] كوژرا ـ كە وەك (ابن المستوفي)[3] دەڵێت: وەزارەتی هەولێری گرتبووە دەست. هەر لەو ماوەیەدا، وەزیفەی باجگرییش پەیدا بوو، (ابن الشعار) دەڵێت: (باپیرەی ـ أبو البركات المبارك ابن المستوفي) هاتە هەولێر و، لە ماوەی حوكمی (الأمیر أبي الهیجاء الهذباني الكوردي الأربلي)[4] باجگریی ئەمارەتەكەی گرتە دەست. هەروەها وەزیفەی سەركارییشی تێدا پەیدا بوو. (ابن المحتسب) كە لە سەردەمی گۆكبوریدا لەدایك بووە

---

(١) ابن واصل، مفرج الكروب، ١/ ٩٧.

(١)

(٢) یاقوت الحموي، معجم البلدان ٥٢/٤.

(٣) ابن خلكان ١٨٩/٢، ط بیروت. كراس (ترجمات المتقدمین من الشعراء) ص ٤٤.

(٤) ابن الشعار، جـ ٦، ورقة ١٧.

و، هەر لە هەولێریش ژیاوە، کوڕە سەرکار بووە و، باپیرە و، براکانی و ژمارەیێ لە بنەماڵەکەیان پشتاوپشت سەرکار بوونە[1].

دووریش نییە، هەر لەو ماوەیەدا، ڕێکخراوی دیکەی، بە نموونە، وەك دادوەریی تێدا پەیدا بووبێت، چونکە هیچ ئەمارەتێك و شارێکی ئیسلام بە بێ قەزاوەت و دادوەری نەبووە. ڕەنگە دیوانی نووسین و دیوانگەلی دیکەشی تێدا پەیدا بووبن، ئەو ڕێکخراو و فەڵەمڕەوانە، لە سەردەمی ئەتابەگیانیشدا، کە بە تەواوکەری ماوەی سەلجووقیان دادەنرێت، هەر بەردەوام بوون[2].

ئێمە کە لێرەدا باسی سیستەم و ڕێکخراو دەکەین و، لەبارەی هەندێ فەڵەمڕەو و ڕێکخراوی هەولێری سەردەمی ئەتابەگیان بێدەنگین، ئەوە، مانای وا نییە کە ئەو ڕێکخراوانە نەبوونە، بەڵکو، پێدەچێ مێژوو نووسەکان لەبەر کەمتەرخەمی باسیان نەکردبێ، کە زۆرتر هەر بە باسوخواسی شەڕ و جەنگ و سیاسەتەوە سەرگەرم بوون، یانیش هەندێ لەو ڕێکخراوانە لە سەرەتادا بوون و، تازە گەڵاڵە دەبوون و ئەوەی نەهێناوە کەس باسیان بکات. دەبێ ئەوەش بزانین کە زوربەی ئەو مێژوونووسانەی باسوخواسی ئەم ئەمارەتەیان نووسیوە، هاودەم و هاوچاخی ڕووداوەکان نەبوون، کەمێکیان نەبێت. کەواتە، لە بن گوێیەتی، پشتگوێیان خستبێ و، بگرە، هەندێ ڕووداوی سیاسیشیان، هەر، باس نەکردبێ.

کتێبێکی تایبەتیش بەم ڕێکخراوانە نەبوو، لەبەر ئەوە، ناچاربووین بە شێوەیەکی گشتی باسیان بکەین و، پاشان باسی ڕەوشتنامەی ئەو کەسانەش بکەین کە لە هەولێردا ئەم ڕێکخراوانەیان گرتبووە ئەستۆ. جا بۆ زانینی شێوازی حوکم و

---

(١) ن. م. جـ ٥ ورقة ١١١.

(٢) محمد مصطفى زيادة، هامش ((السلوك)) جـ ١ ق ١، ص ٢٣٩.

حسن ابراهيم حسن، تأريخ الاسلام السياسى، ص ٣٦١. نظير حسان سعداوي، التأريخ الحربي المصري في عصر صلاح الدين، ص ٢. عماد الدين خليل، عمادالدين زمنگى، ١٩٦.

ابراهيم على طرخان، النظم الاقطاعية، ص ٣٠.

ڕێکخستنی ئەمارەتەکە، پێویستە لە سەرکردایەتیی ئەمارەتەکەوە دەست پێبکەین، واتا دەبێ، لە میری ئەتابەگەوە دەست پێبکەین، تا بزانین پێگەو پلە و دەسەڵاتی لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ئەمارەتەکەدا چۆن بووە.

## ١- میری هەولێر و دەسەڵاتەکانی:

سەرداری هەولێر، سەرۆکی ئەمارەتەکە بوو، دەسەڵاتی ڕەهاو، ئەرك و فرمانی هەموو ئەمارەتەکەی بەدەست بوو، هەر خۆیشی سەرپەرشتیی کاروباری لەشکر و سیاسەت و ئیدارەی دەکرد. بەتەنیا، هەر ئەو جەنگ و شەڕی جاڕدەدا و، شەڕی دەوەستاند و فەرمانداریی لەشکریشی دەکرد و ڕێککەوتنی لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا مۆر دەکرد و، سیاسەتی ئەمارەتەکەی دادەنا. لەم کاروبارانەدا، دەستەیەك کارمەند و فرمانبەرانی ئەمارەتەکە یاریدەیان دەدا.

دراوی تایبەت بە ئەمارەتەکەش ـ کە لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆگبوریدا گۆڕدرا ـ بە ناوی خۆیەوە لێدەدرا و، ناوی خەلیفە و سوڵتانیشیان لەسەر دادەناو، ناوی مەلیکەکەش، ئەگەر مەلیکیان هەبا، هەروەها خوتبەش بەناوی ئەوەوە، لە مزگەوتەکاندا دەخوێنرایەوە.

موزەففەرەددین گۆگبوری هەموو دەسەڵاتێکی لە دەست خۆیدا گیرکردبوو، بە گەواهی ئەوەی، ئەو کارمەندانەی سەرپەرشتیی هەموو دیوان و پلانەکانیان دەکرد، هەموویان کارمەند و فرمانبەری تەختی تەلاری خۆی بوون و، خۆی دایدەمەزراندن و، خۆی لایدەدان. زۆرجاریش دەیکردن بە پەند (ینکل بهم) هەریەکە و بە جۆرێك و بە بیانوویەك، دەستی بەسەر ماڵ و موڵکیاندا دەگرت، یان بەندی دەکردن، یان ئەشکەنجەی دەدان، بگرە هەندێکیشیان لە بەندیخانەدا دەمردن. بەکورتی، ئەوانەی لە شەڕو بەڵای ڕزگاربوون و بەر سزای نەکەوتن، زۆر کەم بوون[1]، تا، وەهای لێ هات، ئەم جۆرە کردەوە خراپانە، بوون بە ڕەفتار و نەریتی

---

(١) د. احسان عباس، مقدمة ((وفيات الاعيان)) ط، بيروت ١٩٧١، جـ ٧، ص ١٥.

میر ـ هەرچەندیشە کەسانێك پاکانەیان بۆ دەکرد و هەقیان، بەو دەدا ـ[١].

ناشتوانین بڵێین، میر، نوێنەر یان بریکاری هەبووە، چونکە بەڵگەمان بەدەستەوە نییە. ناشزانین کاتێ موزەففەرەددین گۆکبوری لە هەولێر نەبا یان بە هێرش و هەڵمەتێکی لەشکرەوە بۆ شەڕو کوشتار، لە شار دەرچووبا، کێ کاروباری ئەمارەتەکەی بەڕێوە دەبرد، بەڵام (سرفتكين الزيني)ی بریکاری دامەزرێنەری ئەتابەگایەتیی هەولێر، یاریدەدەرێکی بۆخۆی دانابوو، ئەگەر خۆی لە هەولێر نەبا[٢]، جێگای دەگرتەوە.

## ب- وەزارەت:

وەك باسمان کرد، وەزارەت بەر لە سەردەمی ئەتابەگایەتی، لە هەولێردا هەبوو، واتا ئەمارەتی هەزەبانیان وەزارەتی هەبووە. (ابن خلكان) لە (ابن المستوفي)یەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (العميد فخر الكتاب أبو اسماعيل الحسين بن علي بن محمد بن عبدالرحمن) کە بە لەقەب (مؤيدالدين الأصبهانی)ی نووسەری (الطغرائي) ناسراو بە (الطغرائي)یە، لە هەولێردا، ماوەیەك وەزارەتی بەدەستەوە بووە[٣].وەهاش، زانراوە کە (الطغرائي) لە دەوروبەری ساڵی (٥١٥ك/١١٢١ز)دا کوژراوە[٤]. واتا وەزارەتی

---

(١) سبط إبن الجوزي، مرآة الزمان ٨/ ٦٨٣.

(٢) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٩، ترجمة هارون بن عبدالحسين بن گرجي.

(٣) ابن خلكان ١٨٩/٢، ط بيروت.

بنۆڕە ناميلكەی: ((ترجمات المتقدمين من الشعراء)) ص٤٤.

(٤) بە جیاواز باسی بەرواری کوژرانی (الطغرائي) دەکرێت. (العماد الكاتب الاصفهانی) دەڵێت: لە ساڵی (٥١٣ك)دا کوژراوە: (تأريخ دولة آل سلجوق – إختصار البنداري، ص ١٢١). بەڵام (ابن خلكان) لە (السمعاني)یەوە وەریگرتووە کە لە (٥١٥ك)دا کوژراوە: (وفيات الاعيان ٤٣٨/١) پاشان لە (العماد)ەوە، وەردەگرێت و دەڵێت لە (٥١٣ك)دا کوژراوە و، دەشڵێت: ((دەڵێن)) لە ساڵی (٥١٤ك)دا کوژراوە. دەشڵێن لە ساڵی (٥١٨ك)دا کوژراوە (م. ن. ٤٤١/١٠) بەڵام (ياقوت الحموي) دەڵێت: لە ساڵی (٥١٥ك)دا کوژراوە: (معجم الادباء ٥٢/٤). وەلێ (ابن الاثير) دەڵێت: لە ساڵی (٥١٤ك)دا کوژراوە: (الكامل ٥٦٣/١٠).

هەولێری لە سەردەمی (أبو الهيجاء الهذباني)ی سەرداری هەولێردا وەرگرتووە کە، تا دوای ساڵی ٥٢٠ك/١١٢٦ز) حوکمی رانیبوو[1]. بەڵام ئەم وەزیفەیە، پاشان لە سەردەمی ئەتابەگیاندا، لە ماوەی حوکمی موزەففەرەددین گۆگبوریدا، دیار نەماو بزربوو.

لێرەدا، گرنگ ئەوەیە، یەکەم بەڵگەی بوونی وەزیفەی وەزارەت لە سەردەمی ئەتابەگیاندا، لە ماوەی حوکمی میر موزەففەرەددین گۆگبوریییەوە دەستمان کەوتووە، چونکە لەو ماوەیەدا، ئەمارەتی هەولێر بەرەو چاکتر گۆڕاو، کاروباری ئەمارەتەکە هەند پەلی هاویشت و پەرەی سەند، ئەم میرە نەیدەتوانی بە تەنیا بەڕێوەی ببات و هەڵیسووڕێنێت، لەبەر ئەوە بار و دۆخەکە پێویستی بە داهێنانی وەزیفەیەکی لەم جۆرە کرد، بۆ ئەوەی هەندێ لە ئەرك و فرمانی ئیدارەی ئەمارەتەکە بگرێتە ئەستۆ، وەزیرەکەش، لە بەرێخستنی ئیش و کار و سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی ئەمارەتەکەدا، - وەك ئەوەی سەلجووقیان[2] پێڕۆیان دەکرد - ئەمیش ببێتە یاریدەری میری ئەمارەتەکەی خۆیان، دەوڵەتی سەلجووقیان وەزیری هەبوو، سەرکردایەتیی دیوانەکانی دەکرد و، چاوی خستبووە سەر هەڵسوکەوت و رەفتاری دامودەزگای دەوڵەت و، دیوانی باجگری و دیوانی نووسینی (قەڵەم)ی لەبن دەستدا بوو، لەبەر ئەوە، پێویست بوو لە ئەمارەتی هەولێریشدا پۆستی وەزارەت هەبێت، وەزارەتیش کە دانراو، دەسەڵاتی وەزیر کەوتە فراوانی، ئەوجا، بووە کێبڕکێ و، شەڕیان لەسەر دەکرد و، دامودوایان بۆ وەزیرەکە دەنایەوە و، گێچەڵیان بۆ دروست دەکرد، بۆ ئەوەی جێگاکەی بگرنەوە[3]. لەبەر ئەوەش کە وەزیفەی وەزیری، وەزیفەیەکی گرنگ و بەرپرسە، پێویست بوو، وەزیر خەسڵەتگەلێکی وەهای

---

(١) الكامل. ٦٣٨/١٠، (ابن الاثير) لێرەدا باسی چالاکیی لەشکرگێڕیی ساڵی (٥٢٠ك)ی (أبو الهيجاء) دەکات. بە قسەی (أبو شامة)یش بێت دوای دوو ساڵ لەو بەروارە، (ئەتابەگ عمادالدين زەنگی) هەولێری گرت: ابو شامة، كتاب الروضتين ٣٠/١.

(٢) عبد النعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق، ص ١٥٨.

(٣)ن. م. ص ١٦٠.

هەبێت بتوانێت ئەو گرنگی و بەرپرسییە لە ئەستۆ بگرێت[١]. لەبەر ئەوە، وەزیر، لەو كەسانە هەڵدەبژێردرا كە بەرۆشنبیر و میرزا و بە پشوو دەناسران و شارەزای یاساو رەوشتی پادشایان بوون و[٢]، پیاوچاك و لەخواترس بوون[٣]. وەلێ ئێمە نازانین، تا چەند، ئەم خەسڵەتە چاكانە لە وەزیرەكانی هەولێردا بووبن، (المبارك ابن المستوفي) نەبێ، كە لە دوادوای رۆژانی ئەمارەتەكەدا وەزارەتەكەی وەرگرت، دەنا، لەبارەی پێگەو جێگەو كلتوور و پلەی خوێندەواریی وەزیرەكانی ترەوە هیچ دەق و بەلگەیەكی تایبەتمان بەدەستەوە نییە.

هەروەها، ناشزانین وەزیری هەولێر، تا چەند دەسەڵاتی بڕی كردووە، یان جۆری ئەرك و فرمانی چی بووە و، بە شێوەیەكی ـ راستەقینە ـ مافی سەرپەرشتیی دیوانەكانی هەبووە یان نەبووە. سەرڕوشتەكان (القرائن) ئەوە دەردەخەن كە موزەففەرەددین گۆكبوری رێگای بە شەریكە بەش نەدەدا و، نەیدەهێشت كەس هاوبەشی لە دەسەڵاتەكانیدا بكات. ئەو، جامی غەزەبی بەسەر زۆربەی گەورەپیاوانی ئەمارەتەكەیدا رژاند، لەبەر ئەوە، زۆر دوورە وەزیر فزەی كردبێ، تەنیا كارمەندێكی گەورە بووە و هیچی دی. وەزیر لە حوكمڕانیدا هاوبەش نەبووە و، لە تەلاری ئەم میرەدا، تەنیا یاریدەری میر بوونە لە كاروباری ئەمارەتەكەدا، واتا وەزارەتی هەولێر تەنیا بۆ جێبەجێكردنی فەرمانی میر بووە و[٤]، دەسەڵاتی زۆر كەم بووە، پێدەچێ بنكەو بارەگای وەزارەت و دیوانەكان لە قەڵا بووبێت، ئەوەتا (ابن الشعار) لە مێژوو

---

(١) الماوردي، الأحكام السلطانية، ط/القاهرة، ١٩٦٠، ص ٢٧.

(٢) عباس إقبال (در وەزارت) ص ٢٥. حسين أمين، العراق في العصر السلجوقي ١٩٠.

(٣) ابن الطقطقي، الفخري في الآداب السلطانية، ص ٢٩٧ – ٢٩٨. النويري، نهاية الأرب ٩٤/٦.

(٤) بنۆڕە بزانە وەزارەتی جێبەجێكردن مانای چییە: النويري، نهاية الأرب ١٢٤/٦ – ١٢٨.

(؟) ابن الشعار، جـ ٩ ورقة ١٢٢. هەتا ئێستاش گەڕەكێك لە قەڵای هەولێر هەیە پێی دەڵێن گەڕەكی سەرای، كەوتووەتە لای دەروازە گەورەكەی روو لە باشوور، كە گەڕەكێكە لە سێ گەڕەكەكەی قەڵا. دوو گەڕەكەكەی دی: (تەكیە) و (تۆپخانە)یان پێدەڵێن.

نووسی هەولێر (ابن المستوفي)یەوە، دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (هبةالله بن أبي الحسن المصري الدمنهوري) دیوانی خەملێ (الارتفاع)ی تایبەت بە هەولێری وەرگرت و، لە قەلا سەرپەرشتیی ئەم دیوانەی دەکرد.

لە هەندێ سەرڕوشتەوە (قرینە) بۆمان دەردەکەوێت یەکەم کەس وەزارەتی هەولێری گرتبێتە دەست (محمود بن محمد بن مقداد بن فارس الحرانی) بووە، کە موزەففەرەددین گۆکبوری لە (الحران)ەوە[1] لەگەڵ خۆیدا هێنای بۆ هەولێر و، کردی بە وەزیری خۆی و (أبا عبدالله محمد)ی کوڕیشی (ت ٦١٢ك/١٢١٥ز) کرد بە سەرۆکی دیوانی شکات[2]. موزەففەرەددین گۆکبوری بەرلەوەی ببێتە سەرداری هەولێر، سەرداری (الحران) بوو. وەزیری دووەمیش (أبو الحسن علی بن شماس بن عبدالله الأربلي) بووە[3].

لە ساڵی (٦٢٣ك/١٢١٥ز)یشدا، یان لە دەوروبەری ئەو ساڵەدا[4] (أبو أسحق شرف الدین ابراهیم بن علي بن أبي حرب)ی ناسراو بە (ابن الوالی الموصلي) وەزارەتەکەی وەرگرت، ئەوەبوو، وەزیرەکەی پێش ئەم، بەهۆی خراپیی ئیدارەو گەندەڵیی دیوانەوە لە وەزارەت لادرابوو. جا، بە بۆنەی هاتنی ئەم وەزیرە تازەیەوە، دەبینین (أسعد بن ابراهیم)ی نووسەری دیوان کە بە (مجدالدین الاربلي) ناسراو بوو، دوو بەیت شیعری گاڵتەجاڕیی بە خەیاڵدا دێت و دەڵێت ئەم وەزیرە تازەیە، لەوە زێتر کە چاوەشێکی (یاساوڵێکی)[5] لەبەر دەرگاکەی راگرتووە، هیچی دیکەی نەگۆڕیوە، گەر کەسێ بچێتە لای، یەکسەر یاساوڵەکەی بانگ دەکات. دوو بەیتە شیعرەکەشی ئەمەیە:

---

(١) ابن الشعار، جـ ٦، ورقة ١٨٧. نازانین ئەم وەزیرە لە چ ساڵێکدا مردووە.

(٢) م. ن. و.

(٣) م. ن. جـ ٧ ترجمة ولده (محمد بن علي بن سماس).

(٤) اليونيني، ذيل مرآة الزمان ١١٢/١.

(٥) جاويش، چاوەش = یاوەر، شمس الدين سامي، قاموس تركي.

| | |
|---|---|
| فرحنا وقلنا تولى الوزير | وافلح ديواننا بالوزارة |
| فما زادنا غير جاويشه | وفي كتبنا كتبت بالأشارة[1] |

واتا: دڵمان خۆش بوو، وەزیری تازەمان بۆهات و، دیوانەکەمان رزگاری دەبێ، کەچی تەنیا چاوەشەکەی خۆی بۆ زیاد کردین و، لەسەر نووسراوەکانیشمان دەنووسێ (بالاشارة).

وەزیر (شرف الدین ابراهیم) کوڕێکی هەبوو بەناوی (تاج الدین عبدالعزیز) دەبوو بە نوێنەری باوکی. ئەمەش مانای ئەوەیە کە لە ئەمارەتەکەدا، نوێنەرایەتی وەزیریش هەبووە. موزەففەرەددین گۆکبوریش، ئەم نوێنەرەی چەندین جار ناردووە بۆ بەغدا. (الیونینی) باسی خەسڵەتەکانی ئەم نوێنەرە دەکات و، دەڵێت: (سەرۆکێکی هیممەت بەرزە، چاکەی زۆرە، دەستپاکە، ڕەوشتی باشە، لە ئیشەکانیدا دڵسۆزە و، لە هەڵسوکەوتیدا بەسەبرە و بەورەیە) [2]وەزیر (شرف الدین) و (تاج الدین)ی کوڕی لەسەر وەزیفەی خۆیان، تا، کۆتایی ساڵی (٦٢٨ك/١٢٣١ز) مانەوە، ئیدی، سەرداری هەولێر هەردووکیانی حەپس کرد[3].

دوایین وەزیری ئەم ئەمارەتە (أبو البركات المبارك ابن المستوفي) بوو، ئەمیش لە بەندیخانە بوو، بەڵام کاتێ موزەففەرەددین گۆکبوری، (شرف الدین ابراهیم)ی حەپس کرد، ئەمی لە بەندیخانە دەرکرد، وەزارەتەکەی پێ سپارد. هەر چەندیشە (ابن المستوفي) ـ وەك (ابن الشعار)ی قوتابیی دەڵێت ـ بەم وەزیفە تازەیەی قایل نەبوو، بەڵام لە کاروباری سوڵتانیدا لێهاتوو بوو، دام و دەزگای حوکمیشی تازەکردەوە[4]. خەڵکی ئەمارەتەکەش گەلێکیان پێخۆش بوو کە هاتەوە سەر حوکم،

(١) اليونيني، م. ن. ص. والكتبي، فوات الوفيات ١/١٨.

(٢) اليونيني ٢/٢٦٩.

(٣) ابن الشعار، عقود الجمان جـ ٤، ورقة (١).

(٤) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ورقة ١٨.

بەڵام زۆری نەخایان و سەرداری هەولێر لە ساڵی (٦١٣ك/١٢٣٣ز)دا کۆچی دوایی کرد و (ابن المستوفي)یش وازی لە پۆستەکەی (وەزیفەکەی) هێنا. بەڵام دوای مردنی موزەففەرەددین گۆکبوری، خەلیفە (المستنصر) ـ وەکو باسمان کرد ـ هەولێری بەزۆر داگیر کرد و، میر (باتكين بن عبدالله الرومي)ی[1]، بەسەر هەولێرەوە دانا. ئەم میرە تازەیە، زۆر لەگەڵ (ابن المستوفي)دا خۆی ماندوو کرد، کە قایل ببێ، لەسەر وەزیفەکەی بمێنێ، بەڵام بێ هوودە بوو.

## ج– پەردەدارەکان (الحجابة):

پەردەداری وەزیفەیەکە لە سەردەمی ئەتابەگیاندا لە هەولێر هاتە گۆڕێ. پەردەدارەکە لەبەر دەرگای سەردار، یان میر دەوەستا و، ئیزنی وەردەگرت[2]، بۆ کەسێ بچێتە ژووری، واتا لە خەڵکی دەپاراستن و دەرگای دادەخست و ـ وەك (ابن خلدون) دەڵێت[3]ـ لەکات و ساتی خۆیدا دەرگای دەکردەوە، ئەوەکا کەسێك خراپەیەکی لە دژ بکات، چونکە لەوەپێش هەندێ لە خەلیفەو سوڵتانەکان دەستدرێژییان لە دژ کرابوو. پەردەدار، لە نێوان میر و وەزیریشدا پێوەندیی ئاسان دەکرد، فەرمانی زارەکیی لە میرەوە دەگەیاندە وەزیر و[4]، وەزیر دەبوو جێبەجێی بکات. پەردەدار، جارجارەش رۆڵی باڵیۆزی دەبینی، لە نێوان وڵاتی خۆی و وڵاتێکی دیکەدا دەکرا بە نوێنەر و پێوەندیی لەگەڵ هەندەراندا دەکرد[5].

ئێمە نازانین پەردەداری، لە هەولێردا، کەی پەیدابووە، وەڵێ یەکەم دەقی نووسراو، لە بارەی پەردەدارەوە، ئەوەیە کە لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆکبوریدا

---

(١) و. ن.

(٢) القلقشندي، صبح الاعشى ٣/٢٧٣.

(٣) ابن خلدون، المقدمة، طبعة بيروت ١٩٦١ ص ٤٣٦.

(٤)البنداري، تأريخ دولة آل سلجوق، ص ١٠٧.

(٥) حسين امين، تأريخ العراق في العصر السلجوقي ١٨٣.

هەبووە. (ابن شداد) دەڵێت: (شجاع الدين الاربلي) پەردەداری ئەم میرە بووە و، لە ساڵی (٥٩٨ك/١٢٠١ز)دا، سێ هەزار دیناری پێدا ناردووە بۆ دیمەشق بۆ تەواوكردنی ئەو مزگەوتەی لەسەر چیای قاسیۆن[1] دروستیان دەكرد.

هەروەها، لە هەولێر (ابو العباس صلاح الدين احمد بن عبدالسيد ابن شعبان بن محمد بن جابر الأربلي)یش، سەردەمێك پەردەدار بووە. (ابن خلكان) دەڵێت:[2]

لە بنەماڵەیەكی گەورەی ناسراوی هەولێر بووە. پێدەچێ، پەردەدارەكەی پێشتر، ئەم وەزیفەیەی وەرگرتبێ. دەڵێن (ابو العباس) ماوەیەكیش لە لەشكری هەولێردا ئیشی كردووە[3]، پاشان لە تەلاری میری هەولێردا[4] وەزیفەی پەردەداریی وەرگرتووە ـ بەڵام وەكو زۆربەی سەرەك دیوانەكانی دی ـ خێری لە وەزیفەكەی نەدی، چونكە موزەففەرەددین گۆكبوری ئەمیشی حەپس كرد، پاشان لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز)دا، ئازادی كرد. ئەمیش هەولێری بەجێهێشت و چوو بۆ شام و، لەوێ كەوتە خزمەتكردنی (الملك المغيث محمود ابن الملك العادل)، دوای مردنی ئەم مەلیكەش، ئنجا، چوو بۆ میسر و، كەوتە خزمەتكردنی (الملك الكامل محمد) و، پلەو پایەی دای لە بەرزی و، - وەك (ابن خلكان) دەڵێت ـ ئەو پلەیەی ئەم پێی گەیشت كەس پێی نەگەیشت، كار گەیشتە ئەوەی، (الملك الكامل) كردی بە میر[5].

(أحمد بن عبدالسيد) لە ساڵی (٦٣١ك/١٢٣٤ز)دا، لە (الرها) گیانی سپارد و،

---

(١) ابن شداد، الأعلاق الخطيرة ((تأريخ دمشق)) ص ٨٦.

(٢) ابن خلكان ١٨٤/١ طبعة بيروت.

(٣) ابن الشعار، جـ ١، ترجمة احمد بن عبد السيد.

(٤) ابن خلكان، ص. ن. الصفدي، الوافي ٦٢/٧.

(٥) ابن خلكان: ص. ن.

تەرمەکەیان بردە قاهیرە و لە گۆڕستانی (القرافة الصغری) [١]بەخاکیان سپارد. ناشزانین دوای ئەم، کێ بووەتە پەردەداری سەرداری هەولێر.

## د- دیوانی قەڵەم (نووسین):

دیوانی نامەکان و، دیوانی نامەو نامەکاریشیان پێدەگوت[٢]. بەرپرسی ئەم دیوانەش، پێیان دەگوت سەرەك دیوان یان ئینشانووس یان نهێنی نووس[٣]. ئەرك و فرمانی ئەم سەرەك دیوانە، ئەوەبوو، نامەو فەرمانی فەرمیی دەنووسی و[٤]هەر نامەو فەرمان و رێنماییەکیش لە میرەوە دەرچووبا، دەهاتە لای ئەم و، ئەمیش پێیدا دەچووەوە و، لە قالبێکی جوانتردا بە خەتی خۆی، یان بە خەتی خەتخۆشێك لە نووسەرەکانی[٥]خۆی، کە متمانەی پێدەکردن[٦]، دایدەرِشتەوە.

(ابن خلدون) دەڵێ: ئیشوکاری ئەم دیوانە زۆر مەترسیدار بوو، لەبەر ئەوە، سەرەك دیوانێکی بۆ دادەنرا، لە چینێکی زۆر بەرزی کۆمەڵگە و، لەوانەی کە هەست بە مرۆڤایەتی و ئابڕوو دەکەن و، ئاستێکی زانستی و بەهرەوەری و زمانەوانیی زۆر چاکیان[٧]هەیە. گەلێ جاریش سەرەك دیوانیان، یان یاریدەدەرەکەی وەك باڵیۆز و نوێنەر دەشاندران بۆ وڵاتانی دەوروبەر و، نامەو نووسراویان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد،

---

(١) ابن خلكان ١٨٧/١. الصفدي ٧٣/٧. (ابو العباس صلاح الدين احمد) لە (مرآة الزمان ٦٩٢/٨)دا، باس کراوە. النجوم الزاهرة ٢٨٦/٦. پێویست ناکات باسی باقیمەنی ژیانی بکەین کە لە دەرەوەی هەولێر پڕبووە لە بزاڤ و چالاکی.

(٢) القلقشندي ٩٠/١.

(٣) المقريزى، الخطط، جـ ٢، ص ٢٢٦. عباس أقبال، (وزارت در عهد سلاطين)، ٣٩.

(٤) عبدالنعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق ١٦٢.

(٥) المقريزي، الخطط، ص. ن.

(٦) ابن شاهين الظاهري، زبدة كشف الممالك، ص ٩٩. عباس أقبال، م. ن. ص ٣٠.

(٧) قدامة ابن جعفر، مخطوط (صنعة الكتابة) ورقة (١١). ابن خلدون، المقدمة، ص ٤٣٨.

یان کارێکی نهێنی هەبا[١]، بە جێیان دەگەیاند. دیوانی قەڵەم (نووسین) لە سەردەمی سەلجووقیاندا، جارجارە، دیوانی (الطغراء)یشی[٢] پێدەگوترا، چونکە لەگەڵ دیوانەکەی تردا، بەسەریەکیانەوە هەبوو.

سەرچاوەکان باسوخواسی ئەوەیان تێدا نییە کە، لە بەرایی حوکمی ئەمارەتی بەگەتگینیاندا، لە هەولێر، کێ ئەرك و فرمانی قەڵەمی (نووسین)ی لە ئەستۆ بووە. وەڵێ بە دووری نازانین (أبو حفص غرس الدين عمر شماس بن هبة الله الأربلي الكاتب) یەکەم کەس بووبێ، ئەرك و فرمانی ئەو دیوانەی راپەڕاندبێ. ئەو، کەم و زۆر زووتر مردووە، لە ساڵی (٦٠٠ك/١٢٠٢ز)دا کۆچی دوایی کردووە[٣]. (ابن الفوطي) لە (ابن المستوفي)یەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئەم (أبو حفص غرس الدين)ە کاتێ میر (مجاهدالدين قايماز) لە ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز)دا هەولێری بەجێهێشت و رووی لە موسڵ کرد[٤]، ئەویش لە تەکی بەڕێ کەوت. ئەم نووسەرە، برای (علي بن شماس بن عبدالله الأربيلي)ی وەزیری ئەمارەتی هەولێر بوو.

کەسێکی دی کە سەرۆکایەتیی دیوانی قەڵەمی (نووسینی) کردبێ (أبو الحسين موسى الكاتب) بووە کە لە بواری رێزمان و شیعریشدا خۆی ماندوو دەکرد. ئەم، کاتێ ئەو وەزیفەیەی وەرگرت کە نووسەرەکەی پێش خۆی (غرس الدين عمر) هەولێری بەجێهێشت. وا دیارە (أبو الحسين موسى) لەسەر وەزیفەکەی مایەوە و نووسینی بۆ سەرداری هەولێر دادەڕشت، تا لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز)دا[٥] گیانی سپارد. (ابن الشعار)[٦] دەڵێت: (ابن المستوفي المبارك)یش، ماوەیەك ئەم دیوانەی بەدەستەوە

---

(١) عباس اقبال، ص. ن.

(٢) المقريزي، م. ن. ص.

(٣)ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، جـ ٤، ق ٤ ص ١١٥٩.

(٤)م. ن. ص.

(٥) المنذري، التكملة لوفيات النقلة: بالرونيو جـ ٦، ورقة. ١٠٩٠.

(٦) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ترجمة المبارك ابي البركات.

بووە.

گرنگترین نووسەر کە لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆکبوریدا دیوانی قەڵەمی وەرگرتبێ، ئەوە (أبو المجد[1] مجدالدین أسعد بن ابراهیم بن حسن بن علي الشیبانی النشابي الأربلی) بووە، کە لە تەمەنی لاوێتیدا لە هەولێر بەدەرکەوتووە و وڵاتانی جزیرە و شام گەڕاوە و، لە ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز)دا گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر و، سەرپەرشتیی دیوانی نووسینی گرتووەتەوە دەست و[2]، پلەو پایەی بەرزتر بووە و، برەوی سەندو قسەی دەڕۆیشت[3]، پاشان لە هەموو کەسێك زیاتر لە موزەففەرەددین گۆکبوری نزیك بووەوە، ئەوەبوو لە ساڵی (٦٢٨ك/١٢٣٠ز)دا[4]، بۆ سەردانی بەغدا، لەگەڵ خۆیدا بردی.

ئەمیش، تا ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣١ز) ئیشەکەی بەڕێوەبرد و، لەو ساڵەدا، سەرداری هەولێر غەزەبی لەویش گرت و، لە دیوان دەری کرد. پاشان گرتی و دووری خستەوە بۆ بەندیخانەی کەرخینی (کەرکوك)، کە ئەو شارەش سەر بە ئەمارەتی هەولێر بوو، لەوێ لە بەندیخانە مایەوە، تا مردنی موزەففەرەددین گۆکبوری، کە ئیدی لەشکری خەلیفە (المستنصر) هەولێری داگیر کرد و، هەموو حەپسەکانی ئازاد کرد (مجدالدین)یش یەکێك بوو لەو ئازاد کراوانە، ئەمیش لێی نەوەستا، یەکسەر، چوو بۆ بەغدا و لەوێ چەندین وەزیفەی وەرگرت[5]، پاشان لە دوادوای ساڵی (٦٥٧ك/١٢٥٩ز)دا مرد. (مجدالدین) یەکێك بوو لەوانەی کە لە رووداوەکەی

---

(١) لە هەموو سەرچاوەکاندا، ناوی بە (أبو المجد) هاتووە، بەڵام لە (ابن الفوطي، تلخیص مجمع الآداب، ط لاهور، جـ ٥ ق ٢، ١٠٧)دا، ناوی بە (أبو الفضل) و (أبو سعد) هاتووە.

(٢) الیونیني، ذیل مرآة الزمان ١١١/١.

(٣) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ١، سیرة اسعد بن ابراهیم.

(٤) الیونیني، ن. ص، کەچی (الکتبي) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆکبوری ناردی بۆ بەغدا: (فوات الوفیات) ١٧/١.

(٥) ابن الشعار، ن. م. الیونیني ١١٣/١.

داگیرکردنی بەغدا نەکوژراو سەر سەلامەت دەرچوو، ئەوەبوو، خۆی شاردەوە، تا دۆخەکە هێور بووەوە[1].

دوایین کەس، ئەم دیوانەی هەولێری گرتبێتە دەست (أبو عبدالله محمد بن جعفر ابن محمد بن محمود بن هبة الله)ی کوڕی قازیی هەولێر (أبو محمد الكفر عزي الأربلى) بووە، ئەوەبوو موزەففەرەددین گۆگبوری، دوای حەپسکردنی بەرپرسی دیوانەکە، ئیشەکەی بەم سپارد[2].

## هـ- وەزیفەی مۆرکردن (الطغراء):

ئەمەش، یەك لەو وەزیفانەیە کە لەم سەردەمەدا هاتە ئاراوە. مۆربەدەست بەدەستی خۆی ئەو نامەو نووسراوانەی کە لە ئەمارەتەکەوە دەردەچوون[3]، مۆردەکرد. هەروەها هەموو جۆرە گەواڵەیەکیشی مۆر دەکرد[4]. ئەم فرمانە بە کەسێك دەسپێردرا هەندێ خەسڵەتی چاکی هەبێ، بەنموونە، (گیر) بێت واتا بە ئیدارە بێت، یەك زمان و یەك ڕا بێت، بوێر و نەفسبەرز و ڕۆشنبیر و زیرەك و

---

(١) اليونيني، ن. ص. ابن الفوطي، تلخيص مجمع الآداب، جـ ٥، ق ٢ ص ١٠٧، کەچی ساغکەرەوەی (تلخيص مجمع الآداب) کە دکتۆر (مصطفى جواد)ە، جـ ٢، ق ٢، ص ٥٦١/الهامش دەڵێت: وابزانم کە هۆلاکۆ لە ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز)دا بەغدای داگیر کرد، ئەویش کوژرا. دکتۆر (مصطفى جواد) هەواڵەی (ابن الكتبى) و (ابن العديم) مان دەکات، کەچی (ابن الكتبى) باسی مردنی (أسعد)ی نەکردووە: (فوات ١٧/١). دکتور (مصطفى جواد) ناوی کتێبەکەی (ابن العديم)ی نەنووسیوە، دوور نییە مەبەستی (بغية الطلب من تأريخ حلب) بێت کە دەسنووسەو، لە ئەستەنبوڵە. بنۆڕە: العزاوى، التعريف بالمؤرخين، ص ٧٩.

(٢) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٧، ورقة (٤٧١ - أ) سيرة محمد بن جعفر بن محمد.

(٣) القلقشندي ١٣٢/٢.

(٤) ابن خلدون، المقدمة، ص ٤٦٧.

بلیمەت بێت[١]. (البنداري) لە بارەی ئەم پۆستەوە دەڵێت: لەدوای پۆستی وەزارەتەوە، مەسنەتی باجگریی[٢] نەبێ، دەنا هیچ مەسنەتێك (منصب) لە مەسنەتی مۆربەدەستی گرنگتر نابینی.

دەشتوانین ئەم وەزیفەیە، بە تەواوکەری وەزیفەی دیوانی قەڵەم[٣] دابنێین، بەرپرسی دیوانی قەڵەم، سەرپەرشتیی نووسین و وەرگرتنی نووسراوی میریی دەکرد و، مۆر بەدەستیش فەرمانەکانی میری بە نەخشێکی تایبەت مۆر دەکرد[٤].

(أبو الفضل هاشم بن عبدالسلام بن یوسف ابن عمر و بن مندو الأربلي) ئەم وەزیفەیەی لە هەولێر وەرگرت، ناشزانین لە چ ساڵێکدا وەری گرتووە، رەنگە درەنگتر وەری گرتبێ، چونکە، ئەو، لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز)دا لەدایك بووە[٥].

ناشزانین کەسێکی دی، پێش ئەو، وەری گرتووە، یان، نا، بەڵام (أبو الفضل) لەسەر ئیشەکەی مایەوە، تا نەمانی ئەمارەتەکە، سامانێکی زۆریشی بەم ئیشە خڕکردەوە ـ بە قسەی (ابو الشعار) کە زۆر لە گەڵیدا کۆدەبووەوە ـ. (أبو الفضل) پاشان لە هەولێر دەرچوو، چونکە لە ساڵی (٦٣٤ك/ ١١٣٧ز)دا مەگۆل هاتنە ناو هەولێرەوە، ئەویش بۆی دەرچوو. پێدەچێ لە بەغدا گیرسابێتەوە، چونکە مێژوونووسی ناوبراو لە ساڵی (٦٣٩ك/١٢٤١ز)دا لە بەغدا چاوی پێی کەوتووە[٦].

---

(١) البنداري، آل سلجوق، ص ٥٦.

(٢) م. ن. ص ٩٢.

(٣) م. ن.

(٤) قدامة بن جعفر، مخطوط (صنعة الكتابة) ورقة ٣١.

(٥) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٩، ورقة ٩٣.

(٦) م. ن. و.

## و- وەزیفەی کوێخایەتی:

بریتییە لە سەرپەرشتی کاروباری تەلار و ماڵی میر، ئەوەش کە ئەم ئیشە رایی دەکات پێی دەڵێن بەرپرسی کوێخایەتی[1]. ئەم بەرپرسە، بە نەسڵ، ئیش و کاری چێشتخانەو خواردن و خواردنەوە و خزمەتی دەستوپێوەند و غیلمانی[2] دەکرد و، بەرکولێکیشی لە خۆراکی میر دەخوارد بۆ ئەوەی دڵنیا بێت زەهری تێدا نییە[3]. کوێخا دەسەڵاتی ئەوەی پێدرابوو، هەموو پێداویستییەکی ماڵی میر و پارە و خەرجی و جل و بەرگ ئامادە بکات[4].

(محمد بن اسطیفان ابن عبدالله) بەرپرسی کوێخایەتی سەرداری هەولێر بووە (ابن الشعار) لە زمانی (ابن المستوفي)یەوە دەڵێت: میرێکی بە ئاکار و رەوشتباش و بەرچاوتێر و خۆش مەشرەب و دڵپاك و خێرخواز بووە، لە هەولێر، لە ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز)دا مردووە[5].

## ز- باجگریی (الاستیفاء):

لە وەزیفە سەرەکی و گرنگەکان بووە، کاروباری دارایی دەوڵەتی هەڵدەسووڕان و، بەند و بەستی (ضوابط) داهات و خەرجی دادەناو، سەرچاوەکانی پارەو دەسکەوتی دەسنیشان دەکرد[6]. (ابن مماتی) کە لە ساڵی (٦٠٦ك/١٢٠٩ز)دا مردووە، باسی ئەرك و فرمانی باجگریی بە دوور و درێژی کردووە، دەڵێت: باجگر داوا لە بەردەستەکانی خۆی دەکات کە لەکات و ساتی خۆیدا ئەو پارەیەی هاتووەتە دەستیان دوای

(١) القلقشندی، پێناسەی کردووە، بنۆڕە: صبح الاعشى ٤٥٧/٥.

(٢) القلقشندي ٢٠/٤. المقريزي، الخطط ٢٢٢/٢.

(٣) یان ئەوەیە کە پێیان دەگوت (الجاشنكير)، بنۆڕە: صبح الاعشى ٢١/٤، ٤٦٠/٥.

(٤) القلقشندي ٢٠/٤. المقريزي. م. ن. ص.

(٥) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ترجمة محمد بن اسطيفان.

(٦) القلقشندي ٢٠/٤

نەخەن و پێشکەشی بکەن.

هەروەها ئاگاداریشیان دەکاتەوە، چەند لەو پارەیە دەردەچێت ئەویش لە کات و ساتی خۆیدا بەیان بکەن و، لیستی قەرز و پارەی دەوڵەت ئامادە دەکات، خۆ، ئەگەر هات و دەرکەوت، پارەیەك هەبووە پشتگوێی خستووە، یان پێشکەشی بە میری نەکردووە یان دوای خستووە، یان سەرانەی وەرنەگرتووە، ئەوا پێویستە تەگبیری حاڵی خۆی بکات[1]. (القلقشندي)یش دیسان بەم شێوەیە وەسفی دەکات، پاشان دەڵێت: باجگر هەند پلەی بەرز بووە، (الحريري) لە مەقاماتەکەیدا، گوتوویەتی: (باجگر جەمسەری دیوانە) [2]. ئەو قسەیەش عاجباتی نییە و، لە هیچە نەگوتراوە، راستت دەوێ، بەرپرس بووە لە بن چاو خستنی (مراقبة) حساب و حسابکاریی دەوڵەت و، بە دەستی خۆی ئەنجامی پشکنینەکانی دەنووسی و هەر نووسراوێکیش پێوەندیی بەکاروباری داراییەوە بووبێت، دانەیەکی لەبەر دەگرتەوە[3]. بۆ پشکنینیش دەردەچوو و دەگەڕا، چاودێریی کاروباری داراییی دەوڵەتی دەکرد و[4]، داهاتی پارە و خەلە (دەغڵ و دان) و مەڕوماڵاتیشی کۆدەکردەوە و، بە ژماردن و بە کێش و سەنگ و بە پێوانە، هەمووی بە جیا دەنووسی و لە دەفتەری دەدان[5]. لەبەر ئەوە گرنگیی ئەم دیوانە بەپلەی دووەم لە خوار وەزارەتەوە دەهات[6].

لەبەر ئەوە، ئەو کەسەی سەرۆکایەتیی ئەم دیوانەی دەکرد، پێویست بوو، مەرج و شەرتوشرووتی دیارکراوی تێدا فەراهەم بێت. (عباس إقبال) دەڵێت: لەناو

(١) الأسعد ابن مماتي، قوانين الدواوين، ص ٣٠١.

(٢) القلقشندي ٤٦٦/٥.

(٣) النويري، نهاية الأرب ٣٠٢/٨.

(٤) حسين امين، تأريخ العراق في العصر السلجوقي ١٩٧.

(٥) النويري، ن. ص.

(٦) البنداري، تأريخ آل سلجوق، ص ٩٢. ابن خلكان ٢٩٧/٣. إبن ابي عذيبة، ص ٣١٢. عباس اقبال ((وزارت در عهد...)) ص ٢٢.

کۆمەڵگەدا بەدمڕاست و لە خوا ترس لە قەڵەم دەدرا و، لە نهێنییەکانی سەروسەختی نێوان خەڵکی دەزانی و، حساب و حسابکاریی زەبت دەکرد و، پیاوێکی قاڵ بوو، لە ئوسووڵی دەزانی و، قەڵەمەکەشی حوکمی هەقیانەتی دەنووسی و، گەواهی دروستی دەردەبڕی و، هەق و ناهەقی لێك جیا دەکردەوە، چونکە بناغەی بەرژەوەندی گشتی و، ڕێکخستنی کاروباری سەڵتەنەت، لەسەر ئەو قەڵەمەی ئەو بنیاد دەنراو، پاراستنی موڵك و ماڵ و سامانی گەنجینەی دەوڵەتیش بەوەوە بەندبوو[1]. (إبن خلكان)یش، باسی باجگری هەولێری کردووە و، دەڵێت: (پلەو پایەیەکی بەرز بوو، بە پلەی دووەم لە دوای وەزارەتەوە دەهات[2]، ئەم وەزیفەیە بەر لە سەردەمی ئەتابەگیان، لە سەردەمی ئەمارەتی کوردی هەزەبانیانیشدا، هەر هەبووە) [3]

وا دیارە، ئەم وەزیفە و مەسنەتە، تەنیا، هەر بەدەستی بنەماڵەی (ابن المستوفي)ی ناودارەوە بووە. هیچ بەڵگەیەکیشمان بەدەستەوە نییە کە بێجگە لەو بنەماڵەیە، کەسێکی دی ئەو وەزیفەیەی وەرگرتبێ. (ابن الشعار) دەڵێت: «باپیرەی ـ ابن المستوفي ـ دەچێتەوە سەر وەچەکانی ـ النعمان بن المنذر بن ماء السماء اللخمي ـ کە مەلیکێك بووە لە مەلیکەکانی ـ الحيرة ـ، خۆی و کوڕەکانی، لە سەردەمی حوکمی ـ الأمير ابو الهيجاء الحسين بن موسى بن جكو الهذباني الكوردي ـدا، هاتوونەتە هەولێر و، لە دیوانی ئەم میرە کوردەدا باجگر بووە» [4]، ئەم مێژوونووسە، ئنجا دەڵێت: ئەم ماڵباتە، بە باجگر شۆرەتیان ڕۆیشت چونکە زۆربەیان باجگرییان کردووە، باوکی (ابن المستوفي) و باپیری و خۆی و باپیری باوکی و، مامی و، خاڵەکانیشی باجگرییان کردووە. (ابن المستوفي) وەك کۆڵەکەی ئەم بنەماڵەیە بووە و،

---

(١) عباس اقبال، ص ٣٦.

(٢) ابن خلكان ٢٩٧/٣. ابن ابي عذيبة، ص ٣١٢.

(٣) ابن الشعار، جـ ٦، ورقة ١٧.

(٤) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٦، ورقة (١٧) وما بعدها، ترجمة المبارك — ابن المستوفي.

خۆی سەرۆکایەتییانی کردووە[١].

(ابن خلكان) دەڵێت: باوکی (ابن المستوفي) لە هەولێر باجگر بووە، (صفي الدين أبو الحسن علي بن المبارك)ی[٢] مامیشی باجگریی کردووە. بەڵام (ابن المستوفي)، خۆی، کە ئەم وەزیفەیەی وەرگرت، زۆر وەستایانە کاروباری دیوان و، راگرتن و جێبەجێکردنی یاساکانی هەڵدەسووڕاند و[٣]، بۆ ماوەی چل ساڵ، بە خۆڕایی خزمەتی تەلاری هەولێری کرد، بەبێ ئەوەی هیچ مووچەو پاداشتێك وەربگرێت[٤]، چونکە دەیویست سەری سەلامەت بێت و، موزەففەرەددین گۆکبوری لە بەندیخانەی نەهاوێ وەك زۆربەی سەرەك دیوانەکانی تر[٥]. بەڵام، ئەوەش دادی نەداو لە غەزەبی سەرداری هەولێر بێوەی نەبوو، ئەوەبوو حەپسی کرد و، مەچەکی لە زنجیر دا و، حەوت هەزار دیناریشی لێ سەند، پاشان لە ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣١ز)دا ئازادی کرد و، پۆستی وەزارەتی هەولێری پێدا.

## ح- دیوانی خاروبار (الاهراء): [٦]

بەر لە سەردەمی سیستەمی ئەتابەگایەتی، ماوەیەکی دوور و درێژ، ناوی ئەم دیوانە بزر بوو، باسوخواسی نەبوو، رەنگە دیوانەکە، خۆی هەبووبێ بەڵام ناوی نەبوو، چونکە دیوانێك لە دەوڵەتێکی شارستانیدا، رۆڵێکی گەورە بگێرێت، بزر نابێت و دەمێنێت، دووریش نییە ناوەکەیان گۆڕیبێت و، بەهەرحاڵ، دیوانی خاروبار

---

(١) م. ن.

(٢) ابن خلكان ١٥١/٤، ط بيروت.

(٣) ن. م. ١٤٧/٤، ط بيروت.

(٤) ابن الشعار، م. ن.

(٥) م. ن، جـ ٩، ورقة ٩٣.

(٦) (محمد مرتضى الزبيدي): پێناسەی ئەم دیوانە دەکات، دەڵێت: الاهراء: - واتا خاروبار: خانوویەکی گەورەیە، خۆراکی سوڵتانی تێدا دادەکرێ، بنۆڕە: (تاج العروس) ٤١٠/١٠.

هەر هەبووە، چونکە دەوڵەت نییە ئەو دیوانەی نەبێ.

(ابـن ممـاتی) پێناسـەی ئـەم دیوانـە دەکـات و دەڵێـت: ((کۆگاگەلێکـە، داهـاتی دەغڵودانی میریـی لێ دادەکـەن و تـافتی دەکـەن، ئـەو بەشەشـی رەزامەنـدیی لەسـەر کرابێ لێی دەردەکەن[1].

(ابن شاهین الظاهري)یش[2]هەروا دەڵێ. (القلقشندی) [3]باسـی ئـەوە دەکـات، ئـەم دەغڵودانە چۆن چۆنی لە کیسە دەکرا و کیسەکانیان مۆر دەکرد و، تـا، کۆنەکـە مابـا، تازەکـەیان بـەکار نـەدەبرد[4]. دەشـتوانین بڵـێین وەك سـایلۆکانی ئـەم سـەردەمە دەغڵودان و خۆراکی وشکەیان لەو کۆگایانە دەکرد.

بێگومان، ئەم جۆرە دیوانە، لە ناوچەیەکی پڕ لە دەغڵودانی وەك هـەولێردا، کـە گەلێ جار دەبـووە قـەرارگای لەشـکر و، چالاکیی سـەربازی چ بـەهۆی شەڕوشـۆڕی لـە دژی ئـەمارەتی موسـڵ و چ بـەهۆی لەشکرکێـشیی مـەگۆلان، گرنگییـەکی گـەورەی هەبووە، ئەمە جگە لەوەی کـە ئـەمارەتی هـەولێر لـە بنەڕەتـدا لەسـەر سیـستەمێکی نیمچە سەربازی دامەزرابوو.

(اسحق بـن معـالي ابـن شمـاس ابـن هبـة الله بـن ابـراهیم بـن شمـاس بـن ابـراهیم الأربلی) کە برازای وەزیری هەولێر (أبو الحسن علي بـن شمـاس)ی نـاوبراو بـووە، لـە هەولێر سەرپەرشتیی دیوانی خاروباری کردووە.

ئەم (اسحق)ە لە کاروباری ئەندازەو پزیشکی و رۆژانی عارەب سەری دەردەکرد و لێـی دەزانـی. پیـاوێکی ئاکـار چـاکیش بـووە، وەڵێ نـازانین کـەی ئـەو وەزیفەیـەی وەرگرتووە، هەر هەندەی لەسەر زانراوە کە تاکو بـەرایی سـاڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) لەسـەر ئـەم دیوانـە مایـەوە، ئیـدی موزەففـەرەددین گۆکبـوری، لەویـشی هەڵپێـچاو، داوای

(١) الأسعد بن مماتي، قوانین الدواوین، ص ٣٥٠. النویري، نهایة الأرب ٢١٩/٨ — ٢٢٠.

(٢) ابن شاهین الظاهري، زبدة كشف المالك، ص ١٣٢.

(٣) القلقشندي، ٣٣/٤.

(٤) م. ن ١٠١/١٣.

پارەیەکی زۆری لێ کرد، کە پێی هەڵنەدەستا و نەیبوو، لەبەر ئەوە غەزەبی لەویش گرت و هاویشتییە بەندیخانەو، لە زینداندا مایەوە، کابرا، خۆیشی پیر ببوو، هەر لەو ساڵەدا، لە زیندانەکەدا کۆچی دوایی کرد، تەمەنیشی لە شەست ساڵ ترازابوو[١]. ناشزانین دوای گرتنی ئەم، کێ جێگاکەی گرتەوە.

## ط- دیوانی خەمڵ (قەرساندن):

ئیشی ئەم دیوانە ئەوەبوو، سەرپەرشتیی بەروبوومی زەویوزار بکات و پەرەی پێ بدات و زۆری بکات[٢]. ئەمەش ئیشێکی گرنگە و باری دارایی و ئابووریی دەوڵەت لەسەر ئەم دیوانە بەندە، کە وەزیر، یەکەم جار، خۆی سەرپەرشتیی دەکرد[٣]. پاشان ئیشەکەیان سپارد بە کەسێکی دی لەبەر ئەوەی هەند پەرەی سەند و ئیشەکانی هەند زۆر بوون، پێویستی بەوە دەکرد دیوانێك بکەنەوە ئەو هەموو خەمڵ و قەرساندنە بگرێتە ئەستۆ. ئەو بەروبووم و داهاتەش کە بەرپرسی ئەم دیوانە رادەستی دەدرا (وەری دەگرت)، لە خەمڵی دەغڵودانەوە دەهات، یان پارەی نەخت بوو[٤].

بەرپرسی ئەم دیوانە، پێویست بوو لە یاساگەلی سەرۆکایەتی[٥] بزانێت و، لە کاروباری حسابی و حوکمگەلی (زەوییانە)[٦] بە ئاگابێت و، بزانێت باج چۆن چۆنی وەردەگیرێت و، رێژەکەی چۆن دەقەرسێت. دەشتوانین بڵێین ئەم دیوانە وەکو دیوانی (زەوییانە)یە، کە لە قەڵەمڕەوی ئەم ئەمارەتەدا ناونەبراوە. یەك، لەوانەی کە

(١) ابن الشعار، جـ ١ ورقة ٢٣.

(٢) ابن الطقطقى الفخري، ص ٣٠١.

(٣) ص. ن.

(٤) النويري، نهاية الأرب، ٢٧٧/٨.

(٥) ابن الطقطقي، ٣٠٤.

(٦) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٩، ورقة ١٢٢.

سەرپەرشتیی ئەم دیوانەیان لە ئەستۆ گرت: (أبو حامد محمد بن عمر بن علي بن سعد الله بن یوسف بن اسماعیل)ی ناسراو بە (ابن الحدیثی) بووە[1]، کە لە (حدیثة/موسڵ) [2]، لەدایك بووە، بەڵام لە هەولێر گەورە بوو، خوێندنیشی هەر لە هەولێر تەواو کرد. موزەففەرەددین گۆگبوری، سەرپەرشتیی دیوانی خەمڵی پێ سپارد و، کردیشی بە بەرپرسی وەقفی میراتی بێکەسان (المواریث الحشریة) [3].

هەروەها، (أبو البرکات عبدالله ابن أبو الحسن بن أبي الخیر ابن بطرس النصرانی المصري الدمنهوری)یش، دیوانی خەمڵی گرتە ئەستۆ. ئەم پیاوە مەسیحی بوو، لە سەرەتای کاریدا خزمەتی دەوڵەتی (الملك الاشرف موسی ابن الملك العادل)ی دەکرد. پاشان ئەم مەلیکە داوای لێ کرد ببێتە ئیسلام، قایل نەبوو، تا ماوەیەك گرتی و لە زیندانی هاویشت، پاشان ئازادی کرد، ئنجا لە ساڵی (٦١١ك/ ١٢١٤ز)دا ڕووی لە هەولێر کرد و، سەرداری هەولێر دیوانی خەمڵی پێ سپارد، چونکە لە حساباتی دیوان و یاسای زەوییانەی دەزانی. (أبو البرکات) لەسەر ئەم ئیشەی مایەوە تا لە ساڵی (٦٢١ك/١٢٢٤ز)دا[4] گیانی سپارد.

---

(١) م. ن، جـ ٧ ترجمة محمد بن عمر بن علي.

(٢) (حدیثة): شارۆچکەیەکە لەسەر ڕۆژهەڵاتی دیجلة، نزیك زێی گەورە، معجم البلدان ٢/٢٣٠.

(٣) ابن الشعار، و. ن.

مەبەست لە (الحشریة)، لە حەشرەوە هاتووە، واتا مەرگ: (تاج العروس)، ٢/١٤٣. (المواریث الحشریة): ماڵ و سامانی کەسێکە بمرێ و، هیچ کەسێکی نەبێ، نەخزم، نە ژن، نەمنداڵ، نەخاوەن، یان ئەو پارەیەیە کە لە دوای فەرز لە سامانی مردووەکە دەمێنێتەوە: (القلقشندي، صبح الاعشی ٣/٤٦٠).

(٤) ابن الشعار، جـ ٩ ورقة ١٣٢.

### ی- دادوەری (قەزاوەت):

قەزاوەت سەیركردن و یەكلاكردنەوەی ناكۆكی و ململانێیە، حوكمی شەرعی بەسەردا دەسەپێت و جێبەجێ دەكرێت. لە هەموو وەزیفەیەكی ئایینی باڵاتر و بەرێزتر و شایانتر و پلەی بەرزترە[1]. لەبەر ئەوە، ئەو كەسەی ئەم دیوانەی لە ئەستۆ گرتبا، دەبا كۆمەڵێ شەرتوشرووتی تێدا فەراهەم ببێت، وەك بڵێین، دەبا ئەقڵ و ئاوەزی كامڵ بێت و، لە شەرع و ئوسووڵ و زانستی پێویست ئاگادار با و، هەموو ئەندامەكانی لەشی ساغ و سەلامەت با[2]. ئەو مەسەلەو دەعوایانەش كە قازی سەیری دەكردن، ئەوانە بوون كە پێوەندییان بە یەكلاكردنەوەی ناكۆكی و ململانێ و، بڕینەوەی شەڕو، سەندنەوەی ماف و، مەسەلەی دیكەی، بە نموونە، وەك مارەو تەڵاق و میرات و وەسیەت و، دزی و، زیناو، شتی دیكەوە[3]هەبووە.

گوندی كفرعزی[4]، ئەو قازییانەی ئەمارەتی هەولێری لێ هەڵكەوتووە كە ئەمانەن، یەكەمیان: (الشیخ جعفر بن عبدالله الكفر عزي الأربلي)یە كە (ابن المستوفي) وەسفی دەكات و دەڵێت: زانایەكە، لە هەموو زانستێكدا بەهرەمەندە و، لە رێزمان و ئەندازە و بیركاریشدا لێزانە. (ابن سعيد الاندلسي) ئەم وەسفەی لە (ابن

---

(١) القلقشندي، صبح الاعشى ٣٥/٤.

(٢) الماوردي، الاحكام السلطانية، ط ١، القاهرة، ١٩٦٠، ص ٦٥ - ٦٦. النويري، نهاية الأرب، ٢٤٨/٦ - ٢٥٢.

(٣) الماوردي، ن. م. ٧٠ - ٧١. النويری ٢٥٥ - ٢٥٦.

(٤) یان (كفرعزا): باخێكە لە هەولێر: بنۆڕە (ابن سعيد الاندلسي، الغصون اليانعة، ص ٧٨). (یاقوت)یش دەڵێت، گوندێكی هەولێرە، دەكەوێتە نێوان هەولێر و زێی خواروو. قازیی هەولێر خەڵكی ئەو گوندەیە: (معجم البلدان، ٢٧٠/٤).

(الأب، البیر أبونا)یش دەڵێت: مەركەزی هەرێمی (حزە)ی كۆنی هەولێر بووە، ئێستا نازانین جێگاكەی لەكوێدا بووە، دوور نییە مەبەست لە گوندی (سربس عزیز)ی ئێستایە كە لە باشووری هەولێرەوە (١٦كم) دوورە. بنۆڕە (الأب توما اسقف المرج، كتاب الرؤساء ص ١٢٦).

المستوفي)یەوە وەرگرتووە.

(الأندلسي) دەڵێت: باسوخواس و شیعرێکی زۆری ئەم قازییەی، لە لای (المشرف یعقوب الأربلی)[1] دیوە و، دەڵێ وەك گوڵی ناو مەجلیسێکی جوان وایە و، پیاوێکی ئاسایی و خاوەن رای دروستە و، بە قازی و خوتبەخوانی هەولێر دامەزرا[2].

وا دیارە لەو ماوەیەی بەر لە ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣ز)دا، وەزیفەی دادوەریی لە هەولێر گرتبێتە دەست، ئەمەشمان بە دامەزراندنی قازییەکەی دوای خۆیدا بۆ دەردەکەوێ کە دوای ئەو بەروارە قەزاوەتی وەرگرتووە. لەبەر ئەوە، رەنگە (الشیخ جعفر بن عبدالله) یەکەم کەس بووبێ دادوەریی لەم ئەمارەتەدا گرتبێتە ئەستۆ.

ئەم قازییە دەستی لەوەزیفەکەی هەڵگرت و ماوەیەك بە تەریکی مایەوە، لەبەر ئەوە کەس توخنی نەدەکەوت و خۆی لە قەرەی نەدەدا. رۆژێکیان ئیشێکی کەوتە لای کارمەندێکی دیوانی میر، کە ئەم کارمەندە، پێشتر، رۆژێ لەرۆژان قوتابیی خۆی بوو، هیچ رووی نەدایە و رێزی لێ نەگرت، قازییش لە داخانا شیعرێکی دڵشکێنی بەسەر ئەم قوتابییە نمەکبەحەرامەی خۆیدا هەڵدا، بەم چەند بەیتەی خوارەوە دەست پێدەکات:

| | |
|---|---|
| هذا مقامي لديك يا من | اقـــام دهراً وراء بابي |
| اقصـى امانيه قرب إذن | في دولة الحُسنِ والشباب |

واتاکەی

| | |
|---|---|
| ئـاوا، رێزم لێ دەگـــــری | سپڵەی نمەك بەحەرام؟ |
| چەن ساڵ لەبەر دەرگاکەم | هەڵدەتووتای، بە مەرام |
| بـــــەلام دا لە دەوڵەتـــێ | پڕبێ لە گـەنجی نەفام |

دەنگوباسی رەفتاری ئەم کارمەندە لەگەڵ ئەم شێخەدا، گەیشتە موزەففەرەددین

---

(١) (ابو عبدالله الحسين شرف الدين يعقوب الهذباني الأربلي)یە (ت ٦٥٦ك/١٢٥٨ز).

(٢) ابن سعيد الاندلسي، الغصون اليانعة، ص ٥٩.

گۆکبوری و، دەستبەجێ ناردی لە دووی شێخ و پێی گوت: (تۆمان لەیاد کردو، ئاگامان لێت نەماوە، کەسیش ئاگاداری نەکردینەوە، تۆ، خۆت پیاوی چاکیت، دەبوو خۆت ئاگاداریی خۆت بکەیتەوە). ئنجا بڕیاری دا بگەڕێتەوە سەر وەزیفەو، کردی بە خوتبەخوانی مزگەوتەکەی خۆی[1]. شێخیش لەسەر ئەو وەزیفەیە مایەوە، تا لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز)دا، مرد.

(أبو محمد جعفر بن محمد بن محمود بن هبة الله ابن احمد بن يوسف الكفرعزي الأربلي)یش دادوەریی هەولێری گرتەدەست. ئەم قازییە ـ بە قسەی (ابن سعيد) ـ ئیمامێکی شەرعی شافیعی بوو، لە زانستە تازە و کۆنەکانیشدا بەشدار بوو[2]. (ابن الساعي)یش وەسفی دەکات و دەڵێت: زانایەك بوو، هەموو زانستی شەرع و فەرز و حساب و ئەندازە و ئەدەب و قورئانی[3] دەزانی و، دەڵێت: پیاوێکی رۆح سووك و قسە خۆش بوو[4].

لە ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣ز)دا دادوەریی پێ سپێردرا، لە ساڵی ٦٠٤ك/١٢٠٧ز) [5]لەسەر ئەو وەزیفەیە مایەوە و، لەو ساڵەدا مرد. پێدەچێ، دوای قازییەکەی پێش خۆی، ئەو وەزیفەیەی لەدەست گرتبێت، ئەم یاریدەدەریشی هەبوو، یاریدەدەرەکەی (محمد بن علي بن محمد ابن الجارود) بوو، بە (أبو عبدالله الماراني الكفرعزي) دەناسرا، کە دوای مردنی قازیی ناوبراو[6]، ئەم قەزاوەتەکەی وەرگرت. مەلای (الماراني) لەبەردەستی (أبو الفضل رضي الدين يونس بن محمد ابن منعة بن مالك الأربيلي) کە لە ساڵی

---

(١) م. ن. ص.

(٢) الغصون اليانعة ١٦٦.

(٣) الجامع المختصر ٢٤٣/٩.

(٤) الغصون اليانعة، ص. ن.

(٥) الجامع المختصر، ص. ن.

(٦) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٧ (ترجمة محمد بن علي بن محمد).

(٥٧٦ك/١١٨٠ز)دا[1] مردووه دەرسی شەرعی تەواو کرد. (الماراني) ماوەی بیست و پێنج ساڵ لەسەر وەزیفەی دادوەریی هەولێر مایەوە، تا لە نیوەی ساڵی (٦٢٩ك/١٢٣٢ز)دا کۆچی دوایی کرد و، تەمەنیشی لە هەشتا بەرەو ژوور بوو. (ابن الشعار)ی هاوچەرخی وەسفی دەکات و دەڵێت: لە هەموو حاکمەکان باشتر بوو، حوکمی ئەو لە هەموو رۆژێ جوانتر بوو، داوێنپاك و دەستپاك بوو... بە ئاوەز بوو، گرانیش و خاکەڕایش بوو، ئاکاری چاك بوو، بە وێڵ بوو[2].

## ك- دیوانی پرسینەوەی شکات (النظر في المظالم):

ئەم وەزیفەیە لە وڵاتانی ئیسلامدا بە وەزیفەیەکی گرنگ و گەورە دادەنرێت، چونکە وەزیفەیەکی ناسکەو، پێوەندیی بە گێڕانەوەی مافی مەزڵووم و ستەم لێکراوانەوە هەیە. بۆ ئەم ئیشەش دەستەیەك پێکدەهێنرا، ئیشی ئەوە بوو، ترس بخاتە دڵ و رێگای ستەمکاران و سزایان بدات، سا، بە هەر شێواز و بە هەر هۆیەك ئەو ستەمەیان کردبێ، کەسێکیش کە دەبوو بە سەرۆکی ئەو دەستەیە پێی دەگوترا سەرۆکی پرسینەوەی شکات، پێویست بوو کۆمەڵێ شەرتوشرووتی تێدا فەراهەم بێت، دەبوو قەدر و حورمەتی خۆی هەبێت، فەرمانبەجێ بێت، بە هەیبەت بێت، پاکرەوشت بێت، کەم تەماع بێت و زۆریش لەخواترس بێت و، قازییەکی بەلگە بەدەست و چەسپاو بێت[3]، یا، وەکو (قدامة بن جعفر) دەڵێت: (پێویستە هەقیانەتیش بێت و بە بەزەییش بێت[4]).

وا دیارە ئەم شەرتوشرووت و خەسڵەتانە، لە (محمد بن محمود بن محمد ابن

---

(١) گەورەی بنەماڵەی (ابن منعة)ی ناسراوی هەولێرییە، - کە باسمان کرد-.

(٢) ابن الشعار، ن. و. ن.

(٣) الماوردي، الاحكام السلطانية، ص ٧٧. النويري، نهاية الأرب ٣٦٥/٦.

القريزي، الخطط ٢٠٧/٢.

(٤) قدامة ابن جعفر، مخطوط (صنعة الكتابة) ورقة ٤٤.

مقداد بن فارس الحراني)دا هەبوو، کە بە (أبو عبدالله ابن الثناء) دەناسراو، کوڕی وەزیرەکەی هەولێریش بوو.

میر موزەففەرەددین گۆکبوری، سەرداری (حرّان) بوو، بەلام کە گەڕایەوە بۆ سەر تەخت و تەلاری ئەمارەتی هەولێر، ئەو دووانەشی ( وەزیر و کوڕەکەشی) لەگەڵ خۆیدا هێنان. (ابن الشعار) ـ لە زمان (ابن المستوفي)یەوە ـ وەسفی (أبو عبدالله) دەکات و دەڵێت: هەند بە هەیبەت بوو، خەڵك لێی دەترسان[1]، بەلام، ئەم مێژوونووسە نازانێ (أبو عبدالله) کەینێ دادوەریی هەولێری گرتووەتە دەست، وەلێ گوتوویەتی کە لە ساڵی (٦١٢ك/١٢١٥ز)دا مردووە و، لە دەرەوەی شارەکە نێژراوە[2]. ناشزانین، پاش ئەو، کێ دیوانی پرسینەوەی شکاتی وەرگرتووە. پێدەچێ، پاش ئەو، درابێت بە قازی.

## ل- سەرکاری (الحسبة):

ئەم وەزیفەیە، بە پێی پێداویست هاتە گۆڕێ، لەوەپێش نەبوو، بەلام کاتێ کە قازی ئیشی زۆری کەوتە سەر شان و، ئیدی نەیدەتوانی، بە تەنیا هەموو کارو بارێکی شەرعی ئیسلامی لە کۆمەڵگەدا بخاتە کار و ئیشەکان زیادیان کرد، ئەو ناچارییە وەهای کرد، وەزیفەی نوێ، بۆ ئاسانکردن و بەڕێخستنی ئیشەکانی قازی، پەیدا ببێت، ئیتر، بەو جۆرە، ئەم وەزیفەی سەرکارییە هاتە گۆڕێ کە لە بنەڕەتدا وەزیفەیەکی ئایینی بوو، بە پێی ڕێسای (ئەمر بە چاکەو، نەهی لە خراپە) [3].

راستیشت دەوێ گەورەبوونی شارەکە و زۆربوونی بازاڕ کارێکی وەهای کرد، ئەوانەی لە یەك پیشەدا کاردەکەن، لەیەك جێگەی تایبەت بە خۆیاندا خڕ ببنەوە و

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان ١٨٧/٦.

(٢) و. ن.

(٣) الماوردي، الاحكام السلطانية، ص ٢٤٠. النويري، نهاية الأرب، ٢٩١/٦. ابن خلدون، مقدمة ٣٩٨. القلقشندی، صبح الاعشى ٣٧/٤.

یەك بگرن و لەناو یەك سیستەمدا خۆیان ڕێکبخەن.

بەمەش وەزیفەیەکی تازە بۆ دەوڵەت هاتە پێش، ئەوەبوو کە سەرپەرشتی لەسەر بازاڕەکان دانا. بەو جۆرە ئەم وەزیفەی سەرکارییە بۆ سەرپەرشتیی بازاڕەکان پەیدا بوو، بە ئامانجی ئەوەی هەم سەرپەرشتیی بازاڕەکان بکات و، هەمیش بەرژەوەندی بەکاربەران[1] لە پێدرێژیی دوکاندار و فرۆشیاران بپارێزێت. ئەم وەزیفە فەرمییە لە سەرەتای پەیدابوونی شارەکاندا، لە وڵاتانی ئیسلامدا نەبوو، چونکە ئەو شارانە، بچووك بوون، سادە و ساکار بوون، پێویستییان بەم جۆرە وەزیفە و خزمەتە نەبوو. بەڵام کاتێ شارەکان پەرەیان سەند و گەورە بوون، ئەوە، وەهای کرد کە سەرکاریش دابمەزرێت و، بوو بە وەزیفەیەکی پێویست، سەرکاریش بۆ ئەوەی ئیشەکانی خۆی ئەنجام بدات و، لە بازاڕ و شەقامەکاندا بگەڕێ و، سەر لە بنکەکانی خزمەتی کۆمەڵایەتیی، بە نموونە، وەك گەرماو (حەمام) و قوتابخانەو مزگەوتەکان بدات و گرانفرۆشان و بەدڕەفتاران بگرێت و سزایان بدات دەسەڵاتی فراوانی لە لایەن سەردارەوە پێدرا، بۆ ئەوە ئەو ئیشانە بە پوختی و بە بێ ترس بە جێ بگەیێنێت و پیاو خراپان تەمێ بکات[2] حوکمەکانی سەرکاری ببوونە پردی پێوەندی لە نێوان حوکمەکانی دادوەری و حوکمەکانی شکاتدا، چونکە سەرکاری بۆ ترساندن ئامادە بوو، ئەگەر هێز و فشاریشی بەکار خستبا، بە زێدەڕۆیی و لادان لە قەڵەم نەدەدرا و کەس نەیدەتوانی بڵێ سەرکار سەرپێچی کردووە. بەڵام دادوەری بۆ وەرگرتنەوەی مافی کەسێك لە کەسێکی دی دانراوە، وەڵێ بە سەبر و بە حورمەت[3].

---

(١) د. عبدالعزيز الدوري ((نشوء الاصناف والحرف في الاسلام)) مجلة كلية الاداب، جامعة بغداد، العدد(١) لسنة ١٩٥٩، ص ١٥٠. د. حسام الدين السامرائي، ص ٣١٩.

(٢) تەمێکردن (التعزير): جۆرێکە لە ئەدەبدادان، بە دەم یان بە لێدان (بە قامچی، کە سەرکار بۆ ئەو مەبەستە بەکاری دەهێنا) یان بە هەردووکیان بە مەرجێ سووکایەتیی تێدا نەبێت: (الماوردي، الأحكام السلطانية ٢٣٦ — ٢٣٩.)

(٣) م. ن. ص ٢٤٢. النويري، نهاية الارب ٢٩٥/٦.

حوکمەکانی سەرکاری هەندەی حوکمەکانی قازی ترسناك و، سانا مەبەست نەبوو، هەر دەتگوت، سەرکاری بۆ خزمەتی دادوەری و قەزاوەت رەخساوە[1].

(الماوردي) درێژە بە شرۆڤەی ئەرك و فرمانی سەرکار دەداو، دابەشی دەکات بەسەر: ئەرکی ئایینی و، مافی مرۆڤ و، بەد ڕەفتاریدا[2]. دەشتوانین ئەم ئەرك و فرمانە، بەکورتی بخەینە بەرچاو و، بڵێین بریتین لە: چاودێریی ئاوی پاك و دابەشکردنی بەسەر خەڵکدا، پاراستنی شوورەی شار، تەمێکردنی ئەوانەی بە ئاشکرا مەی دەخۆنەوە و رژاندنی مەیەکەیان، تەمێکردنی ئەوانەی ئیشی بەد و ناشیرینی، بە نموونە، وەك زیناو، فرۆشتنی خۆراك و کەلوپەلی خراپ و ساختە و، بە ئاشکرا لێدانی موسیقاو، سەرپەرشتیی بازاڕ و، پاکوتەمیزیی بازاڕ و قەدەغە کردنی فڕوفێڵ و خەڵەتاندن و رێگاگرتنی ناو بازاڕ. نەشیاندەهێشت حەماڵەکان باری قورس هەڵبگرن و، شارێکیش رووبار و دەریای هەبا نەیان دەهێشت کەشتی و گەمیَ باری لە توانستی خۆی زیاتر باربکات[3].

ئەم کێشە و گرفتە هەولێریشی گرتەوە، چونکە هەولێریش وەك شارە گەورەکانی تری ولاتانی ئیسلام پەرەی سەند و، بوو بە پایتەختی ئەمارەتێکی گەورە، لەبەر ئەوە، دیوانی سەرکاریشی تێدا کرایەوە. (ابن الشعار)یش دەڵێت: لە

---

(١) إبن خلدون، مقدمة، ص ٣٩٩.

(٢) الماوردي ٢٤٧ — ٢٥٩.

(٣) ابن خلدون، ن. م. ص. چەندین کتێبیش لەسەر ئەرك و فرمانی سەرکار دانراون کە لە بازاڕدا چ دەکەن و چ ناکەن، بە نموونە، وەك کتێبی (نهاية الرتبة في طلب الحسبة)ی (محمد بن احمد)، (ابن بسام المحتسب: تحقيق الدكتور حسام الدين السامرائي. (الرتبة في طلب الحسبة)، ابو الحسن على محمد الماوردي. (معالم القربة في أحكام الحسبة)، محمد بن احمد القرشي. (الحسبة في الاسلام) ابن تيمية، وغيرها. لە حەدیسخوانەکانیش: على حسن فهمي، وابراهيم دسوقي الشهاوى، ونقولا زيادة. دەشتوانین ئیشەکانی سەرکاری وەك هەموو خزمەتەکانی شارەوانی و، وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و پۆلیسخانە و کۆگا فرۆشیارەکانی حکومی دابنێین.

هەولێردا بنەماڵەیەك هەبوو، زەلامەكانی زۆربەیان ئەم سەركارییەیان وەرگرتبوو، ئنجا دەڵێت: (ابن المحتسب الاربلي ابراهيم بن عمر بن محمد بن علي بن جامع الأربلي) سەركاریی لە هەولێر گرتەدەست، هەروەها باوكیشی، پاشان كوڕەكەیشی، بەڵكو، كۆمەڵێكیش لە باپیرانی[1] ئەم وەزیفەیەیان وەرگرتووە. ئێمە هیچ شتێك لە رەوشی ئەوانە نازانین، هەندە نەبێ، كە (ابن المحتسب)ی ناوبراو، كە سەركاریی هەولێری گرتە دەست، لە ساڵی (٥٩٢ك/١١٩٦ز)دا لەدایك بووە. مادامێكی باو و باپیرانی (ابن المحتسب)یش ئەم وەزیفەیەیان لە دەست گرتبێ، كەواتە، ئەم دیوانی سەركارییە، لە هەولێردا، بەرلە سەردەمی ئەتابەگیانیش، هەر هەبووە.

ناوی (ابن محتسب الأربلی)یەكی دیكەش، لە باسوخواسی ساڵی (٦٩٠ك/ ١٢٩١ز)دا بەرچاو دەكەوێت، واتا لە ماوەی پاش سەردەمی ئەتابەگیاندا، لەو ماوەیەدا كە سەرلەبەری ناوچەكە كەوتبووە ژێر دەستی مەگۆلە ئێلخانیەكانەوە، ناوی (امین الدین ابن المحتسب الاربلی) بووە[2]. ناشزانین هەر لە بنەماڵەی (ابن المحتسب)ی یەكەم بووە، یان، نا، یانیش ئەم سەركارییە، پاش ساڵی (٦٥٩ك/١٢٥٨ز) كە مەگۆل هەولێریان داگیركرد هەر بەردەوام بووە، چونكە دیوانی سەركاری، لە هەموو شارەكانی عیراقدا، لە دوا سەردەمی عەبباسیانیشدا، لە سیستەمی حوكمدا هەر هەبووە و بەردەوامیش بووە. لە سەردەمی ئێلخانیانیشدا، هەر وەكو خۆی مابوو، سەركاری سەربەخۆ هەبوون، دەسەڵاتی دادوەرییان بەسەرەوە نەبوو. كەچی لە هەندێ شاردا نەماو بزر بوو، بەڵام قازی ئیشەكەی خۆی و ئیشەكەی ئەویشی دەكرد[3].

وا دیارە، ئەم حاڵەتەی دوایین لە ئەتابەگایەتیی موسڵدا بووبێت. پسپۆڕێك

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان ٥/ ١١١.

(٢) ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق لسنة ١٩٥٦، ص ٣٩٧.

(٣) د. جعفر خصباك، العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص ٧٢.

دەڵێت: لەو سەردەمە دوورودرێژەی (بدرالدین لؤلؤ)دا[١]، وەزیفەی سەركاری هەر ناویشی نەبووە. لە ماوەی حوكمی پێش (بدرالدین لؤلؤ)یشدا[٢]، هەر نەبووە، هەرچەندیشە نەبوونی وەزیفەی سەركاری لە ئەمارەتێكی وەك موسڵدا حاڵەتێكی عاجباتییەو، پیاو سەری لێی سوور دەمێنێ.

## دوو: أ- سیستەمی لەشكری ئەمارەتی هەولێر:

هەرچەندیشە، میر (زین الدین یوسف ینالتگین) و (موزەففەرەددین گۆكبوری) بزاڤ و چالاكیی لەشكر و لەشكرسازییان هەبووە، وەلێ لەبارەی لەشكری ئەمارەتەكەو رێكخستنی لەشكر و سەربازان زانیاریمان دەست نەكەوت. ناشزانین ژمارەی تیپەكان چەند بووە و لە چ جۆرە توخمێك پێكهاتبوون و، سەربازان بە دراوی نەخت مووچەیان وەردەگرت یان لە جیاتی دراو ئازووقەیان پێدەدان. هەر بەو جۆرەش، نازانین، میر، لە لەشكركێشیدا، چ جۆرە پلانێكی دادەنا یان چ پلانێكی پێڕۆ دەكرد، هەرچەندیشە هەولێر ئەمارەتێكی سەربەخۆ بووە و، گەلێكیش بەرەوچاتر گۆڕاوە و، سیستەمی ئیداری و دارایی و دادوەریی خۆی هەبووە و، دامودەزگای فەرمیی ئەوتۆشی هەبووە، ئیدی، هەر بە تەواوەتی دەوڵەتێك بوو، بۆخۆی[٣].

لەگەڵ ئەوەشدا، چەند سەرە قەڵەمێكی كەم و كورت كە باسی شەڕ و جەنگی ئەو دوو میرە دەكات كە دژ بە دوژمنی ئەمارەتەكە كردوویانە، قەبارە و توانستی

---

(١) سوادي عبد محمد الرويشدى، امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ص ١٧٣.

(٢) د. عماد الدين خليل، عمادالدين زنگی، ص ٢٣٣ وما بعدها.

رشيد الجميلي، دولة الاتابكه في الموصل، ص ٢٣٥ — ٢٤٨.

(٣) بنۆڕە: (د. احسان عباس) پێشەكیی (وفيات الاعيان)دا، ط ١٩٧١ بیروت، جـ ٧، ص ١٣، دەڵێت: هەولێر لە سەردەمی موزەففەرەددین گۆكبوریدا، هەموو پلان و دیوان و دامودەزگای دەوڵەتێكی سەربەخۆی بۆ رەخسابوو.

لەشــکری ئەمارەتەکــەمان بــۆ ســاغ دەکاتــەوە و، بگــرە، چــۆنێتیی ڕێکخــستنی لەشکرەکەشمان بۆ دەردەخات. ئـەوەتا (العماد الكاتب) وەسفی لەشکری ئـەمارەتی هــەولێر دەکـات کــە لــە ســاڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ز)دا گەیــشتە فەلەســتین و لــە شــەڕی خاچـدروشماندا ئامادە بـوو، دەڵێت: ((سـەرداری هـەولێر گەیـشتە جێ و لەشکرێکی هێنـاوە وەك گەڵاڵـە هـەور و تاومبارانـە، وەك بەرەکـەتی گـوانی حوشـتر و[1]، هـەر ئامرازێکی بۆ سەرکەوتن پێویـست بێت، لەگەڵ خـۆی هێنـاوێتی))[2]. دەتـوانین لـەم وەسـفەوە، گـەورەیی ئـەو لەشـکرە بێنینـە بەرچـاو، هەرچەنـدیـشە، (العمـاد الكاتـب) زۆری ناوەتە بانی، ئەوەش، لەبەر ئەوەیە کە ئەم (الأصفهاني)یـە بایـەخ بەنووسینی وشــەگەلی هاوئاهــەنگ دەدات، هەنــدە بەتــەنگ ماناکەیــەوە نییــە. بەهــەرحاڵ، گــەورەیی و گرنگیــی لەشــکری هــەولێرمان لــە شــەڕەکانی (زیــن یوســف)دا، بــۆ دەردەکەوێت، کە هێرشی لەشکری ئازەربێجانی تێکشکاند، ئەوانەی کـە هـاتبوون، لـە ژێـر فەرمانـدەی (مجاهدالـدین قایمـاز)دا هـەولێر داگـیر بکـەن، ئـەوە بـوو، پێـشتریش باسمان کرد، ئەتابەگی موسڵ، هانـای بـرد بـۆ مـەلیکی ئازەربێجـان کـە هـەولێری بـۆ داگیربکات، ئەویش، سێ هەزار سەربازی ناردە سـەر ڕێگاوبـان و دەوروبـەری هـەولێر، گونـد و زەوی و زاری خەڵکەکـەیان وێـران کـرد، بـەڵام چـاك بـوو، لەشـکری هـەولێر گەیشتە سەریان و ڕاوی نانەوە بەرەو وڵاتی خۆیان.

پێویستیش ناکات باسی ئەو شەڕانەی خاچدروشمان بکـەین کـە موزەففـەرەددین گۆگبوری تێیدا بەشداریی کردووە، چونکە، خۆی، هەتا ئەوکاتەش نەگەڕاوەتـەوە بـۆ هەولێر، بەڵام گرنگ ئەوەیـە باسـی پێکدادانی خـۆی و (بدرالـدین لؤلـؤ) بکـەین کـە ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) ڕووی دا و، (الملك الاشرف)یش، کۆیلەکەی خۆی: (الأمـیر عزالـدین أیبگ)ی ناردبوو بۆ کۆمەکی (بدرالدین لؤلؤ)، ئـەوەبوو (أیبـگ) گەیـشتە لای (لؤلـؤ).

---

(١) گۆپکـەی گـوانی حوشـتر (اخـلاف)، بـە یـەك گـوانی دەڵـێن: (خلـف) مەبەسـتی لـە بەرەکـەتی لەشکرەکەو سەرکەوتنەکەیە: (الفتح القسی، ص ٣٨٣/الهامش، ط ١٩٦٥).

(٢) الفتح القسي، ص ٣٨٣ ط/١٩٦٥.

(ابن الاثیر) دەڵێت: ئەم فەرماندارە، - کە فەرماندەی باڵی راستی لەشکری موسڵ بوو - خـۆی و لقەکـەی[١](اطـلاب) هێرشـیان کـردە سـەر بـاڵی چـەپی لەشـکرەکەی موزەففەرەددین گۆکبوری کە (عمادالدین زەنگی)ی زاوای فەرماندەیی دەکرد. پاشان باڵی راستی لەشکری هەولێر بەسەر باڵی چەپی لەشکری موسڵدا سەرکەوت. هەرچی موزەففەرەددین گۆکبوری، بوو، ئەوە، ئەو لەناو جەرگەی لەشکرەکەی خۆیدا بـوو[٢].

بەم وەسفە کورتەدا دەردەکەوێ لەشکری هەولێر چۆن چۆنی رێك دەخرا، کە زۆرتـر لەوە دەچێ، هەروەکو لەشکری ئەتابەگەکانی موسڵ رێکخرابێت. ئـەوەش کـە زۆرتـر بەلای ئێمەوە گرنگە، ئەوەیە کە سیستەمی (لق) و (پەل) هەبووە، بەڵام نـە ژمـارەی لقەکان دەزانین و، نە ژمـارەی سـەربازەکانی هەریەکـە لـەو لقانـە دەزانـین. دووریـش نییە ئەتابەگەکان هەمان سیستەمی لەشکری سەلجووقیانیان بەرەو چاتر گۆڕیبـێ و پێڕۆیان کردبێ ـ لەشکری سەلجووقیانیش لەسـەر سیـستەمی پلەبەپلـە رێکخرابـوو، لە ئەڵقەیـەکی بچووکی پێـنج کۆیلەییـەوە دەسـتی پێـدەکرد «پێـنج سـەرباز»، ئنجا

---

(١) لـق، (اطـلاب)، (طلـب) مانـای ئەوەیـە، میرێـك دووسـەد سـواری بەدەسـتە بـۆ کـاتی شـەڕ. بـە فەرمانداری سەدوحەفتا سەربازیش دەڵێن (سەرلق - طلب)، ئـەم نـاوەش، (وشـەیەش) یەکـەم جار لـە میـسر و شـام سـەلاحەدینی ئـەیوبی دایهێنـا، پاشـان بـوو بـە بـەتالیۆن (Battalion)؛ (السلوك، جـ١ ق ١، ص ٢٤٨/الهامش) العماد. سبط ابـن الجوزی، الفـتح القسی، ط القـاهرة ١٩٦٥ ص ٦٩/الهامش. بەڵام (سبط ابـن الجوزی) دەڵێـت: یـەك لـق پێـنج سـەد سـوارە؛ مـرآة الزمـان، ٦٩٥/٨).

وەرگێڕ: سیستەمی رێکخستنی (ل. ش. ك) واتا لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان/ئەیلول، زۆر لەوەی ئەیوبییان دەچوو، بە نموونە (لقی حـەوت/شـوان/کارێزەی خاڵخـالان (٣١٢ — ٣٣٢) پێشمەرگە بوو، (یەك لق (٣) پەل بوو، یەك پەلیش (٣) دەسـتە بـوو)، پاشـان چوار لقیش کـرا بـە یـەك بەتالیۆن) واتا یەك بەتالیۆن دەگەیشتە (٥٠٠ — ٧٠٠) پێشمەرگە (لە گەرمیان). هەریەکـە لـەم لق و پەل و دەستانەش بەرپرسی عەسکەریی خۆی هەبوو لەگەڵ یاریدەدەر. هـەموو لقێکیش رابەری سیاسیی هەبوو. (وەرگێڕ)

(٢) ابن الاثیر. الکامل، ٢٤٠/١٢

بەرەبەرە گەورەتر دەبوو تا دەگەیشتە گەورەترین میر کە سەرپەرشتیی هەزار سەربازی دەکرد بە (گەورەی هەزاران) ناو دەبرا، یان گەورەی سەدان[1]. گەورەی سەدان، سەد کۆیلەی لە ژێر دەستدا بوو. بەهەرحاڵ، پێدەچێ موزەففەرەددین گۆکبوری سیستەمی سەربازیی سەلجووقیانی بەکارهێنابێ، یان سیستەمی لەشکری ئەییوبیانی پێڕۆ کردبێ، چونکە سیستەمی ئەتابەگەکانی هەولێر و ئەتابەگەکانی دیکەش، هەروەك سیستەمی سەلجووقیان لە قەڵەم دەدرێت لەوانەوە ماوەتەوە و بووەتە ئەڵقەیەك لە نێوان ئەمان و سیستەمی سەربازیی دەوڵەتی ئەییوبیدا[2]، کە پاشتر زۆربەی ئەتابەگایەتییەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەییوبیانەوە. ئەوە بوو، موزەففەرەددین گۆکبوری و (زین الدین یوسف)ی برایشی ماوەیەکی زۆر چوونە ریزەکانی لەشکری سەلاحەددینی ئەییوبی و لە شەڕی خاچدروشماندا بەشدارییان کرد، دووریش نییە لە لەشکری ئەییوبییەوە فێری سیستەمی سەربازیی ئەوان بووبن و، بۆ رێکخستنی لەشکری ئەمارەتەکەی خۆیان، بە پێی پێویست پێڕۆیان کردبێت.

لە بارەی قەبارەو گەورەیی لەشکری هەولێرەوە هیچ سەرڕوشتەیەکمان نییە بەڵام بە پێی قەرساندێك کە (ابن الاثیر) باسی دەکات، دەتوانین بەراوردی بکەین لەگەڵ لەشکری موسڵ، لێرەدا (ابن الاثیر) (العماد الکاتب) بە درۆ دەخاتەوە کە گاڵتەی بە ئازایەتیی لەشکری موصڵ کردووە و گوتوویەتی، لەشکری موسڵ لە شەڕەکەی ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز)دا هیچ ئازایەتییەکی نەنواندووە، چونکە ئەم لەشکرە

---

(١) محمد مصطفی زیادة، حاشیة السلوك – للمقریزی، ص ٢٣٩.

(٢) حسن ابراهیم حسن، تأریخ الاسلام السیاسي، جـ ٤، ص ٣٦٢.

ابراهیم علی طرخان، النظم الاقطاعیة ٣٠ – ٣١.

د. سعداوي، التأریخ الحربي المصري، ص ٢. بنۆڕە، بزانە (القلقشندی)، هەر بەم مانایە، لە (صبح الأعشی ٥/٤)دا دەڵێت: (دەوڵەتی ئەییوبی هەر ئەو سیستەمەی دەوڵەتی (عمادالدین زەنگی) موسڵ و، دەوڵەتی (نورالدین محمود)ی کوڕی لە شام، پێڕۆ کردووە.

گەورەیە بیست هەزار سەرباز دەبوون، کە سەلاحەددینی ئەیوبی زووبەزوو تێکی شکاند و راوی نا[1]. (ابن الاثیر) مێژوونووسی تەلاری ئەتابەگیان بوو لە موسڵ، لەبەر ئەوە (العماد الکاتب) بە درۆ دەخاتەوە و، دەڵێت: (العماد) مێژوونووسی تەلاری ئەیوبیانە و، زۆری لەسەر ناوە و، قسەکانی راست نییە و، دەڵێت: (العماد) لە کتێبی (البرق الشامي)یەکەی خۆیدا نووسیوێتی: (سیف الدین غازی) لەم شەڕەدا بیست هەزار سواری هەبووە، بەڵام (ئەم قسەیە راست نییە، بەڵکو ساغ بووەتەوە کە شەش هەزار سواری هەبووە و کەمتریش لە پێنج سەد پیادە، من خۆم بەدیار سەرژمێریی تیپەکانەوە وەستابووم و بەشەکانی قۆڵی راست و قۆڵی چەپ و ناوجەرگەی لەشکر و بەرسنگی لەشکرەکەو[2] بەشەکانی ترم[3] بە چاوی خۆم دیوە)، ئنجا دەڵێت: (العماد الکاتب) دەیەوێت شانوشکۆ بۆ سەلاحەددین پەیدا بکات و، بڵێت بە شەش هەزار سەرباز، بیست هەزار سەربازی راوناوە. ئنجا گاڵتە بە قسەکانی دەکات و دەڵێت: بۆچی، موسڵ و شارەکانیشی تا دەگاتە فوراتیش، خۆی چەندە؟ تا بیست هەزار سواری هەبێت[4]؟!

جا، ئەگەر موسڵ ـ کە سنووری گەیشتبووە فورات ـ نەیتوانیبێت لەشکرێکی

---

(١) بنۆڕە: (البنداري، سنا البرق الشامي، ٢٠٠/١ تلخيص (البرق الشامي)، العماد الاصفهاني.

(٢) بەرسنگی لەشکر، یان پێشەنگی لەشکر. بنۆڕە دوای لاپەڕەی ١١٥ پەراوێزی (١)، هەروەها: الفتح القسي ط ١٩٦٥، ص ٧٠/الهامش.

(٣) الكامل، ٤٢٩/١١. (أبو شامة)ش قسەکەی (العماد الکاتب) بە راست دەزانێت، لە قەرساندنی ژمارەی سەربازەکانی لەشکری موسڵ و دەڵێت: دەنگوباسەکە وەهایە کە بێجگە لە پیادە، بیست هەزار سەربازی سوارە بوونە: الروضتين ٢٥٥/١. وەڵێ قسەکانی (ابن الاثیر) لە راستییەوە نزیکترە، هەرچەندیشە زۆرتر بەلای تەلاری موسڵدا دایدەشکێنێ، (ابن الاثیر) برایەکی هەبووە بەناوی (مجدالدين المبارك ابن الأثير) بەرپرس و بنووسی دیوانی موسڵ بووە، رەنگە ئەو سەرژمێرییەی لەم برایەوە وەرگرتبێ: الكامل ٤٢٩/١١.

(٤) الكامل ٤٢٩/١١.

شەش هەزار و پێنج سەد سەربازی ساز بدات و، سەلاحەددینیش لەشکرەکەی، لەم شەڕەدا لە شەش هەزرا سەرباز زیاتر نەبووبێت[1]، کەواتە لەشکری ئەتابەگایەتیی هەولێر زۆر لەوانە کەمتر بووە، هەرچەندیشە ئێمە ناتوانین بیقەرسێنین ژمارەیان چەند بووە و چەند نەبووە، کە پێدەچێ، ئەوپەڕی ژمارەیان دوو هەزار سەربازی فەرمی بووبن و، رەنگە هەندێ جەنگاوەری رەشۆکیی ئێل و هۆزەکانیشی لەگەڵدا بووبن بۆ (مووچە) کە میر بییانداتێ یان بۆ چەپاوڵ و دەستکەوت یان بۆ غەزا، نەخاسمە ئەمارەتەکەش لە لایەن مەگۆلەوە، پەلامار و مەترسی لەسەر بوو.

هەرچی پێکهاتەی رەسەنی لەشکری هەولێرە، ئەوە هیچ دەقێکمان بەدەستەوە نییە شتێکمان بۆ روون بکاتەوە، بەڵام لە دوا چاخەکانی حوکمی ئیسلامدا عادەتیان وەها بوو کۆیلەیان لە ناوەڕاستی ئاسیاو وڵاتی (القبجاق)ەوە[2] دەهێنا کە تورکمان بوون. ئەوانە ببوونە کۆڵەکەو راگری دەوڵەتی سەلجووقی و دەوڵەتانی ئەتابەگیان[3]، ئەوانی دیکەی، بەڕەسەن کورد و، عەرەبیشیان تێدا بوو[4]، بەڵام رێژەی هەریەکە لەم نەتەوانە بە پێی جیاوازیی ئەمارەتەکان و بە پێی جیاوازیی هەرێمەکان و پێکهاتەی رەسەن دەگۆڕان و هەموویان وەك یەك نەبوون. لە ئەمارەتی هەولێر،

---

(١) البنداري، سنا البرق الشامي ٢٠٠/١. الكامل، ص. ن.

بەڵام ژمارەی سەربازە فەرمییەکانی لە شەڕەکەی (حطين)دا گەیشتبووە دوازدە هەزار سەربازی دەرمەبەگایەتی و، مووچەخۆر، بنۆڕە: الكامل ٥٣١/١١. الروضتين ٧٦/١. بێجگە لە سەربازی خۆبەخش (خۆحەز): الكامل، ص. ن.

(٢) ناوچەیەکە لە چیاکانی ئۆراڵ، لە دەوروبەری رووباری ڤۆلگا: شمس الدين سامي، قاموس الأعلام (تركي) جـ ٥، ص ٣٥٩٩.

(٣) ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٧٩، السير جب، صلاح الدين، دراسات في التأريخ الاسلامي، ص ١٥٩، ١٧١ الباز العريني، الشرق الادنى في العصور الوسطى، ص ١٥٥، ١٦٤، ١٦٥. (عمادالدين خليل، عمادالدين زنكى ١٩٨.

(٤) البنداري، م. ن. ص.

جب، ن. م. ص ١٧٢ — ١٧٣.

دەقمان بەدەستەوە هەیە کە کوردی شارەزوور، بەزۆری لە لەشکری هەولێردا ئامادە و بەشدار بوون، ئەوەتا (ابن العبري) دەڵێت: (کاتێ موزەفەرەددین گۆگبوری لە ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز)دا بەسەر لەشکری (بدرالدين لؤلؤ)دا سەرکەوت، سەربازەکانی لە (نینوی) سێ ڕۆژ قەرارگایان هەڵدا، دوای ئەوە، موزەفەرەددین گۆگبوری فەرمانی دا بگەڕێنەوە بۆ هەولێر، لە گەڕانەوەیاندا، هەندێ لە سەربازە شارەزوورییەکان، لە ڕێگا بەو بۆنەیەوە هەڵپەرکێیەکیان سازدا[1].

بە مەدا دەردەکەوێت کە کوردی زۆری شارەزوور لە لەشکری ئەتابەگایەتیی هەولێردا هەبوونە.. دەربارەی ئەرك و مەسرەفی لەشکری هەولێر، ئەوە، موزەفەرەددین گۆگبوری، بەشێکی زۆری دەرامەتی دارایی ئەمارەتەکەی بۆ پێگەیاندنی لەشکر تەرخان کردبوو کە نزیکەی دوو سێیەکی (دەرامەتەکە) دەبوو. بەو بۆنەیەوە، (سبط ابن الجوزي) دەڵێت: «موزەفەرەددین گۆگبوری، ڕۆژێکیان، لە ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)دا، کەمێك، دوای ئەوەی گەڕایەوە سەر تەختی خۆی، شەرتی کردووە دەرامەتی ئەمارەتەکەی بکات بە سێ بەش، بەشێکیان بۆ کاری خێر، بەشێکیان بۆ مەسرەفی لەشکر و مەسرەفی خۆی و، بەشێکیشیان پاشەکەوت دەکات بۆ پاراستنی ئەمارەتەکەی لە دوژمنێك بیەوێت دەستدرێژیی لەسەر بکات» [2]. لێرەدا دەبینین کە دوو لەسەر سێی بۆ لەشکر تەرخان کردووە. وەڵێ نازانین ئەو دوو لەسەر سێیە چەند دینار بووە، بەڵام بەحسابی ئەو بەشەی کە بۆ کاری خێری دادەناو، هەولێری پێ ئاوەدان دەکرد و، لە دەرەوەی هەولێریش کاری خێری دەکرد، بە هەمووی دەگەیشتە نێوان دووسەد هەزار دینار و[3]، سەد هەزار دینار[4]، کە ئەم

(١) البنداري، آل سلجوق ٤٦ — ٤٧. أبو شامة، كتاب الروضتين ١٧٣/١. جب، صلاح الدين ١٧١ — ١٧٢. الرويشدي، إمارة الموصل، ص ١١٢، ١١٣. الباز العريني، م. ن. ص ١٦٥.

(٢) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٨١/٨.

(٣) عن ابن قاضى شهبة، نقله الحنبلى في (شذرات الذهب) ١٤٠/٥.

(٤) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٦٨٢/٨.

پارە زۆرە بە قسەی (ابن الجوزي) تەنیا سێیەکی داهاتی دەغڵودانی هەولێر بووبێت، سەرباری ئەوەش، ساڵانە دەرامەتی لۆکە دەگەیشتە بیست و دوو هەزار دینار[1] لە سەردەمێکدا کە هەولێر بایەخی سیاسی و ئابووریی نەمابوو، ببوو بە شارێکی بێ بەهاو بچووك و ساکار[2].

کەواتە ئەگەر ئەم هەموو دەرامەتە بریتی بێت لە تەنیا سێیەکی داهاتی هەولێر، ئەمە مانای وایە کە موزەففەرەددین گۆکبوری، هیچ نەبێ دوو هەندەی بۆ لەشکر و لەشکرسازی تەرخان کردبوو.

## ب- ئاڵای ئەمارەتی هەولێر

هەڵکردنی ئاڵا دیاردەیەکە لە دیاردەکانی سەروەری و، بەڵگەی سەربەخۆیی ئەمارەت یان دەوڵەتە. خۆ، دەبوو ئەمارەتی هەولێریش ئاڵایەکی هەبێت. ئەوەش لە کاتێکدا دەرکەوت کە لە ساڵی (٥٧٩ك/١١٨٩ز)دا، هەولێر لە موسڵ جیابووەوە. شێوەی ئاڵای هەولێرمان لەو نامەیەدا بۆ دەردەکەوێت کە (ضياء الدين ابن الاثير الجزري الكاتب) لە وەڵام و سوپاسگوزاریی خەڵات و بەخششی موزەففەرەددین گۆکبوریدا بۆی نووسیبوو. ئەوەبوو، ئەو نووسەرە کە سەردانی هەولێری کرد، موزەففەرەددین گۆکبوری خەڵاتی کرد، لە خەڵاتەکاندا باڵندەی باز هەبوو. ئەویش نامەی سوپاسگوزاریی بۆ نارد و، بە شان و باڵیدای هەڵدا، هەر لەو نامەیەدا دەڵێت: ((وا، شای باڵندەی باڵندە خۆرەکانیش هات ـ مەبەستی لە بازەکەیە - دەستێکی بەخێر و سپی ناردوویەتی کە لە چاکەی بەردەوامدا بەهرەمەندە، ئەو پیاوەتییەی ئەو هەیەتی، کەسی دی نییەتی، ئاکار و رەوشتی بەرزە و، بۆنی لە هەموو بۆنێ خۆشترە، بەڵکو دەڵێن وەك باڵندەی ناو ئاڵاکەیە و، مەقدەمی خێرە[3] وەڵێ یەکێکیان بەدەست

(١) حمدالله المستوفي القزويني، نزهة القلوب، ص ١٠٣.

(٢) ابن الطقطقى، الفخري في الآداب السلطانية، ص ٣٢.

(٣) برای مێژوونووسی بەناوبانگ (عزالدين إبن الاثير)ە (ت ٦٣٧هـ/١٢٣٩ز).

مەبەستی لەو بازەیە کە لەسەر ئاڵاکەی سەرداری هەولێر وێنەی کێشرابوو.

هەڵدەگیرێ و، ئەوی دی دەخرێتە بان سەر»[١]. لەم نامەیەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئاڵای هەولێر وێنەی بازێکی لە ناوەڕاستیدا هەبووە، هەر وەکو ئاڵاکەی سەلاحەددینی ئەییوبی و ئاڵای دەوڵەتی ئەییوبیان.

بەڵام نازانین سەربازانی لەشکری هەولێر چ جۆرە بەرگێکیان دەپۆشی، نازانین سەرداری هەولێر، بەرگی وەك سەربازانی ئەتابەگەکانی موسڵ لەبەر سەربازانی خۆی دەکرد، یان، نا. ناشزانین سەربازانی ئەمارەتی هەولێر چەکی وەك چەکی سەربازەکانی (زین الدین علی کچك)ی[٢] دامەزرێنەری ئەمارەتی هەولێر هەڵدەگرت یان، نا. ئەوان (چەقۆ) و (درەوش) [٣]و (چەکوش) و (شووژن) [٤]و (شمشێر) و (مشار)یان[٥] پێبوو. ـ بە قسەی ابن الأثیر ـ زۆرتر لە کاتی شەڕدا ئەم چەکانەیان هەڵدەگرت. بەڵام نازانین سەربازانی ئەمارەتی هەولێریش ئەم چەکانەیان هەڵدەگرت، یان، نا. ناشزانین دەزگای هەواڵگریی هەولێر، تا چەند چالاکیی نواندووە. دەزگایەکی هەواڵگری هەبووە، بە تایبەتیش لە کاتی شەڕی نێوان هەولێر و موسڵدا و، جاسووسیی بەسەر جموجووڵی لەشکری (بدرالدین لؤلؤ)ەوە کردووە. (بدرالدین لؤلؤ) بەرامبەر بە مەسیحییەکان خراپەی دەکرد، ئەمان کەم و کەم دەسەڵات بوون، هەژار بوون، نەیان دەتوانی ئەو پارەو سەرانەیەی (بدرالدین

---

(١) بنۆڕە کتێبەکەی خۆی: (رسائل ابن الأثیر).

(؟) لەبارەی جلوبەرگی سەربازانی موسڵەوە، بنۆڕە: (الدیوەجي، الموصل في العهد الأتابكي، ص ٧٢. الجمیلي، دولة الموصل، ص ٢٥٨).

سوادي الرویشدي، إمارة الموصل، ص ١١٧.

(٢) الباهر، ١٣٥.

(٣) درەوش، وەکو سووژن وایە، بەڵام دەسکی هەیە: (ابن خلف التبریزي)، برهان قاطع، ص ٤٨٢. محمد موسى هنداوي، المعجم في اللغة الفارسیة، ص ١٥١.

(٤) شووژن (المسلة).

(٥) مشاری بچووك (دسترك): هنداوي، المعجم في اللغة الفارسیة، ١٥٦.

لۆلۆ) داوایان لێ دەكات بیدەنێ، لەبەر ئەوە هانایان بۆ دوژمنی[1](لۆلۆ) دەبرد، بە تایبەتیش بۆ موزەففەرەددین گۆكبوری. مەسیحییەكان لە ڕێگای هەواڵگرەكانی سەرداری هەولێرەوە نامەیان دەنارد و تەگبیر و هاودەنگییان هەبوو بۆ ئەوەی لە دژی (لۆلۆ) پەیمان ببەستن و بێ هێزی بكەن. لەو نامانەدا هەموو نهێنییەكانی بزاڤ و چەك و نیاز و رازی لەشكری موسڵیان بۆی دەنووسی، بۆ ئەوەی، ڕێگا، بۆ داگیر كردنی موسڵ خۆش بكەن[2]. جارێكیان، نامەیەكی (شمعون مفریان)ی[3] بەرپرسی گوندی (برطلی) كە بۆ موزەففەرەددین گۆكبوریی نووسیبوو، كەوتە دەست (بدرالدین لۆلۆ)، ئەویش دەستبەجێ گرتی و لە زیندانی هاویشت، پاشان بە دەرگای زیندانەكەدا هەڵیواسی، تا، مرد[4]. ڕەنگە ئەمە یەكەم نامەش نەبووبێ كە گەورەیەكی مەسیحی بۆ سەرداری هەولێری ناردبێ.

سەرباری ئەوەش، (بدرالدین لۆلۆ) سەروسەختی لەگەڵ تایەفەی (عدویە)دا باش نەبوو، بەردەوام خراپەی لەگەڵیاندا دەكرد، چونكە ئەو تایەفەیە زوڵمیان قبول نەدەكرد، لەبەر ئەوەش كە لە هەندێ ناوچەی شاخاویی موسڵدا بوون و جێگایان قایم بوو، جارجارە تۆڵەی خۆیان دەسەندەوە و، هێرشیان دەكردە سەر موسڵ[5]، تا، جارێكیان (بدرالدین لۆلۆ) بۆی ڕێكەوت رابەری ئەم تایەفەیەی دەسگیر كرد كە ئەوكات (تاج الدین ابو محمد الحسن بن عدي بن أبي البركات بن صخر بن مسافر) كە

---

(١) سوادي الرويشدي، امارة الموصل، ص ٤٧.

(٢) ن. م. ص ٤٨.

(٣) مفریان: وشەیەكی ئارامییە (مەفریونو – Mafryono) بە مانای (بەرەدار) دێت مەبەست لە پلەی ئەو كەسەیە لە كەنیسە لە نێوان بەتریارك و قەشەكاندا، بنۆڕە: سوادي، امارة الموصل، ص ٤٥، هامش (٢).

(٤) بطرس نصري، ذخيرة الأذهان، جـ ٢، ص ٥٤.

(٥) الكتبي، فوات الوفيات، ط، مصر ٢٢٤/١. الذهبي، العبر ١٨٣/٥.

ئەکا برای شێخ عودەی (ت ٥٥٧ك/١١٦٢ز) [1]، پاشان لە قەڵاکەی موسڵدا خنکاندی، لەبەر ئەوە، پێدەچێ ئەو تایەفەیەش پێوەندییان لەگەڵ موزەففەرەددین گۆگبوریدا بووبێت، نەخاسمە، سەرداری هەولێر زۆر ڕێزی لە شێخ عودەی دەناو، هەمیشە باسی چاکەی ئەو شێخەی دەکرد و، بە پیاو چاکێکی گەورەی دادەنا [2].

## ج- دیوان و جبەخانەی چەك:

سەرڕوشتەمان هەیە کە لە هەولێردا، کۆگای چەك یان جبەخانە هەبووە، کە ئەوکات (سیلاحخانە)یان [3]، پێدەگوت و، (أبو المحاسن أسعد ابن احمد بن موسى بن منصور بن علي بن نصر الأربلى) سەرپەرشتیی دەکرد. ئەم پیاوە لەسەر وەزیفەکەی مایەوە، تا، لە موحەڕەمی ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز)دا گیانی سپارد، کە تەمەنی لە هەشتا تێپەڕی کردبوو [4]. بەڵام نازانین کەی ئەم وەزیفەیەی وەرگرتووە و، پاش ئەو، کێ لە جێگەی دانراوە. (النويري) دەڵێت: جبەخانەکە، لە هەموو جبەخانەیەك گەورەتر و گرنگتر بووە و، هەموو کاروبارێکی بەدەست (میری چەك) بووە؛ هەر چەکێ هەواڵەی بکرابا دەینووسی و دەیپاراست و، هەر چەکێکیشی لێ دەرکرابا، دیسان

(١) تەرجەمەی ژیانی لە (وفيات الاعيان)دا هەیە: ٤١٧/٢ – ٤١٨، ط/مصر ١٩٤٨. الكامل، ٢٨٩/١١. الذهبي، العبر ١٦٣/٤. باسی ژیانیشی بە دووروودرێژی لە (تأريخ ابن الوردى ٩٢/٢ – ٩٤)و، لە (شذرات الذهب) ١٧٩/٤ – ١٨٠)دا هەیە.

(٢) وفيات الاعيان ٤١٨/٢.

(سوادي الرويشدى) دەڵێت: موزەففەرەددین گۆگبوری، ئەم تایەفەیەی گاڵ دەدا کە دوژمنایەتیی (بدرالدين لؤلؤ) بکەن و هێرش بکەنە سەری: بنۆڕە: امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ص ٣٥.

(٣) النويري، نهاية الأرب ٢٢٧/٨. القلقشندي ١١/٤.

(٤) ابن الشعار، عقود الجمان، ٢٥٩/١ ب.

دەینووسی و[١]، چەکسازانی هەبوون، هەرچەکێ کۆن و خراپ با، چاکیان دەکردەوە[٢].

ئەتابەگ، خۆی، فەرمانداری لەشکر بوو، ئەوەش بە رووداوەکان و پێوەندییەکانی دەرەوەیدا، دیاربوو. بەڵام بەقسەکانی (ابن الشعار)دا دەردەکەوێ کە ئەتابەگ یاریدەدەری بۆ خۆی دانابوو، تا، فەرمانداریی لەشکرەکەی بکات و، دەڵێت: (الأمير شهاب الدين قرطاى بن عبدالله الاربلي) بووە کە ئەکا باوکی هەردوو میر (محمد و احمد ولدا قرطاي) کە، ناویان بە زۆری لە کتێبی (عقود الجمان)دا دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە. ئێمە نازانین، سەرداری هەولێر، ئەم میرەی بە فەرمانداری لەشکر و یاریدەدەری خۆی داناوە، یان تەنیا بە بەرپرسی کاروباری رێکخستن و ئیدارەی داناوە؟ ئەوە، دەزانین کە سەرکردەی لەشکر، لە کەسانێکی ئازاو بەجەرگ و شارەزایانی نهێنیگەلی جەنگ و رۆڵەکانی هونەری سوارچاکی و شمشێربازی هەڵدەبژێردران، کە ئەزموونی تەواویان لە کوشتاردا هەبوو[٣]. ئەم سەرداری لەشکرەش نازناوی (سوپا سالار)یان[٤]، پێ بەخشیبوو.

راستیشت دەوێ، ئەم میر (قرطاي)یە، خۆی، کۆیلەی سەرداری هەولێر بوو، پاشان ئازادی کرد (سەرفرازی کرد) و، پلەی لە ئەمارەتەکەدا بەرزکردەوە، تا، لە ساڵی (٦١٤ك/١٢١٧ز)دا[٥]، گرتی و، لە زیندانی هاویشت تا، مرد[٦]. بەڵام کوڕە

---

(١) النويري، نهاية الأرب ٢٢٧/٨.

(٢) القلقشندي ١٢/٤. ابن شاهين الظاهري، زبدة كشف الممالك، ص ١٢٢.

(٣) حسين امين، العراق في العصر السلجوقي، ٢٠٥.

(٤) سوپا سالار (الأصفهسلار) واتا (پارێزگار) یان (پاسەوانی سنوور) Frontier Commanders بنۆڕە: (الراوندی، راحة الصدور وآية السرور، النسخة الفارسية، تحقيق محمد اقبال (ص ١٠) له (فهرست الكلمات والمصطلحات النادرة). الكلمة مركبة من لفظين: (أسفه) بالفارسية بمعنى (المقدم) و (سلار) بالتركية بمعنى (العسكر): صبح الاعشى ٨٠٧/٦.

(٥) ابن خلكان ٢٧٦/٣.

(٦) ابن الشعار، ٢٣٩/٥. الصفدي، الوافي بالوفيات، ط/دار صادر بيروت ١٩٦٩، ٢٩٦/٧.

گەورەکەی، کە ناوی (محمد) بوو، لە ساڵی (٦٠٦ك/١٢٠٩ز)دا لە هەولێر لەدایك ببوو، میرێکی بە هەیبەت و شۆخ بوو[1]. پێدەچێ ئەرك و فرمانێکی سەربازیی گرنگی لە ئەستۆ بووبێ، چونکە، هەر بە یەکێ لە میرەکانی هەولێر ناوی دەبرا، ئەویش هەروەکو (ابو شجاع رکن الدین احمد ابن قرطای) برای، کە (الصفدي) بە، میر، کۆیلەی سوڵتان موزەففەرەددین گۆگبوری ناوی دەبات و[2]، (ابن الشعار)یش، بە (میری گەورە و زانا و سوپا سالار) [3]وەسفی دەکات، هەرچەندیشە بە تەمەن، منداڵ بوو. بەمەدا دەردەکەوێت کە ئەم میرە فەرماندارییی لەشکری هەولێری کردووە، وەلێ سەرچاوەکان، کە باسی رووداو و کارەساتی سەربازی دەکەن، ناوی ئەو ناهێنن.

وا دیارە، ئەم دوو میرە هەولێرییە، پاش مردنی موزەففەرەددین گۆگبوری لە راپەرینەکەی دژ بە لەشکری خەلیفە (المستنصر)دا، بەشدار بووبن و سەرکردایەتیی بەرەڤانییەکەیان کردبێ، کە ساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٣ز)دا رووی دا، چونکە هەردووکیان، پاش ئەو کارەساتە، شارەکەیان جێهێشت و روویان کردە حەڵەب، کە ئەوکات، حەڵەب (الملك العزيز غياث الدين) حوکمڕانیی دەکرد. دوو برا، کاتێ گەیشتنە حەڵەب، ئەم مەلیکە بە گەرمی پێشوازیی لێ کردن و، پیاوانە بۆیان وەستاو، پێداویستی بۆ فەراهەم کردن[4]، (محمد بن قرطاي) لە ساڵی (٦٣٩ك/١٢٤١ز)دا[5]، مرد. وەلێ (احمد بن قرطای) دوای مردنی سەرداری حەڵەب، شارەکەی جێهێشت و لە بەغدا گیرسایەوە، لەوێ مایەوە، تا لە ساڵی (٦٥٥ك/١٢٥٧ز)دا، گیانی سپارد.

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان، جـ ٧ ترجمة حياة محمود بن قرطاى. الصفدي، الوافي ٣٥٣/٤.

(٢) الصفدي ٢٦٩/٧.

(٣) ابن الشعار، جزء (٩) ترجمة حياة (نبهان بن محمود بن عثمان الأربلي) ئەو بە (زانا) ناوی دەبات، گوایا ئەستێرەناس بووە و، لە فیبلەنماشی زانیوە: ابن الشعار، جزء (١) ترجمة (احمد قرطاى)

(٤) ابن الشعار، هەمان ئەو دوو وەرەقەیە. الصفدي: (ئەویش هەر وەها)

(٥) ابن الشعار، کورتە باسی ژیانی (محمد بن قرطاي). الصفدي دەڵێت: لە ساڵی (٦٣٤ك/١٢٣٦ز)دا گیانی سپاردووە، واتا، کە مردووە تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر بووە.

(٦) الصفدي ٢٩٦/٧. وهامش ترجمة أحمد في (عقود الجمان) بقلم ناسخ المخطوط، جـ (١).

باسی کەسێکی دی دەکرێ بەناوی (ابن الفتح عیسی ابن الفضل ابن بشر بن عیسی بن مواهب)ی ناسراو بە (ابن البحراني الموصلي) کە لە بنەماڵەی (قرطاي) نییە. ئەم کابرایە هاتە هەولێر و، کەوتە خزمەتکردنی میر (قرطاي ابن أبي عبدالله)، کاتێ موزەففەرەددین گۆگبوری، (قرطاي) و دۆستانی (قرطاي) گرت، ئەمیشی لەگەڵیاندا راپێچا. پاشان ئازادی کرد و، کردی بە سەرپەرشتی دیوانی لەشکر، زۆری نەبرد، لەم وەزیفەیەش دەری کرد و، بە نمایشکاری لەشکر دایمەزراند، لەبەر ئەوەش کە زەلامێکی شەڕانی و چاونەترس[1]بوو، ئەو وەزیفەیەی لێ دەهات و بە چاکی هەڵیدەسووڕان.

## سێ : دراو و سیستەمی دراوی ئەمارەتی هەولێر:

دراوی ئەمارەتی هەولێری سەردەمی ئەتابەگیان، نە لە شێوە و، نە لەکێش و نە لە قەبارەدا یەك بوون، واتا شێوە و کێش و قەبارەی دیارکراو و چەسپاویان نەبوو. بەو جۆرە، لەسەر یەك عەیارە جێگیر نەبوون، واتا رێژەی کانزا گرانبەهاکە لە کێشی یەك پارچە دراودا، وەکو یەك نەبوو، جیاواز بوو، لەبەر ئەوە، بارودۆخی ئابووری لەق دەبوو، بازاڕیش دەشڵەژا. پێدەچێ ئەم حاڵەتە بەهۆی ئاژاوە و شڵەژاوی شەڕی خاچدروشمانەوە پەیدا بووبێت و، مەملەکەتی ئیسلامیش ببوو بە چەندین ئەمارەت و یەکەی سیاسی. هێرشی مەگۆلیش بە یەکجارەکی ئاڵۆزی و شڵەژاوییەکەی بەرەو خراپتر برد و، زێڕ و زیوی لە بازاڕدا نەهێشت[2]. وەنەبێ، ئەم دیاردەی ناچونیەکی و نا یەکسانییەی کێش و عەیار و قەبارەی دراوە، تەنیا ئەمارەتی هەولێری گرتبووبێتەوە، بەڵکو هەموو ئەمارەتەکانی ئەتابەگایەتیی

---

(١) ابن الشعار، عقود الجمان، ٢٣٩/٥.

(٢) جعفر خصباك، العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص ١٢٠.

گرتەوە[١].

لە لێكۆڵینەوەی بارودۆخی دراوی ئەم ئەمارەتەوە، بۆمان دەركەوت كە دراوی زیو بە یەكجارەكی نەمابوو، تەنانەت یەك پارچەشمان لەم دراوە لە مۆزەخانەی عیراقدا نەدۆزییەوە و، لە كتێبگەلی باسی دراویشدا بەرچاومان نەكەوت، تەنیا ئەوە نەبێ كە سكەی دینار بە زێڕ و، سكەی درهەم و فلسیش بە مس لێدراوە[٢].

هیچ پاساو و بیانوویەكی بەجێشمان بۆ لێكدانەوەی ئەم دیاردەیە چنگ نەكەوت، نەخاسمە، وڵاتی فارس كە كانگای كانزای زیوە[٣]، لە ناوچەكەوە دوورنییە.

دەشبینین كە سكەی درهەم بە زیو، تەنیا هەولێری نەگرتبووەوە، بەڵكو ئەمارەتەكان و دەوڵەتەكانی تریشی گرتبووەوە. لە هەموویاندا درهەمی خراپ، بە عەیارەی سێیەك یان كەمێ زیاتر لە زیو و باقیمەنییەكەی لە مس دروست دەكرا[٤].

دەشبینین، ( ابن مماتی) و (ابن بعرة) كە هەردووكیان لە میسر، لە تەلاری ئەییوبیاندا كاریان دەكرد و، هاوچەرخی سەردەمی ئەتابەگیان بوون، باسی ئەم درهەمانە دەكەن و دەڵێن: سێ سەد درهەم زیو، حەوت سەد درهەم مسیان پێكەوە

---

(١) محمد باقر الحسيني، العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص ٧٢.

(٢) دانەرانی كتێبگەلی باسی دراو، مەگەر بە دەگمەن ناوی درهەم و فلس بێنن، بەڵكو هەر بە ((پارچە مسەكان)) یان بە وشەی ((پاقر)) ناویان دەبەن. بە نموونە: (اسماعیل ادهم غالب، بە ((پاقر)) ناویان دەبات كە وشەیەكی توركییە ص ١٣٨ واتا (مس) Copper، واتا پارچە دراوی مس – (لین بول) یش هەر وەهای ناو دەبات.

The Cains of Turkman type, v. ııı, p. ٢٣٨

بەڵام (الحسینی) دەڵێت: (هەموو ئەم پارچە دراوانە، مس بوون: (العملة الاسلامیة ص ١٣٧ – ١٤٠).

(٣) الاصطخري، المسالك والممالك، ط ١٩٦١، ص٩٨. كي لسترانج، بلدان الخلافة الشرقية، ٣٥٤،٣٢٢.
عبدالرحمن فهمي، فجر السكة العربية، ص ٣٤.

(٤) القلقشندي، صبح الاعشى، ٤٦٣/٣.

جۆش دەداو پاشان، درهەم، درهەم دەیانبڕی[1].

وەڵێ (القلقشندي) دەڵێت: لەبەر ئەوە وازیان لە دراوی زیو هێنا چونکە زیویش لە بازاڕدا نەدەماو، لە دروستکردنی زینی ئەسپ و دەفری ناوماڵدا بەکاریان دەهێنا[2]. ئەم حاڵەتە، نەك هەر میسر، بەڵکو موسڵیشی گرتەوە. موسڵ درهەمی مسی بەکار دەهێنا، تا، لە سەردەمی (الملك الصالح ركن الدين اسماعيل بن بدرالدين لؤلؤ)دا کە لە دوای باوکی، لە نێوان ساڵی ٦٥٧ك/١٢٥٩ز _ ٦٦٠ك/١٢٦٢ز[3] حوکمی موسڵی دەکرد، وازیان لە مس هێناو، ئیدی بۆ لێدانی دراو بەکاریان نەدەهێنا. (زامباور)یش، دیاردەی دروستکردنی درهەم لە مس لەم ناوچەیەدا، لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچی، واتا لە سەدەکانی دوازدەم و سیازدەمی لەدایکبوووندا بە دیاردەیەك دادەنێ کە تەنیا لەم ناوچەیەدا روویدابێت[4]. بەم درهەمە مسانەیان دەگوت ((درهەمی رەش)) چونکە لە مسی پەتی دروست دەکران، درهەمی (قەڵب)یشیان پێدەگوت چونکە سەرباری ئەوەش فڕوفێڵی تێدا دەکراو[5]، پێشیان دەگوت ((درهەمی فلس بایی)) [6]. وەڵێ چەند درهەم دەیکردە دینارێك، ئەوە، لە بارەی درهەمی هەولێرەوە هیچ سەرڕوشتەیەکمان دەست نەکەوتووە، بەڵام دەتوانین بەهای درهەمی هەولێر، بە پێودانگی بەهای درهەمی ئەمارەت و دەوڵەتەکانی ئەو دەمە بقەرسێنین، بە تایبەتیش بە پێودانگی بەهای درهەمی موسڵ. بە نموونە،

---

(١) ابن مماتی، قوانين الدواوين، ص ٣٣٣. ابن بعرة ((كشف الاسرار العلمية بدار الضرب المصرية، ص ٨٣)).

(٢) القلقشندي، ص. ن.

(٣) الحوادث الجامعة، ٣٤٨.

(٤) زامباور، دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، مجلد (٩)، ص ٢٢٧.

(٥) المقريزي، شذور العقود في ذكر النقود، ص ٧٤.

(٦) ابن بعرة، كشف الاسرار العلمية بدار الضرب المصرية. ص ٤١.

دانـەری کتێبـی (الحـوادث الجامعـة) دەڵێـت: لـە موسـڵ، لـە سـاڵی (٦٦٠ك/١٢٦٢ز)دا[1]، دینارێك، دەیکردە نزیکەی چل (درهـەمی رەش) واتـا بـەهای درهـەمی رەش، زۆر لـە بـەهای درهـەمی زیـو کـەمتر بـووە و، دە درهـەمی زیـو، یـان دوازدە درهـەمی زیـو دەیکردە یەك دینار[2]. ئەم پارچە دراوانە لە قەبارە و لە کێشیشدا جیاواز بوون، لـە مۆزەخانەی عیراق و، لە کتێبگەلی باسی دراویشدا، پارچە دراوی قەبارە جیـاوازی بـە تیرەی (٣٠ ملم[3]، ٢٨ ملم[4]، ٢٦ ملم[5]، ٢٥ ملم[6]، ٢٤ ملـم[7]، ٢٣ ملـم[8]، ٢٢ ملـم[9]، ٢١ ملـم[10]) دەبینیـت. ئـەم دراوە مـسانە لـە کێشیـشدا جیـاواز بـوون. بـە پێـی دەفتەری[11] تۆمار کردنی کێشی ئەم دراوانە، کە لە مۆزەخانەدا هەیە، کێشەکانیان لـە نێوان (٢ ,٨ گرام) تا (٤ ,١٠) گرامدایە. لە هۆڵی (الحاج عبـدالله شـکر الـصراف)ی نـاو

---

(١) الحوادث الجامعة، ص ٣٤٨.

(٢) ن. م: ٧٠ – ٧١. النقشبندي: الدينار الاسلامي في المتحف العراقي (١٤) و (٣٦).

(٣) اسماعيل غالب، مسكوكات تركمانية فتالوغي، ص ١٤١، ژمارەی پارچەکە (١٨٤).

(٤) پارچەی ژمارە (٥٨٠) لە هۆڵی (الحاج عبدالله شاكر الصراف) دانراوە. پارچەی ژمارە (٢٢٦ مس) لە دەفتەری تۆمارکردنی دراوەکان، لە مۆزەخانەی عیراقدا هەیە.

(٥) دراوی ژمارە (٣٧٩٩ مس) لە دەفتەری تۆمارکردنەکەدا هەیە.

(٦) اسماعيل غالب، ص ١٣٨، دراوی ژمارە (١٧٩)، دەفتەری تۆمارکردنی دراوەکان.

(٧) اسماعيل غالب، ص ١٣٨ پارچە دراوی ژمارە (١٨٠)

(٨) ن. م. ص (١٤٠) دراوی ژمارە (١٨٣).

(٩) د. الحسيني، ص ١٣٧ (القطعـة الموجـودة في متحـف القـاهرة، والمرقمـة ١٧١٩٦/١). لای خۆیـشمان چەند پارچەیەك هەیە بە تیرەی (٢٥، ٢٣، ٢٢) ملم.

(١٠) اسماعيل غالب، ص ١٣٩، قطعة (١٨١) و (١٨٢).

(١١) خاتو (مهاب درويش البكري) شارەزای دراوە لە مۆزەخانەی عیراق. سوپاسی دەکـەین، کـە ئـەم پارچە دراوانەی، لە رۆژی (١٩٧٢/٧/٣)دا بە تەرازوو لە سەنگ داوە (کێشاوە).

مۆزەخانەکەدا پارچە دراوێك هەیە ژمارەکەی (٥٨٠)یە، کێشەکەی (٩,٩) گرامە[١]. لە مۆزەخانەی قاهیرەش دراوێك لەم دراوانە هەیە، کێشەکەی (٦٦ ,٩) گرامە[٢].

هەرچی دیناری ئەمارەتەکەیە، ئەوەش، کێشەکەی لەگەڵ کێشی دیناری باوی ئیسلامدا کە (٢٥ ,٤) [٣]گرامە، جیاوازە، بێگومان قەبارەکەشی جیاواز دەبێت وەك کێشی دراوە مسەکان کە باسمان کرد. ئەوانەی باسی دراوی ئەتابەگەکانیان کردووە، هەر چەندیشە، کێشی دینارەکانیان نەنووسیوە، بەڵام مادامێکی قەبارەکانیان جیاوازە، کێشەکانیشیان جیاوازە. جگە لەوەش دینارێك لە شارەزوور دۆزرایەوە، کە شارەزوور سەر بە هەولێر بووە، کێشەکەی لەگەڵ کێشی دیناری هەولێردا، جیاواز بوو. ئەو دەمە (عمادالدین زەنگی)ی زاوای موزەففەرەددین گۆگبوری حوکمی شارەزووری دەکرد[٤]. دینارەکەی هۆڵی (الصراف) ٤ ،٣ گرامە و[٥]، تەنیا دینارەکەی شارەزوور کێشی (٥٣٦ ,٤) گرام دەرچوو[٦].

دوو دیناری هەولێر، لە مۆزەخانەی هەمایۆنی ئەستەنبوڵدا دانراون، تیرەی

---

(١) محمد باقر الحسيني، (دليل مجموعة عبدالله شكر الصراف)، الخزانة الخامسة المنشور في مجلة المسكوكات، مجلد (١)، جـ ٢، ص ٦٤.

(٢) الحسيني، العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص ١٣٧.

(٣) زامباور، دائرة المعارف الاسلامية، ط ١٩٣٣، ٢٢٧/٩ و ٣٧٠.

عبدالرحمن فهمي، فجر السكة، ٣٠

(٤) وڵاتی شارەزوور، لە ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)ەوە، کەوتبووە ژێر رکێفی حوکمی هەولێر، واتا لەو رۆژەوەی کە موزەففەرەددین گۆگبوری گەڕایەوە بۆ هەولێر. ئەمیش بەر لە ساڵی ٦٢٢ك/١٢٢٥ز پێشکەشی کرد بە (عماد الدين زەنگی) زاوای، بۆ ئەوەی لە جیاتی خۆی، حوکمی تێدا بڕانێت.

(٥) دراوی ژمارە (٥٧٨) کە لە گەنجینەی پێنجەمی هۆڵەکەدایە، لە ساڵی (٦٠٧ك)دا لە سکە دراوە.

(٦) الحسيني، العملة الاسلامية، ص ٦٨. ئەم دینارە، لە مۆزەخانەی قاهیرەدایە.

یێکێکیان (٢٦) [1]ملم و، تیرەی ئەوی دیکەیان (٢٨) [2]ملیمەترە. ئەو دینارەی لە مۆزەخانەی عیراقیشدا هەیە[3]، هەروەهایە، بەڵام دینارەکەی شارەزوور، تیرەکەی (٢٥, ٦) ملیمەترە[4].

وەك پێشتر باسمان کرد، نایەکسانیی قەوارەی دراوەکان لەم ئەمارەتەدا بەهۆی نالەباری و شڵەژاویی بازاڕەوە هاتە گۆڕێ، وەلێ ئەم نایەکسانییە بازاڕەکەی بە یەکجارەکی شڵەژاند، بەڵگەش ئەوەیە کە خەڵك (دراوی کەل) واتا دراوی قرتاویان دەساودەس دەکرد. ئەم دینارە، نەختێکیان لێ دەقرتاند و، بەو پارچە قرتاوانەش، کڕین و فرۆشتن دەکران[5]. ئەم دینارانە سەری لە بازاڕ دەشێواند، لەبەر ئەوە، گوایا، هەندێ خەلیفە و کاربەدەستان هەوڵیان بۆ نەهێشتنی داوە و، جارجارە ویستوویانە پووچەڵی بکەنەوە، بۆ ئەوەی مسکێن (الرعیة) تووشی حەرام و گوناح نەبێت[6].

دیناری قرتاو، لە هەولێر، لەو ماوەیەدا، لە بازاڕ هەند زۆر بوو، تا (ابن خلکان) دەڵێت «لە عیراق و لە هەولێریشدا، خەڵك، خوویان پێوە گرتبوو، ببوو بە عادەت، ئەم دینارە قرتاوانە و، پارچە بچووکە قرتاوەکانیشیان لە کڕین و فرۆشتندا دەخستەگەڕ، بە پارچە وردەکانیان دەگوت (القراضة) واتا وردە قرتراوەکان، لە بازاڕا (دیناری قرتاو و پارچە قرتراوەکانیش بە زۆری بەدەست خەڵکەوە دەبینران و لە

---

(١) احمد ضیاء، مسکوکات اسلامیة تقویمی، ص ١٣٢. ئەم دینارە لە ساڵی (٥٩٠ك)دا لە سکە دراوە. ژمارەکەشی لە مۆزەخانەدا (١٧٩٥)ە.

(٢) م. ن. ص. ئەم دینارە لە ساڵی (٦١٤)دا لە سکە دراوە، ژمارەکەشی (١٧٩٦)ە.

(٣) مجلة المسکوکات، ص ٦٤.

(٤) الحسینی، العملة الاسلامیة، ص ٦٨.

(٥) ابن خلکان ١٥٠/٤ ط بیروت. النقشبندي، الدینار الاسلامي ص ١٥.

(٦) الحوادث الجامعة، ص ٧١.

کڕین و فرۆشتندا بەکار دەهێنران»[1]

جا، بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری (سکەلێدان) پێویست بوو دیوانێك هەبێت ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، دەبوو خانوویەکیش تەرخان بکرێت بۆ ئەو ئیشەو، کەسێکی بە ئەزموون و هونەرومەریش بۆ سەرپەرشتیی ئەم ئەرك و فرمانە بدۆزرێتەوە، بتوانێت کانزاکان بەسەریەکدا جۆش بدات و ڕێژەکان دیاربکات و، وێنە و خەت و، نووسینەکان لە قاڵبەکاندا مۆربکات. ئێمە لە بارەی ئەو کارسپێردراوانەوەی هیچ نازانین، بەڵام (ابن الشعار) دەڵێت، کەسێك، کە سەرپەرشتیی سکەخانەکەی دەکرد، لە هەولێر: (عثمان بن ابراهیم بن علي بن احمد بن محمد سالم الأربلی) بووە کە لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز)دا مردووە[2].

دەبێ ئەوەش بزانین کە، خودی سکەلێدان، نیشانەیەکی سەروەریی دەوڵەت یان ئەمارەتە و بەڵگەی سەربەخۆبوونە، چونکە دراو وێنەی حوکمڕان یان وەکو (ابن خلدون) دەڵێت: «نیشانەی سوڵتان»ی لەسەرە[3]. بەو دراو و نووسینانەشدا دەردەکەوێ کە موزەففەرەددین گۆگبوری، یەکەم کەس بووە، سکەی لەم ئەمارەتەدا لێدابێت. ئەو، هەر زوو، کاتێ کە حوکمی گرتە دەست سکەی لێدا، دراوێکی مس هەیە لە ساڵی (٥٨٧ك/[4] ١١٩١ز)دا لێدراوە، واتا لە ساڵی تازەی دوای گەڕانەوەی بۆ سەر تەختی هەولێر، لێدراوە.

لە چەقی ڕووی دراوەکەدا، وێنەی کەسێك هەیە، ڕووی لە لای چەپ کردووە، لە پەراوێزی ئەم ڕوومیدا ناوی سەلاحەددینی ئەییوبی نووسراوە، ناوی سەرداری هەولێریشی لەگەڵدایە و نووسراوە: «گۆگبوری بن علي»، لە پشتی دراوەکەش

---

(١) ابن خلکان، ص. ن.

(٢) عقود الجمان، جـ ٤، ورقة ١٤٥.

(٣) ابن خلدون، المقدمة، ص ٣٩٩.

(٤) Lane – Pool, The coins of the Turkman, v, ١١١, P. ٢٣٢

نووسراوە: الناصرلدين الله أمير المؤمنين[١]. پێوەندیی نێوان ئەمارەتی هەولێر و بەغدا، وەك باسمان کرد[٢]، پێوەندییەکی نادۆستانە بوو، تا ساڵی (٦٠٦ك/١٢٠٩ز) درێژەی کێشا، وەڵێ، میری هەولێر، ناوی خەلیفەی لەسەر دراوەکەی دادەنا، وەکو، بڵێی، خۆی بە دەسدا (تابع)ی خەلیفە دادەنا، هەرچەندیشە ئەم دەسداییەی هەر بەسەرزارەکی و رواڵەت بوو.

دراوێکی دیکەی مس، لە مۆزەخانەی ئەستەنبوڵ هەیە، ناوی (الملك حسام الدين يولق بن ايلغازی الارتقی) سەرداری ماردینی لەسەر نووسراوە، کە لە ساڵی (٥٨٠ ـ ٥٩٧ك/ ١١٨٤ ـ ١٢٠٠ز)دا[٣]لە ماردین حوکمی ڕانیوە. بەرواری لە سکەدانی ئەو پارچە دراوە نەزانراوە، لەبەر ئەوە ناتوانین بڵێین لە هەولێر لێدراوە، یان بڵێین موزەففەرەددین گۆکبوری کاتێ ئەم سکەیەی لێداوە کە سەرداری (حران) و (الرها) بووە[٤]. لەسەر رووی ئەم دراوە وێنەیەك هەیە، کەسێکە لەسەر تەخت دانیشتووە و گۆچانێکی بەدەستی چەپەوەیە و، خودەیەکی لەسەرە[٥]. لە پەراوێزەکەشیدا،

(١) الحسيني، العملة الاسلامية، ص ١٣٧.

(٢) هەر لەم کتێبەدا، سەیرێکی بابەتی پێوەندییەکانی نێوان ئەمارەتی هەولێر و خەلافەتی عەبباسی بکە.

(٣) زامباور، معجم الانساب والاسرات الحاكمة، ص ٢٤٥.

(٤) (عباس العزاوي): تەکەز لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم پارچە دراوە لە شاری (حران) لە سکە دراوە، نەك لە هەولێر، بنۆڕە کتێبەکەی خۆی: (النقود العراقية) ص ١٩٥. کەچی، هەر زوو، خۆی بەدرۆ دەخاتەوە و لە لاپەڕەی (١٩٦)دا دەڵێت:

ئەو وێنەیەی لەسەر دراوەکە کێشراوە، تا دوای مردنی سەلاحەددینیش، بەسەر دراوەکانی هەولێرەوە، هەر هەبووە. بەڵام (الحسيني) ئەم دراوە لەگەڵ دراوەکانی هەولێردا دادەنێت. بنۆڕە: (العملة الاسلامية، ١٣٩). هەرچی (اسماعيل غالب)ە، ئەوە، ئەو لە ریزی دراوەکانی (آل بکتگین ـ موزەففەرەددین گۆکبوریدا ـ دایناوە. بنۆڕە: (مسکوکات ترکمانية فتالوغی) ص ١٤٠، پارچەی ژمارە ١٨٤.

(٥) اسماعيل غالب، مسکوکات ترکمانية فتالوغی، ص ١٤٠.



نووسراوە: (حسام الدین یولق بن ایلغازی) و (گوگبوری بن علی)، لەسەر پشتەکەشی نووسراوە: (الملك الناصر صلاح الدنیا والدین یوسف بن أیوب محیی دولة أمیر المؤمنین)[1].

هەندێ پارچە دراویش هەن، لە ساڵی (٥٩٠ك/١١٩٤ز) یان دوای ئەو ساڵە لێدراون، ناوی هیچ مەلیکێکی ئەییوبیی لەسەر نییە[2]وا دیارە، موزەففەرەددین گۆگبوری لەگەڵ (الملك العزیز عمادالدین عثمان)ی کوڕی سەلاحەددینی ئەییوبیدا، کە دوای مردنی باوکی، لەو شەش ساڵەی نێوان (٥٨٩ ـ ٥٩٥ك/١١٩٣ ـ ١١٩٨ز)دا حوکمی کردووە، سەروسەختی نەبووە و، پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵیدا نەبووە[3]ئنجا سەرداری هەولێر ناوی (الملك العادل)ی (٥٩٦ ـ ٦١٥ك/١١٩٩ ـ ١٢١٨ز) لەسەر دراوەکانی دادەنا،

---

(الحسینی) دەڵێت: شێوەی سەر دراوەکە، کاری هونەری فارسیی ساسانی لەسەر دیارە، لە وێنەکەدا، ئەوکەسەی بە ئێرانی دانیشتووە و، پرچی بەسەر شان و ملیدا ڕێك شۆڕ بۆتەوە و، ئەم جۆرە کڵاوە، تەنیا بەسەر دراوەکانی هەولێرەوە هەبووە — بەڵام نازانین بۆچی ئەم جۆرە خوودەیەیان بەکار هێناوە؟ تەنیا دەتوانین، وای دابنێین کە وێنەکێشەکە لە شێوەی جل و بەرگی میللی وەریگرتووە، چ جل و بەرگی خودی ناوچەکە، چ لە شێوەی جل و بەرگی هاوردەی ئێران. بنۆڕە: (العملة الاسلامیة، ص ١٣٩).

(١) اسماعیل غالب، م. ن. ص. بشنۆڕە: Catalogue des, P.١٤٤

(٢) احمد ضیاء، مسکوکات اسلامیة تقویمی، دیناری ژمارە (١٧٩٥)، لاپەڕەی ١٢٢ کە لە ساڵی (٥٩٠ك)دا لێدراوە. سەیرێکی دراوە مسەکانی ژمارە، لە (١٧٩ — ١٨٣)یش بکە لە کتێبەکەی (اسماعیل غالب)دا: (مسکوکات ترکمانیة) لاپەڕەی ١٣٨ — ١٤٠. هەروەها، لە کتێبەکەی (لین پول)یشدا، سەیری دراوەکانی ژمارە (٦٥٤، ٦٥٥) بکە: Lane – Poole, The coins, v. ١١١, P. ٢٣٢ هەروەها دراوی ژمارە (١٧١٩٦/١)، لە (المتحف الاسلامي) القاهرە، بنۆڕە (الحسیني)، العملة الاسلامیة، ص ١٣٩. هەروەها، بنۆڕە (اسماعیل غالب: - ١٤٢ .Ghalib Edram, cataloge.., p ١. ١٤٤

(٣) الکامل ١٢/١٤٠.

هەروەك ئەو دینارەی کە لە مۆزەخانەی هەمایۆنی ئەستەنبوڵ و[1] ئەو دینارانەش کە لە مۆزەخانەی لەندەندا هەیە[2]. سەرداری هەولێر تا (الملك العادل) مابوو، ناوی لەسەر دراوەکان دادەنا، بەڵام کە (الملك العادل) لە ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨)دا مرد، ئنجا، ناوی (الملك الکامل محمد)ی کوڕی (الملك العادل)ی کە ئەوکات مەلیکی میسر بوو، خستە سەر دراوەکانی[3].

بەڵام ناوی خەلیفەی عەبباسییان لەسەر هەموو دراوەکان، مابوو.

لە کۆتاییدا، ئەوەش بڵێین کە زۆربەی دراوەکانی ئەمارەتی هەولێر وێنەی زەلامێکی لەسەر کێشرابوو باڵی (قۆڵی) راستی کردووەتەوە و سواری پشتی شێرێکی تووڕە بووە، رووی کردووەتە لای چەپ و، بە دەستی چەپیشی یاڵی شێرەکەی گرتووە[4].

---

(١) لە ساڵی (٦١٤ك/١٢١٧ز)دا لێدراوە: احمد ضیاء، مسکوکات اسلامیة تقویمی، ص ١٢٢ الدینار المرقم ١٧٦٦.

(٢) ژمارەکانیان (٦٥٧/pp) و (٦٥٧/ii) و (٦٥٧/PP) یە کە، (لین بول) لە کتێبی: Catalogue of oriental, v. ix, P. ٣١١ باسیان دەکات و، بەڕیز، لە ساڵەکانی (٦٠٩، ٦١٠، ٦١٢ك)دا لە سکە دراون. دراوێکیش، لە مۆزەخانەی هەولێردا هەیە، بە زێڕی تێدەگەم، لە ساڵی (٥٩٧ك/١٢٠١ز)دا لێدراوە. (ماوەی حوکمی) (الملك العادل). هەرچەندیشە پێناس نەکراوە.

(٣) بنۆڕە پارچەی (٦٥١/aa) کە لە ساڵی (٦٢١ك)دا لێدراوە/لین بول (I bid, P. ٣١٠).

(٤) پێویست بە ژماردنی ئەم دراوانە نییە، کە ئەم وێنەیەیان لەسەر بووە، چونکە زۆرن. (الحسینی) دەپرسێت، دەڵێت: تۆ بڵێی، وێنەی ئەم شێرە، هیچ پێوەندییەکی بە ناوی (گۆگبوری)ی سەرداری هەولێرەوە بووبێت؟ چونکە (گۆگبوری) بە تورکی، مانای (شینە گورگە). پاشان، دەڵێت: نەخێر، هیچ پێوەندییان لەگەڵ یەکدا نییە، چونکە وێنەکە وێنەی شێرە، وێنەی گورگ نییە. سەیری لاپەڕە (١٤٠)ی کتێبی (العملة الاسلامیة) بکە، کە کتێبی خۆیەتی.

# خشتەکان

## خشتەی ژمارە (١)

## حوکمرانی ئەتابەگەکانی هەولێر، (نەوەی هەولێر)

(زین الدین أبو الحسن علي بن بکتکین بن محمد) ناسراو بە (گچك)، پارمـەتیی (عمادالـــدین زەنگـــی)ی، دا، ئەتابەگایـــەتیی موســـڵ لـــە ســـاڵی (٥٢١ك/١١٢٧ز)دا دابمـەزرێنێت و، خۆیـشی (هـەولێر و، شـارەزوور و، حـران و، تکریـت و، هـەکاری و شنگاڵ)ی، لە ساڵی (٥٢٢ك/١١٢٨ز)وە بەدەست بووە.

(١) ئـەو سێ کەسـەی خـوارەوە، بـە بریکـاریی (زیـن الـدین علـي کـچك) حـوکمی هەولێریان کردووە:

أ- (أبو منصور سرفتکین الزیني) تا ساڵی (٥٩٩ك/١١٦٤ز)

ب- (مجاهدالدین قایماز الزینی) (٥٥٩ _ ٥٧١ك/١١٦٤ _ ١١٧٥ز)

ج- (عزالدین الیاس بن عبدالله الزینی) (پاش مجاهدالدین قایماز)

(زین الدین علي کچك) دەستی لە هەموو موڵکی خۆی هەڵگرت بۆ (قطب الـدین مـودود)ی ئەتابـەگی موسـڵ و، تـەنیا هـەولێری بۆخـۆی هێـشتەوە و، لـە سـاڵی (٥٦٣ك/١١٦٨ز)دا، هەر لە هەولێر گیانی سپارد.

(٢) موزەففەرەددین گۆکبوریی کوڕە گەورەی (زین الدین علي کـچك) دوای مردنـی باوکی، حوکمی هەولێری لـە ژێـر چاودێریی ئەتابـەگ (مجاهدالـدین قایمـاز)دا گرتە دەست.

(٣) (مجاهدالـدین قایمـاز) موزەففـەرەددین گۆکبـوریی لـە هـەولێر دەرکـرد. بـەڵام موزەففەرەددین گۆکبوری حوکمی (حـران) و (الرهـا)ی گرتـە دەسـت، تـا سـاڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)

(٤) دوای دەرکردنی موزەففەرەددین گۆگبۆری لە هەولێر، (زین الدین یوسف ینالتگین)ی کوڕە گچکەی (زین الدین علي کچك) حوکمی هەولێری، تا ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز) گرتە دەست.

(٥) موزەففەرەددین گۆگبوری گەڕایەوە بۆ هەولێر و، لە ماوەی (٥٨٦ ـ ٦٣٠ك/١١٩٠ ـ ١٢٣٣ز)دا تەختی هەولێری بە شارەزووریشەوە وەرگرت.

(٦) دوای مردنی موزەففەرەددین گۆگبۆری، ئەمارەتی هەولێر، لە ماوەی (٦٣٠ ـ ٦٥٦ك/١٢٣٣ ـ ١٢٥٨ز)دا کەوتە سەر موڵکەکانی خەلافەتی عەبباسیان.

## خشتەی ژمارە (٢)

**دوای مردنی زین الدین علی كچك لە هەولێر لە ساڵی ٥٦٣ك/١١٦٨ز، ئەم خەلیفە عەبباسییانە، هاوزەمەنی ئەمارەتی ئەتابەگایەتیی هەولێر بوونە:**

١- المستنجد بالله، أبو المظفر یوسف ابن المقتفي: (٥٥٥ _ ٥٦٦ك/١١٦٠ _ ١١٧٠ز).

٢- المستضيء بامرالله: (٥٦٦ _ ٥٧٥ك/١١٧٠ _ ١١٧٩ز).

٣- الناصرلدین الله: (٥٧٥ _ ٦٢٢ك/١١٨٠ _ ١٢٢٥ز).

٤- المستظهر بالله (٦٢٢ _ ٦٢٣ك/١٢٢٥ _ ١٢٢٦ز).

٥- المستنصر بالله (٦٢٣ _ ٦٤٠ك/١٢٢٦ _ ١٢٤٢ز).

## خشتەی ژمارە (٣)

## ئەتابەگەکانی موسڵ (٥٢١ _ ٦٣١ك)



## پاشکۆ ـ ژمارە (١)

**دەقی بەیاننامە (بڵاوکراوە)کەی سەلاحەددینی ئەییوبی (یوسف کوڕی ئەییوب) کە هەڵوێستی خۆی تێدا، رووبەڕووی هێزەکانی دیکەی ئیسلام دیارکرد**

خوا، کە لەسەر زەمین حوکم و هێزی پێ بەخشین و، توانیمان هەق لە پێناوی فەرزدا بەهێز بکەین، وامان بەباش زانی، لە رێی خوادا، فەرزی غەزا لەبەرتر رابگرین و رێگاکەی نیشان بدەین و، پشتگیری لە ئیمانداران بکەین و، پیاوچاکان و بەرپرسانی ئیسلام بۆ غەزای دژ بە دوژمنان بانگ بکەین، کە، لەسەر زەوی بەیەك دەنگ داوا لە ئاسمان بکەین سەرمان بخات. هەر کەسێ، لەم فەرزەدا یاریمان بدات و ئەم کارە چاکە بەجێ بگەیێنێ، ئەوا لە چاکەی بێ پایانمان بێ بەشی ناکەین و، پاداشتی رەفتاری خاسی خۆی وەردەگرێت، بەڵام ئەو کەسەی دووی لەزەتی دنیاو، ئارەزووی خۆی بکەوێ و، پشتی لە ئایینی هەق و، رووی لە دنیای ناهەق کردبێ ـ ئەگەر تۆبەی کرد و پەشیمان بووەوە، ئەوا بەیەکێك لە خۆمانی دادەنێین، دەنا ئەگەر لەسەر گومرایی خۆی مکوڕ بوو، ئەوا دەستی لەکار دادەبڕین و دەری دەکەین[1].

(١) أبو شامة، كتاب الروضتين ٢/٦٠

ابن واصل، مفرج الكروب ٢/ ١٦٣ - ١٦٤

## پاشکۆ ـ ژمارە (٢) (بەیاننامەی هەولێر)

**سەلاحەددینی ئەیوبی، پاش مردنی ـ زین الدین یوسف ینالتگین لە ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)دا، دەربارەی چارەنووسی ئیدارەی هەولێر بڵاوی کردەوە**

بێگومان دەزانن (زین الدین یوسف)ی ماندووی ڕێگای غەزاو، سوپاسگوزاری نیعمەتی خودا، کۆچی دوایی کرد و، بەر ڕەحمەتی خوا کەوت. ئەو کەسێکە لەو بەختیارانەی حوکمی ئەم ئایەتە، دەیانگرێتەوە: (ومن یخرجْ من بیتهِ مهاجراً الی اللهِ ورسولهِ، ثم یدرکهُ الموت، فقد وقع اجرُهُ علی الله) [1]. واتا: (کەسێ ماڵی خۆی جێبهێڵێ و، ڕوو لە ڕێگای خواو پێغەمبەر بکات و، بمرێت، ئەوە، ئەجری دەکەوێتە سەر خودا). ئای، چەند دڵتەزێنە ئەو لێقەومانە و، وای لە سۆی ماڵاوایی ئەو جوانەمەرگە! ئەو بەهیممەتی خۆی پێگەیشت و پلەی بەرزی وەرگرت، بەڵام بەر لەوەی جێپەنجەی چاکەی دەرکەوێ و مانگی چواردەشەوە ئاواتەکانی دەروونی ڕۆشن بکاتەوە، خوا بردییەوە بۆ بارەگای خۆی. ئەم هەولێرەش حەفتا ساڵە[2]خەڵاتی بنەماڵەی ئەتابەگەکانە و، بۆ (زین الدین) [3]ماوەتەوە. لە شەرت و سیستەمی ئەم نیعمەتە لایان نەداوە و، حوکمەکانیان قایمتر و پتەوتر کردووە. ئەم جێگەیەش کە بۆیان هێشتووەتەوە، نەیهێشتووە بە فیڕۆ بچێت. میری گەورەش موزەففەرەددین گۆکبوری گەورەی بنەماڵەکەیە و، لە هەموویان لەبەرترە. لەسەر وەسیەتی باوکیشی

---

(١) القرآن الکریم، سورة النساء، الآیة (١٠٠).

(٢) بە پێی قسەکانی (ابو شامة) (کتاب الروضتین ٣٠/١، ص ٣٨) ئەکا شەست و چوار ساڵ، نەك حەفتا ساڵ.

(٣) مەبەستی لە (زین الدین علي کچك)ە، کە دامەزرێنەری بنەماڵەی ئەتابەگەکانە.

بە سەرداری هەولێر دامانناو، کە براکەشی بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنمایی بکات و[1] لە جیاتی ئەویش حوکم بگرێتە دەست.

ئەمانـە، نامەگـەلێکن (الملك الناصـر ـ سـەلاحەددینی ئـەیوبی نـاردوونی بـۆ موزەففـەرەددین گۆکبـۆریی سـەرداری هـەولێر و، داوای دەکـات بگاتـە لای و بـۆ کوشـتاری خاچـدروشمان ئامـادە بێـت. نامـەکان (عمـاد الـدین الکاتـب الاصـفهانی) دایڕشتوون، کە نووسەری تایبەتی خودی سەلاحەددینی ئەیوبی بووە:

---

(١) کتاب الروضتين ١٦٤/٢ — ١٦٥.

مفرج الكروب ٣٣٩/٢ — ٣٤٠

ابن الفرات، مجلد ٤، جـ ١، ص ٢٣٦.

## پاشکۆ ـ ژمارە (٢)

### نامەی یەکەم

**(بەشێکە لە نووسراوێك بۆ موزەففەرەددین گۆکبوریی سەرداری هەولێر، باسی بارودۆخی شەڕ دەکات).**

پێشتریش باسی بارودۆخەکەمان بۆت نووسیوە کە ئاوات و ئومێدی ئێمە سەرکەوتنە. مەلیکەکانی فەرەنگ بەخۆیان و لەشکری لەبن نەهاتوویانەوە گەیشتوونەتە بەندەرەکەو خڕبوونەتەوە و مۆڵیان بەستووە، ئێستاش مەنجەنیقیان لێمان دامەزراندووە و ئاگرباران و بەردبارانمان دەکەن، شوورەکەش کون و کەلەبەری تێ کەوتووە و، شەڕەکەش گەرمە، دوژمن ددانی لە شارەکە تیژ کردووە و، بەتەمای تالانە، ئەوەتا، بۆ ناو شار دەکشێ و ڕێگای مەرگی بەرەو شەقام و کۆڵانەکان کێشاوە ـ ئێمەش بە لەشکرەوە هەڵمانکوتاوەتە سەری و هێرشمان کردووە، بەڵام دوژمن، زۆربەی هێز و لەشکری لە شوورە و کەندەکی شارەکە قایم کردووە و، بەئومێدی زیاتریشە... لە کاتێکا مەترسییەکە زیادی کرد و، بە ورمیەکی زیاتر و خۆڕاگرییەکی پتەوترەوە ئومێدی سەرکەوتنمان هەبوو، تاقمێ لە میرانی کەمباوەڕ و تاوانبار و خیانەتکار و ترسنۆك هەڵاتن و خیانەتیان لە ئیسلام کرد، بەڵام لە سزای هەق ڕزگاریان نەبوو. بەو ڕاکردنەی ئەوان دوژمنیش زیاتر ددانی لێ تیژ کردین و، کەسانێکی دیکەشمان ورمیان بەردا. وەلێ زۆربەی زۆرمان سەنگەریان بەرنەداو، مەرگیان لە لا خۆشتربوو، بڕیاریان دا خۆیان ڕادەستی دوژمن نەکەن تا دوو ئەوەندەیان لێ نەکوژن و، سووربوون لەسەر پاراستنی بەندەرەکە، بەڵام کە زۆریان بۆهات و ناچاربوون، کەوتنە دانوستان لەگەڵ فەرەنگ، وەلێ فەرەنگ بە هەلی زانی و، زیاتر پێی لێ ڕاکێشاو، شەرتو شرووتی قورسیان دانا، ئەمانیش زیاتر

سەبریان گرت و ورەی خۆیان بەهێز کرد، دوژمن هەند چاوقایم بوو، لەبانەوە دەردەکران، لە کون و کەلەبەرەوە دەهاتنەوە، کونیان لێ دەگیرا، لەبانەوە دەهاتنەوە، مەگەر خودا دەرووێك لە خەڵکەکە بکاتەوە و لەم تەنگانەیە رزگاریان بکات. ئێمەش لە لای خۆمانەوە دوژمنمان تەنگاو کردبوو، راست و چەپمان لێیان گرتبوو، بەڵام ئەوان لە پشت دیوارەکانەوە شەڕ دەکەن و زیانمان لێ دەدەن. دەشزانن ئەگەر خۆیان بخەنە تەهلوکە و بەکۆمەڵ هێرشمان بکەنە سەر، ئەوە شکاندنیان زەحمەتە و ناکرێت. قەزاو قەدەری خوایش گەڕانەوەی بۆ نییە، ئەوەش کە ئاشکرانییە و نهێنییە و، چیمان لە چارە نووسراوە، هەر خوا دەیزانێت، حوکمیش هەر حوکمی خوایە، پەناو، ئومێدیشمان هەر بەوە، ئەم بەڵایەش هەر بەو دەگەڕێتەوە و سەرکەوتنیش هەر بەدەست خوایە و، تەوەکەل بەخوا و، لەویش زیاتر، پەنامان نییە.

## پاشکۆ ـ ژمارە (٤)

## نامەی دووەم

**(ئەمەش نامەیەکی ترە کە داوای موزەففەرەددین گۆکبوری دەکات، لە هەولێرەوە بگاتە (عکا)، باسی کارەساتی شارەکە دەکات و، بارودۆخی شەڕەکە نیشان دەدات)**

هەموو کەسێ دەزانێت، دوژمنی کافر و، هێزی بێشوماری زوڵم و ستەم و زۆرداران، لەناکاو، تەپیان داوەتە سەر موسوڵمانان و، هەرچی کافری بەحر و بەڕ هەیە، بۆ لەناوبردنی هێزی ئیسلام، خڕی کردووەتەوە. بەڵام خوای گەورە، بە قودرەت و توانای خۆی، قودرەت و توانا و هێزی دوژمنی ملکەچ کرد، چونکە دەزانێت چییان بەسەر (عکا)دا هێناوە، کە ئێمە، ئەمە دوو ساڵە تێدەکۆشین لە دوژمن بیپارێزین و، شارەکە، دوو گەمارۆی لەسەرە. دوژمن هەر تەگبیرێکی کردبێ، لێمان تێکداوە، هەر غەدرێکی گەڵاڵە کردبێ، پووچەڵمان کردووەتەوە، هەر مەنجەنیقێکیان هێنابێتە بەرەوە، لە لووتمان داوە و بەرەوپاش گەڕاندوومانەتەوە، هەر تاوەر و قولەیەکیان ساز دابێ، سووتاندوومانە، هەر کەلێن و کەلەبەرێکیان لێ دەرکەوتبێ، خۆمان پێیدا کردووە، هەر ئاگری شەڕێکیان هەڵایساندبێ، خوا کوژاندوویەتیەوە، ئیدی هیچ فڕو فێڵێك نەما، نەیکەن و، هەموو غەدر و نامەردییەکیان تاقی کردەوە. لەم ماوەیەدا، دانیان بەخۆدا نەگرتووە و چەندین جار هێرشیان کردووە و، هاتوونەتە سەرمان، نزیکەی پەنجا هەزار شەڕوان و جەنگاوەری سوارە و پیادەیان لێ کوژراوە، بێگومان هەموویان بە مەرگ دەگەیێنین. گرووپی خواناسان، کرووهی گومڕاهان لەناو دەبات. ئێمە، وامان دەزانی کە لەناومان بردوون و نەماون، کەچی هەر زۆر دەبن و هەڵدەقوڵێن، وامان دەزانی فەوتاون

کەچی هێشتا هەر ماون، شەڕدەکەن. ئەمانە سووتەنیی ئاگری شەڕن، خۆشەی شمشێر و کوتەکن، خۆیان بۆ مەرگ و بۆ گۆڕستان بەکوشت دەدەن، وا دەزانن کە لەوەش زیاتریان لەدەست دێت. کە ساڵی تازەش هاتە بەرەوە، لەبەر خاتری دۆست و سەربازانی ناو شارەکە کە لە شەڕدا زۆر ماندوو بوون و، لەوە زیاتریان لە توانادا نییە، ویستمان نۆرەی پاراستنی شارەکە بە کەسانی دی بسپێرین، کەلێنەکان پڕ بکەینەوە و، هەڵەکان راست بکەینەوە. لەناو شاردا، زیاتر لە دە هەزار زەلامی بە جەرگ و ئازا و قارەمان هەبوون، ئەوان لە شار دەرچوون و جێگەیان پڕ نەکرایەوە، بەڵام ئەوانەی کە چوونە ناوەوە و، ویستیان جێگەیان پڕ بکەنەوە، وەك ئەوان دڵگەرم و پەرۆش نەبوون، دەریاش لەوەزیاتر رێگای پێ نەداین و، دوژمنیش بە پەلە گەیشتە جێ و، ناو شاریش هەند پڕ بوو، جێگای ئەو هەموو خەڵکەی تێدا نەدەبووەوە و، کەسی دیکەی نەدەگرت، ئیدی پەنای بردە لای خوا، لە شەڕ و بەڵا بیپارێزێت. ئنجا مەلیکەکانی فەڕەنگیش هاتن، بەڵام ئەم هاتنەی ئەمساڵیان وەك هاتنی ساڵانی پێشتر نەبوو، غەزەب لە چاویان دەباری و، بە رق و کینەوە، کەوتنە کار و، دۆزەخیان بە پەلە هێنایە جۆش و، یەکسەر دەستیان بە ئاگر باران و سووتاندن کرد، هەرچی لەشکرە، ئەوە، هەر بەلێشاو دەهات، هەموو شارەکانی خۆیان، لەبنڕا کرد بە سەرباز و، لە کەشتی و گەمێیان هاویشتن و تیرە و نەتەوەی داخ لەدڵی هەمەجۆریان هێنایە سەر (عکا). هەردوو مەلیکی فەڕەنگ و ئنگلیزیش، بە لەشکری سوارە و پیادەوە، بەوپەڕی تەدارەکەوە، بە ئاقڵ و کەودەنەوە، بە قورس و بە سووکەوە، بە پتەو و بە پووکەوە، بە دەبابە و مەنجەنیقەوە هاتوونەتە سەرمان و، تەنیا، لە یەك جێگە دا، سیازدە مەنجەنیقیان لێمان دامەزراندووە، هەر بەردێکمان تێدەگرن، چەند بەردێکی شوورەکەمان دەترازێنێت و دەیخات. جێگای بەرز و بەرچاوەکانی شوورەکەیان رووخاندووە، کەندەکەکەیان پڕ کردووەتەوە، کەلێن و کون و کەلەبەریان لە شوورەکە خستووە. گەلێك لە دەوڵەمەند و پیاو ماقووڵانی شارەکە لە دین وەرگەڕاون، کەوتوونەتە کۆمەکی نەعلەتییەکان. دیوار و

شووره و تاوەرەکان رووخاون و کەوتوون، بەسەر درز و کەلەبەرەکانەوە ئاڵای کفر و، کۆڕی هەمەج دیارن. بەڵام برادەر و دۆستانمان هێشتا خۆیان ڕاگرتووە و، ورەیان بەرنەداوە و، بە سەبرن، کەلەبەرەکان بە جەستەی خۆیان پڕ دەکەنەوە، بەردی مەنجەنیقەکان کە بە سەرماندا دەبارێ، ئەمان دەیکەن بە خوودەی سەری خۆیان و، سنگیشیان ناوەتە بەر تیربارانی دوژمن. خوێن بە بژانگ و لچ و لێویاندا دەچۆڕێ و، فریشتەکانی ئاسمان سوپاسگوزاری لەخۆبوردەیی و گیانبەخشییان دەکەن. پەلاماری دوژمن دەدەن و، بڵاوەیان پێدەکەن و، درِ بەرێزەکانیان دەدەن، بڕیان دەدەنێ و لەتریان پێدەدەن و ساتمەیان پێدەکەن. دوژمن گەر هێرشی بێنێ، بە دەمی شمشێر بەرسنگیان دەگرن و بڵاوەیان پێدەکەن. برادەرانمان شەڕدەکەن، پەلامار دەدەن، خۆیان ماندوو دەکەن و، تینیان بۆ دەبەن، هەموویان بە سەربەرزی وەستاون و هەمیشە شمشێری رووتیان بەدەستەوەیە، قاچیان لە گۆمی خوێنا چەقاندووە و، بەرەو بەهەشت ماڵاوایی لە برادەران و کەسوکاریان دەکەن و، دوژمنی کافریان هەواڵەی دۆزەخ دەکەن.

بەڵام هەندێ لە میرە ترسنۆکەکان، ناپاکی و خیانەتیان کرد، لە جیاتی شەرم و حەیا، ژیانی سەرشۆڕییان بەگەن کرد، خاکیان بەجێ هێشت و بەرەو نەگبەتی و بەڵای کفر رایانکرد و، هانایان بۆ دوژمن برد، وایان دەزانی بەو رەفتارە ناپاکەیان رزگاریان دەبێت، بە سواری گەمێیەکی بچووك ـ کە پێشتر بۆ ئەم رۆژە ئامادەیان کردبوو، خۆیان دەرباز رکرد، زامی هەمیشە بە ئازاری تف و نەعلەتییان، لە زامی تیغ بە باشتر دانا، هەندێ لە کەسانی وەکو خۆشیان لەگەڵ خۆدا سوار کرد، بەم راگردنە، ورەی سەربازانی تر و خەڵکەکەشیان سارد کردەوە و، ئەژدیهای کافریشیان زێتر دەم شیرین کرد. بەڵام دۆستان و دڵسۆزان لەگەڵیاندا نین و ملیان بۆ نەداون، پشتیان لە شەڕ نەکردووە و، سەنگەریان بەرنەداوە و، هێشتا هەر لە ریزی پێشەوە شەڕ دەکەن، لە شەڕی گەورەتریش ناترسن و سڵ ناکەن، چەکدارێکیان پشتێن بۆ دە سەربازی دوژمن ناکاتەوە، خۆ لە شەڕ نادزنەوە، رۆحی خۆیان بە ئەمانەت دەزانن.

ئێستا، شەڕەكە گەرمە، كوشتار لە شوورەكەوە گەیشتە ناو ماڵەكان، لە سەری كۆڵانەكانەوە گەیشتە ناو كۆڵانەكان. دوژمن بە بێدەنگییەكی نیوە شەڕو، بە خشكەیی و، بە ترسێكی خراپتر لە خورپەی دڵ، هەروا، بەرەو ناو شار، هێرش دێنێ و دەكشێ، دوژمن زۆر و بێشومارە، هێز نییە لەبەر دەمیدا بووەستێ و پێشی لێ بگرێ، ئەگەر قەزاو قەدەری خوا نەبوایە و، ئەو كەلێن و لاوازییەی خۆمان رووی نەدابا دوژمن چ جای بوو، بێتە ناو (عكا) و، مل، بە (عكا) كەچ بكات. (عكا)یش لە دەست بچێ، ئایین و ئیمان لە دەست نەچووە. (عكا) داگیر كرا بەڵام دەوڵەت ماوە، ئەگەر دڕیان بە ریزی لەشكری (عكا) دابێت و، هاتبنە ناوەوە، بەڵام هێشتا بنەماو پەرگەمای نەپچڕاوە. ئەمە قەدەری خودایە، خودا، ویستی لەخەو بێدارمان بكات و بە ئاگامان بێنێت و غیرەتمان بە بەردا بكات و، كانیاوی هیممەتمان بتەقێنێتەوە و، بەختی خەواڵوومان هەستێنێتەوە و، رامانپەڕێنێ و، هێز و ورەو توانستمان بۆ تازە دەكاتەوە و سەرمان دەخات. ئێمە، هەتا ئێستاش، وەك جاران، بەسەر كەندەكەكانیاندا هەواڵەین و، دەستمان لە بینیان گیر كردووە و، مەرگ بەسەر حەشارگەكانیاندا دەبارێنین، هەموو رۆژێكیش بۆ شەڕی دەستەو یەخەو تاڵاوی سزای مەرگ رایاندەكێشین، بە زەرووی تێر لە خوێنی رەش، ئاوی خواردنەوەیان رەش دەكەین. ئەوەیان هاتبێتە ژوور، ناچێتەوە دەر، ئەوەیان گەیشتبێتە ئێرە، تازە، بەدیدار شاد نابێت، ئەوەش كە بەرەو سارای مەرگ چووبێت، لانەو خاووخێزان شیوەنی بۆ دەكەن، كامیان دەركەوێ، مەگەر كەمتیار گۆڕی داپۆشێت. ئەوان پاڵیان لێ داوەتەوە، لە خێوەتگای خۆیان نابزوون، حەز ناكەن جێگای خۆیان بەجێبێڵن، هەوارگەی خۆیان پێخۆشە، چونكە حەز لە مەیدانی حوشترەمێیان ناكەن، لەبەر ئەوە، جارجارە، بە ترس و لەرزەوە دەردەچن بۆ شەڕ و، جاروبار سەر هەڵدەبڕن و بە دەورو پشتی خۆیاندا دەڕوانن، خوا یاربێ لە هەردوو حاڵەتەكەدا، چارەنووسیان هەر مردنە و، قڕ دەبن، روو لە هەر لایەك بكەن، پێشیان لێ دەگرین، لەهەر جێگەیەك كۆڕ ببەستن و مۆڵ ببن- بۆ مەرگ فەرموویان لێ دەكەین، دیارە بە تەماو

نیازی (عکا) ددان تیژ دەکەن، چونکە لەسەر تەماع پێك هاتوون، بۆ شەڕ جەم بوون و، وەك پەروانە، بە دەوری ئاگری شەڕدا دەگەڕێن و منەی مەرگ دەکەن (واتا لە شەڕ دەگەڕێن) بەلاّم پێخەفی گەرموگوڕیان، هەر خاکەو گۆڕە. دوژمن گەر خۆی دەرخات، مردن چاوەڕوانێتی، هێز و هەیبەت و غیرەت بەرامبەری وەستاوە، لەشکری خۆمان لێیان بەئاگایە و، بێتە پێش، دەیپروێنن. ئەنجومەن جێگای شانازییە و پشت و پەنایە، بۆ لەناوبردنی خاچدروشمان، لەسەر پێیەو ئامادەیە، بە لەشکری گەورە و گران، دوژمن هەڵدەلووشێ، بە پشکۆی سوور، بە تەنووری پڕ لە گڕ و نێڵەنێڵ، بە هێزی بێشوماری خوێنڕێژ، وەك سکەی دراو، لە ئاگری شەڕدا دەتوێنێتەوە، وەك ئاژەڵ کەوڵی دەکاو، مووی هەڵدەکڕووزێنێ. بێگومان، ئەم راپەڕینەی لەشکرە، ئێوەش رادەپەڕێنێ و، بانگتان لێ دەکات. کەسێکیش بۆ ئەم کارە خێرە بانگ کرابێت، بە دەنگەوە دێت و، دەگاتە (عکا) و چاوەڕوانتانین.

## پاشکۆ ـ ژمارە (٥)

## نامەی سێیەم

## (بەشێکە لە نامەیەك بۆ موزەففەرەددین)

**«هۆکاری بانککردنەکەی روون دەکاتەوە کە دوای دەرچوونی لەشکری دوژمن رووی دا»**

کە دوژمن لە داگیرکردنی (عکا) بووەوە و، بەتەواوی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت، ئیدی وای دەزانی هەموو هێلکەیەك بەزە و، هەموو رەشێك رەژووە، بۆیە بەرەو شاری حەیفا ملی ناو، خۆی تووشی رێگای هات و نەهات کرد، وەك کەرە دێزەکە، مردنی خۆی و زەرەری خاوەنی رێگای هەڵدێری گرتەبەر ـ بە درۆ گوایا مەبەستیە بچێت بۆ عەسقەلان، بەڵام بۆی نەچووە سەر و، خوا مەبەست و درۆی ئاشکرا کرد، ئێمەش بەرمان لێ گرت و تووشی داموداومان کرد. ئەم رۆیشتنەیان کەوتە سەرەتای مانگی شەعبانەوە، مەلیکی ئنگلیز فەرمانداریان بوو، بەرەو مەرگی دەبردن، ئەوانە کە خۆیان دۆزەخینە، بەرەو دۆزەخی بردن، ئێمەش، لێگا، لێگا لەم جۆرە مەرگەمان پێ دەبەخشین و، لە لارێگاکانەوە، دوور و نزیك لەچاو بزرمان دەکردن، وەك سێبەری خۆیان لێیان جیا نەدەبووینەوە. رێگەمان لێ دەگرتن و، جاروبار، بە درێژایی رێگەکە پەلامارمان دەدان و شوێنەونیمان لێیان دەکرد و، دەمانکوشتن. هەر لە یەکەم رۆژی بەرێکەوتنیانەوە چەرخەچییە چالاك و بە ئەزموونەکانمان، بە فرۆفێڵی سەربازی زیانی گەورەیان لێ دەدان و دەیانکوشتن، پاشکۆی لەشکری دوژمنیان زێتر دوا دەخست و نەیاندەهێشت بگەنەوە بە پێشەنگی لەشکر، ئەسپ و سوارە و پیادەیان لێ دەکوشتن و، بە هەموو شێوازێك خەڵتانی خوێنیان دەکردن. تالانێکی زۆریان لێیان سەند، چەندین زەلامیان لێیان سەر بڕی، گەلێکیان راپێچ

کرد و رفاندیان، تا مردن دارکارییان دەکردن، قوماش و چەك و کوتاڵیان لێ سەندن، هەر زەلامێك دەستیان پێی ڕاگەیشت، وەك مریشك ئاوەڕووتیان دەکرد، پەڕوباڵیان پێوە نەهێشتن، تا دوژمن گەیشتە سەر رووباری حەیفا، لەوێ قەرارگایان دامەزراند و خێوەتیان لێ هەڵداو، باریان خست، لەوێش، ئەوەی کە مابوو بەر شمشێریان دا، لەسەر ئەو رووبارە کەوتنە حەوانەوە و تیمارکردنی بریندار و ناشتنی مردووەکانیان، بەڵام ئێمە، دیسان پێشیان کەوتین، رێگامان لێ گرتن، نیازمان ئەوەیە پرشوبڵاویان بکەینەوە و، پەڕەوازەیان بکەین. بە هیممەتی خودا، دەست و بازووی بەهێز کەوتەوە رفاندن و کوشتنیان، پشتمان بەخوا قایمە، ریزەکانمان یەك بخات و خڕمان بکاتەوە، تا بتوانین پەڕەوازەیان بکەین و لێکیان دابڕین. بۆ ئەوەی، شادمان ببین و دوژمن جوانەمەرگ بێت و، مژدەی سەرکەوتن ببەین بۆ ئەنجومەنی جەنگ، تا ئەویش پیرۆزبایی لە سەرکەوتنمان بکات، خۆ ئاسایی رێنماییمان بکات. بە ئومێدی ئەوەی وشکە ساڵی ئومێدمان بە بارانی بەهار ببووژێنێتەوە و، ژیانمان بکاتەوە بە چەمەن و گوڵزار و، بێبازاڕیی ئایینیش ـ گەر روویدابێ ـ برەوی پێ بداتەوە. ئەو خاوەن چاکە و کەرەمەش، چۆن تۆڵەی ئیسلام لەبیر دەکات، لە (عکا) ئافرەتی شەرمەندیان بە دیل گرت و بردیان. ئەگەر باش رامێنی، دەبینی، کە بەڵاکە، بەڵایەکی گەورەیە و، لێقەومانێکی سەختە، بە هیممەتی خوا نەبێت لە کۆڵ نابێتەوە، خەمەکەش پێی داکوتاوە، ئەو رایئەماڵێ، دەمێنێ، ئەم قەرزەش هەر بە سەرۆك وەردەگیرێتەوە.

# سەرچاوە و ژێدەرەکانی ((ئەم لێکۆڵینەوە))یە

## یەکەم - دەستنووسەکان:


(ابن أبي عذيبة، شهاب الدين احمد بن محمد بن عمر) (ت ٨٥٩هـ/١٤٥٢م)

١- انسان العيون في مشاهير سادس القرون، مخطوط، في مكتبة الدراسات العليا لجامعة بغداد، رقم ٢٤٨.

(ابن العبيثي، ابو عبدالله محمد بن سعيد بن يحيى بن علي الواسطي) (ت ٦٣٧هـ/١٢٣٩م).

٢- التأريخ المذيل به على تأريخ بغداد لأبي سعيد السمعاني، مخطوط مصور في مكتبة الدراسات العليا، رقم ١٢٣٨ عن نسخة باريس.

(ابن شداد، عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم) (ت ٦٨٤هـ/١٢٨٥م).

٣- الاعلاق الخطيرة في امراء الجزيرة، قسم الجزيرة، دەستنووسی وێنەگیراوە، نوسخەکەی (د. صالح احمد العلي)یە، لەسەر نوسخەکەی پاریس وێنەی گیراوە.

(ابن الشعار، أبو البركات كمال الدين المبارك بن أبى بكر بن حمدان) (ت ٦٥٤هـ/١٢٥٦م).

٤- (عقود الجمان في شعراء هذا الزمان)، نوسخەکەی (السيد بشار عواد معروف)ە، دەستنووسێکی وێنەگیراوە بە مایکرۆفیلم، لەسەر ئەو نوسخەیە گیراوەتەوە کە تەنیا یەك دانەی لە (مكتبة السليمانية) لە ئەستەنبوڵدا هەیە، ٨ جزمە.

(ابن الصلاح الشهرزوري، ابو عمرو تقي الدين عثمان بن عبدالرحمن الكوردي الشرخانى) (ت ٦٤٣هـ/١٢٤٥م).

٥- طبقات الشافعية، دەستنووسێکی وێنەگیراوە، مكتبة الدراسات العليا، رقم ١٢٨٩.

(ابن قاضي شهبة، ابو بكر بن احمد بن محمد الاسدي) (ت ٨٥١هـ/١٤٤٧م).

٦- طبقات الشافعية، دەستنووسێکی وێنەگیراوە، مكتبة الدراسات العليا، رقم ١٤٩٠.

٧- طبقات النحاة واللغويين، دەستنووسێکی وێنەگیراوە، المكتبة المركزية، رقم م خ ١٢٤ ق ١، ق ٢.

(الحسيني، أبو العباس عزالدين احمد بن محمد) (ت ٦٩٥هـ/١٢٩٦م)

٨- صلة التكملة لوفيات النقلة، نوسخەکەی (السيد بشار عواد معروف)ە لەسەر نوسخەکەی

کۆبرلی/ئەستەنبوڵ گیراوەتەوە.

(الحميدي، أبو عبدالله محمد بن عبدالله بن عبد المنعم) (ت ٩٠٠هـ/١٤٩٥م).

٩- الروض المعطار في خبر الأقطار، دەستنووسی وێنەگیراوە بە مایکروفیلم، لەبەر نوسخەکەی کتێبخانەی (نور)ی عوسمانی گیراوەتەوە، لە کۆڕی زانیاریی عیراقیدا دەیبینیت.

(الذهبي، ابو عبدالله شمس الدين محمد بن احمد الدمشقي) (ت ٧٤٨هـ/١٣٤٧م)

١٠- تأريخ الاسلام، دەستنووسی وێنەگیراوە، مكتبة الدراسات العليا ((قسم ١ + ٢)) رقم ١٦٥٩، ١٦٦٠.

(الصفدي، صلاح الدين خليل بن أيبك) (ت ٧٦٤هـ/١٣٦٤م).

١١- الوافي بالوفيات، دەستنووسی وێنەگیراوە، المكتبة المركزية، رقم ٩٢٠ ف.

(قدامة بن جعفر، ابو الفرج الكاتب البغدادي) (ت ٣٢٠هـ/٩٣٢م).

١٢- صنعة الكتابة، دەستنووسی وێنەگیراوە، المكتبة المركزية، رقم م خ ١٣.

## دووەم: کتێبگەلی بە ڕۆنیۆ چاپکراو:

١٣- العبود، نافع توفيق، الدولة الخوارزمية، رسالة ماجستير عن جامعة بغداد، ١٩٧١.

١٤- الغساني، أبو العباس اسماعيل بن العباس (ت ٨٠٣هـ/١٤٠٠م)

(العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك)، دراسة وتحقيق شاكر محمود عبدالمنعم، رسالة ماجستير عن جامعة بغدادد ١٩٧٠.

١٥- فهد بدري محمد، تأريخ العراق في العصر العباسي الأخير (٥٥٢ _ ٦٥٦هـ/١١٥٧ _ ١٢٥٨م) رسالة دكتوراه عن جامعة الأسكندرية، كلية الآداب ١٩٧٢.

١٦- المنذري، أبو محمد زكي بن عبدالعظيم بن عبدالقوي (٦٥٦هـ/١٢٥٨م)، دراسة وتحقيق بشار عواد معروف الاعظمي، التكملة لوفيات النقلة، رسالة ماجستير عن جامعة بغداد ١٩٦٧.

## سێیەم: سەرچاوە چاپکراوەکان:

ابن ابي أصيبعة، أبو العباس موفق الدين احمد بن القاسم بن خليفة بن يونس الخزرجي (ت ٦٦٨ هـ/١٢٦٩م).

١٧- عيون الانباء في طبقات الاطباء (اصدار دار الفكر _ بيروت ١٣٧٦هـ/١٩٥٦م) سێ جزمه.

ابن أبي الحديد، أبو حامد عزالدين عبدالحميد بن هبة الله المدائني (ت ٦٥٦هـ/١٢٥٨م)

١٨- شرح نهج البلاغة _ (ط/ دار مكتبة الحياة _ بيروت ١٩٦٣) پێنج جزمه.

ابن الاثير، أبو الفتح ضياء الدين نصر الله الجزري الشيباني (٦٣٧هـ/١٢٣٩م).

١٩- رسائل ابن الأثير، تحقيق أنيس المقدسي، (ط ـ بيروت ١٩٥٩)، دار العلم للملايين.

ابن الاثير، أبو الحسن عزالدين على بن ابي الكرم محمد الجزري الشيباني (ت ٦٣٠هـ/١٢٣٣م).

٢٠- التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل. تحقيق د. عبدالقادر احمد طليمات (ط، دار الكتب الحديثة بالقاهرة، ١٣٨٢هـ/١٩٦٣م).

٢١- الكامل في التأريخ (دار صادر ـ دار بيروت، لبنان ١٣٨٦هـ/١٩٦٦م) (١٣) جزمه.

ابن بعرة، منصور بن بعرة الذهبي الكاملي (عاصر الملك الكامل الأيوبي) (ت ٦٣٥هـ/١٢٣٧م).

٢٢- كشف الأسرار العلمية بدار الضرب المصرية، تحقيق الدكتور عبدالرحمن فهمي (مؤسسة دار التحرير، القاهرة، ١٣٨٥هـ/١٩٦٦م).

ابن تغري بردي، ابو المحاسن جمال الدين يوسف الأتابكى (ت ٨٧٤هـ/١٤٦٩م).

٢٣- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٢٩ ـ ١٩٧٢، ١٦ جزمه.

ابن الجوزي، أبو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد بن علي (ت ٥٩٧هـ/١٢٠١م).

٢٤- المنتظم في تأريخ الملوك والامم، (مطبعة دار المعارف العثمانية، حيدر آباد ـ الدكن، ١٣٥٨هـ/١٩٣٩م)، ٥ جزمه.

ابن حوقل، أبو القاسم بن حوقل النصيبي (ت ٣٦٧هـ/٩٧٧م)

٢٥- صورة الارض، (منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، مجهول سنة الطبع).

ابن خرداذبة، ابو القاسم بن عبيدالله بن عبدالله الخراساني (ت ٢٨٠هـ/٨٩٧م)

٢٦- المسالك والممالك، ط ـ بريل ١٨٨٩.

ابن خلدون، أبو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت ٨٠٨هـ/١٤٠٦م).

٢٧- العبر وديوان المبتدأ والخبر (تأريخ ابن خلدون، دار الكتاب اللبناني ـ بيروت ١٩٦١).

٢٨- مقدمة ابن خلدون، دار الكتاب اللبناني، بيروت ١٩٦١.

ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن أبي بكر بن خلكان (ت ٦٨١هـ/١٢٨٢م).

٢٩- أ- وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، مطبعة السعادة، ١٩٤٨، ٦ جزمه.

ب- نفس الكتاب، تحقيق د. احسان عباس (مطبعة الغريب، دار الثقافة ـ بيروت) (٨) جزمه، (١٩٦٨ ـ ١٩٧١)

٣٠- ترجمات المتقدمين من الشعراء، نشر إي، أي. ستراندمان، ط ١٨٦٦.

ابن دحية، أبو الخطاب عمر بن أبي علي حسن بن علي البلنسي (ت ٦٣٣هـ/١٢٣٥م).

٣١- النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس، تحقيق عباس العزاوي (مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٨).

ابن رجب، زين الدين عبدالرحمن بن شهاب الدين احمد البغدادي الدمشقي الحنبلي (ت ٧٩٥هـ/١٣٩٢م).

٣٢- الذيل على طبقات الحنابلة (مطبعة السنة المحمدية، ١٩٥٢م) دوو جزمه.

ابن رستة، أبو علي احمد بن عمر ((کتێبەکەی لە ساڵی (٢٩٠ك/٩٠٢ز)دا داناوە)).

٣٣- الأعلاق النفيسة (ط، ليدن ١٨٩١).

ابن زيني دحلان، احمد.

٣٤- تأريخ الدول الاسلامية، المطبعة البهية، القاهرة ١٨٨٨م.

ابن الساعي، أبو طالب تاج الدين علي بن انجب بن عثمان بن عبيدالله البغدادى السلامي (ت ٦٧٤هـ/١٢٧٥م).

٣٥- الجامع المختصر في عنوان التواريخ وعيون السير، المطبعة السريانية الكاثوليكية، بغداد، ١٩٣٤، تحقيق د. مصطفى جواد، ج- ٩.

ابن سعيد، ابو الحسن موسى بن سعيد الاندلسي (ت ٦٨٥ هـ/١٢٨٦م)

٣٦- الغصون اليانعة في محاسن شعراء المائة السابعة، مطبعة دار المعارف بمصر، ١٩٤٥.

ابن شاكر الكتبي، محمد بن احمد (ت ٧٦٤هـ/١٣٦٢م)

٣٧- فوات الوفيات، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٥١ ـ دوو جزمه.

ابن شاهين الظاهري، غرس الدين خليل بن شاهين (ت ٨٧٣هـ/١٤٦٧م).

٣٨- زبدة كشف الممالك وبيان الطرق والمسالك، اعتناء وتصحيح، بولس راويس، طبع باريس، مطبعة الجمهورية ١٨٩٤.

ابن الشحنة، أبو الفضل محب الدين محمد بن الشحنة الحلبي (ت ٨٨٤هـ/١٤٦٨م).

٣٩- الدر المنتخب في تأريخ مملكة حلب، تحقيق يوسف بن الياس سركيس، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٠٩.

ابن شداد، أبو المحاسن بهاء الدين يوسف بن رافع الأسدي (ت ٦٣٢هـ/١٢٣٤م).

٤٠- النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، سيرة صلاح الدين، تحقيق د. جمال الدين الشيال، ط ـ الدار المصرية، القاهرة، ١٩٦٤.

ابن شداد، أبو عبدالله عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (ت ٦٨٤هـ/١٢٨٥م).

٤١- الأعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، تأريخ دمشق، د. سامي الدهان، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٥٦.

ابن الصابونى، أبو حامد جمال الدين محمد بن علي (ت ٦٨٠هـ/١٢٨١م)

٤٢- تكملة اكمال الاكمال في الانساب والأسماء والألقاب، تحقيق د. مصطفى جواد، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد (١٣٧٧هـ/١٩٥٧م).

ابن الطقطقى، محمد بن علي بن طباطبا الحسينى (ت ٧٠٩هـ/١٣٠٩م)

٤٣- الفخري في الآداب السلطانية والدول الاسلامية، دار بيروت للطباعة والنشر، ١٣٨٥هـ/١٩٦٦م.

ابن طولون، شمس الدين (ت ٩٥٣هـ/١٥٤٦م)

٤٤- قضاة دمشق، تحقيق صلاح الدين المنجد، مطبوعات المجمع العلمي العربي، دمشق ١٩٥٦.

ابن العبري، ابو الفرج غريغورس أهرون الملطي (ت ٦٨٥هـ/١٢٨٦م).

٤٥- تأريخ الدول السرياني، ترجمة الخورى اسحق أرملة السرياني المنشور في مجلة المشرق، المطبعة الكاثوليكية، بيروت (من المجلد ٤٦ لسنة ١٩٥٢ لغاية المجلد ٤٩ لسنة ١٩٥٥).

٤٦- تأريخ مختصر الدول، المطبعة الكاثوليكية، ط ٢ بيروت ١٩٥٨.

ابن العديم، أبو القاسم كمال الدين عمر بن احمد بن هبة الله (ت ٦٦٠هـ/١٢٦١م)

٤٧- زبدة الحلب من تأريخ حلب، تحقيق الكتور سامي الدهان، المطبعة الكاثوليكية، (١٩٥٢، ١٩٥٤، ١٩٦٨) ٣ جزمه.

ابن عساكر، أبو القاسم علي بن الحسن بن هبة الله بن عبدالله (ت ٥٧١هـ/١١٧٥م).

٤٨- التأريخ الكبير، تهذيب ابن عساكر (مطبعة روضة الشام، دمشق، ط ١٩١٣) ٧ جزمه.

ابن العماد، أبو الفلاح عبدالحي بن العماد الحنبلي، (ت ١٠٨٩هـ/١٦٧٨م).

٤٩- شذرات الذهب في أخبار من ذهب (مطبعة القدسي، القاهرة، ط ١٣٥٠هـ-١٩٣١م) ٨ جزمه.

ابن الفرات، ناصرالدين محمد بن عبدالرحيم (ت ٨٠٧هـ/١٤٠٤م)

٥٠- تأريخ ابن الفرات، المجلد (٤، ٥) تحرير ونشر الدكتور حسن محمد الشماع ١٩٦٧ ـ ١٩٧٠ ومجلدات اخرى (٧، ٨، ٩) تحقيق د. قسطنطين زريق، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٣٦ ـ ١٩٤٢.

ابن الفوطي، أبو الفضل كمال الدين عبدالرزاق البغدادي (ت ٧٢٣هـ/١٣٢٣م)

٥١- تلخيص مجمع الآداب في معجم الألقاب، تحقيق د.مصطفى جواد، المطبعة الهاشمية، دمشق ١٩٦٢ — ١٩٦٧ ج- (٤) بە هەر چوار بەشەکەیەوە.

٥٢- نفس الكتاب، تصحيح وتعليق الحافظ محمد عبدالقدوس القاسمي، ط لاهور ١٩٤٠، ج- ٥.

٥٣- الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة (وایان دەزانی کە گوایا ابن الفوطي دایناوە)، تحقيق د. مصطفى جواد، مطبعة الفرات، بغداد ١٣٥١هـ/١٩٣٢م.

ابن قاضي شهبة، ابو الفضل بدرالدين محمد بن تقي الدين الأسدي (ت ٨٧٤هـ/١٤٦٩م).

٥٤- الكواكب الدرية في السيرة النورية، تحقيق د. محمود زايد، بيروت ١٩٧١.

ابن قطلوبغا، أبو العدل زين الدين قاسم (ت ٨٧٩هـ/١٤٧٤م)

٥٥- تاج التراجم في طبقات الحنفية، مطبعة العاني، بغداد ١٩٦٢.

ابن القلانسي، ابو يعلى حمزة (ت ٥٥٥هـ/١١٦٠م).

٥٦- ذيل تأريخ دمشق، مطبعة الآباء اليسوعيين، بيروت ١٩٠٨، طبعة آمدروز.

ابن كثير، اسماعيل بن كثير الدمشقي (٧٧٤هـ/١٣٧٢م).

٥٧- البداية والنهاية (مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٣٢) ١٤ جزمە.

٥٨- ابن المستوفي، شرف الدين المبارك بن احمد الاربلي (ت ٦٣٧هـ/١٢٣٩م).

نباهة البلد الخامل لمن ورده من الاماثل في تأريخ اربل. تحقيق وتعليق د. سامى بن السيد خماس الصفار. منشورات وزارة الثقافة والاعلام بغداد ١٩٨٠. ابن مماتي، الأسعد بن الخطير بن مماتي المصري (ت ٦٠٦هـ/١٢٠٩م).

٥٩- قوانين الدواوين، تحقيق عزيز سوريال عطية، طبعة مصر ١٩٤٣م.

ابن منظور، أبو الفضل جمال الدين محمد بن مكرم الأفريقي المصري.

٦٠- لسان العرب (دار صادر ـ دار بيروت، لبنان ١٩٥٥) ١٤ جلدە.

ابن منقذ، أبو المظفر اسامة بن مرشد بن منقذ الكناني (ت ٥٨٤هـ/١١٨٨م).

٦١- الاعتبار، تحقيق فيليب حتي، مطبعة جامعة برنستون، الولايات المتحدة ١٩٣٠.

٦٢- المنازل والديار، تحقيق حجازي، ط ـ القاهرة ١٣٨٧هـ/١٩٦٨م.

ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم بن واصل (ت ٦٩٧هـ/١٢٩٧م).

٦٣- مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، (ج- ١ ـ ٣)، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٥٣، ١٩٥٧، ١٩٦٠. و (ج- ٤) تحقيق د. حسنين ربيع، مطبعة دار الكتب المصرية ١٩٧٢.

ابن الوردي، زين الدين عمر بن الوردي (٧٤٩هـ/١٣٤٨م).

٦٤- تأريخ ابن الوردي، ذيل المختصر في أخبار البشر (المطبعة الحيدرية، النجف ١٩٦٩) دوو

جزمه.

أبو شامة، أبو محمد شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي (ت ٦٦٢هـ/١٢٦٦م).

٦٥- الروضتين في أخبار الدولتين (مطبعة وادي النيل ١٢٨٧ ـ ١٢٨٨هـ) دوو جزمه.

٦٦- الذيل على الروضتين، تراجم رجال القرنين السادس والسابع باعتناء محمد زاهد الكوثري (ط القاهرة ١٣٦٦هـ/١٩٤٧م).

أبو الفداء، عمادالدين اسماعيل بن محمد بن عمر (ت ٧٣٢ هـ/١٣٣٢م).

٦٧- تقويم البلدان، دار الطباعة السلطانية، باريس ١٨٤٠م.

٦٨- المختصر في اخبار البشر (المطبعة الحسينية المصرية، القاهرة، ١٣٢٥)، ٣ جزمه.

٦٩- رسالة الطيف، ط ـ المؤسسة العامة للصحافة والطباعة، دار الجمهورية ـ بغداد ١٣٨٨هـ/١٩٦٨م. الأربلي، عبدالرحمن سنبط ابن قنيتو.

٧٠- خلاصة الذهب المسبوك، ط ـ بغداد، (بەرواری چاپکردنی لەسەر نەنووسراوە).

الأزرقي، أبو الوليد محمد بن عبدالله بن احمد (ت ٢٢٠هـ/٨٣٤م).

٧١- كتاب أخبار مكة، مطابع دار الثقافة، بيروت، ١٩٦٥.

الأسنوي، ابو محمد جمال الدين بن الحسن بن علي بن عمر الاموي القرشي (ت ٧٧٢هـ/١٣٧١م).

٧٢- طبقات الشافعية، تحقيق عبدالله الجبوری (ط ـ١- مطبعة الارشاد، بغداد، ١٣٩٠ ـ ١٣٩١هـ/١٩٧٠ ـ ١٩٧١م) دوو جزمة.

الاصطخري، ابو اسحق ابراهيم بن محمد الفارسي (ت بعد ٣٤٠هـ/٩٥١م).

٧٣- المسالك والممالك، تحقيق د. محمد جابر عبدالعال الحسيني، دار القلم، القاهرة (١٣٨١هـ/١٩٦١م).

الاصفهاني، عمادالدين الكاتب الاصفهاني (ت ٥٩٧هـ/١٢٠٠م).

٧٤- الفتح القسى في الفتح القدسي (ط ليدن ١٨٨٧)

نفس الكتاب، تحقيق محمد محمود صبح (ط الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٥).

٧٥- خريدة القصر وجريدة العصر (القسم العراقي، الجزء الثاني)، تحقيق محمد بهجة الأثري، مطبعة المجمع العلمي العراقي ١٩٦٤.

الأنصاري، أبو عبدالله شمس الدين محمد الأنصاري الدمشقي (ت ٧٢٧هـ/١٣٢٧م)

٧٦- نخبة الدهر في عجائب البر والبحر (ط ـ الأكاديمية الأمبراطورية الروسية، بطرسبورغ

١٢٨١هـ/١٨٦٥م).

الأيوبي، محمد بن تقي الدين عمر بن شاهنشاه (ت ٦١٧هـ/١٢٢٠م).

٧٧- مضمار الحقائق وسر الخلائق، تحقيق د. حسن حبشي، (طبع عالم الكتب ـ القاهرة ١٩٦٨).

الباكوي، عبدالرشيد صالح بن نوری (کتێبەکەی لە نێوان ساڵی ٨٠٦ ـ ٨١٦ك)دا داناوە.

٧٨- تلخيص الآثار وعجائب الملك القهار (مطبعة دار النشر/العلم ـ موسكو ١٩٧١).

البنداري، قوام الدين الفتح بن علي البنداري (ت ٦٤٢هـ/١٢٤٣م).

٧٩- سنا البرق الشامي، اختصار الكتاب (البرق الشامي)، عمادالدين الاصفهاني، تحقيق رمضان ششن (ط ـ دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧١، ق ١.

٨٠- تأريخ دولة آل سلجوق، طبع شركة طبع الكتب العربية، مطبعة الموسوعات ١٩٠٠م.

الجزري، أبو الخير شمس الدين محمد بن محمد (ت ٨٣٣هـ/١٤٢٣م).

٨١- غاية النهاية في طبقات القراء، نشر بعناية (ج. برجستراسر) ط ١، مكتبة الخانجي، مصر ١٩٣٢. (دوو جزمە).

الحاجري، حسام الدين عيسى بن سنجر بن بهرام الاربلي (ت ٦٣٢هـ/١٢٣٥م).

٨٢- ديوان الحاجري (جێگەو بەرواری چاپکردنی لەسەر نەنووسراوە).

الحسيني، ابو الحسن صدرالدين علي أبو الفوارس ناصرالدين بن علي (لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە).

٨٣- اخبار الدولة السلجوقية، ط ـ نشريات كلية بنجاب، لاهور ١٩٣٣ (بە سەرپەرشتیی محمد اقبال).

الحموي، أبو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي (ت ٦٢٦هـ/١٢٢٩م).

٨٤- ارشاد الأريب الى معرفة الأديب «معجم الادباء» طبعة مرغليوث، (چاپخانەیەکی هندییە لە (الموسکی)، مصر ١٩٢٣ ـ ١٩٣٠، ٧ جزمە.

٨٥- معجم البلدان (دار صادر بيروت ١٩٥٥ ـ ١٩٥٧) ٥ جزمە.

الحموي، ابو الفضائل محمد بن علي (ت ٦٤٤هـ/١٢٤٦م).

٨٦- التأريخ المنصوري، تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان، نشر بطرس غرياز نيوويچ، موسكو، دار النشر للآداب الشرقية ١٩٦٠م.

الخوانساري، محمد باقر الموسوي الاصفهاني (الفه سنة ١٢٨٧هـ/١٨٧٠م).

٨٧- روضات الجنات، طبع طهران حجري، ط ١٣٦٧هـ.

الدواداري، أبو بكر بن عبدالله بن أيبك (ت بعد ٧٣٦هـ/١٣٣٥م).

٨٨- كنز الدرر وجامع الغرر، الدرة المضية في اخبار الدولة الفاطمية، تحقيق د. صلاح الدين المنجد، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٣٨٠هـ/١٩٦١م.

الدياربكري، حسين بن محمد بن الحسن (ت ٩٩٠هـ/١٥٨٢م).

٨٩- تأريخ الخميس في احوال أنفس نفيس، المطبعة الوهبية، القاهرة (١٢٨٣هـ/١٨٦٦م).

الذهبي، ابو عبدالله شمس الدين محمد بن احمد الدمشقي (ت ٧٤٨هـ/١٣٤٧م).

٩٠- دول الاسلام (مطبعة دار المعارف العثمانية، حيدر آباد، الدكن ١٣٦٥هـ) دوو جزمه.

٩١- العبر في خبر من عبر، تحقيق د. صلاح الدين المنجد، فؤاد سيد (مطبعة حكومة الكويت، الكويت ١٩٦٠ ـ ١٩٦٦) ٥ جزمه.

٩٢- المختصر المحتاج اليه من تأريخ الحافظ ابي عبدالله محمد بن سعيد بن محمد بن الدبيثي، تحقيق د. مصطفى جواد (مطبعة المعارف، بغداد ١٣٧١هـ/١٩٥١م) دوو جزمه.

٩٣- تذكر الحفاظ (دار احياء التراث العربي، بيروت ١٩٥٨) چوار جزمه.

الراوندي، محمد بن علي بن سليمان الراوندي (ت ٦٠٣هـ/١٣٠٧م).

٩٤- راحة الصدور وآية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية، ترجمة ابراهيم أمين الشواربي وجماعته، نشر دار القلم، القاهرة، ١٣٧٩هـ/١٩٦٠م.

الزبيدي، أبو الفيض محب الدين محمد مرتضى الحسيني الواسطي (ت ١٢٠٦هـ/١٧٩١م).

٩٥- تأريخ العروس من جواهر القاموس، ط (١) (المطبعة الخيرية ١٣٠٦هـ، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت) ده جزمه.

سبط ابن الجوزي، أبو المظفر شمس الدين قزاوغلي التركي (ت ٦٥٤هـ/١٢٥٦م).

٩٦- مرآة الزمان في تأريخ الأعيان (مطبعة مجلس دار المعارف العثمانية، حيدر آباد، الهند، ١٩٥١، ١٩٥٢) بە هەردوو بەشەكەی (٨) جزمە.

السبكي، أبو نصر تاج الدين عبدالوهاب ابن تقي الدين (ت ٧٧١هـ/١٣٧٠م).

٩٧- طبقات الشافعية الكبرى، ط ١ (الحسينية، القاهرة، ١٣٢٤) ٦ جزمه.

نفس الكتاب، تحقيق محمود محمد الطناحي وعبدالفتاح محمد الحلو، طبع مطبعة عيسى البابي الحلبي (١٣٨٣ ـ ١٣٩٠هـ/١٩٦٤ ـ ١٩٧٠م) ٨ جزمه.

السخاوى، شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت ٩٠٢هـ/١٤٩٦م).

٩٨- الاعلان بالتوبيخ لمن ذم التأريخ، مطبعة الترقي ١٣٤٩هـ/١٩٣٠م.

السمعاني، أبو سعد عبدالكريم بن محمد بن منصور التميمي (ت ٥٦٢هـ/١١٦٦م).

٩٩- الانساب، ط ١، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد، الدكن، الهند ١٩٦٢.

السيوطي، جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر (ت ٩١١هـ/١٥٠٥م).

١٠٠- بغية الوعاة في طبقات اللغويين والنحاة، تحقيق محمد أبو الفضل ابراهيم، (مطبعة عيس البابي الحلبي، ١٩٦٤ _ ١٩٦٥) دوو جزمه.

١٠١- تأريخ الخلفاء، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، مطبعة القاهرة ١٩٦٤.

١٠٢- حسن المحاضرة في تأريخ مصر والقاهرة، تحقيق محمد أبو الفضل ابراهيم، ط ١ (دار احياء الكتب العربية، ١٣٨٧هـ/١٩٦٧، ١٩٦٨م) دوو جزمه.

الصفدي، صلاح الدين خليل بن أيبك (ت ٧٦٤هـ/١٣٦٣م).

١٠٣- الوافي بالوفيات، (چوار جزمەکەی یەکەمی، ط ٢، سالی ١٩٦١ هلموت ریتر، سەرپەرشتیانی کردووه. بەلام جزمەکانی تری، ١٩٧٠ م، لە لایەن _ س. دیدرنغ، احسان عباس ١٩٦٩م، محمد یوسف نجم ١٩٧١م سەرپەرشتی کراوه. ط _ دار النشر فرانز شتاینر، فیسبادن، المانیا) هەشت جزمه.

طاش كبرى زاده، احمد بن مصطفى (ت ٩٦٨هـ/١٥٦١م).

١٠٤- مفتاح السعادة ومصباح السيادة، نشر دار الكتب الحديثة، مطبعة الاستقلال الكبرى، القاهرة، ١٩٦٨م.

عبدالحق، صفي الدين عبدالمؤمن بن عبدالحق (ت ٧٣٩هـ/١٣٣٨م).

١٠٥- مراصد الاطلاع (ط: ت. ك. ج. جوينسبول، ليدن، ١٨٥٢م) ٣ جزمه.

العسقلاني، شهاب الدين احمد بن حجر (ت ٨٥٢ هـ/١٤٤٨م).

١٠٦- الدر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، ط ٢، طبعة دار الكتب الحديثة، القاهرة، ١٩٦٢.

العمري، محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري (ت ١٢٠٣هـ/١٧٨٨م).

١٠٧- منهل الأولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، تحقيق سعيد الديوهجي، (مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٣٨٦هـ/١٩٦٧ _ ١٩٦٨م) دوو جزمه.

العمري، ياسين بن خير الله.

١٠٨- منية الأدباء في تأريخ الموصل الحدباء، تحقيق سعيد الديوهجي، مطبعة الهدف، الموصل ١٩٥٥.

١٠٩- غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام، طبعة دار منشورات البصري، بغداد ١٩٦٨.

الغزي، كامل بن حسين بن محمد البالي.

١١٠- نهر الذهب في تأريخ حلب، المطبعة المارونية، حلب، ١٣٤٢هـ/١٩٢٣م.

الفاسي المكي، ابو الطيب تقي الدين محمد بن احمد بن علي الحسني (ت ٨٣٢هـ/١٤٢٨م).

١١١- شفاء الغرام بأخبار البلد الحرام، تحقيق وتعليق لجنة من كبار العلماء والادباء، ط مكتبة النهضة الحديثة، مكة ١٩٥٦.

١١٢- العقد الثمين في تأريخ البلد الامين، تحقيق فؤاد سيد وآخرون (مطبعة السنة المحمدية، القاهرة، ١٩٥٩ ـ ١٩٦٩) ٨ جزمه.

فضل الله الهمداني، رشيدالدين فضل الله الهمداني (ت ٧١٨هـ/١٣١٨م)

١١٣- جامع التواريخ، تأريخ المغول الايلخانيين، ترجمة محمد صادق نشأة وجماعته، (ط ـ دار حياء الكتب العربية ١٩٦٠) دوو جزمه.

قدامة بن جعفر، أبو الفرج الكاتب البغدادي (ت ٣٢٠هـ/٩٣٢م).

١١٤- نبذ من كتاب الخراج وصنعة الكتابة، ط بريل ١٨٨٩م.

القرشي، أبو محمد محي الدين عبدالقادر بن ابي الوفاء محمد الحنفي المصري (ت ٧٧٥هـ/١٣٧٣م)

١١٥- الجواهر المضيئة في طبقات الحنفية، ط ١ (مطبعة مجلس دائرة المعارف النظامية، حيدر آباد، الدكن، الهند ١٣٣٢هـ/١٩١٤م) دوو جزمه.

القزويني، زكريا بن محمد بن محمود (ت ٦٨٢هـ/١٢٨٣م).

١١٦- آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر، دار بيروت ١٩٦٠م.

القفطي، ابو الحسن جمال الدين علي بن يوسف (ت ٦٤٦هـ/١٢٤٨م).

١١٧- أنباء الرواة على أنباء النحاة، تحقيق محمد ابو الفضل ابراهيم، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة (١٩٥٠ ـ ١٩٥٥) ٣ جزمه.

القلقشندي، ابو العباس احمد بن علي (ت ٨٢١هـ/١٤١٨م).

١١٨- صبح الأعشى في صناعة الانشا (المطبعة الاميرية ١٩١٣ ـ ١٩١٧م) ١٥ جزمه.

الماوردي، أبو الحسن علي بن محمد بن حبيب البصري البغدادي (ت ٤٥٠ هـ/١٠٥٨م)

١١٩- الاحكام السلطانية والولايات الدينية، شركة ومطبعة مصطفى البابي القاهرة، ١٩٦٠.

المقدسي البشاري، شمس الدين أبو عبدالله محمد (ت ٣٨٧هـ/٩٩٧م)

١٢٠- أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، ط ليدن ١٩٠٦.

القزويني، ابو العباس تقي الدين احمد بن علي (ت ٨٤٥هـ/١٤٤٢م).

١٢١- السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق د. مصطفى زيادة (مطبعة دار الكتب المصرية ١٩٣٤م) ٤ جزمه.

١٢٢- شذور العقود في ذكر النقود، تحقيق محمد السيد علي بحر العلوم، المطبعة الحيدرية،

النجف ١٩٦٧م.

١٢٣- المواعظ والأعتبار بذكر الخطط والآثار، مطبعة بولاق ١٧٩٤ مكتبة المثنى، بغداد، بالاوفسيت.

المنذري، أبو محمد زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي (ت ٦٥٦هـ/١٢٥٨م).

١٢٤- التكملة لوفيات النقلة، دراسة وتحقيق بشار عواد معروف، مطبعة الآداب، النجف (چوار جزمەکەی یەکەمی چاپ کراوە).

النسوي، محمد بن احمد (ت ٦٣٩هـ/١٢٤١م).

١٢٥- سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، تحقيق حافظ احمد حمدي، مطبعة الاعتماد، دار الفكر العربي، القاهرة ١٩٥٣.

النعيمي، عبدالقادر محمد الدمشقي (ت ٩٢٧هـ/١٥٢١م).

١٢٦- الدارس في تأريخ المدارس، تحقيق جعفر الحسني (مطبعة الترقي، دمشق، ١٩٤٨) دوو جزمە.

النويري، شهاب الدين احمد بن عبدالوهاب (ت ٧٣٢هـ/١٣٣٢م)

١٢٧- نهاية الأرب في فنون الأدب (نوسخەیەکە، لەوەی ـ دار الكتب القاهرة ـ وە وێنە گیراوە، ١٩٥٤) ١٨ جزمە.

اليافعي، أبو محمد عبدالله بن اسعد بن علي اليمني المكي (ت ٧٦٨هـ/١٣٦٦م)

١٢٨- مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ط ٢ (منشورات مؤسسة الأعلمي للمطبوعات ١٩٧٠م) ٤ جزمە.

اليمني الأنصاري، احمد بن محمد بن علي (نەزانراوە کەی مردووە).

١٢٩- حديقة الأفراح لأزاحة الاتراح، طبع المطبعة الميمنية، مصر ١٣٢٠هـ/١٩٠٢م.

اليونيني، أبو الفتح قطب الدين موسى بن محمد البعلبكي (ت ٧٢٦هـ/١٣٢٦م)

١٣٠- ذيل مرآة الزمان، (ط حيدر آباد، الدكن ١٣٧٤هـ/١٩٥٤م) ٤ جزمة.

## چوارەم: سەرچاوە تازەکان:

أدی شیر، سەرۆکی قەشە کلدانییەکانی سەعرەت

١٣١- الالفاظ الفارسية المعربة، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٠٨ أمين، د. حسين أمين.

١٣٢- تأريخ العراق في العصر السلجوقي، مطبعة الأرشاد، بغداد ١٩٦٥ بابو اسحق، روفائيل.

١٣٣- تأريخ نصارى العراق، مطبعة المنصور، بغداد ١٩٤٨.

بارتولد، فازيلي

١٣٤- تأريخ الترك في آسيا الصغرى، ترجمة احمد السعيد سليمان، القاهرة، ١٩٥٨. الباشا، د. حسن

الباشا

١٣٥- الألقاب الاسلامية في التأريخ والوثائق والآثار (مطبعة لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٥٧)

١٣٦- الألقاب الاسلامية والوظائف على الآثار العربية (مطبعة لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٦٥ ـ ١٩٦٦) ٣ جزمه.

باقر، طه باقر وفؤاد سفر

١٣٧- المرشد الى مواطن الآثار والحضارة، وزارة الثقافة والارشاد، بغداد ١٩٦٦م.

بدر، د. مصطفى طه.

١٣٨- محنة الاسلام الكبرى، زوال الخلافة العباسية من بغداد، ط القاهرة ١٩٤٧م.

براون، أدوارد جرانفيل

١٣٩- تأريخ الأدب في ايران من الفردوسي الى الشيرازي، ترجمة ابراهيم أمين الشواربي، ط مصر ١٩٥٤م.

البغدادى، اسماعيل

١٤٠- هدية العارفين، ط ٣، طهران ١٣٨٧هـ/١٩٦٧م

بكنغهام، جيّمس

١٤١- رحلتي الى العراق، ترجمة سليم طه التكريتي، مطبعة أسعد، بغداد ١٩٦٨م.

بيومي، علي.

١٤٢- قيام الدولة الأيوبية في مصر، ط دار الفكر الحديث، القاهرة ١٩٥٢م.

جب، السير، هاملتون، آر.

١٤٣- صلاح الدين الأيوبي، دراسات في التأريخ الاسلامي، ترجمة يوسف أيبش، ط، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ١٩٧٣م.

الجميلي، رشيد.

١٤٤- دولة الأتابگة في الموصل بعد عمادالدين زنگى (٥٤١ ـ ٦٣١هـ)، ط، دار النهضة، بيروت ١٩٧٠.

جواد، د. مصطفى.

١٤٥- شخصيات القدر، مكتبة النهضة، مؤسسة فرانكلين، بغداد ١٩٦٣م.

نفس المؤلف مع د. احمد سوسة.

١٤٦- دليل خارطة بغداد، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٥٨.

حاجي خليفة، كاتب جلبي (١٠٦٧هـ/١٦٥٧م)

١٤٧- كشف الظنون في أسامي الكتب والفنون، ط ٣ طهران ١٣٨٧هـ/١٩٦٧م.

حسن د. حسن ابراهيم.

١٤٨- تأريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي (مطبعة السنة المحمدية، القاهرة، ١٩٦٧م) ٤ جزمه.

حسين. د. عبدالنعيم محمد.

١٤٩- سلاجقة ايران والعراق، ط ٢ مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٧٠.

الحسني، عبدالرزاق.

١٥٠- العراق قديماً وحديثاً، مطبعة دار الكتاب، بيروت ١٩٧١.

الحسيني، د. محمد باقر.

١٥١- العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، مطبعة دار الجاحظ، بغداد ١٩٦٦م.

الحصان، عبدالرزاق.

١٥٢- نظرة عابرة في شمال العراق، مطبعة التفيض، بغداد، ١٩٤٠م.

حمادة، ابراهيم.

١٥٣- خيال الظل وتمثيليات ابن دانيال، المؤسسة المصرية للطباعة ١٩٦١م.

خباز، حنا

١٥٤- المعارك الفاصلة في التأريخ، دار الكاتب العربي، بيروت.

خصباك. د. جعفر حسين.

١٥٥- العراق في عهد المغول الايلخانيين ٦٥٦ _ ٧٣٦هـ/١٢٥٨ _ ١٣٣٥م، مطبعة العاني _ بغداد ١٩٦٨.

خليل، د. عمادالدين.

١٥٦- عمادالدين زنگی، الدار العلمية، بيروت ١٩٧١م.

خليفة، حسن.

١٥٧- الدولة العباسية، قيامها وسقوطها، المطبعة الحديثة، القاهرة، ١٩٣١م.

الدفتر، محمد هادي الدفتر، عبدالله حسن

١٥٨- العراق الشمالي، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٥٥م.

الديوهجي، سعيد.

١٥٩- الموصل في العهد الأتابگی، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٥٨م.

رنسيمان، ستيفن.

١٦٠- تأريخ الحروب الصليبية، ترجمة د. السيد الباز العريني (ط دار الثقافة، بيروت ١٩٦٨) ٣

جزمه.

روزنتال، فرانز.

١٦١- علم التأريخ عند المسلمين، ترجمة د. صالح احمد العلي، ط مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٦٣.

الرويشدي، سوادى عبد محمد.

١٦٢- امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ ٦٠٦ ـ ٦٦٠هـ/١٢٠٩ – ١٢٦١م، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧١م.

ريج، كلوديوس جيمس.

١٦٣- رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، ترجمة بهاءالدين نوري، مطبعة السكك الحديدية، بغداد، ١٩٥١.

زامباور، ادوارفون.

١٦٤- معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التأريخ الاسلامي، ترجمة د. زكي محمد حسن، حسن احمد، مطبعة جامعة فؤاد الاول، ١٩٥١م.

١٦٥- دائرة المعارف الاسلامية، مادة (الدينار) ط القاهرة ١٩٣٣.

الزركلي، خيرالدين.

١٦٦- الاعلام، قاموس تراجم (ط ٢) ١٠ جزمه.

زكي، محمد امين.

١٦٧- خلاصة تأريخ الكورد و كوردستان، ترجمة محمد علي عوني، ط ٢، مطبعة صلاح الدين، بغداد ـ ١٩٦١م.

زيدان، جرجي.

١٦٨- تأريخ آداب اللغة العربية (مطبعة دار الهلال) ٤ جزمه.

السامرائي، د. حسام الدين قوام.

١٦٩- المؤسسات الادارية في الدولة العباسية، مكتبة دار الفتح، دمشق، ١٩٧١م.

سترك، م.

١٧٠- دائرة المعارف الاسلامية، مادة أربل، ط القاهرة ١٩٣٣.

سعداوى، د. نظير حسان.

١٧١- التأريخ الحربي المصري في عهد صلاح الدين، مطبعة لجان البيت العربي، ١٩٥٧م.

سوبرنهيم.

١٧٢- دائرة المعارف الاسلامية، مادة (اقطاع) ط القاهرة ١٩٣٣.

سيد، فؤاد.

١٧٣- فهرست المخطوطات، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة.

الشبيبى، محمد رضا.

١٧٤- مؤرخ العراق ابن الفوطي، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٢٧٨ ـ ١٩٥٨.

الشريف، د. حسن احمد محمود، احمد ابراهيم الشريف.

١٧٥- العالم الاسلامي في العصر العباسي، مطبعة المدني، القاهرة، ١٩٦٦.

شلبي، د. احمد

١٧٦- تأريخ التربية الاسلامية ط ٢، مكتبة الانكلو ـ المصرية، ١٩٦٠.

الصائغ، القس سليمان الصائغ الموصلي.

١٧٧- تأريخ الموصل، المطبعة السلفية، القاهرة ١٣٤٢هـ/١٩٢٣م.

طرخان، د. ابراهيم علي.

١٧٨- النظم الاقطاعية في الشرق الاوسط في العصور الوسطى، دار الكاتب العربي، القاهرة، ١٣٨٨هـ/١٩٦٨م.

اطلس، د. محمد اسعد

١٧٩- التربية والتعليم في الاسلام، دار العلم للملايين ١٩٥٧.

الطليات، د. عبدالقادر احمد

١٨٠- مظفرالدين گوگبورى، امير أربل، سلسلة اعلام العرب، القاهرة ١٩٦٣.

طوقان، قدري حافظ

١٨١- تراث العرب العلمي في الرياضيات والفلك، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٦٤.

العبادى، احمد مختار

١٨٢- قيام دولة المماليك الأولى في مصر والشام، ط دار النهضة العربية، بيروت ١٩٦٩.

العريني، د. السيد الباز

١٨٣- الشرق الادنى في العصور الوسطى، الأيوبيون، دار النهضة العربية، بيروت ١٩٦٧.

١٨٤- المغول، دار النهضة، بيروت ١٩٦٧.

١٨٦- تاريخ العراق بين احتلالين، طبع بغداد، عدة مطابع، ١٣٥٣ _ ١٣٧٦هـ/١٩٣٥ _ ١٩٦٥م، ٨ جزمه (ج-١ حكومة المغول، مطبعة بغداد).

١٨٧- تأريخ النقود العراقية، ط شركة التجارة والطباعة، بغداد ١٩٥٨.

١٨٨- التعريف بالمؤرخين في عهد المغول والتركمان، ط شركة التجارة والطباعة، بغداد ١٩٥٧.

عطية الله، احمد

١٨٩- القاموس الاسلامي، (٣ جزمه) ط ١٩٦٣، ١٩٦٦، ١٩٧٠، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة.

عطية، رشيد

١٩٠- معجم عطية، ط سان باولو (البرازيل) ١٩٤٤.

فهمي، د. عبدالرحمن.

١٩١- فجر السكة العربية، مطبعة دار الكتب المصرية ١٩٦٥.

القزاز، د. محمد صالح داوود.

١٩٢- الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الاخير، مطبعة القضاء، النجف ١٩٧١.

١٩٣- الحياة السياسية في العراق في عهد السيطرة المغولية، مطبعة القضاء، النجف ١٩٧٠.

كاهين، كلود.

١٩٤- دائرة المعارف الاسلامية، مادة أتابك، ترجمة ابراهيم زكي خورشيد، ط ٢، مطبعة دار الشعب، القاهرة، ١٩٦٩ مجلد ٢

كرد علي، محمد

١٩٥- الاسلام والحضارة، مطبعة لجنة التأليف والترجمة، القاهرة ١٩٥٠/ دوو جزمه.

١٩٦- خطط الشام، عدة مطابع، دمشق ١٩٢٥ _ ١٩٢٨/ ٦ جزمه.

لسترنج، كي.

١٩٧- بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد ١٩٥٤.

متز، آدم

١٩٨- الحضارة الأسلامية في القرن الرابع الهجري، ترجمة محمد عبدالهادي أبو ريدة، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٤٨/ دوو جزمه.

معروف، د. ناجي.

١٩٩- علماء النظاميات ومدارس المشرق الاسلامي، مطبعة الارشاد، بغداد ١٣٩٣هـ/١٩٧٣م.

٢٠٠- تأريخ علماء المستنصرية.

نصري، بطرس نصري الكلداني.

٢٠١- ذخيرة الأذهان، مطبعة دير الدومنكيين، الموصل ١٩٠٥ _ ١٩١٣/ دوو جزمه.

النقشبندي، ناصر السيد محمود

٢٠٢- الدينار الاسلامي في المتحف العراقي، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٣٧٢هـ/١٩٥٣م.

نيبور، كارستن

٢٠٣- رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ترجمه عن الالمانية، د. محمود حسين الامين ط بغداد _ ١٩٦٥.

الهلالي، عبدالرزاق.

٢٠٤- معجم العراق، مطبعة النجاح، بغداد، ١٩٥٣.

هنداوي، محمد موسى

٢٠٥- المعجم في اللغة الفارسية، مكتبة مطبعة مصر ١٩٥٢.

هوارت

٢٠٦- دائرة المعارف الأسلامية (مادة الاسماعيلية)، ط القاهرة ١٩٣٣.

هي، دبليو. آر.

٢٠٧- سنتان في كوردستان ١٩١٨ _ ١٩٢٠، ترجمة فؤاد جميل، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٧٣.

## پێنجەم: کتێبگەلی فارسی و تورکی:

أشتياني، عباس اقبال.

٢٠٨- تأريخ مفصل ايران ((مغول)) از حملة جنگيز تا تشكيل دولت، تيموري، چاپی سوم (٣) تهران ١٣٤٧هـ/١٩٢٨م جلد أول.

٢٠٩- وزارت در عهد سلاطين بزرگ سلجوقي، بكوشش محمد تقي دانش پژوه ويحيى ذكاء، انتشارات دانشگاه تهران — تهران ١٣٣٨هـ/١٩١٩م.

آيتى، عبدالمحمد

٢١٠- تحرير، تأريخ وصاف، انتشارات بنياد فرسنگ ايران.

التبريزي، محمد حسين ابن خلف التبريزى

٢١١- برهان قاطع (قاموسێکی فارسییه) بتصحيح واهتمام محمد عباسى، طبعة مؤسسة مطبوعاتى أمير كبير، سنه ١٣٣٦هـ.

جويني، علاءالدين عطا ملك ابن الصاحب بهاءالدين محمد (ت ٦٨١هـ/١٢٨٢م)

٢١٢- تأريخ جهانكشاى (الفه سنة ٦٥٨هـ) تصحيح محمد بن عبدالوهاب قزويني، مطبعة بريل، ليدن في ١٩١١، ١٩١٦، ١٩١٧ (٢ جزمه).

خواند امير، غياث الدين بن همام الدين الحسيني (ت ٩٤٢هـ/١٥٣٥م)

٢١٣- تأريخ حبيب السير في اخبار افراد وبشر، أز انتشارات كتابخانه خيام، خيابان ناصر خسرو ١٣٣٣.

سايكس، الجنرال برسى.

٢١٤- تأريخ ايران (سيد محمد تقى فخرداعى گيلانى، لە ئینگلیزییەوە كردوویە بە فارسى) شركة سهامي، چاپ انتشارات ايران.

مستوفى، قزوينى، حمدالله بن أبى بكر بن احمد بن نصر (ت ٧٥٠هـ/١٣٤٩م)

٢١٥- تأريخ گزيده، باهتمام دكتر عبدالحسين نوائي، مؤسسة چاپ انتشارات امير كبير، ط ١٣٣٩هـ/١٩٢٠م.

٢١٦- نزهة القلوب، تحقيق كي لسترانج، طبعة ليدن، هولندا، ١٣٣١هـ/١٩١٣م مشكوتى، نصرت الله.

٢١٧- أز سلاجقه تا صفويه، مطبعة بانك بازرگانى، تهران ١٣٤٣هـ/١٩٢٤م.

مير خواند، محمد حميد الدين بن سيد برهان الدين (ت ٩٠٣هـ/١٤٩٨م)

٢١٨- تأريخ روضة الصفا، ط انتشارات مركزي خيام، بيروز، تهران ١٣٣٩هـ.

الهمداني، رشيدالدين فضل الله (ت ٧١٨هـ/١٣١٨م).

٢١٩- جامع التواريخ، بكوشش دكتر بهمن كريمى، شركت نسبى حاج محمد حسين اقبال وشركاه، (تهران ١٣٣٨هـ/١٩١٩م) دوو جزمه.

دياربەكرلى، سعيد پاشا.

٢٢٠- مرآة العبر، قرمبت وقصباد مطبع-حسى، باب عالى جادهسى، استانبول ١٣٠٥هـ (كتێبى دووەم جلدى ٨، ٩)

دوهسون، مورازا

٢٢١- موغول تاريخي، ترجمة مصطفى رحمى، عامره مطبع-حسى، استانبول ١٣٤٠ _ ١٣٤٢هـ.

سامي، شمس الدين

٢٢٢- قاموس الاعلام، مهران مطبع-حسى، باب عالي جادهسنده، نومرو (٧)، استانبول ١٣٠٦ — ١٣١٤ (٦ جلده).

٢٢٣- قاموس تركي، اقدام مطبع-حسى، باب عالي جادهسنده، استانبول ١٣١٧هـ.

ضياء، احمد

